# تەفسیری زمناکۆیی

بەقەڵەمی

مەلا سعیدی زمناکۆیی

جزمی ﴿٨ ، ٩ ، ١٠﴾

بەرگی شەشەم

ناوی کتێب : تەفسیری زمناکۆیی .
ناوی نووسەر :مەلا سعیدی زمناکۆیی .
جزمی هەشتەم و نۆیەم و دەیەم.
بەرگی شەشەم.
چاپی یەکەم .
چاپی کۆمپیۆتەرو ڕاکێشانی : ﴿ چاپخانەی ئۆفسێتی بابان ﴾
ژمارەی سپاردنی (٤٠٩) ی ساڵی ( ٢٠٠٠ ) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ سپێردراوە .



( بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان )

سوپاس وستایشی بێ پایان بۆ یەزدان پەروەردەکەری هەموو بونەوەران. دروودی زۆر لەسەر پێشەوای بونەوەران پێغەمبەری مەزن لەسەر یارو یاوەران و پەیرەوانی بێ .

دوای ئەوەی خوای مەزن ڕوونی کردەوە لە ئایەتەکانی پێشوودا کە کۆمەڵێ لە بت پەرستان داوایان لەپێغەمبەر کرد نیشانەیەکی تایبەتی بۆیان بهێنێ هەتا باوەڕی بێ بهێنن باوەڕدارانیش لایان خۆشبوو وەڵامیان بدرێتەوە، لەمەودوایش خوای مەزن ڕونتری ئەکاتەوە بۆ پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەفەرموێ: ئەو بت پەرستانە ئەگەر زۆرتر لەو داخوازیانەی پێشووش بەڵگەی زۆر گەورەتریشیان بۆ بهێنێ هەرگیز باوەڕ ناهێنن ، وەك خوای مەزن ئەفەرموێ :

وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴿١١١﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾ وَلِتَصْغَىٰٓ إِلَيْهِ أَفْـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا۟ مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ ﴿١١٣﴾

﴿ وَلَوْ أَنْزَلْنا أَلَيْهِمْ الَملائِكَةُ ﴾ وەئەگەر بە ڕاستی ئێمە ڕەوانەمان بکردایە بۆ لای ئـەو بێ باوەڕانە فریشتەکان بە چاوی خۆیان بیاندیبایە ئاگاداریـان بدایـە لەسـەر پێغەمبرایـەتی موحەمەد وەك خۆیان داوابان ئەکرد بۆچی فریشتەکان نایەرێ شایەتی بدەن .

﴿ وَكَلَّمَهُمْ الَموْتى ﴾ وە گفوگۆیان بکردایە لەگەڵ ئەو بێ باوەرانە مردووەکان، دوایـی ئێمە زیندوویان بکەینەوە شایەتی بدەن بەیەکێتی خواو پێغمبەرایەتی موحەمەد، وەك خۆیان ئەیان ووت: باوکەکانمان بۆ بێننەوە و بۆمانی زیندوو بکەرەوە .

﴿ وَحَشَرْنا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَيْءٍ قُبُلاً ﴾ وەئێمە کۆمان بکردایەوە بەسەر ئەو بـێ باوەرانـە هەموو شتێ لەم جیهانەدا بـەزیندوو بەمردویانـەوە، بەوانەیانـەوە دیـارن و بەوانەیشـەوە بەنهانن، بەهەموو گیان داران و بەئاسمانەکان و بەزەوی وبەهەموو بونەوەرانی تـرەوە ڕوو بـەڕوو تـاقم لـە دوای تـاقم هـەموویان ببینـن وشـایەتی بـدەن لەسـەر یـەکێتی خـواو پێغەمبەرایەتی موحەمەدو بەڕاستی ئایەنی خوا. ئێمە ئەوانە هەموویان بکەین .

﴿ ماكانُوا لِيُؤْمِنُوا إلاّ أنْ يَشاءَ اللهُ ﴾ ئەوانـە لەوانـە نـەبوون بـەوەی بـاوەڕ بـهێنن مەگەر کەخوا ئارەزووی باوەڕهێنان ئەوان بکاو پاڵیان پێوە بنێ زۆریـان لێ بکـاو بـۆلای باوەڕهێنان و دوایی ئەوان باوەڕ بهێنن. ئەبێ بزانـین کـە خـوا ئـەقڵی داوە بـەوان و زۆر لەکەس ناکا بۆ هیچ شتێ .

پرسیار/ ئایا ئەو بڕیارە ڕاستە چۆن ئەبێ ئەو هەموو شتانە بێن بۆ لای ئـەو بـێ بـاوەڕە کەمانەو کەچی ئەوان باوەڕ ناهێنن، ئەو جۆرە ئادەمیزادانە ئەبێ هەبن و ئـەوەندە نـەفامبن بە شێوەیەکی ئاسایی چۆن ئەبێ ئەو تاقمە کەمـەی بـێ بـاوەڕان ئـەو هـەموو بونەوەرانـە بەدروو بخەنەوە شایەتی ئـەدەن لەسـەر ڕاسـتی ئایـەنی ئیسـلام؟ ئایـا ئەچێتـە مێشـکەوە ئادەمیزادێ بەچاوی خۆیان ببینن وە بەگوێچکـەی خۆیـان ببیسـن ئـەو مـردووە ڕزیوانـە زیندوو ئەکرێتەوە لە گۆڕەکانیان دێنە دەرێ پاش هەزاران ساڵ و هەموویان شایەتی بدەن وبڵێن: هیچ کەسێ شایەنی پەرستن نی‌یە جگەی خوا و موحەمـەد وفروسـتادەی خوایـە،

فریشتەکان بهێنن پۆل پۆل بێنە خوارەو و شایەتی بدەن بە فروستادەی موحەمـەد ﴿ ﷺ ﴾، ببیسن کە گیانداران لـە باڵندەو ماسی شتی تر لـە بونەوەران بە وێنەی درەخت و بـەرد و ئەستێرەکان جارِ بدەن بە یەك جار بە یەك دەنگ شایەتی بدەن هیچ کەسێ شایەنی پەرستن نی‌یە مەگەر خواو موحەمەد وفروستادەی خوایە لـەگەڵ ئەوانە هـەموودا چـۆن ئـەگونجێ ئادەمیزادێ هەبێ ئەو هەمووە کارە بەك خەرانـەو ئـەو هـەموو یاسا تێکدەرانـە بـە درۆ بخاتەوە بەبێ بەڵگەو بـاوەرِ نـەهێنێ بـە ئـاینی ئیسـلام ؟ بەرِاسـتی ئـەو کـارە زۆر سـەر سوورِهێنەرە ؟.

وەڵام/ ئەو برِیارانەو ئەو شتانە رِابوردن رِاست نین. بەڵکو ناگونجێ دەربـارەی کەسـێ رِاستی و بەڵگەی رِاستی کاری تێ بکاو بەگوێرەی سروشتی ئـەقڵ ژیـری‌و بـەو پاکیـەی ئەوتۆ خوا ئادەمیزادی لـەسەر دروست کرد بـرِوا بـەرێوە، چونکـە ئـەو بەڵگانـە کـاری بەکەس نەکراون وهەر خوا ئەیانکاو جێگە بۆگومان نایەڵنـەوە. بـەلاَم ئـەو فەرمودانـەی خودا بۆ کەسانێکی ئەوتۆیە هەموو هەست و ئاواتیان چەندین سوودی تایبەت خۆیان بـێ بە تەنها، ئیتر ئەقڵ و پاکێتی دەروون و مرۆڤایەتی ورِاستی وداد پەروەری و جگەی ئەوان مەبەست نی‌یە لای ئەوان. کەواتە باوەر نەکردن بـەو کـارە نائاسـایانە دەربـارەی ئەوانـە رِاستەو بێ گومانە، لـەبەر ئەو رِەوشتە خراپانە هیچ شتێ سوود نابەخشێ لـەگەڵیان مەگەر ئەو هێزەی ئـەوتۆ خـوا ئامـاژەی کـرد بـۆی و فـەرموی: ﴿ إلاّ أنْ يَشـاءَ اللهُ ﴾ وەئـەش فەرموێ:

﴿ وَلَكِنَ أَكْثَرِهُمْ يَجْهَلُونَ ﴾ وە بەلاَم زۆر تـر لـەو بـێ باوەرانـە نـازانن ئەگـەر ئـەو بەڵگانە بێن بۆ لایان باوەر ناهێنن هەرچـەندە سـوێندی سـەخت ئـەخۆن بـاوەرِ ئـەهێنین، هۆشیان نایەتەوە بەخۆیانەوە کە خۆیان تاقمێکی یـاخی و لـەسنوور دەرچـوون وئـەقڵ و پاکی دەروون سوودی نابێ لـەگەڵ ئەوان و ئاین و مرۆڤایەتی کار ناکاتە سـەریان، هیـچ شتێ سەریان پێ شـۆر ناکـا مەگـەر زۆر وزاڵبـون بەسـەریانا: کەواتـە گفتوگـۆ کـردن لـەگەڵیان بەزمانی زانست و مرۆڤایەتی هەڵەیەو بێ سوودە .

﴿ وَكَذلِكَ جَعَلْنا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُواً شَياطِيْنَ الأِنْسِ وَالْجِنِ ﴾ وە هەر بەو جۆرەی ئێمەی گێراومانە بۆ تۆ بت پەرستان بە دوژمن گێراومانە بۆ هەموو پێغەمبەرێ دوژمن لەیاخی بووان و لەسنوور دەرچوانی ئادەمیزادو جنۆکە. شەیتانی ئادەمیزاد ناسراون هەموو کەسێکە هانی ئادەمیزاد ئەدەن بۆ لای کاری پڕو وپوچ وبەرگی ڕاستی ئەکاتە بەری ئەو کارە. بەڵام جنۆکە نابینرێن و خوا ئەیانزانێ. ئێمەی باوەردار بروامان بە بوونیان هەیە، بە وێنەی فریشتەکان و بەرپرسیار نین بۆزۆر تر.

جێگەی سەر سوورمان نی‌یە دوژمنایەتی خراپەکەران بۆ پێغەمبەران و ئایین پەروەران و پیاو چاکان لەمەو بەر و ئێستاو لەمەو دواییش، چونکە بەهۆی ئەو دوژمنایەتی‌یەوە چاك وخراپ ڕاست و پوچ جوێ ئەبنەوە لەیەکتری.

پرسیار/ هەرکاتێ خوا ئەو کەسەی ئەوتۆ بێ گێرابێنی بۆپێغەمبەران دوژمنێ لە خراپە کاران هەر وەك ڕواڵەتی دەرکەوتوی ئەو ئایەتە دەفەرموێ. کە واتە بۆخوا سزای دوژمنانی پێغەمبەران ئەدات؟ دووبارە چۆن فەرمانی داوە بە پەیرەوی کردنی پێغەمبەران، دوایی چەندین دوژمن دروست بکا بۆ پێغەمبەران بۆ بەرگری کردن لەوان وهانی ئادەمیزاد بدەن بۆ باوەڕ نەکردن بە پێغەمبەران و بەپەیامەکانیان؟ .

وەڵام/ خوای مەزن پێغەمبەرانی دروست کردوە بۆئەوەی بانگی ئادەمیزاد بکەن بۆدادپەروەری و یەکێتی خواو نەهێشتنی ستەم و لابردنی بت پەرستی، ئەو شتانەی کردوون بە پیشەو مەبەستی ئەو پێغەمبەرانە، ئەو پیشەو مەبەستە خۆیان لە خۆیانا بەگوێرەی سرووشت دوژمنایەتی و زۆران بازییە لە نێوان پێغەمبەران و لە نێوان بت پەرستان و چاو برسی و بێ باوەڕاندا. کەواتە ڕەوانە کردنی پێغەمبەران هۆی دوژمنایەتی‌یە. بەڵام لەبەر ئەوەی خوای مەزن خۆی یەکەمین هۆیە بۆ ناردنی پێغەمبەران، ناردنی پێغەمبەران ئەبێتە هۆی دوژمنایەتی نێوان ڕاست وچەپ، بەو بۆنەوە گەڕاندنی ئەو دوژمنایەتی‌یە ئەدرێتە پاڵ خوای مەزن.

﴿ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلَ غُرُواً ﴾ هەندێ لەو بێ باوەڕانە گفتو گۆی درۆی ڕوکەش کراو کە دەرەوەی چاکەو ناوەرۆکی سزایە وخراپەیە ئەیان نێرن بۆلای هەندێ تر لە خۆیان بە فڕوفێڵی پوچ بە مەبەستی هاندانیان بۆکردنی کاری خراپ و بۆ دوژمنایەتی مافی ڕەوا و خاوەنەکانی، جفەیان بۆ ئەکەن بەشتێ باوەڕداران و پیاو چاکان فریو بدەن وکاری نارەوا بکەن و فێڵ کردن لەوان لە ناکاودا.

﴿ وَلَوْ شاءَ اللهُ ما فَعَلُوهُ ﴾ وە ئەگەر خوا ئارەزووی هەبوایە ئەو کارە خراپەیان نەئەکرد و دوژمنایەتی پێغەمبەرانیان نە ئەکرد و ئەو گفتوگۆ ڕوکەشانەیان نە ئەنارد بۆ یەکتری، بەلاَم خواکاری شایان لە شوێنی خۆیادا ئەنێ، چونکە خوا ئەقڵی پێ داون و کاری چاك وخراپ لە یەك جوێ ئەکەنەوە وەئەتوانن کاری چاك بۆ خۆیان بسازێنن و زۆرلەکەس ناکا بۆ هەڵبژاردنی هیچ شتێ وخۆیان بەر پرسیارن.

﴿ فَذَرْهُمْ وَما يَفْتَرُونَ ﴾ دوایی تۆواز لەوە بێباوەڕانە وشتێ بهێنە ئەوان بە بوختان شەیتان ئەیخاتە دەرونیانەوە، پێویستە تۆ فەرمانی خوا ڕابگەیەنی بەوان، پرسیارو وەلاَمو سزادانیان لەسەر ئێمەیە. بێ باوەڕان گفتوگۆی ڕوکەش ئەنێرین بۆ لای هەندێ تریان لەبەر فریودان و فێڵ کردن لەوان لەناکاوداو:

﴿ وَلِتَصْغى إِلَيْهِ أَفْئِدَةُ الذيْنَ لا يُؤْمِنُونَ ﴾ وە لەبەر ئەوەی لابکاتەوە بۆ لای ئەو گفتوگۆ ڕوکەش و پڕو پوچانەی ئەوان، دڵی کەسانێکی ئەونۆ باوەڕ نایەرن بە ڕۆژی دووایی .

﴿ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا ماهُمْ مُقْتَرِفُونَ ﴾ وە بۆئەوەی هەندێ لەوان ئەو گفتوگۆیە ڕوکەشانە و پڕوپوچانە پەسەند بکەن بۆ خۆیان وەری بگرن لەو شەیتانەوە وکاری بێ بکەن و بۆئەوە پەیدا بکەن شتێ ئەوبێ باوەڕانە کردویانە لە گوناهو کاری خراپ ونارەوا. کورتە وپوختەی مانای ئەو ئایەتانە: بەڕاستی شەیتانەکان ئەڕازێننەوە و ڕوکەش ئەکەن گفتوگۆی پڕوپوچ بۆ ئەوەی ئادەمیزادی ئەقڵ لاوازی پێ ئەخلەتێنن هەتا ئاورێ

بدەنەوە بۆلای وپەسەندی بکەن وشتێ ئەوان کردویانە لەگوناە ئەمانیش بیکەن، هاوبەش دانەران ووتیان بە پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾: تۆ دابنێ بۆ ئێمە ناوبژیکەرێ لە زاناکانی جوەکان یا لە قەشەی گاورەکان، بۆ ئەوەی هەواڵ بدەن بە ئێمە بەو شتەی لە نامەکانی ئەواندا هەیە لە بارەی پێغەمبەریەتی تۆوە، بۆ ئەو مەبەستە خوا فەرمانیدا بە پێغەمبەرو فەرموی:

أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَٰبَ مُفَصَّلًا ۚ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١١٤﴾ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿١١٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١١٧﴾

﴿ أَفَغَيْرَ اللهِ أَبْتَغِي حَكَماً وهو الذي أَنْزَلَ إِلَيْكُمْ الْكِتابَ مُفَصَّلاً ﴾ ئایا من جگەی خوادا وابکەم بەناوبژی کە رێ لە نێوان من و ئێوە داکەشتی ڕاست و پوچ لە یەك جوێ بکاتەوە و خوا کەسێکی ئەو تۆیە ناردیەتیە خوارەوە بۆ لای ئێوە ئەو نامەیە کە قورئانە بە هۆی جبرەئیلەوە بە درێژی و بەشی کراوەیی بۆ هەموشتێ و چاك وخراپی جوێ کردوەتەوە. یانێ پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرمویبە هاوبەش دانەران: ئێوە دا وا لەمن ئەکەن

زۆر بە توندی‌کە کارە پەك خەرەکان بۆ ئێـوە بـهێنم، داوای چـەندین داخـوازی تـرم لیّ ئەکەن ناوەشێتەوە لە من کە لە سنووری فـەرمانیّ دەرچـم، حـوا ناردویەتیـە خـوارەوە بۆسەر ئێوە قورئان وهەمو شتیّ پێویستی بۆ ژیانی ئێوە لەودا هەیە لە ناسینی خوا و کـارە ڕەواکان وکارە قەدەغە کراوەکان ئێمەی باوەڕدار پێویستیمان بە جگەی قورئـان نی‌یـە وهەوالّ دەرە بە زۆرتر لە کارە نهێنیەکان و جگەی ئـەوانیش، ئێـوە کـە داوای زۆر تـر بکەن جگە لە دوژمنایەتی و لـە خوّبایی بون هیچ شتێکی تر نیە .

﴿ وَالذيْنَ أتَيْناهُمْ الْكِتابَ يَعْلَمُونَ أنَّهُ مُنَزَلٌ مِنْ رِبكَ بِالْحَقِ فَلا تَكُونَنَ مِنَ الْمُحْـتَرِمِينَ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ ئێمە بەخشیومانە بەوان زانیاری تەورات لـە عەبدولاّی کوڕی سـەلام و هاوڕێکانی ئەزانن کە بە ڕاستی قورئان نێرراوەتە خوارەوە لـە لایەن پەروەردەکەری توّو بە ڕاستی کاری پوچی تێدا نی‌یە، دوایی تۆ مەبە لـەو کەسانەی گومانیان هەبیّ لـە نـاردنی قورئان بە ڕاستی و بە بیّ گومان. ئێمە بڕوامان هەیە کـە پێغەمبـەری خـوا پـارێزراوە لـە گومـان. بـەلاّم خـوای مـەزن ڕوی ئـەو ئایەتـەی کردوەتـە لای پێغەمبـــەر ﴿ ﷺ﴾ زۆر ڕاستیشە، چونکە ڕو تیّ‌کردن لـە لایەن خوای مەزنەوە بۆ لای بچوکی خۆی زۆر جێگەی شانازیە بۆ ئەو بچوکە، ئەوە لـەلایەك، لـە لایەکی ترەوە ئـەوڕو تێکردنـە هێمایـە بـۆ لای جگەی پێغەمەر﴿ ﷺ﴾ .

﴿ وَتَمَتْ كَلِمَةُ رَبكَ صِدْقاً وَعَدْلاً ﴾ وە فـەرمودەی پـەروەردە کـەری تـۆ تـەواوەو ڕاستە لـە هەوالّدانیداو لە داد پەروەری ئەودا لـە هەمو فەرمانەکانیداو لـەو بەلّێنەیدا کـە ئاینی ئیسلام سەر ئەخات بەسـەر هـەمو ئـایین و بـیرو بـاوەڕانی تـردا، هەرچـەندە بـت پەرستان لایان ناخۆش بێت .

﴿ لا مُبَدِلَ لِكَلِماتِهِ ﴾ هیچ گۆڕان کەریّ بۆ فـەرمودەکانی خـوای پـەروەردگار نیـە، چونکـە ڕاسـتن و دادپـەروەرن و گەیشـتونەتە ئەوپـەڕی ڕاســـت ویـّژی و ئەوپـــەڕی دادپەروەری و هەر شتیّ بەو جۆرە نەبیّ لـە ڕاستیەوە دورە. بە هیچ شتیّ ناوتریّ ڕاست و دادپەروەر هەتا بنچینەی لـەسەر ڕاستی دانەنرابیّ، هەر شتیّ بەو جۆرە بیّ گۆڕانی بۆ نیـە.

ئەو ڕستەیە گەورەترین بەڵگەیە بۆ ڕاستی و دروستی و هەواڵدان بە کارە نادیاری نەهاتوەکان، چونکە هەزارو چوار سەدو بیست ساڵە زۆر کەس نەیتوانیوە کە قورئان بگۆڕیٚ و تاکە سورەتێکی کەمی‌دانیٚ، لەگەڵ ئەوەشدا دوژمنانی قورئان هەوڵی زۆریان داوە بۆ ئەو مەبەستە، ئەگەر بوختانێکیان کردبیٚ لە گۆڕانیدا کوتو پڕ ئابڕویان چوە. بەلاٚم گاوررو جوەکان ئینجیل و تەوراتیان گۆڕی و دەستکاریان کردوە، ئەوەی بە هەوەسی خۆیان نەبوبیٚ گۆڕیویانە.

﴿ وَهُوَ السَمِيعُ العَلِيمُ ﴾ وە خوا ی پەروەردگار گوفتاری هەمو کەسیٚ دەبیسیٚ، هەمو نهێنی بونەوەران ئەزانیٚ هەر کەسیٚ باوەڕی بە هەر ئایین و بە هەر بیرو باوەڕی هێنا، ئەو کەسە باوەڕ بە ڕاستی ئەو ئایین و بیرو باوەڕە ئەهێنیٚ لە هەمو ڕویێکەوە و بە کوێرانە هەوڵی بۆ ئەدا و وا ئەزانیٚ جگەی ئەو ئایین و بیروباوەڕەی خۆی پەژارەو گومانە ... بەلاٚم هەر کاتیٚ هەمو بیرو باوەڕیٚ بژمێرین و بە راوردیان بکەین بە بەراورد و ترازوی خوای مەزن لەو ئەنجامەوە دەرئەچیٚ کە بەراستی زۆربەی ئادەمیزاد دوای گومانی هەڵەو گۆترەی درۆینە کەوتون بۆیە خوای مەزن فەرمان ئەدا بە پێغەمەرو ئەفەرمویێ:

﴿ وَإِنْ تُطِعْ أَكْثَرَ مَنْ فِي الأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَنْ سَبِيلِ اللهِ ﴾ وە ئەگەر تۆ پەیڕەوی و فەرمانبەر داری زۆر ترین کەسانیٚ بیٚ لە ڕوی زەویدا کە باوەڕیان بە خواو بە ئایینی خوا نەبیٚ ئەوان تۆ لائەدەن لە ڕێگەی ئاینی خوا .

﴿ إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَنَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَخْرُصُونَ ﴾ ئەو تاقمە زۆرانە دوای هیچ شتیٚ نەکەوتون لە گفتو گۆیانا لەگەڵ پێغەمەر مەگەر هەر دوای گومانو گۆترە کاری کەوتون و وا ئەزانن لاسایی کردنەوەی باوکەکانیان دروستەو ئەو کەسانە هیچ شتیٚ نین مەگەر درۆ بکەن و بە گۆترە و بەبوختان بیدەن بە سەر خوادا لە بە ڕەوادانانی ناڕواکان بیدەنە پاڵ خوای مەزن هاوبەش و کوڕ و کچ، بۆیە خوای مەزن فەرمانی دا بە پێغەمەری خۆی گویٚ نەگریٚ لە وتەی نالەباری ئادەمیزاد و نەکەوێتە دوای لاسایی و بەزم و باویان، پێویستە لەسەری دوای ئەو شتە بکەوێ لای خواوە بۆی هاتوە، چونکە هەر ئەو ڕێگەی

ڕاستی و ڕانموییە هەر کاتێ زانیمان زۆرترین کەس لەسەر هەڵەن لەو بیرو باوەڕو ئاینەداو ئەپەرستن پێویستە نرخیان بۆ دانەنرێ بە وتەو بە فەرمانیانەوە و لامان وا نەبێ ئەوەیان ڕاستەو ئەمەیان پوچە ئەبێ بزانین فەرمان دان بۆ هەمو شتێ هەر بۆ خوایە بە تەنها لەو شتانەدا ڕونیان دەکاتەوە لە بنچینەکانی ئاین و لە یاساکانی قورئان ئەوەیش مەبەستە لە فەرمودەیە کە خوا ئەفەموێ:

﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ مَنْ يُضِلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِيْنَ ﴾ بە ڕاستی پەروەردەکەری تۆ هەر ئەو زاناترە بەو کەسەی ئادەمیزاد لائەدا لە ڕێگەی ئاینی خۆی زاناترە لە تۆو لە هەمو بونەوەران و، هەر خوا زانا ترە بەو کەسانە ڕانمویی وەرئەگرن و دوای ڕاستی ئەکەون. دروست کراوانی خۆی لاپەنهان نیە، هەردو تاقمەکان باش ئەناسێ و بە شایستەی کردەوەی خۆیان پاداشت و سزایان ئەداتێ و وەری ئەگرن.

عەرەبەکان بەر لە هاتنی ئاینی ئیسلام گۆشتی مردارۆبویان ئەخوارد، ناوی بتەکانی خۆیانیان ئەبرد لە کاتی سەر برینی کوشتارەکانیان، دوایی خوای مەزن ئەو شتانەی لەسەر موسوڵمانان قەدەغە کرد. بۆ ڕەوابون و خواردنی سەربڕاوەکانیان مەرجە ناوی خوا ببەن لە سەریان بە تەنها، بۆی ڕون کردنەوە ئەو شتەی مەبەستە و پێویستە کە خوا ئەفەرموێ:

فَكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِآيَاتِهِ مُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِالْمُعْتَدِينَ ﴿١١٩﴾ وَذَرُوا ظَاهِرَ الْإِثْمِ وَبَاطِنَهُ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَكْسِبُونَ الْإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا يَقْتَرِفُونَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ

ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَـٰدِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾

﴿ فَكُلُوا مِما ذُكِرَ إسْمِ الله عَلَيْهِ إنْ كُنْتُمْ بِأياتِهِ مُؤْمِنونَ ﴾ دوایی ئێوە بخۆن لە شتێ ناوی خواو یادی خوا باس کرابێ لە سەری ئەو شتە لە کاتی سەر بڕیندا. ئەگەر ئێوە بڕواتان بە ئایەتەکانی قورئان هەیە بە ڕەوا کردن و قەدەغە کردنیان بۆ خواردەمەنیەکان.

پرسیار/ بە ڕاستی دروست بونی خواردن لەو سەربڕاوانەی ئەوتۆ ناوی خوای لەسەر برابێ نە بەستراوە بە باوەڕ هێنان بەخواو بە ئایەتەکانی قورئانەوە، چونکە بۆ بێ باوەڕانیش دروستە لێی بخۆن هەر وەك باوەڕ هێنان بە خوا پەیوەستە بە سەر بڕاوێ ناوی خوای لەسەر برابێ. چونکە باوەڕ دار هەر باوەڕدارە با لەو گۆشتەیش نەخوا، دەرکەوتوی مانای ئایەتەکە وا ئاماژە ئەکا کە باوەڕهێنان مەرجە بۆ ڕەوا بونی خواردن لەو سەر بڕاوانە، چونکە مانای ئایەتەکە وایە ئێوە بخۆن لەو سەر بڕاوانە ئەگەر ئێوە باوەڕدارن.

وەڵام/ بەڕاستی فەرمودەی خوا ﴿ إنْ كُنْتُمْ بِأياتِهِ مؤمنون ﴾ مەرج نیە بۆ ڕەوا بونی خواردن لەو سەر بڕاوەی ناوی خوای لەسەر برابێ. بەڵام ئاماژەیە بۆ لای ئەوە کەسێ ناوی جگەی خوا ببا لە کاتی سەربڕیندا بەڕاستی ئەو کەسە هاوبەشی گێڕاوە بۆ خوا، چونکە ئەو کەسە ڕوی کردوە لەو کارەی خۆیدا بۆ لای جگە لە خوا، بە وێنەی شتێ بت پەرستانی عەرەب دەیکەن، بەڕاستی کەسێ ناوی خوا ببا لەسەر سەربڕاوێ خۆی بەڕاستی باوەڕی بە خوا هێناوەو دوری خستۆتەوە لە خوا هاوبەش بۆی، چونکە بە تەنها ڕوی بۆ لای خوا کردوە.

هەندێ لە موسوڵمانان خۆیان قەدەغە ئەکرد بۆ خواردنی سەربڕاوی ناوی خوا ی لەسەر برابێ لەبەر گومانێ کەوتبوە دەرونیان: چۆن دروستە بۆ ئادەمیزاد بە دەستی خۆی گیاندارێك سەر ببڕێت و ناوی خوای لەسەر بباو دوایی بیخوا، کەچی دروست نەبێ کە

بخوا گیانداریّ خوامراَلدبیّتی بە کاتی مردنی خۆی، خوای مـەزن بـە هەرِەشـەوە وەلاّمـی دانەوەو فەرموی:

﴿ وَمالَكُمْ أنْ لا تَأكُلُوا مِمّا ذُكِرَ إسْمُ اللهِ عَلَيهِ ﴾ وە چ سودیّ بۆ ئیّوە هەیە کـە ئیّـوە نەخۆن لە شتیّ ناوی خوای لەسەر برابیّ و خۆتانی لیّ قەدەغە بکەن ؟

﴿ وَقَدْ فَصَلَ لَكُمْ مـا حَـرَمَ عَلَيْكُـمْ إلاّ مـا أضْطـررتم إلَيْـهِ ﴾ وە بەرِاسـتی خـوا رِونـی کردوەتەوە بۆ ئیّوە شتیّ خوا قەدەغەی کردوە لەسەر ئیّوە بە دریّـژی مەگـەر شـتیّ ئیّـوە ناچار بکا بۆ لای خواردنی ئەو شتەی قەدەغە کراوە لەسەرتان لـــە مـردارۆ بوەکـان لــە کاتی گرانی و برسیّتی بەو مەرجەی بۆی دانراوە، رِون کردنەوەی ئەو شتانەی خواردنیان قەدەغەیە لە ئایەتی (١٤٥) ی ئەم سورەتەو لە ئایەتی (١٧٣) ی سـورەتی ئەلبەقـەرە دا رِون کراوەتەوە.

﴿ وَإنْ كَثِرينَ لَيُضِلُونَ بِأهْوائِهِمْ بِغَيْرِ عَلِيْمِ ﴾ بە رِاستی زۆر کەس لە ئادەمیزاد خۆیان و پەیرِەوەکانی خۆیان لائەدەن لە رِیّگەی رِاست بەهۆی ئارەزو و هەوەسی خۆیان بـە بـیّ زانست و بە بیّ بەلّگە، یانی خواردەمەنی رِەوا ئەکەن و قەدەغەشی ئەکەن بە کویّرانە بـە گویّرەی هەوەسی خۆیان و بە بیّ زانست، بە ویّنەی رِوا کردنی مردارۆ بو بۆ باشـتر لــەو باسە تیّبگەین تەماشای ئایەتی ( ٣) ی سورەتی ئەلمائیدە بکەن .

﴿ إنَّ ربَكَ هُوَ أعْلَمُ بِالْمُعْتَدِيْنَ ﴾ بە رِاستی پەروەردە کەری تۆ هــەر ئـەو زانـاترە بـە کەسانیّ لە سنور دەرئەچن ە رِەوا کردن و قەدەغە کردن بە گویّرەی هەوەس و ئارەزوی خۆیان. خوای مەزن بە شتیّ سزایان بە شتیّ شایستە بن بۆی.

﴿ وَذَرُوا ظاهِرَ الأثْمَ وَباطِنَهُ ﴾ وە ئیّوە واز بهیّنن لە شتیّ کە ئەبیّتە هۆی گونـاهو بـیّ فەرمانی هەمویان بە ئاشکراو بە نهیّنی لە کەمی و لەزۆری، لە داویّن پیسی بـە ئاشـکراو کرتنی دۆستی نارِەوا بەنهیّنی، لە بەکارهیّنانی دەرمانی بیّ هـۆش کـردن و فیّـلّ سـازان و دلّپیسی و دوبەرەکی .

﴿ إنّ الذيْنَ يَلْسِبُونَ الأثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِما كانُوا يَقْتَرِفُونَ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ پەیدا ئەکەن گوناه لە جیهان دا بە ئاشکرا و بە نهێنی لەمەو دوا پاداشتیان ئەدرێتەوە بە هۆی شتێ ئەیکەن لە پەیڕەوی کردنی ئارەزوی بێ بەڵگەو، بە هەوانتە ناڕوا بە بێ پرسیارو تۆڵە پاش ئەوانەی ڕابواردن کە خوای مەزن ڕەوای کردن لەو شتانەی ناوی خوایان لە سەر ببرێ لە کاتی سەر بڕیندا، قەدەغەی ئەکا شتێ ناوی خوا نەبرێ و ئەفەرموێ:

﴿ وَلا تَأكُلُوا مِمّا لَمْ يُذكِرَ إسْمُ اللهِ عَلَيْهِ وَإنَّهُ لَفِسْقٌ ﴾ وە ئێوە مەخۆن لە شتێ ناوی خوای لەسەر نەبراوە لە کاتی سەر بڕیندا، بەڕاستی خواردنی ئەو شتەی ناوی خوای لەسەر نەبرابێ لە سنور دەرچونەو گوناهە. زانایان بۆ مانا کردنی ئەم ئایەتە لە بارەی ناو بردنی ناوی خوا لەسەر سەربڕاوەکان بیریان جیاوازە بەم جۆرەی خوارەوە:

١- کۆمەڵی زانایان وەکو ئیبنو سیرین و شەعبی وفەخرەدینی ڕازی لایان وایە ئەو سەربڕاوەی ناوی خوای لەسەر نەبرێ خواردنی قەدەغەیە ئیتر بەدەستیانقنست بێ یان لە بیری نەبێ ناوی خوا ببا.

٢- لای حەنەفیەکان قەدەغەیە خواردنی ئەگەر بەدەستیانقەسبێ ناوی لەسەر نەبرابێ ڕەوایە ئەگەر لە بیری نەما.

٣- بە لای شافیعیەکانەوە ئەو سەر براوەی ناوی خوای لەسەر نەبرابێ ڕەوایە، ئیتر بە دەستیان قەسبێ یا لە بیری چوبێتەوە بەلاّم بە گوێرەی فەرمودەی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ چاك وایە ناوی ببرێ لەسەری.

٤- بە لای هەمو زانایانەوە ئەو کەسەی گۆشتی سەر براوی موسوڵمانێ بخوات ناوی خوای لەسەر نەبردبێ بە لادەر لە سنوری یاسا ناژمێررێ.

﴿ وَإنْ الشَياطِنَ لَيُوحُونَ إلى أوْلِيائِهِمْ لِيُجادِلُوكُمْ ﴾ وە بەڕاستی شەیتانەکانی ئادەیزاد دو دڵی و گومان ئەنێرن و ئەیخەنە دەرونی دۆستەکانی خۆیان لەبەر ئەوەی دوژمنایەتی

ئێوەی پێ بکەن بە گفتو گۆی خۆیان و ئەڵێن: ئێوە شتێ ئەخۆن خۆتان بە دەستی خۆتان دەیکوژن کەچی ئەوەی خوا ئەی کوژێ نایخۆن. مەبست لەو شەیتانانە نێرە یاخیەکانی ئادەمیزادن لەو کەسانەی ڕوکەش و بۆیاخی ڕاستیەکان ئەکەن بە بۆیەی پیس و خراپ، بۆ نمونە: هەندێ لە هاوبەش دانەران ئەیانوت بە پەیڕەوانی خۆیان: پرسیار لە هاوڕێکانی موحەمەد بکەن چۆن گۆشتی گیانداری ئەخۆن خۆتان ئەیکوژن و سەری ئەبڕن بە دەستی خۆتان، گیانەوەرێ ناخۆن خوا بیکوژێ بە کاتی مردنی خۆی، لەگەڵ ئەوەشدا کوژراوی خوا چاکترە بۆ خواردن لە کوژراوی ئێوە، دوای خوای مەزن بەو موسوڵمانە لاوازانەی فەرمو:

﴿ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ أَنَكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴾ وە ئەگەر ئێوەی باوەڕدار پەیڕەوەی ئەو بێ باوەڕانە بکەن بۆ خواردنی گۆشتی مردارەوە بو بە ڕاستی ئێوە لە هاوبەش دانەرانن ئەگەر ناچاری پاڵتان پێوە نەنێ. یانی ئەو کەسانە گوێ بگرن لە هاوبەش دانەران و بە ڕەوای بزانن خواردنی مردارۆ بو وەك هاوبەش دانەرانن، ئەو فەرمان دانە بە تەنها پەیوەندی بە گۆشتی مردارۆ بو نیە، بەڵکو هەر کەسێ بڕوای بە دەستوری ئیسلام نەبێ و ئاگاداریش بێ بێگومان ئەو کەسە بێ باوەڕە، بەبێ جیاوازی ئیتر گۆشتی مردارۆ بو بێ یانە. خوای مەزن لە دوای ئەو باسانەی پێشو وێنەیە لێ ئەدا بۆ بەراورد کردن لە نێوان باوەڕ داران و بێ باوەڕان کە باوەڕ داران وەك زیندوان و بێ باوەڕان وەك مردوان و ئەفەرموێ:

أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِى كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَٰبِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا۟ فِيهَا ۖ وَمَا

يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿١٢٣﴾ وَإِذَا جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ قَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَآ أُوتِيَ رُسُلُ ٱللَّهِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُواْ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا كَانُواْ يَمْكُرُونَ ﴿١٢٤﴾

﴿ أَوْ مَنْ كانَ مَيْتاً فَأَحْيَيْناهُ وَجَعَلْنا لَهُ نُوراً يَمْشي بِهِ في الناسِ ﴾ ئایاکەسێ مردبێ بە هۆی بێ باوەڕی یا بە هۆی نەزانیەوە ڕێگەی لێ ون بوبێ، دوایی ئێمە ئەو کەسە زیندو بکەینەوە بە ئیسلام بونی یا بە زانست و ڕانموییی بۆ لای ڕێگەی ڕاست بە وێنەی عەماری کوڕی یاسر و ئێمە دابێتمان بەو کەسە ڕوناکیە بە هۆی ئەو ڕوناکیە وە بڕوا بە ناو ئادەمیزادا ڕاست وچەوتی پێ جیا بکاتەوە، ئایا ئەو کەسە بەو جۆرە بێ ؟

﴿ كَمَنْ مَثَلَهُ فِي الظُلُما لَيْسَ نَجارجٍ مِنْها ﴾ وەك کەسێکە وێنەی ئەو کەسە لە نێو چەندین تاریکی دا بێ دەرنەچێ لە نێویاناو نەیەتە دەرەوە، وەك ئەبو جەهل، بێگومان ئەو دو کەسانە وێنەی یەك نین.

خوای مەزن بەو ڕستانەی پێشو وێنەی لێداوە بۆ بەرانبەر کردنی نێوان باوەڕداران و بێ باوەڕان. زۆر ڕون و ئاشکرایە بەرانبەری کردنی ئەو دو کەسە بە بێ جیاوازی وەك بەرانبەری کردنی نێوان مردو زیندو وایە، وێنەی بەرانبەری کردنیشە لە نێوان ڕوناکی و تاریکیدا. یانێ ئەو کەسە باوەڕی هێناوە وەك زیندو کرابێتەوە سەر لە نوێ گیانی تری کرابێتەوە بە بەردا. باوەڕەکەیشی ڕوناکیە کە ئەچێ بە نێو ئادەمیزادا بە هۆی ئەو ڕوناکیەوە لە ژیانی ڕۆژانەیدا بە چاوی ڕونەوە لە کارو فەرمانی خۆیا، بێ باوەڕیش وەك مردو وایە کە لەسەر بێ باوەڕی و هاوبەش داناندا ئەمێنێتەوە، وێنەی ئەو کەسە وەك کەسێکە تەپاوتل بکا لە نێو چەندین تاریکی دا ئەچێ بە ڕێگەدا بەکوێرانەو توشی چاکە نەبێ لە ژیانیدا و لە ماوەی تەمەنیدا.

پرسیار/ بە ڕاستی ئەو ئایەتە باوەڕهێنانی بە زیندو بونــەوە دا نـاوە، بـێ بـاوەڕی وەك مردن داناوە، کەچی ئەبینرێ بێ باوەڕان و بێ ئایینان لەم کاتەو لە سەردەمی ئێمە سامان و خۆشیان زۆر ترە لە باوەڕ داران و خوا پەرستان ؟

وەڵام/ مەبەست لە زیندویەتی ئەو ئایەتەدا ئەوە نیە کە ئادەمیزاد بە خۆشــی و ســامان داری کات ببەنە سەرو خواردمەنی پاك و بە نرخ بخۆن و بەرگی گران مایە بکەنــە بـەرو شلەمەنی بەتام بخۆنەوە، ئەوەی ڕاستی بێ خۆشیو ڕابـواردن نەبەســتراوە بـە تایبـەتی بـە یەکێ لـە باوەڕو بێباوەڕی، ئەگینا ئەبوایە باوەڕداران هەمویان لە ڕۆئاواو ڕۆژهـەڵاتا وەك یەك وابونایە لـە شارستانیو ڕابواردنو پێشکەوتن و دواکەوتن و ســامانداری و هـەژاری، هـەروەها بێبـاوەڕانیش وەك یـەك وابونایـە لـەو شـتانەدا، کـەچی هـەردولایان هەیانــە ساماندارن، هەیانە هەژارن، بە بێ گومان ڕابواردن و ســامان نەبەســتراون بـە بـاوەڕو بـە بێباوەڕیەوە. بەڵکو چەندین هویە هەن بۆیان جگەی باوەڕو بێباوەڕی. بــەڵکو مەبســت لە زیندویەتی لەو ئایەتەدا باوەڕ هێنان و هەستی ئایینە کە پاڵ بنێ بە خاوەنەکەیانــەوە بـە هەڵسان بۆ چاکە کردن لە بەر چاکیەتی و واز لــە خراپـە کـردن بـهێنێ لەبـەر ئـەوەی خراپە.

ئەگەر ئادەمیزاد هیــچ پرســیارێ لــەوان نـەکرێ بـە ڕاسـتی هـەمو دەسـتورو یاسـاو گفتوگۆیێ بێ هودەو بێ ماناو بێ ناوەرۆك و بێ پەیڕەو ئەبن، هەر کاتێ ئێمـە سـەلماندمان ئادەمیزاد بەرپرسیارن و بە بەرەڵایی کات نەبەنە سەر، بە بێگومــان ئـەبێ بیشـزانین ئـەو پرسیارەیان لێ ئەکرێ لە بەردەم کەسێکا کە هەرگیز پرسیاری لێ ناکرێ، ئەو کەسە کــە هەر خوایە بە تەنها، هەر کەسێ باوەڕی بەبونی پرسیارکەرێکی باڵاتری لــە هـەمو کـەس نەبێ کە ئەو پرسیارکەر بێ بە تەنــها و پرســیار لێکـراو نـەبێ، ئـەو کەسـە هەست بـە لێپرسراوی ناکا، بنچینەیەکیان بۆ دانانرێ ، ئەبێ بزانین کە هەرگیز نەبینراوە پرسیارکەرو پرسیارلێ کراو نەبوبن و بێ بنچینە بن، هەر کەسێ بڕوای بەبەرپرســیاری نـەبێ بێگومـان باوەڕیشی بە ژیان و بە ئاسودەیی کۆمەڵایەتی نیــە. ئەگـەر کەســێ پرسـیار بکـا و بڵــێ: ئادەمیزاد پرسیاری لێ ئەکرێ. بەڵام پێویست ناکا کە هەر خوا بـــێ، ئـادەمیزاد خۆیـان

ئەتوانن لیژنەیەك هەلبژێرن لە خۆیان بۆ ئەوە هەمو كەس لەبەردەم ئەو لیژنەیەدا پرسیاری لیٚ ئەكریٚ، ئێمەش لە سەرەی خۆمانا پرسیار لەو كەسە ئەكەین: ئەگەر ئەو لیژنەیە كەوتنە هەلەوە چ كەسیٚ پرسیاریان لیٚ‌ئەكا، ئەگەر لە وەلامدا بلیٚ:

پرسیار/ كە ویژدانی خۆیانە، ئێمەش وەلامی ئەدەینەوە: ئەو ویژدانە نابینریٚ ودەرناكەویٚ بۆ هیچ كەسیٚ هەتا جێگەی متمانە بیٚ، ویژدان تەنها بۆ لیژنەیەنیەو بەشی هەموو كەسێكەو ئادەمیزاد بە گشتی خۆیان بە خاوەن ویژدان دەزانن، ئەو لیژنەیە وازی لیٚ بهێنریٚ و پرسیاریان لیٚ‌نەكریٚ ؟ جگەی ئەوان گیرۆدە بن بە هۆی ویژدانەوە. كەواتە بۆمان دەركەوت پرسیار كەریٚ كە پرسیاری لیٚ نەكریٚ هەر خوایە بەتەنهاو بەس، ڕون بویەوە بۆ ئادەمیزادی ژیر هەر كەسیٚ باوەڕی بە خوا هێنا و خۆی بەستەوە بە دەستورو یاسا و فەرمانی خوای كەورەوە بێگومان بەرچاوی ڕونەو بە تاریكی ناچیٚ بە ڕێوە لە بیرو باوەڕو ڕەوشتی خۆیا، ئەگەر باوەڕی نەهێنا وێنەی كەسێكی كوێر بیٚ و بە تاریكی دا بڕواو ڕزگاری نەبیٚ لەو تاریكیە.

﴿ كَذٰلِكَ زُيِنَ لِلْكافِرِيْنَ ماكانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ هەر وەك ڕازێنراوەتەوە بۆ باوەڕداران باوەڕ هێنانیان، ڕازێنراوەتەوە بۆ بیٚ‌باوەڕانیش شتیٚ ئەیكەن وێنەی بت پەرستن. بەلام كردەوەی باوەڕداران لە ڕاستیەوە هەلقولاوە، بە پێچەوانەی ڕازێنراوی بیٚ باوەڕان بیٚ بنچینەو گۆترەكارین.

﴿ وَكَذٰلِكَ جِعلْنا فِي كُلِ قَرْيَةِ أكابِرَ مُجْرِمِها لَيِمكُرُوا فِيها ﴾ وە هەر بەو جۆرەی ئێمە دروستمان كرد لە مەكەدا چەندین پیاوانی تاوانبار لەناویدا، ئێمە هەر بەو جۆرە دروست دەكەین لە هەمو گوندو شارێكا پیاوانی تاوانبار لەو گوندەدا، لە بەر ئەوەی ئەو سەرۆكە تاوانبارانە بسازێنن فێلٚ و ستەم و سوێندی بە درۆ خواردن نرخ دانان بۆ شتی پرو پوچ لە بەر مانەوەی سەرۆكایەتی خراپی خۆیان، بەدژایەتی كردنی چاكەكەران و دادپەروەران. مەبەست لە گوند لێرەدا هەمو كۆمەلٚگایە كەم بن یا زۆر. یانی چۆن لەم كۆمەلٚگایەی تۆدا موحەمەد سەرۆكی تاوانباران هەن فێلٚ و دژایەتی پەیدا ئەكەن بۆ ئایینی خوای مەزن،

هەر وایش پەیدا بوە لە کۆمەڵگای پێشوەکانداو لەمەو پاشیش چەند سەرۆك و كار بەدەستی تاوانبارو فێڵباز ناکۆکی ئەسازێنن بۆ گەلانی دوایی و دژی ئایین و ڕاستی. ئەبێ بزانین بە ڕونی و ئاشکرایی نەخۆشی کوشندە بۆ ئادەمیزاد سەرۆك و گەورە پیاوانی نێو گەلانن هەر ئەوانن فێڵ و تەڵەکەو ڕەوشتی نالەبارو داوێن پیسی و ڕوتی ژنان و ئامادە کردنی جێگەی داوێن پیسی و خواردنەوەی مەی و قومار کردن بلاو ئەکەنەوە. بەرتیل خواردن و تالان کردن و دزی و پشت گرتنی تاوانباران ئەسازێنن، خۆیان ئەیان کەن و دانیشتوانی تریش چاو لەوان ئەکەن، بگرە ئەو گەورە پیاوانە هانی دانیشتوان ئەدەن بۆ بلاوکردنەوەی ئەو ڕەوشتە خراپانە و فێڵ کردن لە دانیشتوان .

﴿ وَما يَمْكُرُونَ إلاّ بِأنْفُسِهِمْ وَما يَشْعُرُونَ ﴾ وە لە ناو نابا ئەو فێڵەی ئەوان مەگەر هەر خۆیان لەناو ئەباو هەستی پێ ناکەن و نایزانن کە تۆڵەی فێڵەکانیان بۆ خۆیان ئەگەڕێتەوە .

پرسیار/ ڕواڵەتی دەرکەوتوی مانای ئەو ئایەتەی پێشومان پیشان ئەدا هەر خوای گەورەیە، گەورە پیاوانی گەڕاندە کە تاوان و فێڵ بەکار بهێنن بەرانبەر بەو کەسانە کە خاوەنی ڕاستین. لەگەڵ ئەوەیشدا زانراوە کە خوا فێڵ و تاوان کردنی قەدەغە کردوە و سزا ئەدا لەسەر کردنیان. دوایی مانای ئەو ئایەتە چۆن ئەبێ چۆن بکرێ ؟

وەڵام/ مەبەست لەو پەیوەست و پاڵدانی ئەو شتە بۆ لای خوای مەزن ئاماژە کردنە بۆ لای ئەوەی ویست و ئارەزوی خوا فەرمانی داوە بەوەی دەستوری کۆمەڵایەتی دانراوە لە سەر دژایەتی کردنی ڕاست کەران و دادپەروەران و پوچ خوازان و خراپەکاران بۆ یەکتری، بۆ دژایەتی نێوان دەسەڵاتدارانی تاوانبارو نێوان تاوان لێ کراوان، هەڵهاتن لەو دژایەتیەی نێوان ئەوان نابێ و ڕزگاری پەیدا نابێ مەگەر بەوەی تاوانباران بنە بڕ بکرێن، پێویستە ئەوەش تەواو بێ و وشەی ڕاستی بەرز بکرێتەوە لە سەر دەستی دادپەروەران و چاکە خوازان، هەرچەندە کاری خراپ گەورە درێژە بکێشێ، بەڕاستی خوا تۆماری کردوە لە نامەی خۆیا فێڵ و خراپە کردن خاوەنی خۆیان لە ناو ئەبەن، وەك خوا

ئەفەرموێ لە سورەتی ( فاتیر ) دا (( ولا یحیق المکر السیء الا باهله )) ئایەتی ( ٤٣ )، وە فێڵی خراپ کەس لە ناو نابا مەگەر هەر خاوەنەکەی خۆی .

وەلیدی کوڕی موغەیرە وتی بە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾: ئەگەر پێغەمەرایەتی ڕاست بوایە من لە تۆ چاکترو شایان ترم بۆ پێغەمەرایەتی، چونکە من لە تەمەندا لە تۆ گەورە ترم و سامانیشم زۆرترە، خوای مەزن لەو بارەوە فەرموی:

﴿ وَإذا جاءَتْهُمْ آيَةٌ قالُوا لَنْ نُؤمِنَ حَتى نُؤتى مِثْلُ ما أُوتِـى رُسُـلُ اللهِ ﴾ وە هەر کاتێ بهاتایە بۆ بێ باوەڕان و گەورە پیاوانی تاوانبارانی قورەیشیەکان ئایەتێ لە قورئانی پیرۆز و بەڵگەی دانابێ لەسەر ڕاستی پێغەمەرو ئایینی ئیسلام، ئەوبێ باوەڕانە ئەیانوت: ئێمە باوەڕ ناهێنین بەو ئایەتە و بەو بەڵگەیە هەتانە بەخشرێ بە ئێمە وێنەی ئەو شتەی بەخشراوە بە ڕەوانە کراوەکانی پێشوی خوا. زانیان لە ماناکردنی ئەو ئایەتەدا بیریان جیاوازە: (١) کەورە پیاوانی تاوانبارانی قورەیش داوایان کرد لە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ کاتێ ئێمە باوەڕ بە تۆ ئەهێنین کاری پەك خەری وەك موسا لە بچڕانی دەریا و زیندوکردنەوەی مردوان بە وێنەی عیسا بە تۆ بدرێ (٢) وتیان ئێمە باوەڕ ناهێنین هەتا نەیەتە خوارەوە بۆ سەر ئێمە سروش وەك هاتوە بە سەر پێغەمەراندا، پێشەوا فەخری ڕازی ئەفەرموێ: ئەمەیان ئێمە بە چاکی ئەزانین، چونکە خوا بە ڕێچی ئەوان ئەداتەوە و ئەفەرموێ :

﴿ اللهُ أعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رسالَتَهُ ﴾ خوا زانا ترە لە هەموکەسێ پەیامی خۆی لە چ جێگەیە دائەنێ و چ کەسێ جێگەی متمانەی خوایە و ئەیگێڕێ بە پێغەمەر، هەر خوا ئەزانێ چ کەسێ شایانە بکرێ بە پێغەمەر، بێگومان موحەمەد شایستەو بەرێز ترینی ئادەمیزادە بۆ فروستادەیی .

﴿ سَيُصِيبُ الذيْنَ الذيْنَ أجْرَمُوا صَغارٌ عِنْدَ اللهِ وَعَذابٌ شَدِيدٌ بِما كانُوا يَمْكَرُونَ ﴾ لە مەو دوا توشی کەسانێکی ئەوتۆ ئەبێ تاوانیان کردوە ڕسوایی و بێ نرخی لە خزمەت خوا دا لە ڕۆژی دواییدا وە توشیان دەبێ سزایەکی سەخت بە هۆی شتێ ئەوان کردویانە بە

فێڵ و خراپەکاری و باوەڕ بە موحەممەد نایەرن و خراپەی بۆ ئەسازێنن گیرو گرفتیان بۆ دائەنێن، ئەو بێباوەڕانە چونکە خۆیان بە گەورە دائەنا شایستەی بێئابڕویین و سزای سەختن لە ڕۆژی دواییدا. کاتێ خوای مەزن باسی باوەڕداران و بێ باوەڕانی فەرمو، دوایی بۆمانی ڕون ئەکاتەوە ئەو شتەی لەگەڵ هەر یەکە لەو دو تاقمە ئەی کات و ئەفەرموێ:

فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٢٥﴾ وَهَٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسْتَقِيمًا ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ ۞ لَهُمْ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ عِندَ رَبِّهِمْ ۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٧﴾

﴿ فَمَنْ يُرِيدَ اللهِ يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ للأيْمانِ ﴾ دوایی هەر کەسێ خوا ئارەزوی هەبێ و بیەوێ کە ڕانموی بکا بۆ لای ڕێگەی ڕاست و یاریدەی بدا بۆ لای باوەڕ هێنان خوا دڵی ئەکاتەوە و فراوانی ئەکا بۆ لای وەرگرتنی ئاینی ئیسلام، خوا گومانی شەیتان لە دڵیا ئەسڕێتەوە بە میهرەبانی خۆی. ئەو کەسە یەکێکە لەو تاقمە دڵیان بۆ باوەڕ هێنان کراوەتەوە و ئارامی گرتوە، وازی هێناوە لە سودی تایبەتی خۆی، خۆیانیان ڕزگار کردوە لە لاسایی کردنەوەی پێشوەکان و هەوەس بازی ئەوان.

﴿ وَمَنْ يُرِدْ أنَ يُضِلَهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيْقاً حَرَجَا ﴾ وە هەر کەسیێ خوا ئارەزوی هەبێ و بیەوێ کە لە ڕێگەی ڕاست لایداو ڕێگەیباوەڕهێنانی لێ ون بکا خوا سنگی ئـەو کەسـە تەنگ ئەکا زۆر بە تەنگی و دوری ئەخاتەوە لە وەرکرتنـی ڕاسـتی و بـاوەڕی تێناچێ و چاکە وەرناگرێ و ئەوپەڕی دڵی تەنگ ئەبێ، ئەو کەسـە یەکێکـە لـەو تاقمـەی دڵیـان هاتوەتە یەك و ڕوناکی تیا نەماوە لەبەر نەزانین و سودی تایبـەتی خـۆی لاسـایی بـاوك و باووباپیرانی خۆی دەکاتەوە، ترسی نەمان و لـە نـاو چونـی سـەرکردایەتی سـەرگەردانی کردوە .

﴿ كَأنَما يَصَعَدُ في السَماءِ ﴾ ئەوەندە دڵ و سنگی تەنگە وەك ئەو وایە کـە بـە ڕاسـتی ئەو زۆری لێ بکرێ بەرز بێتەوە بۆ ئاسمان و چۆلاّیی و هەناسەی دەرنەیە . یانێ ئەو کەسە چەندە لای گرانە بەرز بێتەوە بۆ لای ئاسمان و چۆلاّیـی و هەناسـەی دەرنەیـە ئـەوەندەش لای گرانە دوای ڕاستی بکەوێ و باوەڕ بهێنێ .

بۆزانین لەو ئایەتەدا خـوای مـەزن بەڵگـەو نیشانەوزانسـتی یـەکی یەکجارگـەورەی ڕوونکردوەتەوە بۆیان لەسەرپێغەمەرایەتی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بەهۆی قورئانی پیرۆەوە ئەوەیش ئەمەیـە کەهـەتا ئـادەمیزاد بەرزبێتـەوە بـەرەو ئاسمـان و بۆشـایی ولـە ڕاکشـــانی زەوی دوربکەوێتەوە هەناسە برکێی بێ ئەکەوێ وەختە دڵی شەقبێ، چونکە هـەوای بـۆ کـەم ئەبێتەوە بەجۆرێ نزیکە دڵی بپچڕێ وخوێن لەچاوەکانی و گویچچکەو وهەموو لەشیەوە بیچتە دەرێ، ئەگەرخوای مەزن پێغەمبـەری شـارەزا نـەکردبێت بـەهۆی قورئانـەوە ئـەو پێغەمبەرە نـەخویندەوارە چۆنـی زانیـوە هـەتا بـەرەوژوور بەرزبێتـەوە تـەنگی هەناسـە پەیدائەبێت .

﴿ كَذلِكَ يَجْعَلُ اللهُ الرِجْسَ عَلَى الذيْنَ لا يُؤْمِنُونَ ﴾ هەر بـەو جـۆرە دڵـی ئەوکەسـە تەنگ ئەبێت دوور ئەبێ لەڕاستی خوا سزا ئەخرێتە سەر کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕنـاهێنن و یەکێتی خوا وەرناگرن، یانی ئەو کەسانە ئەکەونە نێو دڵتەنگی بۆ وەرگرتنی ڕاسـتی هـەر وایش لەپاشەڕۆژدا توشی سزار زۆر گەورەتر و گرانتر لەو دڵتەنگیە جیهانە ئەبن وچـارە بۆ ڕاکردن ودەرچوون نادۆزنەوە و ڕسوا ئەبن .

﴿ وَهذا صِراطُ رَبِكَ مُسْتَقِيماً ﴾ وەئەوشتەی ئەوتۆ ئێمە بۆ تۆمان ڕوون کردەوە لەم سورەتە دا و جگەی ئەم سورەتە لەقورئاندا هەرئەوە ڕێگەی ڕاستی پەروەردگاری تۆیە ڕاست و دروستە و خوارو خێچی تێدا نیەو گران نیە بۆ ئەوکەسانە فەرمودەکانی خوا ئەبینن و وەریان ئەگران .

﴿ قَدْ فَصَلْنا الآياتِ لِقَوْمٍ يَذْكُرُونَ ﴾ بەڕاستی ئێمە ڕوونمان کردوەتەوە ئایەتەکانی قوۆرئان بۆ تاقمێ ئامۆژگاری وەربگرن. بەڵگەن لەڕاستی ئایینی ئیسلام و دروستی قورئان و ئایەتەکانی .

﴿ لَهُمْ دارُ السَّلام عِنْدَ رَبِهِمْ ﴾ وەهەیە بۆئەو کەسانەی ئامۆژگاری وەرئەگرن خانوی خوای خۆیان کە بەهەشتە لەخزمەت پەروەردە کەری خۆیانا، هەرکەسێ بچێتە نێو ئەو بەهەشتە توشی خراپە نابێ و خەفەتبار نابێ و خوا پشتیوانیانە، وەك ئەفەرموێ .

﴿ وَهُوَ وَلِيُهُمْ بِما كانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ وەپەروەردەکەری ئەوان کاربەدەست و یاریدەدەری ئەوانە و دۆستیانەو سەریان ئەخا بەسەر دوژمنانیاندا لە جیهاندا بەهۆی شتێ ئەیکەن لە چاکەو پەرستنی خوا .

وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ قَدِ ٱسْتَكْثَرْتُم مِّنَ ٱلْإِنسِ ۖ وَقَالَ أَوْلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلْإِنسِ رَبَّنَا ٱسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِىٓ أَجَّلْتَ لَنَا ۚ قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٢٨﴾ وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّى بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٢٩﴾ يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِى وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ

يَوْمِكُمْ هَٰذَا ۚ قَالُوا شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا ۖ وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَشَهِدُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَٰفِرِينَ ﴿١٣٠﴾ ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَٰفِلُونَ ﴿١٣١﴾ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٢﴾

﴿ وَيَوْمَ يَحْشِرْهُمْ جَمِيعاً يا مَعْشَرَ الْجِنِ قَدْ أَسْتَكْثَرْتُمْ مِنَ الأنْسِ ﴾ تۆ بیری ئەوکاتە بکەرەوە خوا کۆ ئەکاتەوە جنۆکەو ئادەمیزاد هەمویان، خوا ئەفەرموێ: ئەی کۆمەڵی جنۆکە بەڕاستی ئێوە زۆر کەستان لەئادەمیزاد لادا وەلەرێگەی ڕاست و کردونتان پەیڕەوی خۆیان.

﴿ وَقالَ أَولياؤُهُمْ مِنَ الأنْسِ رَبَنا أَسْتَمْتَعَ بَعْضُنا بِبَعْضٍ ﴾ وەدۆستی جنۆکەکان لەو ئادەمیزدانە جنۆکەکانیان کردوە بەدۆست و کاربەدەستی خۆیان و پەیڕەو بۆخۆیان ئەڵێن ئەی پەروەردە کەر ئێمە: هەندێ لە ئێمە سوودو خۆشیمان ڕابردووە لەهەندی ترمان. ئادەمیزاد پەیڕەوی جنۆکەکانیان ئەکرد بەجۆرێ جنۆکەکان وەك گەورە وابوون وسوودیان لێوەرئەگرتن و ڕێگەی خراپیان نیشان ئەدان، ئاداەمیزادیش سوودیان لەجنۆکەکان وەرگرت لە ڕازانەوەی کردەوەەی خراپ و سامانی جیهان بۆ خۆیان بەهەرشێوەیەك بێ .لەڕۆژی دووایدا هەردوویان ئەڵێن:

﴿ وَبَلَغْنا اَجَلَنا الذي أَجَلْتَ لَنا ﴾ وە ئێمە گەیشتووین بەو کاتەی ئەوتۆ، تۆ بۆ ئێمەت دیاری کردوە. کە لە یەکتری جوێ ببینەوە لەجیهاندا ، ئێمە ئیستا لەبەردەم تۆداین و بڕیار بەگوناهباری خۆمان ئەدەین .

﴿ قالَ النارُ مَثْواكُمْ خالِدِيْنَ فِيها إلاّ ما شاءَ اللهُ إنَّ رَبَكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴾ خوا ئەفەرموێ، ئاگری دۆزەخ جێگەی دانیشتنی ئێوەیە بەردەوامن لەناو ئاگردا مەگەر شتێ خوا ئارەزووی بکا بۆ گواستنەوەتان لە جێگەیەکەوە بۆلای خراپتر، لەگەرماییەوە بۆ ساردی سزاکەی خراپتربێ و ئازاری زۆرتر بێ، ئەوسزادانەیان بەئاگر فەرمانێکە چاك و خراپ دیاری ئەکاو پاداشتێکی دادپەروەرانەیە. بەڕاستی پەروەردەکەری تۆ هەموو شتێ چ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنی بۆ ئادەمیزاد وبۆ جنۆکە، ئەزانی بەهەموو کردەوەی ئەوان گەورەبن یابچووك ،پاداشتی تاوانی خۆیان وەرئەگرن .

﴿ وَكَذلِكَ نُوَلِي بَعْضَ الظالِمينَ بَعْضاً بِما كانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ وەهەر بەو جۆرەی باسمان کرد لە سوود وەرگرتنی جنۆکە و ئادەمیزاد لەیەکتری لەجیهانداو وازهێنانیان لەیەکتری لەپاشەڕۆژدا، ئێمە هەندێ لەستەمکاران ئەکەین بەسەردارو دۆستی یەکتری ، هەندێکیان زاڵ ئەکەین بەسەر هەندێکی تریان لەجیهاندا بەهۆی شتێ ئەیکەن لەبێ باوەڕی و سوود وەرگرتن لەیەکتری و لەپاشەڕۆژدا هاوبەشی یەکترین لەسزادان و تۆڵەکردنەوە لەوان .

بۆ جارێ تر خوا ڕووی فەرمودەی خۆی ئەکا بۆ لای جنۆکەو ئادامیزاد بەتاوانج و بەخەشمەوە لەڕۆژی دواییدا ئەفەرموێ:

﴿ يا مَعْشَرَ الجِنِ وَالأنْسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ يَقُصُونَ عَلَيْكُمْ أياتي ﴾ ئەی کۆمەڵی جنۆکەو ئادەمیزاد: ئایا نەهاتوە بۆلای ئێوە چەندین نێردراوی ئێمە بۆ لاتان و لەخۆتان بن بخوێننەوە بەسەر ئێوەدا ئایەتەکانی قورئانی ئێمە و هەواڵ بدەن بەو سروشەی هاتوە بۆ لایان و بەڵگەن لەسەر یەکێتی ئێمە و باوەڕکردن بە فروستاوەکانی من؟ .

﴿ وَيُنْذِرُونُكُمْ لِقاءَ يَوْمِكُمْ هذا ﴾ وەئەو نێراوانە ئێوە بترسێنن بەگەیشتن بەم ڕۆژەی ئێوە کەئەم ڕۆژەی دواییە ؟ بێگومان خوا هەموو شتێ ئەزانێ ، بەڵام بەهەڕەشەوە ئەوانەیان پێ ئەڵێ .

تێبینی : مانای دەرکەوتوی ئەو ئایەتە وامان پیشان ئەدات کە جنۆکەکان پێغەمبەریان بۆ نێردراوە لەڕەگەزی خۆیان .زانایان لەو بارەوە بیرو بۆچونیان جیاوازە : ئایەتی (٢٩) ی سورەتی (ئەلئەحقاف) بۆمانی ڕوون ئەکاتەوە کەخوای گەورە هەر لەئادەمیزاد پێغەمبەرانی ڕەوانەکردووە ،بەڵام لەجنۆکەکانیش چەند کەسێکی ناردوون بۆلای پێغەمبەران و گۆی لە فەرمودەکانی خوا بگرن وکردونی بەنوێنەری پێغەمبەران بۆ لای جنۆکەکان ،ئایەتەکانی قورئان هەندێکیان مانی هەندێ تریان ئەکەن.کەواتە چونکە ئادەمیزاد کۆبونەتەوە لەگەڵ جنۆکەکان دروستە پرسیار لەوان بکرێ بەتەنها .

﴿ قالُوا شَهِدْنا عَلَى أَنْفُسِنا ﴾ هەردوو تاقمی جنۆکەو ئادەمیزاد ئەڵێن لەوولامی فەرمودەی خوادا: ئێمە شایەتی ئەدەین لەسەرخۆمان و بریارئەدەین تاوانبارین و شایستەی سزادانین و مافی خۆمانە ئەو شایەتیە بدەین، چونکە لەو ڕۆژەدا جگەلە ڕاستی هیچ تر ناڕواتە سەر بۆ هیچ کەسێ .

﴿ وَغَرَّتْهُمُ الْحَياةُ الدُّنيا وَشَهِدُ وأعْلى أَنْفُسِهِمْ أَنَهُمْ كانُوا كافِرِيْنَ ﴾ وەفریوی ئەوکەسانەی داوە ژیان و ڕابواردنی جیهان و زیندوبونەوە و کۆبونەوەی ڕۆژی دوایی لەبیر بردونەتەوە، وەشایەتیان دا لەسەرخۆیان کە بەڕاستی ئەوان بێ باوەڕ بوون لەجیهاندا. دووپات کردنەوەی ئەو شایەتی دانە بۆ سەرکوت کردن و گەڕنەوەیە لەبێ باوەڕی و بێ فەرمانی خودا: چونکە کەسێ هەوڵی ئەوەبدا گوناهێ بکائەگەر بزانێ ناچار ئەکرێ بریاریدا بەخراپە و بێ فەرمانی خودا واز لەکردنی گوناە ئەهێنێ و پەلاماری نادا ئەگەر ئەو کەسە ژیر بێ .

﴿ ذلِكَ أَنَّ لَمْ يَكُنْ رَبُّكَ مَهْلِكَ الْقُرى بِظُلْمٍ وَأَهْلُها غافِلُونَ ﴾ ناردنی پێغەمبەران بۆلای بێ باوەران ترساندنیان بەوجۆرە لەبەرئەوە کەبەڕاستی پەروەردگاری تۆ لەناونابا دانیشتوی گوندەکان بەهۆی ستەمی دانیشتوی ئەوگوندانەوە، دانیشتوی ئەو گوندانە بێ ئاگابن و ئاگادار نەکرابن لە لایەن پێغەمبەرەکانەوە بەفەرمودەکانی خواو پێغەمبەرانیان هەتا بیانویان نەمێنێ.

یانیٚ خوا دادپەروەرە و ستەم لەکەس ناکا و سزای نادا مەگەر دوای ناردنی پیٚغەمەران و موژدەیان بداتیٚ و بیان ترسیٚنیٚ، دوایی کەوازی نەهیٚنا پیٚغەمەران هەواڵی ئەدەنیٚ بەشتیٚ توشی ئەبیٚ ئەگەر پەشیمان نەبیٚتەوە، دوایی ئەگەر بەردەوام مایەوە لەسەرستەم کردن خوا سزای ئەدا بەشتیٚ شایستەبیٚ .

﴿ وَلِكُلٍّ دَرَجاتٌ مِمّا عَمِلُوا وَما رَبُّكَ بِغافِلٍ عَمّا يَعْمَلُونَ ﴾ وەبۆ هەموو کەسیٚ هەیە چەندین پلەو پایە لەپاداشت وتۆڵە لەبەرشتیٚ کردویانە لەجیهاندا، دوایی بۆ خراپەکاران هەیە چەندین پلەو پایە بەگویٚرەی کردەوەکانیان وەهەر لەگاڵتە پیٚ کردنیان هەتا تالاٚن کردنی خواردەمەنی گەلان و فریٚدانی بۆمبای زەرڕە لەجیهاندا و سزای گران لەپاشەڕۆژدا، بۆ چاکەکەران هەیە چەندین پلەو پایە بەگویٚرەی کردەوەکانیانە وەهەر لە ناوبردنیان بەچاکە هەتا کوشتنیان لەریٚگەی خوادا وگشت چاکەیەو، پەروەردەکەری تۆ بیٚ ئاگانیە لەشتیٚ ئادەمیزاد و جنۆکە ئەیکەن، هەموو شتیٚ بەبیٚ کەم و کوڕی تۆمار کراوە لای خوای مەزن لەگەورەو بچووك و لەچاك و لەخراپ، هەموو کەسیٚ بەگویٚرەی شایستەی خۆی مافی کردەوەی خۆی وەرئەگریٚ لەپاداشت و لە سزا، ئەوەی شایانی باسبیٚ بیٚ پیٚویستە ئیٚمە بڕوامان هەبیٚ بەبونی جنۆکە بەشیٚوەیەکی کورت، چونکە خوا بەنامەی خۆی هەواڵی بەبونی فریشتە داوەو ئەقڵیش گونجاوە لای بونی جنۆکە هەروەك بوونی فریشتەیە. بەلاٚم بەدریٚژی هەواڵەی زانینی خوایە چۆنیەتی جنۆکەو فریشتە، بۆیە هەرکەسیٚ باوەڕی بەبونیان نەبیٚ بەبیٚ باوەڕدائەنریٚ. دوای ئەوەی خوای مەزن ڕوونی کردەوەو فەرماندانی خۆی بۆ پەرستن و هانی دابن بۆ باوەڕ بەئایینی ئیسلام، بۆیشمانی ڕوون ئەکاتەوە کەخوا پیٚویستی بەهیچ شتیٚ نی‌یە، هیچ شتیٚ زیان بەخوا ناگەیەنیٚ و سودیشی پیٚ نابەخشیٚ و ئەفەرمویٚ:

وَرَبُّكَ ٱلْغَنِىُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِنۢ بَعْدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ ءَاخَرِينَ ﴿١٣٣﴾ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَءَاتٍ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿١٣٤﴾ قُلْ يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَامِلٌ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١٣٥﴾

﴿ وَرَبُّكَ الغَنِيُّ ذُو الرَّحْمَةِ ﴾ وە پەروەردە کەری تۆ پێویستی بەبەندەکانی خۆی نیەو بێ نیازە لەپەرستنی ئەواندا بۆ خۆی، خاوەنی بەزەیی و میهرەبانی‌یە بۆ بەندەکانی خۆی،داواکردنی پەرستن لەبەندەکانی خۆی بۆ سوودی تواوی ئەوانە لەهەموو ڕویەکەوە، بۆ ئەوە نی‌یە خوا پێویستی بەباوەڕپێهێنان وپەرستنی ئەوان هەبێ. بونەوەران هەمویان هەژاری یارەگای پەروەردە کەری خۆیانن .

﴿ إِنْ يَشأ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِنْ بَعْدِكُمْ ما يَشاءُ ﴾ ئەگەر پەروەردەکەری تۆ ئارەزوو بکا ئێوە لەناو ئەبا چونکە پێویستی بەئێوە بی‌یە و، دائەنێ لەدوای ئێوەو لەجێگەی ئێوەدا شتێ ئارەزووی بکا، ئێوە ئەگۆڕرێنەوە بەجگەی ئێوە تاقمی خوا پەرستتر بن. بەڵام بەمیهرەبانی خۆی مۆڵەتی ئێوە ئەدا هەتا هۆشێ بکەنەوە لەخۆتان و کردەوەی خۆتان .

﴿ کَما أنْشأکُمْ مِنْ ذُرِّيَةِ قَوْمِ أخَرِيْنَ ﴾ هەروەك پەروەردەکەری تۆ ئێوەی دروست کردووە لە منال و نەتەوەی گەلانی تر و لای ئاسان بووە، ئاسانە لەسەری تاقمێ تری تازە دروست بکا لە ئێوەو لەجگەی ئێوە .

﴿ إِنَّ ما تُوعَدُونَ لآتٍ وَما أَنْتُمْ بِمُعْجِزِيْنَ ﴾ بەڕاستی شتێ بەڵێنی پێدراوە بەئێوە دێت بەبێ گومان لەزیندو بونەوەو پرسیار و پاداشت سزاو، ئێوە دەرچونتان نابێ لەهەرجێگەیەك بن مردن پێتان ئەگا و، ڕێگەی پێ ناگرن.دوای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بانگی عەرەبەکانی کرد بۆ لای ئیسلام هەندێکیان وەلامیان دایەوەو باوەڕیانهێنا، هەندێ تر وەلامیان نەدایەوەو باوەڕیان پێ نەهێنا، خوای مەزن فەرمانی دا بەپێغەمبەری خۆی و فەرمووی:

﴿ قُلْ يا قَوْمِ إعْمَلُوا عَلَى مَكانِكُمْ إني عامِلٌ ﴾ تۆ بڵێ بەبێ باوەڕان :ئەی تاقمی خۆم: ئێوە کاربکەن بۆ خۆتان لەسەر ئەوپەڕی دەستەلات و توانای خۆتان ولەسەر شێوەی خۆتان بن و بەردەوام بن لەسەرکاری خۆتان هەر خۆتان تووشی زیان ئەبن. بەڕاستی من ناوەستم و کاری خۆم ئەکەم و بەپێی توانای خۆم و بەردەوام ئەبم لەسەر ئایینی ئیسلام و وەرگرتنی ڕێگەی ڕاست .

﴿ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَنْ تَكُونُ لَهُ عاقِبَةُ الدّار إِنَهُ لا يُفْلِحُ الظّالِمُونَ ﴾ دوایی ئێوە بەم نزیکە ئەزانن بۆچ کەسێ ئەبێ بەرهەمی چاکەی ڕۆژی دوایی کە بەهەشتە؟ بەڕاستی ستەمکاران ڕزگاریان نابێ لەتۆڵەی ستەمی خۆیان، ئەگەر ڕزگاریان ببێ ستەمکاران و دادپەروەران لەیەك جوێ نابنەوە، ئەوەیش ناکونجێ و ناچێتە مێشکەوە .

پاش ئەوەی خوای مەزن باسی بێ باوەڕی و هاوبەشدانان و نەزانین و تێنەگەیشتنی بێ باوەڕانی فەرموو، لەمەودوا باسی فەرماندانی پوچیان ئەکا بەدرێژی: لەو فەرماندانە پوچانەیە کە بێچوی چوارپێکانی خۆیانیان ئەکرد بەبەشی خواکانیان و وازیان لێ ئەهێنا بۆ بتەکانیان، هەروەها دانەوێڵەو بەرهەمی باخ و کشت وکاڵیان ئەکرد بە دوو بەش بۆ خواو بۆ بتەکانیان: بەشی خوایان بۆ میوان و هەژاران: بەشی بتەکانیان واز لێ ئەهێناو ئەیان ووت: خوا پێویستی بەو شتانە نییە، ئەیاندا بەزێوانیان. ئەوەیش هەر لەبەر خۆشەویستی بتەکانیان بو، هەرشتێ لەبەشی بتەکانیان بکەوتایەتە نێو بەشی خواوە هەڵیان ئەگرتەوەو ئەیان خستەوە نێو بەشی بتەکان و ئەیان ووت: بتەکان پتر پێویستیان بەوشتانەیە هەرشتێ لەوبەشەی خوا لەناو بچوبایە ئاوریان لێ نەئەدایەوە، هەرشتێ لەبەشی بتەکان کەم ببوایەتەو تۆڵەیان ئەکردەوە لەبەشەکەی خوای مەزن، بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو باسانە ئەفەرموێ:

وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلْحَرْثِ وَٱلْأَنْعَٰمِ
نَصِيبًا فَقَالُوا۟ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَا ۖ
فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمْ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ
وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمْ ۗ
سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿١٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ
لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ
شُرَكَآؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا۟ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ ۖ
وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١٣٧﴾
وَقَالُوا۟ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن
نَّشَآءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ
ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ ۚ سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُوا۟
يَفْتَرُونَ ﴿١٣٨﴾ وَقَالُوا۟ مَا فِى بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلْأَنْعَٰمِ
خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا ۖ وَإِن يَكُن
مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَآءُ ۚ سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ

حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٣٩﴾ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ قَتَلُوا أَوْلَادَهُمْ سَفَهًا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا مَا رَزَقَهُمُ اللَّهُ افْتِرَاءً عَلَى اللَّهِ قَدْ ضَلُّوا وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ ﴿١٤٠﴾

﴿ وَجَعَلُوا اللهِ مِمّا ذَرَ أَمِنَ الْحَرْثِ وَالأَنْعامِ نَصيباً ﴾ وەبت پەرستانی عەرەب ئەیان گێڕا بۆ خوا لەشتێ خوا دروستی کردبوون لە دانەوێڵەو بەرو بومی درەخت و لە بێچوی چوارپێکانیان بەشێ بۆ خواو بەشێکیش بۆ بتەکانیان کە ئەیان پەرستن وناویان نابوون هاوبەشی خوا.

﴿ فَقالُوا هذا اللهِ ﴾ دوایی ئەیان ووت ئەوبەشەیان بۆخوایەو ئەم بەشەیشیان بۆ هاوبەش و خواکانی ئێمەیە، هەردوولایانیان بەگومانی پوچ وگوفتاری درۆینەی خۆیان، خواکانی ئەوان بریتی بوون لە بتە دەست کردەکانی خۆیان.

﴿ فَما كانَ لِشُرَكائِهِمْ فَلا يَصِلُ إلى اللهِ وَما كانَ للهِ فَهُوَ يَصِلُ إلى شُرَكائِهِمْ ساءَ ما يَحْكُمُونَ ﴾ دوایی ئەو بەشەی بۆ هاوبەشەکانی ئەوانبێ نەگا بۆ لای خواو نەیبەخشن بەهەژاران ومێوانەکان وە شتێ بۆ خوا دانراوە دوایی ئەوشتە ئەگا بەهاوبەشەکانیان و بەکاربهێنرێ بۆیان و بۆ زێوانەکانیان. یانێ ئەتوانن دەستکاری بەشی خوا بکەن. بەلاّم نابێ دەستکاری بەشی بتەکانیان بکرێ. ئەوشتەی ئەوان فەرمانی پێ ئەدەن و ڕێزی بەشی بتەکانیان ئەدەن بەسەر بەشی خوادا گێل و بێئەقلّییە وخراپە، دەستورێکی نارەوایە دروستیان کردووە بۆ خۆیان، دوایی ڕونی ئەکاتەوە کردەوەیەکی خراپتریان و ئەفەرموێ:

﴿ وَكَذلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِنَ الـمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلادِهِمْ شُرَكائُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ ﴾ وەهەر بەو جۆرەی ئەو کارە پێشوانەیان ئەکرد لەبەشکردنی کشتوکالّ و بێچوی چوارپێکان بۆ هاوبەش و بتەکانیان لەجنۆکەو زێوانی بتەکان، هەروایش

هاوبەشەکانی بت پەرستان لە پۆشە ڕێژەکان و زێوانی بتەکان ڕازاندویانەتەوە بۆ زۆرترینی ئادەمیزاد کوشتنی منداڵەکانیان و و زیندە بەچاڵ کردنیان لەبەر ئەوەی بت پەرستان لەناو ببەن و لایان بدەن لە ڕێگەی ڕاست و لەبەرئەوە تێکەڵاوی ئەو ئایینەی ئیبراهیم بکەن ئەوان لەسەربنی‌کاری نارەوا.

پرسیار/ دەستکاری کردنی هاوبەشدا نەران لەدارایی و منداڵەکانی خۆیان بەو جۆرەی باسکران بەهۆی سروشتیێ بوە لەدام و دەزگای بەر لە ئیسلام وەریان گرتووە لە باوباپیری خۆیانەوە، دوایی هەرکاتێ لەبەرهەژاری منداڵێکی خۆیان یالەبەر شورەیی کچی خۆیان زیندەبەچاڵ بکەن لەخۆیانەوە نەك بتەکان و زیێوانەکانەوە؟

وەڵام/ زۆر ڕاستە ئەو کارانە بەهۆی لاسایی کردنەوەی پێشوەکانیانەوە بوە، بەڵام زێوان و سەرۆکەکانیان لاسایی کردنەوەی ڕازاندوەتەوە بۆیان وەك نوێنەری بتەکان وان لەگفتو گۆیانا. کەواتە ڕاستە ئەو کارانە بدرێنە پاڵ بتەکانیان .

﴿ وَلَوْ شاءَ اللهُ ما فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَما يَفْتَرُونَ ﴾ وەئەگەر خوا ئارەزووی بکردایە ئەوشتانەیان نەئەکرد بەزۆر ڕێگەی کردنیان لەوان ئەگرت . بەڵام خوای مەزن ئەقڵی پێ بەخشیون و ڕێگەی چاك و خراپی بۆ دەست نیشان کردوون، خۆیان بەسەربەستی خۆیان ئەو کارە خراپانەیان پەسەند کردووە، دوایی واز لەوان و لەو بوختان و درۆیە هەڵی ئەبەستن بهێنە، ئەو ڕستەیە بۆ تاوانج و هەڕەشەیە لەوان، مانای وانیە خوا بەلایەوە چاکبێ ئەو کارەی ئەوان و فەرمان بدا پێغەمەر وازیان لێ بهێنێ .

هاوبەشدانەران جگەی لەوانەی پێشوو سێ جۆری تر لە گومڕایی و سەرلێشێوانی خاوەن دزیانی تریان بۆ خۆیان دروست کردووە، وەك ئەمانەی خوارەوە :

١- ﴿ وَقالُوا هذِهِ أَنْعامٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لا يَطْعَمُها إلاّ مَنْ نَشاءُ بِزَعْمِهِمْ ﴾ وەبت پەرستان ئەیان ووت: ئەوانە چەندین چوارپێ‌و بەرهەمی کشت و کاڵو درەختن قەدەغەیە سوود وەرگرتن لەوان نابی بیان خۆن مەگەر کەسێ ئێمە ئارەزوومان هەبی دەرخواردیان بدەین لەخزمەتکاری بتەکان و جگەی ئەوان، ئەو کارەیان ئەکرد بەهۆی گومانی خۆیانەوە بەبی بەڵگە.

٣- ﴿ وَأَنْعامَ حُرِمَتْ ظُـهُورُها ﴾ وەئـەيانووت: ئـەوەيش چـەندين چوارپێـن پشـتيان قەدەغە كراوە بۆ سواربوون و بارلێنان، ئەبوايە كەس سواريان نەبوايە و باريان لێ نەنايە .

٤- ﴿ وَأَنْعامَ لا يَذْكُرُونَ أَسْمَ اللهُ عَلَيْها ﴾ وەئەمەيش چەندين چوارپێن نابێ ناوی خوا ببرێ لەسەريان لەكاتی سەربڕينيانا. بـەڵكو ئـەبێ نـاوی بتـەكانيان لەسـەرببرێ لـەكاتی سواربونيان و سەربڕينيان، دوايی نەحەجيان پێوەئەكردن و نەناوی خوايان ئـەبرد لـەكاتی سـواربونيانا، نەيشـيان ئەدۆشـين و باريـان نەئـەكردن. ئەوانـەيان هـەموو ئـەكرد بـەبێ فەرماندانی خواو بەبێ دەستورێ خوا بۆی دانابن .

﴿ أفْتِراءً عَلَيْهِ سَيَجْزِيهِمْ بِما كانُوا يَفْتَرُونَ ﴾ ئەو كارە نارەوانانەيان ئـەووت بـەبوختان ودرۆ ئەياندا بەسەر خودداو بـەگومانی خۆيـان ئـەيان ووت خـوا فـەرمانی داوە بەئێمـە بەوكارانە، خوا لەمەودوا سزای ئەوان ئەدا بەهۆی ئەوانەی هەڵيان بەستووە كەئەو بـەش كردنانە ئەدەنە پاڵ خودا .

﴿ وَقالُوا ما فِي بُطوُنِ هذِهِ الأَنْعامِ خالِصَةٌ لِذُكُور وَمُحَرَمٌ عَلَى أَزْواجِنا ﴾ وەبت پەرستان ئەيان ووت: شتێ لەورگی ئەو چوارپێيانەدايە ڕەوايە وتايبەتە بۆ نێرەكانمان و قەدەغەيە بۆ ژنەكانمان ئەگەر بوون لەدايكيان بەزيندويی، نابێ ژنەكانمان بيخۆن .

﴿ وَإنْ يَكُنْ مَيْتةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكاءُ سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ إِنَهُ حَكِيـمٌ عَلِيـمٌ ﴾ وەئەگـەر ئـەو شتە لەسكيانايە بەمردوی لەدايك بوو، دوای نێرەكان لەوشـتەدا هاوبەشـی ژنـەكانيانن، دوايی خوا تۆڵەی ئەو باسەو بەختانەی ئەوان لەوان ئەسێنێ وە بەڕاستی خوا هەموو شتێ لە جێگەی شياوی خۆی دائـەنێ لـە قەدەغـەكردن و ڕەوانـە كـردن، ئـەزانێ بەسـودی بەندەكانی خۆی لەڕەاونە كردن و قەدەغەكردنی هەموو شتێ .

﴿ قَدْ خَسِرَ الذِيْنَ قَتَلُوا أوْلادَهُمْ سَفَهاً بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ بەڕاستی كەسانێكی ئەوتۆمناڵـەكانی خۆيانيان كوشتوە زيانيان لەخۆيان داوە لەبەرسوكی ئـەقڵيان و نـەزانييان كـەخوا ڕۆزی دەری مناڵـەكانيانەو ئەيانپارێزێ لەديل كردنيان. چ شتێ لـەوە بـێ غـيرەتی تـرە كـەباوك كوڕی خۆی بكوژێ و كچی خۆی زيندە بەچاڵ بكا و مافی كۆمەڵايەتی پێشێل بكا .

﴿ وَحَرَمُ ما رَزَقَهُمْ اللهُ أفْتِراءَ عَلَى اللهِ ﴾ وەبت پەرستان قەدەغەیان کردبوّ شتێ خوا کردبوی بە ڕۆزی بۆ ئەوان و بۆی ڕەوا کردبوون ئەو، قەدەغەکردنە بوختان ئەیاندا بەسەر خواداو ئەیان ووت: خوا فەرمانی پێداون .

﴿ قَدْ ضَلُوا وَما كانُوا مُهْتَدِيْنَ ﴾ بەڕاستی بێ باوەڕان لایان داوە لەڕێگەی ڕاست و ئەوان ڕاغویی وەرناگرن .

پاش ئەوەی کەخوا گێڕایەوە کەهاوبەشدانەران خۆیان هەندێ شتیان ئەکرد بەبەشی خوا و هەندێ تریان ئەکرد بەبەشی بتەکانیان، دوای ئەوانە ڕونی ئەکاتەوە کەخوای مەزن دروست کەری هەموو شتێکە.کەواتە دروست و گونجاو نییە هیچ شتێ هەواڵەی یتەکان بکرێ لەڕەوا کردن وقەدەغەکردنی خواردەمەنی و جگەی خواردەمەنی، دوایی خوای مەزن ئەفەرموێ:

وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّـٰتٍ مَّعْرُوشَـٰتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَـٰتٍ وَٱلنَّخْلَ وَٱلزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَـٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَـٰبِهٍ ۚ كُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ ۖ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٤١﴾ وَمِنَ ٱلْأَنْعَـٰمِ حَمُولَةً وَفَرْشًا ۚ كُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ

وَمِنَ ٱلْأَنْعَـٰمِ حَمُولَةً وَفَرْشًا ۚ كُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ

ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٤٢﴾

ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ ۗ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۖ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾ وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ ۗ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۖ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا ۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾

﴿ وَهُوَ الذي أنْشأ جَناتٍ مَعْرُشاتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشاتٍ ﴾ وەخوا کەسێکی ئەوتۆیە دروستی کردووە بۆ ئێوە چەندین باخ و بێستان هەیانە لقەکانیان بەرزکراونەتەوەو خراونەتە سەر کەپرو کۆڵەکە ،هەیانە وازیان لێ هێنراوە بەگوێرەی سروشتی خۆیان بەرەو ژوور ئەڕۆن، بۆ زانین: زانایان لەدیاری کردنی مەبەست لەووشەی ( مَعْرُشاتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشاتٍ ) بیرو بۆچونیان جیاوازە: ئیبنو عەباس دەڵێ معروشات بەشتێ ئەڵێن ڕاکشابێ بەسەر زەویدا و بڵاو ئەبێتەوە لەسەر کەپرو شتی تردا وەك ترێ و کولەکەو کاڵەك و شتی تر، غەیرە معروشات بەوانە ئەبێژێ کەلەسەر بنکی وەستابێ وەك خورما ودرەختەکانی ترو گەنم و جۆ .زوحاك ئەڵێ هەردوکیاتن لەترێ دا دێنە جێ هەیەتی لەسەر کەپر دائەنرێ ،هەیەتی ڕائەکێشرێ بەسەر زەویدا و بەگوێرەی سروشتی خۆی

بلاو ئەبێتەو بەڕوی زەویدا، هەندێ تر ئەڵێن مەعروشات بریتییە لەو شتانەی ئادەمیزاد خۆیان ئەیڕوێنن لەبێستانەکاندا و گرنگی پێ ئەدەن لەترێ و جگەی ترێ. غەیرە مەعروشات ئەوانەن خوا ئەیانڕوێنێت لەدەشت و لەکێواندا وەك خورماو ترێ و هەرمێ ودرەختی تردا، ئەو مانایە هەمویان پەسەندن و لەمەبەست ناگۆڕن .

﴿ وَالنَّخْلَ وَالزَّرْعَ مُخْتَلِفاً أُكُلُهُ ﴾ وەخوا دروستی کردووە بۆ ئێوە خورماو کشتوکاڵ لەکاتێکا بەرهەمەکانیان لەیەك ناچن و جیاوازن لەخواردن و لەرەنگ و قەوارەو تام و بۆندا، هەریەکەیان تامێك و بونێك و رەنگێك و لەشێکی تایبەتیان هەیە،هەیشیانە بەپێچەوانەی یەکترین .

﴿ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمانَ مُتشابِهاً وَغَيْرَ مُتَشابِهٍ ﴾ وەخوا دروستی کردووە بۆ ئێوە داری زەیتون وهەنار لەکاتێکدا هەیانە لەیەك ئەچن لەڕەنگ ولەتامدا ،هەیانە لەیەك ناچن. بۆ نمونە بەری هەنار هەندێکیان لەهەندێ تریان ئەچن. یەلاّم هەیانە شیرین و هەیانە ترشە، هەروەها لیمۆو شتی تریش. زەیتون هەیانە بەرهەمی چاکەو هەیانە خراپە، گەڵای زەیتون لەگەڵای هەنار ئەچێت، کەچی بەرەکانیان جیاوازن لە ڕەگەزو لەتامدا .

﴿ كُلُوا مِنْ ثَمَرِهِ إذا أثْمَرَ ﴾ ئێوە بخۆن لەبەرهەم ومیوەی هەریەکە لەوانەو سودیان لێی وەرگرن کاتێ بەرهەمەکانیان دەرئەکەوێ باکاڵ و کرچ بن، قەدەغە نیە خوادنیان، چونکە لەوکاتەدا مافی هەژارانیان لەزەکات پێوەنەبەستراوە .

﴿ وَآتُوا حَقَّهُ يَوْمَ حَصادِهِ ﴾ وەئێوە ببەخشن بەهەژاران مافی هەریەکە لەوبەهەمانە لەڕۆژی درەو کردنی کشتوکاڵ و بڕین و چنینی میوەو بەرهەمی درەختەکان .ئەوەی گرنگبێ و وەرئەگیرێ لەووشەی (حصاد ) ئەبێ ئەو بەرهەمانە کۆبکرێنەوەو نەهێلرێ لەناو بچن ،وایش ئەگەیەنێ مافی هەژاران لەکاتی پێگەیشتن و درەودا پێویست ئەبێ، ئەوەی بدرێ بەهەژاران لە (١/١٠ ) ٥ یا لە ( ١/٢٠) ٥ بەوجۆرەی لەباسی زەکاتا ڕوون کراوەتەوە .

بۆ زانین: زانایان بیریان جیاوازە لەبەخشینی ئەو مافەی بدریّ بەهەژاران. ئایا بریتیە لە وزەکاتەی پێویست کراوە یا بریتیە لەجگەی زەکات لەوەی واچاکە بەهەژاران بدریّ. زۆربەی زانایان لایان وایە بریتیە لەو زەکاتەی پێویست کراوە ،هەندیّ تریان لایان واچاکە بەشیان بدریّ و سونەتە. پیشەوا حەنەفی ئەفەرمویّ :ئەورستە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەموو شتیّ سوودی تێدابی بۆ هەژاران پێویستە بەشیان بدریّ نەك بەتەنها خورما و مێوژ و دانەوێلە، لای ئەو هەرمیّو هەنارو قۆخ وشتی تر ئەبیّ بەشی هەژاران لێی بدریّ بەو جۆرەی یاسا دیاری کردووە .

﴿ وَلا تُسْرِفُوا إنَ اللهَ لا يُحِبُ الْمُسْرِفِيْنَ ﴾ وەئێوە لەسنوری دیاری کراوی خوا دەرمەچن لە بەخشینی ئەو بەرهەم و بەری ئەوشتانەی باسکران، یانی هەموی مەدەن بەهەژاران وزیانیشیان لێی مەدەن و لەبەشەکانیان کەم بکەنەوە. بەراستی خوا خۆشی ناویّ ئەو کەسانەی لەسنور دەرئەچن ،ئیتر بۆ خۆیانی دابنێن یا بیدەن بەجگەی خۆیان .

خوای مەزن بۆی ڕوون کردینەوە ڕوەك وسەوزە و درەخت هەیانە هەڵئەواسرێن و هەیانە ڕائەکێشرێن بەسەر زەویدا و هەیانە لەسەر بنکی خۆی بەرز ئەبێتەوە وبەرەوژوور، هەروایش بۆمان ڕوون ئەکاتەوە چوار پیّ وێنەی ئەو شتانە بۆ ئێوە دروست کراون وەك ئەفەرمویّ :

﴿ وَمِنَ الأنْعامَ حَمُولَةً وَفَرْشاً ﴾ وەخوا دروستی کردوو لەچوارپێکان شتیّ ئێوەو بارەقورسەکانتان بۆ هەڵئەگرن وەك حوشتر وگا، شتیّ ئێوە ڕایان ئەکێشن و سەریان ئەبڕن و سوود لەگۆشت و خوری و مووەکورگەکانیان وەرئەگرن. هەندیّ لەزانایان ئەڵێن: (حمولە) بریتیە لەوانە دەست ئەدەن بۆ بارکردن لەچوارپیّ گەورەکان وەك حوشتر وگا. ( فرشا) بریتین لەوانە بچوکن ودەست نادەن بۆ بارکردن وەك بەرخ و کارو گوێرەکە .

﴿ كُلُوا مِمّا رَزَقَكُمْ اللهُ وَلا تَتَبِعُوا خُطُواتِ الشَيْطانِ إنَهُ لَكُمْ عَدُو مُبِيْنٌ ﴾ ئێوە بخۆن لەوشتەی خوا کردویەتی بە خوادرەمەنی بۆ ئێوەو بەرۆزی ئێوە بۆ مانەوەتان لەجیهاندا، وەك بەروبومی درەختەکان و دانەوێڵەو بەرهەمی چوارپێکان و، ئێوە دوای ڕێگە و

هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون لەبەرەوا کردنی شتیَ قەدەغەیە وبەقەدەغە کردنی شتیَ رەوایە، بەلەسنور دەرچوونی خوا. بەراستی شەیتان دوژمنی ئاشکرایە بۆ ئیَوە.

﴿ ثَمانِيَةَ أَزْواجٍ ﴾ ئەو بار هەلگرو و راخراونە بریتین لە هەشت هاوریَی یەکتری لەو چوارپیَیانە نویَنەری چوار رەگەزن، بۆهەریەکیَ لەو رەگەزانە دوو هاوریَ نویَنەرایەتیان ئەکەن وەك خوا ئەفەرمویَ :

﴿ مِنَ الضَأنِ أثْنَيْنِ وَمِنَ المَعْزِ أثْنَيْنِ ﴾ لەخوری لە پشت دووهاوجووت: بەران ومەرو مو لەپشت دووهاوەلَی یەکتری نویَنەری یەکیَ لەورەگەزانەن نیَری و بزن، ووشەی ( زوج ) ئەبیَژیَ بۆ هەموو شتیَ هاوریَیەکی لەرەگەزی خۆی هەبیَ: وەك یەکیَ لەجوتیَ. بۆ نمونە: تاکە کەوشیَ بەکۆبونەوەی تاکەکەی تریا ئەبیَژیَ جووت .

﴿ قُلَ الذكَرَيْنِ حَرَمَ أمْ الأُثنَيْنِ أمّا أشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أرْحام الأُنْثَيَيْنِ ﴾ موحەد تۆ بەهەرەشەو سەرزەنشتەوە بلَیَ بەبت پەرستانو بیَژ لەکردەوەکانیان بکە لەسەر قەدەغەکردنی هەندیَ چوارپیَ و رەوا کردنی هەندیَ تریان، بەوان بلَیَ: ئایا خوا قەدەغەی کردوە دوونیَر لەنیَرەکانی مەرو بزن یا دوومیَینە لە میَینەکانیان یا قەدەغەی کردووە ئەوشتەی ئەوتۆ لەنیَوان منلَدانی میَینەکانی مەرو بزندان .

﴿ نَبِئُوني بِعِلْمٍ إنْ كُنْتُمْ صادِقِيْنَ ﴾ ئیَوە هەوالَبدەن بەمن بەزانیاریەکی بیَگومان گیَررابیَتەوە لەیەکیَ لەپیَغەمبەرانەوە یا بەزانیاریەکەوە وەرگیرابیَ لەلایەن ئەقلَەوە کەخوا هەندیَ لەوانەی قەدەغەکردبیَ لەسەرئیَوە، سەرچاوەی ئەوەمان بۆ روون بکەنەوە، نەك لەبەر لاسایی کردنەوەی باو وباپیرتان ئەگەر ئیَوە راست ئەکەن، قەدەغەکردن بەگۆترە کاری نابیَ.

﴿ وَمِنَ الأبِلِ إثْنَينْ وَمِنَ البَقَرِ أثْنَيْنْ قُلْ الذَكَرَيْنِ حَرَمَ امِ الأُثنَيْنِ أما أشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أرْحامُ الأُنْثَيَيْنِ ﴾ وە لە هوشتر دووهاوریَی و هاوجوت نیَرو میَ و لەرەشە وولاخ دووهاوریَی گاو مانگا. تۆ بلَیَ بەبت پەرستان : ئایا خوا قەدەغەی کردووە لەوان دوو نیَر یان دوو میَینە یان شتیَ لەنیَو منالَدانی میَینەکانی هەشتر و رەشە وولاَخدایە .

﴿ أَمْ كُنْتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ وَصاكُمُ اللهُ بِهِ ﴾ ئایا ئێوە ئاگـادارن لـەکاتێ خـوا ئـەو شـتانەی قەدەغە کردوون و بەئێوەی سپاردووە، خۆ ئێوە بڕواتان بەهیچ پیغەمەرێ نیـە، ئیـتر ئێـوە چۆن ئەو فەرمانانە ئەدەنە پاڵ خوا. کاتێ ڕونی کردەوە کەهیچ سـەرچاوەیەکیان نی‌یـە بـۆ ئەو شتانە فەرموی:

﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَنِ أفْتَرَى عَلَى اللهِ كَذِباً لِيُضِـلَ النـاسَ بِغَـيْرِ عِلَـمٍ ﴾ دوایـی چ کەسـێ ستەمکار ترە لـەکەسێ دروست بکا بەبوختان درۆ بیدا بەسەر خوادا، بۆ ئەوەی ئـادەمیزاد لابدا لـەرێگەی ڕاست بەبێ زانین و بەبێ بەڵگە، لـەکاتێکا گومان ببا خوا ڕاغویی کـردوە بۆ لای ئـایینی خـوا، بەوێنـەی زۆرتریـن کـەس لـەمیزەربەسـەرو پـیرانی تەریقـەت لـەم سەردەمەی ئێمەدا .

﴿ إِنَ اللهَ لا يَهْدِي الْقَـوْمِ الظَـالِمِينْ ﴾ بەڕاسـتی خـوا ڕاغویـی تـاقمی سـتەمکار ناکـا کەخۆیان بۆ خۆیان شتێ هـەڵبژێرن، چونکـە ئەوانـە هـەموو پـەیوەندی نێـوان خۆیـان و خوایان پچڕاندوە، خوا کارە ڕەواکان و کارە قەدەغەکراوەکانی ڕوون کردوەتەوە .

ئەوباسانەی ڕابوردن لـەوەوە هاتووە بت پەرستان ئەیان ووت: خوا قەدەغەی کـردووە ئەوشتانەی ئێمە قەدەغەمان کردوون لـەچوار پێ‌و کشتوکاڵ. پێغەمبـەر ﴿ ﷺ﴾ فـەرموی: ئەوشتانە ڕون نابنەوە بەیەکێ لـەم دوو شـتانە نـەبێ: یابـەچاو ببیـنرێ یائاگادارکـەرێکی ڕاست وێژ ئاگاداربوبێ، ئێـوە ئەوشـتانەتان ڕاسـتە، خـۆ لـەخواوە وەرنـەگیراوە بـەهۆی پێغەمبەر وفروستادەیەکەوە. کەواتە لـەکێتانەوە وەرگرتووە ؟

ئەگێڕنەوە کە عەمری کوڕی لوحای کوڕی قەمعەی خوزاعی یەکەمین کەسێ بوو ئەو دامو دەزگایانەی بلاو کردەوە لـەنێو عەرەبەکاندا ولای دان لـەئاییني ئیسماعیلـەوە بۆ لای پەرستنی بتەکان، لـەشامەوە بتێکی هێنا بەناوی (هوبـەل) هـەڵی واسـی لـەنێو کەعبـەدا. دوای ئەوە خوای مەزن ڕوونی کردەوە ئەوشتانەی بت پەرستان لـەخۆیانــەوە قەدەغـەیان کردبون. نەك لـەلایەن خوای مەزنەوە. ئێستایش باسی ئەو شتانەمان بۆ ئەفەرموێ کەخوا قەدەغەی کردوون و ئەفەرموێ:

قُل لَّآ أَجِدُ
فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ
مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ أَوۡ
فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَإِنَّ
رَبَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٤٥﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا
كُلَّ ذِي ظُفُرٖۖ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ
شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلۡحَوَايَآ أَوۡ مَا
ٱخۡتَلَطَ بِعَظۡمٖۚ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِبَغۡيِهِمۡۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾
فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمۡ ذُو رَحۡمَةٖ وَٰسِعَةٖ وَلَا يُرَدُّ
بَأۡسُهُۥ عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٤٧﴾

﴿ قُلْ لا أَجِدُ فيها أوّحي التي مُحَرَماً على طاعِمٍ يَطْعَمُهُ ﴾ تۆ بڵێ بەو بوختانکەرو بێ باوەڕانە: من دەستم ناکەوێ لەنێو شتێکا بەسروش نێرابێ بۆ لای من قەدەغەکراوبێ لەسەر هیچ بخورێ ئەوشتە بخوا پیاوبێ یا ژن. ئەوڕستەیە بت پەرستان بەدرۆ ئەخاتەوە کە ئەیان ووت: ئەوشتە لەمناڵدانی چوارپێکاندایە بەشی نیرەکانمانە بەتایبەتی، قەدەغەیە لەسەر ژنەکانمان.

﴿ إلا أن يَكُونُ مَيْتةً أوْ دَماً مَسْفُوحاً ﴾ مەگەر ئەو خواردەمەنیە مردارۆ بوبێ کەبریتیە لە گیانلەبەرێ لەخۆیەوە بمرێ یابەگوێرەی دەستوری ئیسلام سەرنەبڕابێ لەوکاتەدا بەمردارۆبو ئەژمێرێ و قەدەغەیە خواردنی، چونکە ئەبێتە لانکەی میکروبێ بخۆرەکەی تووشی زیان ئەکا، وایش ئەبێ مردنی ئەو گیانلەبەرە بەهۆی نەخۆشیەکی واوەبێ لەکەسێکەوە بپەڕێ بۆلای ئەوکەسەو کەسێ‌تر لەکاتی خواردنیدا، یا مەگەر ئەو خواردەمەنیە خوێنێکی ڕەوان بێ ولەکاتی سەربڕینیدا بەخوڕی دەرچێ لە شادەمارەکانی ملیەوە، ئەو خوێنە بەوشێوەیەبێ خواردنی قەدەغەیە ;چونکە بەگوێرەی تاقیکردنەوەی پزیشکی لەوخوێنەدا پەیدائەبێ ترشەڵۆکێ کەزیانی ناهەموار ئەگەیەنی بەتەندروستی. بەتایبەتی خوێنی گیانلەبەرانی گژوگیاخۆر، زۆرجاران لەخوێنیانا میکرۆبێ پەیدا ببێ لەکەسێکەو بۆ کەسێکی تر بپەڕێ، هەرلەبەرئەو نەخۆشیانەیە سوودی فەرماندان بەسەربڕینی گیانلەبەران بە بڕینی شادەمارەکانی ملییان هەتا هەموو خوێنەکەی لەشیان دەرچێ. بەڵام خوڕنەبێ خواردنی قەدەغەنیە وەك سپڵ و جگەر .

﴿ أوْ لَحْمَ خَنْزِيرٍ ﴾ یامەگەر ئەو خواردەمەنیە گۆشتی بەراز بێ، ئەوکاتە ئەو گۆشتە قەدەغەیە. قەدەغەکردنی گۆشتی بەراز جێگەی سەرسوڕمانی زۆرکەسی بێ بیرو بێ هۆشە. ئەوکوسانە پرسیار ئەکەن هۆی قەدەغەکردنی گۆشتی بەراز چ شتێکە، هەندێ کەسی نەفام و بێ باوەڕ خواردنی گۆشتی بەرازیان لاڕەوایە، گرنگی بەفەرمودەی خوانادەن و لاسایی ڕۆژ ئاوایی و جێگەکانی تر ئەکەنەوە، هەموو بیانوی پوچیان ئەوەیە ئەوانە لەپێشکەوتن بەرەو پێشکەوتن ئەڕۆن، وادیارە ئەبێ داوێن پیسی پێشکەوتنە لای ئەوان .

بەڵام ئەو کەسانە ئاگاداری نهێنی و دروست کراوانی خوان بۆیان ڕوون بوەتەوە بەهۆی زانین و زانستەوە زیان و مەترسی خوادرنی گۆشتی بەراز بەئاشکرایی و ڕوونی زیانەکانیان دەرخستووە، کەسانی تریش ئەگەر وەك ئەو زانایانە ووردبینەوە ڕاستیان بۆ دەرئەکەوێ و چارەیان نامینێ و کوڕنوش بۆ خوا ئەبەن و سوپاسی ئەکەن لەسەر ئەو

دەستورە لەقورئاندا ناردویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ کەوازی لەڕوون کردنەوەی هەموو شتێ نەهێناوە کەزیانی ئادەمیزادی تێدابێ و قەدەغەی کردووە لەسەریان، لەمەوپاش ئەیخەینە بەردەم خوێنەرانی بەڕێز هەندێ لەو زیانانەی توشی ئادەمیزاد ئەبن بەهۆی خواردنی گۆشتی بەرازەوە:

١- لەشی بەراز ژمارەیەکی زۆری لەزیندەوەرانی لاکوت و لامێژی لەخۆیا کۆ کردوەتەوە نەخۆشی زۆر جیاوازی بەکۆمەڵ تووش ئەبێ، ئەو زیندەوەرە لاوەکی یانە ( الطفيلة) و ئەو نەخۆشیانە لەبەرازەوە ئەپەڕن بۆ جێگەیەکی تر، بەتایبەتی بۆ لای ئادەمیزاد لەکاتی خوارنی گۆشتی بەراز نەخۆشی کوشندەی وەهایان تووش ئەکا ببێتەهۆی نەمان و لەناوچوونی ئادەمیزاد .

٢- خراپترین نەخۆشی تووشی بەرازئەبێ و ئەپەڕێ بۆ یەکێ تر تایەکی گرانە ( لحمي الخنزير ) کە بڵاوبوەتەوە بەنێو هەموو بەرازەکانا لەهەر تەمەنێکا بن و لەهەر ڕەگزێ بن ، ئەو (تا)یە میکرۆبێکی تایبەتیە ئەگەرێ بەنێو خوێن پیسی دا پێش پەیدابوونی تایەکە بەهۆی باڵندەو مێشس و گیانەوەرانی ترەوە بڵاو ئەبێتەوە و لەئادەمیزادێکەوە بۆ یەکێ تر .

٤- نەخۆشیەکی تری بەراز تای شەپۆلدارە ( الحمى التموجية) ئەپەڕێ بەهۆی خواردنی گۆشتی بەرازەوە، توشی ئادەمیزاد ئەبێ‌و خۆی ئەچەسپێنی بەتایبەتی لەبڕبڕەی پشت و جومگەکان وهێلکەکانی وەتەدا ئەبێتە هۆی ئاوسان و ئارەق کردنەوەو ئازار لە ماسولکەکاندا و ئاوسانی جومگەکان، بەزۆری ئەونەخۆشیە بەهۆی شیرەوە بڵاو ئەبێتەوە بەجۆرێ چارە کردنی بێ سودو گرانە لەکاتێکدا ئەو نەخۆشیە بپەڕێ بۆ لای ئادەمیزاد زۆر خاوەن مەترسی‌یە و ئەنجامێکی خراپی ئەبێ .

٥- لەو زیندەوەرە لاوەکی و لاکوتانەیە بڵاو بونەتەوە لەگۆشتی بەرازدا جۆرە کرمێکی دەزوولەیی خڕە گەورەکانیان ئەچنە نێو ڕیخۆڵەوە، هێلکەکانیان ئەچنە وورده دەمارەکانەوە، دەردێکی کوشندە پەیدائەبێ و گرانترین نەخۆشییە کارئەکاتە سەر

ئادەمیزاد، بەراز نیشانەی ئەو نەخۆشیانەی هەرگیز لێی دەرناکەوێ و پێیانەوە ڕامبوون، ئەو نەخۆشیە توشی بەراز ئەبێ بەهۆی خواردنی گەن و گوی پیسایی سەر سەلوینك و خواردنی مرداروبو و مشك و پیسایی گیانەوەران، خواردنی ئەوشتانە ئەبنە هۆی پەیدابوونی چەندین تورەکەیە لەهێلکەی زیندەوەرە لاکوتەکان، بەلام ئادەمیزاد توشی ئەو نەخۆشیە ئەبێ بەهۆی خواردنی گۆشتی بەرازەوە. ( یوونیستاین) زانای پرسیارلێکراوی نەخۆشیە لاکوتەکان و نەخۆشیە پەڕیوەکان لەئەمەریکادا ئەڵێ نەخۆشی کرمی دەزوولەیی توشی ئادەمیزاد ئەبی لەکاتی خواردنی گۆشتی ئەو بەرازە کەتورەکەی هێلکەکانی هەڵگرتووە و ئەپەڕێتە نێو گەدە، لەپێشەوە ئەچنە نێو ڕیخۆڵ ووردەکان و ئەلکێن بە دیوارەکانیانەوە بەتوندی، لەنێو ڕیخۆڵەکاندا کرمی نێرەو مێینە دروست ئەکەن هەتا پی ئەگەن، بەجۆرێ درێژی نێرەکانیان ئەگەنە لە ١٦/١ گرێیە، درێژی مێکانیان ئەگەنە ٦/١ گرێی، لەدوای جوتبونی نێرەو مێیە بۆ ماوەی تروکاندنی هێلکەکانیان (٤٩) ڕۆژ یا زۆرتر درێژە ئەکێشێ، ئەو هێلکانە ئەچنە نێو شوێنی لووەکان لەدیواری ڕیخۆڵەکاندا، لەوێشەوە بۆ ناودڵ لەدڵەوە بۆ نێو سوڕی گەورەی خوێن، هەروەها بەچەندین پەردەی تردا ئەروات، بەتێپەڕینی (٣٠) ڕۆژ درێژی تەنها هێلکەیەك ئەگاتە میلیمەترێ و پێچ ئەخوا بەیەکا بەخڕی لەوێنەی هێلکەدا، لەدواییدا ووردر وورده تورەکەیە کۆیان ئەکاتەوە، تەمەنیان درێژە ئەکێشێ بۆ ماوەی سالێك، لەدواییدا خۆ ئەبێ بمرێ یا لەش ئەی مژێ و نامێنێ، وائەبێ ئەپەڕنە شوێنی تر لەمێشکدا لەماوەی (٢١) ڕۆژدا .

٦- بەلام دەرکەوتوی ڕواڵەتی زیندەوەرە لاکوتەکان زانای ڕابوردو ( یوونیستاین ) ئەڵێ: بەڕاستی کەسێ کەمێ لەنەخۆشی کرمی دەزولەیی خڕتوش ئەبێ نیشانەیەکی ڕوون بۆ نەخۆشیەکەی دەرناکەوێ زۆرجاران، وائەبێ نیشانەی ڕشانەوەو ڕەوانی و ئازار لەو کەسەوە دەرئەکەوێ لە نێوان ( ٢٤) ڕۆژ و (٤٨) ڕۆژدا، وائەبێ ڕواڵەتی نەخۆشی ئەو کرمە دیاری ناکرێ مەگەر بۆ ماوەی نێوان ( ١٥) ڕۆژ و (٢٩) ڕۆژ، نیشانەی

توشبونی ئەو نەخۆشیە لاوازی لەش و هەست بەماندویی و تاو لەرز بەئارەقەوە، لە هەندێ نەخۆشیەکاندا ووشکی قورگ و ئاوسان و هەوکردنی قورگ لەگەڵ پژمین و ئاوسان و هەواکردنی پێس پەیدا ئەبن .

٧- هەرلەگەڵ توشبونی نەخۆشی کرمی بەراز بێ ماوەی دیاری کراو ڕیشۆڵەی ئێسیکی ئەو کەسە تووشی ئازارێکی گران ئەبێ و جومگەکانی ووشك ئەبن، ئەو کەسە نەخۆشە تووشی نەخۆشی دڵو ئاوسانی سیی ئەبێ، وائەبێ ئەو نەخۆشیە توشی دەماری درکاوی دەماری مێشك ئەبێ، هەروەها تووشی ئاوسانی پەردەی مێشك و ڕاوەستانی لەش لەکارکردن ئەبێ .

٨- لەزیندەوەری لاکوتەکانی بەڕازە کرمی زەردی ماروێنە ئەبێتە هۆی گواستنەوەی کرمی نێری تاو لەرز لەجێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر، هێلکەی کرمی مێینەی تاولەرز وائەبێ لەبەرازەوە ئەکەوێتە سەرزەوی و تێکەلاوی خۆڵ ئەبێ بۆ ماوەی چوارساڵ ئەژی و بەرگەی سەرماو گەرمای زۆر ئەگرێ، بەو بۆنەوە بەهۆی باو شتی ترەوە ئەکەونە نێو لەشی ئادەمیزادەوە و تووشی ئاوسانی سی و هەناسە تەنگی و کەمی گەشەکردن ئەبێ و لەئەنجامدا بەرەو مردن ئەیبا .

٩- لەزیندەوەرە لاکوتەکانە کەبەراز هەیەتی کرمی سی خاوەنی زۆر ئازار لەبۆری سیدا ئەژی و کوشندەیە و ئەبێتەهۆی ئاوسانی سی، لەدواییدا لەبەرازەوە هاڵەمەتی بەراز و تای بەرازی ئادەمیزاد توشیان ئەبێ .

١٠- لەزیندەوەرە لاکوتەکانی لەشی بەرازە کرمی قامچی کرمێکە نزیکەی دوو ئینج درێژەوسەرێکی گەورەی درێژی هەیە لەڕیخۆڵە بارێکەکاندا ئەژی و ئەلکێ بەدیواری میزڵدانەوە بەشێ لەو کرمەو کرمی گورچیلە ئازاری زۆری جگەرو گورچیلە ئەدا لەگەڵ ئەندامەکانی تردا .

١١- گۆشتی بەراز دوو ئەوەندەی گۆشتەکانی تر ڕۆن و چەوری تێدایە، ئەو کەسانەی گۆشتی بەراز ئەخۆن ئەندازەیەکی یەکجار زۆر لەوچەوریە ئەچێتە ناو

خوێنەکانیانەوە و ئەبێتە هۆی تەنگبونەوەی شادەماری خوێن و ڕەقبونی خوێن و نەخۆشی دڵ و بەردی نێو زراو و بەستنی هاتوچۆی ئاوی زراو و ئازاری جومگەو باداری لەش. ئێمە بەرپێچی ئەوکەسانە ئەدەینەوەو بەڕویانا ئەتەقینەوە کەئەلێن ئامێرو کەرەستەی تازەی ئەمڕۆ دروست کراون بۆ پێکهێنانی خواردەمەنی و لابردنی میکرۆب ئەبنە هۆی نەمانی زیندەوەرانی لاکوت و لاوەکی و پاك کردنەوەی گۆشتی بەراز. وولامی ئەوکەسانە ئەدەینەوە ئەلێن وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەئەوپەڕی پێشکەوتندان لەم سەردەمەدا ئەو پەڕی توانای خۆیان تەرخان کرد بۆنەمانی ئەو نەخۆشیانەی بەراز کەتوشی ئادەمیزاد ئەبن. بەلأم لەگەڵ ئەو هەموە کۆششانەدا (٢١) ملیۆن کەس توشی نەخۆشی بەراز بوون لەگەڵ چەندین نەخۆشی نری بەرازدا. ( دائـرة المعـارف البريطانيـة) ئەو ڕوداوەی باس کردوە.

﴿ فَإنهُ رجْسٌ ﴾ دوایی بەڕاستی بەراز و گۆشتی بەراز و بەکارهێنانیان پیسن و بێزلێکراوەیە لەبەر ئەو (١١)ە بەڵگانەی پێشوو کەباسکران لەبەرئەوەیش خۆشترین خواردەمەنی بەراز پیسایی یە .

﴿ أو فِسْقاً أهِلَ لِغَيْرِ اللهِ بِهِ ﴾ هیچ خواردەمەنیە قەدەغە نیە مەگەر خواردەمەنیە لادانبێ لە دەستوری خوا بەوێنەی سەربڕاوێ دەنگ بەرزکرابێتەلەکاتی سەربڕیندا بۆ جگەی خوا، یانێ گۆشتی ئەو سەربڕاوە قەردەغەیە .

بۆ زانین: دەقی ئەو ئایەتەی پێشوو وای دەرئەخا ئەلێ هەموو خواردەمەنیە کاتێ قەدەغەیە سروش هاتبێتە خوارەوە بۆ قەدەغەکردنی، بۆیە زانایان بیریان جیاوازە لەو بارەیەوە. هەندی لەزانایان وەك ئیبنو عەباس و عائشە و سەعیدی کوڕی جوبەیرو دەرکەوتووی ڕێگەی مالیك بەلایانە وایە جگەی ئەوچوارشتە کەمردارۆبوو خوێنی ڕەوان و گۆشتی بەراز و شتێ سەربڕێ بۆ جگەی خوا قەدەغە نین و ڕەوایە خواردنیان. بەلأم جگەی ئەوان ئەلێن: جگەی ئەوانەیش قەدەغە کراون بەفەرمودەی پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾، وەك لەباسی مانای ئایەتی (٣) ی ئەلمائیدە باسکراوە بت پەرستان پێش ئیسلام لەکاتی سەربڕینی گیاندارا ندا بەدەنگی بەرز ئەیان ووت: بەهۆی ناوی عوزاو لات و مەنات ئەم

ئیشە ئەکەین. قەدەغەکردنی ئەو گۆشتەلای ئیسلام لەبەرئەوەیە ئەو کردەوەیە هاوبەشدانانە بۆ خوا وئیسلام ئەیەوی پەیرەوانی خۆی لە ڕواڵەتی هاوبەشدانان بۆ خوا بپارێزێ، کوشتار و سەربرین و هەموو شتێ هەرئەبێ بەناوی خواوە بێ.

﴿ فَمَنِ أظطُرَ غَيْرَ باغٍ وَلا عادٍ فَإنَ رَبَكَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ دوایی هەرکەسێ ناچار بکرێ بۆ خواردنی ئەو قەدەغەکراونە قەدەغەکراوەکان بەجێ نەیەرێ بەبێناچاری و، ستەم لە بێچارەیەتر نەکا بەوێنەی خۆیی و لەسنور دەرنەچێ لە خواردنیاناو زۆرتر لەپێویستی نەخواردویی بەڕاستی پەروەردەکەری تۆ خۆش ئەبێ لەو کەسەو سزای نادا لەبەر بێ چارەیی ئەوشتنە بخوا، میهرەبانە بۆیان کە خواردنی ئەو قەدەغەکراوانەی ڕەواکردوە بۆی.

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی ئەوشتانەی کرد کە قەدەغەی کردووە لەسەر موسڵمانان لە مەودوایش باسی ئەوشتانە ئەکا قەدەغەی کردوون لەسەر جووەکان و ئەفەرموێ:

﴿ وَعَلَى الذيْنَ هادُوا حَرَ منْا كُلَّ ذي ظُفُرٍ ﴾ وەلەسەر کەسانێکی ئەوتۆ ئایینی جولەکەیان هەیە قەدەغەمان کردووە هەموو خاوەن نینۆکێ کەپەنجەکانیان بەیەکەوە لکاون، ئیتر سم داربن وەك هوشتر و قازو مراوی و سۆنەو هوشترو دڕوندەکان.

﴿ وَمَنَ البَقرِ والْغَنَمَ حَرَمْنا عَلَيْهم شُحُومَها ﴾ وەلە ڕەشەوولاخ و مەڕو بزن ئێمە قەدەغەمان کردوە لەسەر جوەکان بەزو چەوریەکانیان کەلەنێو گەدەو بەسەر گورچیلەکانیاننەوە بێ، یانێ خوای مەزن ڕەوای کردوە بۆیان هەموو پارچەو ئەندامی ڕەشەولاخ و مەڕوبزن بەو مەرجەی گۆشتی سوربن. بەلام گۆشتی سپی قەدەغەکراوە لەسەریان ئەم سێ جۆرەی خوارەوەیان نەبێ:

١- ﴿ إلاّ ما حَمَلَتْ ظُهُورُها ﴾ مەگەر شتێ لکابێ و هەڵی گرتبێ پشتی ڕەشەوولاخ مەڕوبزن قەدەغە نیە لەسەریان.

٢- ﴿ أوْ الحَوايا ﴾ یا مەگەرشتێ لەو چەریانە لکابێ بەو ڕیخۆلانەوە جێگەی شیاکەو پشقەلە ئەوەیش قەدەغەنیە لەسەریان.

٣- ﴿ أوْما أخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ﴾ یامەگەر شتێ لەوچەوریانە لکابێ بەئێسکەوە، وەك دووگی مەڕو کلکی بزن و چەوری ئەم لاو ئەولای گوێچکەو چاوو لاتەنیشت، ئەو سێ جۆرە چەوریانە و مۆخی میشك خواردنیان قەدەغە نین و رەواکراوە بۆ جوەکان و جگەی ئەوانە قەدەغەن ( ذلك جزيناهم ببغيهم وإنا لصادقون ) ئەو قەغەکردنانە ئێمە سزای جوەکانماندا بەهۆی گوناهو ستەمکردنیانەوە، تاوان و ستەمەکانیان وەك کوشتنی پێغەمەرەکانی خۆیان بەناڕەواو خواردنی سودو دارایی دانیشتوان و سامانی هەتیوان و، بەڕاستی ئێمە راست ئەکەین لە هەواڵدان بەموژدەدان و هەڕەشەکردن و قەدەغەکردن و رەواکردندا. بەلاّم جوەکان ناچنە ژێر ئەوەی ئەو شتانە قەدەغەکراوە لەسەر ئەوان بەتایبەتی، تۆ بەدرۆ ئەخەنەوەو ئەڵێن: قەدەغەن لەسەرئێمەو جگەی ئێمەش .

﴿ فَأنِ كَذَبُوكَ فَقُلْ رَبُكُمْ ذُو رَحْمةٍ واسِعَةٍ ﴾ دوایی ئەگەر جوەکان تۆ بەدرۆ بخەنەوەو باوەڕت پێ نەیەرن کە من بەسروش ئەوانەمان بۆ تۆ ناردووە و دوایی تۆ بڵێ: پەروەردەکەری ئێوە خاوەنی بەزەیی و میهرەبانی فراونە لە مۆڵەتدانی ئێوە لەجیهانداو بەکتوپڕی سزاتان نادا لەسەر تاوانەکانتان. کەواتە لەخۆتان مەگۆڕێن، ئەگەر خوا ئارەزووی هەبێ تۆڵەتان لێی ئەسێنێ لەسەر کردەوەکانتان. تۆ ئەوان بێ ئومێد مەکە لە بەزەیی خواو بەوان رابگەیەنە کە لێتان ئەبورێ ئەگەر ئێوە پەشیمان ببنەوە .

﴿ وَلا يُرَدُ بَأْسُهُ عَنِ الْمُجْرِمِينْ ﴾ وەناگەرێتەوە سزای خوا لەتاوانباران کە بەدرۆ ئەخەنەوەدواخستنی سزادانی خوا، دوایی ئەوەی شایستەی ئێوەی جوبێ ئەمەیە: ئێوە دژی ئەوە مەوەستن کەخوا هەندی خواردنی خۆشی لەئێوە قەدەغەکرد، چونکە ئەو قەدەغەکردنە تۆڵەسەندنە لەئێوە .

ئەو ئایەتە پیرۆزەی پێشوو بەڕونی فێری ئەم شتانەمان ئەکا: موژدەدان، هەڕەشە کردن لێ بوردنی خوا، خەشمی خوای مەزن. لێ بوردن بۆ کەسێ پەنا بۆلای خوا ببا و داوای لێ بوردن بکا. خەشمیش بۆ کەسێ ئەبێ بەردەوامبێ لەسەر یاخی بوون، لە پەرستنی خوا لابداو ڕاڕابێ .

لەئایەتەکانی پێشوودا خوای مەزن بەرپێچی بت پەرستانی دایەوە لەبارەی باوەڕە پوچەکانیانەوە. لەم ئایەتەی دواییدا بەرگری لەگفتوگۆی خراپیان ئەکا و ئەفەرموێ:

سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا بَأْسَنَا ۗ قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا ۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴿١٤٨﴾ قُلْ فَلِلَّهِ الْحُجَّةُ الْبَالِغَةُ ۖ فَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٤٩﴾ قُلْ هَلُمَّ شُهَدَاءَكُمُ الَّذِينَ يَشْهَدُونَ أَنَّ اللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَا ۖ فَإِن شَهِدُوا فَلَا تَشْهَدْ مَعَهُمْ ۚ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٠﴾

﴿ سَيَقُولُ الذِيْنَ أشْرَكُوا ﴾ لەمەودوا ئەڵێن کەسانێکی ئەوتۆ هاوبەشیان داناوە بۆ خوا. لەو ناوەڕۆکی ئەو ئایەتەدا کارێکی پەکخەری تێدایە، چونکە قورئان هەواڵ ئەدا بەشتێ کەلەمەودوا پەیدا ئەبێ: ئەوەیە پاش هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە بت پەرستان ئەڵێن:

﴿ لَوْ شاءَ اللهُ ما أشْرَكْنا وَلا أباؤُنا ﴾ ئەگەر خوا ئارەزووی هەبوایە ئێمەو باوکانمان هاوبەشمان دانەئەنا بۆ خوا، ئەوگفتو گۆیەی بیٚ باوەڕان هەرچەندە خۆی لە خۆیا زۆر ڕاستەو هەموو شتیٚ ئارەزوو و ویستی خوایە. بەلاٚم ئەوان ئەو شتەی ئەوان بۆ ئەوە نیە بیانوو بهێننەوە لەسەر کارە خراپەکانیان و بەباوەڕەوە بیلێن، مەبەستیان گاڵتە کردنە، بڕوای ڕاستی و دروست ئەوەیە کەکاری ڕەواو پەسەند لای خوا هاوبەش دانەنانە و فەرمانی پێداون هاوبەش بۆ خوا دانەنێن .

ئەو کەسانەی ئامۆژگاری وەرگرن و دوای ووتەی ڕاست بکەون زۆر کەمن، لەوانیش کەمتر ئەو کەسانەن خراپەو شورەیی خۆیان ببینن و لەخۆیانی وەرنەگرن، زۆربەی ئادەمیزاد تاوانبارن و خراپەی خۆیان بە چاکە ئەزانن، چاکەی جگەی خۆیان بەخراپ دائەنێن، ئەگەر بیٚ باوەڕان و تاوانباران ویستە خراپەکانیان بۆ نەچووە سەر ئەیدەنە پاڵ خواو ئەڵێن: ویستی خوا خراپەمان پیٚ ئەکا، زۆر ئاشکرایە ئەو ویستە لەخواوە دوورە .

﴿ وَلا حرَمْنا مِنْ شَيْءٍ ﴾ وەئێمە هیچ شتێکمان قەدەغەنەئەکرد لەکشتوکاڵ و چوارپێکان ئەگەر خوا ئارەزووی بکردایە. بەلاٚم خوا فەرمانی داوە بەقەدەغەکردنیان و ئارەزووی لێی بووە. خوای مەزن بەدرۆیان ئەخاتەوەو ئەفەرمویٚ:

﴿ كذلِكَ كَذّبَ الذيْنَ مِنْ قَبْلِهِمْ ﴾ هەربەو جۆرەی بت پەرستان تۆ بەدرۆ ئەخەنەوە بەدرۆیان خستوەوە کەسانێکی ئەوتۆ لەپێش ئەوانەوە بوون پێغەمەرەکانی خۆیان و بەردەوامبوون لەسەر بیٚ باوەڕی خۆیان .

﴿ حَتى ذاقُوا بَأْسَنا ﴾ هەتا کاتێك چەشتیان سزای ئێمە، سزای کردەوەی خراپی خۆیانیان وەرگرت لەتۆڵەی بەدرۆخستنەوەی پێغەمەرەکانیان .

دوای ئەوەی خوای مەزن بت پەرستان و کردەوە خراپەکانیانی ڕوون کردەوە فەرموی: ئەو بت پەرستانە وێنەی بیٚ باوەڕانی گەلانی پێشوون لەبیٚ باوەڕیدا، فەرمانی دا بە پێغەمەری خۆی ڕووبەڕوی بت پەرستان بوەستیٚ و پرسیارێکی وایان لیٚ بکا کەلاڵیان بکاو نەتوانن وەلاٚمی بدەنەوە و داواکانیان پوچ بکاتەوە، خوافەرمووی بەپێغەمەر:

﴿ قُلْ هَلْ عِنْدَكُمْ مَنْ عِلْمٍ فَتُخرِجُوهُ لَنا إنْ تَتبِعُونَ إلاّ الظَنَ ﴾ تۆ بڵێ بەوان: ئایا لای ئێوە هەیە کارێکی زانراوی وا ئێوە بیکەن بەبەڵگە لەسەر شتێ ئێوە گومانتان بۆ بردوە؟ دوایی ئێوە ئەو بەڵگە ئاشکرابکەن بۆ ئێمە و دەری بهێنن بۆمان، ئێوە دوای هیچ شتێ ناکەون لەو کارانەی خۆتانا مەگەر دوای گومانی ناپەسەندی بێ بەڵگەی خۆتان کەوتوون کە هیچ سودێ بەئێوە ناگەیەنێ، ئێمەی موسڵمان گومانمان لەوەدا نیە کەتاوانبارە گەورەکان ئەزانن خۆیان درۆ ئەکەن لەوشتانەدا ئەیڵێن بەلاّم بەڕاڕایی ورکەرك ئەیانەوێ ئەو ڕاستیانە پەسەند نەکەن کەداواکانیان پوچ ئەکەنەوەو سودی تایبەتیان بنە برئەکا .

﴿ وَإنْ أنتُمْ إلاّ تَخرُصُونَ ﴾ وەئێوە نین لەهەموو ئەوشتانەدا مەگەر درۆ ئەکەن و بەبوختان درۆ دروست ئەکەن و ئەیدەنە پاڵ خوا، کەواتە دواکەوتنی گومان قەدەغەیە .

خوای مەزن لەئایەتی پێشودا ڕوونی کردەوە کە بت پەرستان بەڵگەیان نیە لەسەر داواکانیان جگە لە گومان و درۆکردن، لەم ئایەتەی دواییدا ڕونی ئەکاتەوە کەبەڵگەی تێژو بەهێز هەر لای خوایە بەتەنهاو ئەفەرموێ:

﴿ قُلْ فَلِلهِ الْحجَةُ الْبالِغَةُ فَلَوْ شاءَ اللهُ لَهَداكُمْ أجْمَعِينَ ﴾ تۆ بڵێ بەبت پەرستان: دوایی بۆخوا هەیە بەڵگەی بەهێز وبە توانا بەجۆرێ هەموو بیانو و داوایەکیان نەهێڵێ و سەرنخونی بکا، بەڵگەی بەهێز قورئانە کەئێوە لێی تێ ناگەن، دوایی ئەگەر خوا ئارەزوی هەبێ بەڕاستی ڕاغویی ئێوەی ئەکرد بۆ لای ڕێگەی ڕاست هەموتان بەبێ جیاوازی.

بەلاّم خوای مەزن ئارەزووی ڕاغویی هەندێکیان و گومڕایی هەندێ تریان ئەکا، هەریەکەتان بەگوێرەی هەڵبژاردەی خۆتان .

بۆ تێگەیشتن لەمانای ئەو ڕستەیەو نەمانی دوودڵی لەدڵتانا ئەبێ بزانین کە خوای مەزن دووئارەزوو ویستی هەیە:

١- ویستی خوا بۆ دروست کردن لەنەبونەوە بۆلای بوون، بە وویستە ئەگەر خوای مەزن بیەوێ دەستکاری لەئیشی کۆمەلاّیەتی بکا بەویستی ( کن فیکون ) تۆ ببە دوای تۆ

ئەبێ. بێگومان ئەوکاتە بەویستەی هەمو ئادەمیزاد باوەڕ ئەهێنن بەلاّم خوای مەزن ئەو ویستەی خۆی ناخاتەکار، چونکە ئەگەر ئەو ویستە بخاتەکار ئەنجام و سودێ بۆ داواکردنی پەرستن و پاداشت وسزای نامێنێ و ئادەمیزاد خاوەنی هیچ شتێ نابێ، بەو ویستە هەموو بونەوەرانی دروست کردووە.

٢- ویستی داواکردنی پەرستن لەئادەمیزاد و دەستوردانان بۆیان، خوای مەزن ئەگەر ئارەزووی هەبوایە بە ویستەی خۆی ئێوەی ئامادە ئەکرد بۆ ڕانموییو وازهێنانیان لە هەوەسی خۆتان و دلّتانی بە ڕوناکی باوەڕ ڕوون ئەکردەوە. بەلاّم یاسای خوا لەبونەوەراندا وا چەسپاوە کەپێغەمەران ڕەوانە بکا بۆلای ئادەمیزاد و بیانترسێنێ و موژدەیان بداتێ، شارەزایی ئادەمیزاد بکەن بۆ لای چاکە و خراپە بەوانی بناسێنێ، بەمیهرەبانی خۆی ئەقلّی پێ بەخشیون، هەرکامیان ڕاغوییان وەرگرت سوودی بۆ خۆیانە، هەرکەسێ ڕێگە وون بکا زیانی لەخۆی داوە، بەگوێرەی ئارەزوی ئەقلّی خۆیان مەبەستی خۆیانیان هەلّبژاردوە، هەر خۆیان تاوانبارن و بیانویان نامێنێ .دوایی خوای مەزن ڕوونی ئەکاتەوە کەبەڕاستی ئەو ڕێگەیە بڕوا بۆ لای بیرو باوەڕی بت پەرستان پوچەو جێگەی بۆ دانانرێ، نەلەلایەن ئەقلّەوە نەلەلایەن بیستنەوە، هەر شتێ بەو شێوەیە بێ بێگومان پوچ و ناپەسەندە خوا بەپێغەمەری ئەفەرموێ:

﴿ قُلْ هَلُمَّ شُهَدَاءَكُمْ الَّذِيْنَ يَشْهَدُونَ أَنَّ اللهَ حَرَّمَ هذا ﴾ تۆ بلّێ بەبت پەرستان: ئێوە ئامادەبکەن شاهیدەکانی ئەوتۆی ئێوە شایەتی بدەن کەبەڕاستی خوا قەدەغەی کردوە هەریەکە لەکشت وکالّ و ئەو چوارپێیانە و جگەی ئەوانەش.

بت پەرستان بوختان ئەدەن بەسەر خوادا بەدرۆ بەقەدەغەکردنی هەندێ لەکشت وکالّ و چوارپێکان و ئەیشیانداتە پالّ خوا، دوایی خوا فەرمانی دا بە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ لەئایەتی یەکەمدا بەبت پەرستان بلێ: بەلّگەتان چیە دەری خەن، لەئایەتی دووهەمدا فەرمانی پێدان بلّێ: هەمو بەلّگەی تێژو بەهێز کە گومان نەیەلّێ لای خوایە بە تەنها نەك لەلای ئێوە، لەئایەتی سێهەمدا فەرمانی پێدا بەبت پەرستان بلّێ: ئێوە ئامادەبکەن و

پیشانی منی بدەن کسانێکی ئەوتۆ شایەتی بدەن کە سروشی بۆ ئیوە ناردوە ڕاستەو خۆ بەهۆی پێغەمەرێکەوە کە خوا قەدەغەی کردووە ئەو شتانە ئێوە قەدەغەتان کردوون شایەتی دان بەڕاستی مەرجە بۆی هەبێ بەڵگەیەکی بێگومان کە گومانی ناپەسەند پرشو بلاو بکا، چونکە شایەتی دان بە شتی راست بەبێ بەڵگە نابێ، بەڵگە بۆ ناسینی قەدەغە کراوەکان و ڕەواکان بەگشتی ناگونجێ بەجگەی سروشی خوای مەزن، ئەگەر بەڵگەتان هەیە بیان هێنن .

﴿ فَأْنْ شَهِدُ وأفلا تَشْهَدْ مَعَهُمْ ﴾ دوایی ئەگەر بت پەرستان شایەتیان دا خۆیان بۆ خۆیان لەسەر قەدەغەکردنی ئەو شتانە بەدرۆ و بە بوختان، تۆ شایەتی مەدە لەگەڵ ئەوان و بڕوایان پێ بکەی لەو شایەتی دانەیاندا، چونکە گونجاو نیە پێغەمەرێکی وەك تۆ بڕوا بەوان بکا و شایەتی بدا لەگەڵ ئەوان. ئەو ئایەتە هێمایە بۆ ئەوە کەبت پەرستان درۆ ئەکەن لەشایەتی دانەکەیاندا ئەگینا پێغەمەر شایەتی نادا لەکەڵیان. دوای ئەوەی خوا فەرموی ئەوانە درۆ ئەکەن بەپێغەمەری فەرموو:

﴿ وَلا تَتَبِعْ أهْـواءَ الذيْـنَ كذّبُـوا بِأياتِنـا ﴾ و تۆ دوای ئارەزووی کەسانێکی ئەوتۆ مەکەوە بڕوایان بە ئایەتە رونەکانی قورئانەکانی ئێمە نیە و بەدرۆیان ئەخەنەوە، دوای سروشێ بکەوە لای ئێمەوە بۆ تۆ هاتوەو پوچی ڕوی تی ناکا .

﴿ والذيْنَ لا يُؤْمِنُونَ بِالأخِرَةِ وَهُمْ بِرَبِهِمْ يَعْدِلُونَ ﴾ وە دوای کەسانێکی ئەوتۆ مەکەوە باوەڕنایەرن بە ڕۆژی دوایی و بڕوایان هەر بەهەوەسی خۆیان هەیە. بێگومان کەسێ بڕوای بەڕۆژی دوایی نەبێت لەسزای خوا ناترسێ و شایەتی ئەدا لەسەر شتێ درۆبێ، ئەوبت پەرستانە دائەنێن بەپەروەردەکەری خۆیان هاوتایە لەدروست کردنی بونەوەراندا، هەرکەسێ هاوبەش بۆ خوا دابنێ شایەتی‌دانی لێی وەرناگیرێ، چونکە ئەوکەسە خراپترین شتی کردووە. کاتێ خوای مەزن ئەو شتانەی لەبت پەرستانەوە گێڕایەوە لەقەدەغەکردندا بەبوختان، لەمەودوا باسی قەدەغەکراوەکانی ڕاستیمان بۆ ئەکاو ئەفەرموێ :

قُلۡ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗاۖ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡۖ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَۖ وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥۖ وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۖ وَإِذَا قُلۡتُمۡ فَٱعۡدِلُواْ وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰۖ وَبِعَهۡدِ ٱللَّهِ أَوۡفُواْۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾

خوای مەزن لەئایەتەکانی پێشودا ڕای گەیاند کە بت پەرستان خۆیان شتیان بۆ خۆیان ڕەوا ئەکرد و قەدەغەیان ئەکرد بەگۆترەو بەهەوەسی خۆیان ئەیانادنە پاڵ خوا بەبوختان و نەزانین ، خوای مەزن بەرپێچی دانەوە بەبەڵگەی ئەقڵ وپاکی دەرون. باسی هەندێ لەقەدەغەکراوەکانی کرد وەك مردارۆبو، خوێنی خوڕ و گۆشتی بەراز و گیانداری ناوی خوایان لەسەرنەبرێ لەکاتی سەربڕینیاندا. لەم سێ ئایەتانەی دواییدا باسی هەندێ لەقەدەغەکراوەکانی ترمان بۆ دەکا کەلەلای هەموو دەستورە ئاسمانیەکان قەدەغەن بەبێ جیاوازی، لەپاڵ ئەوانیشدا باسی هەندێ شتی ترمان بۆ ئەفەرموێ کەپێویست کراون لەسەر ئادەمیزاد جێ بەجێ بکرێن، وەك دەست پاکی لەکێشانەو پێوانەدا و ڕاگرتنی پەیمانەکانی خواو پەیڕەوی دادپەروەری، زۆر ئاشکرایە هەرشتێ پێویستبێ کردنی قەدەغەیە وازلێهێنانی، هەرشتێکیش قەدەغەبێت پێویستە نەکرێن .. زانایان ئەوشتانەی لەم سێ ئایەتەی دواییدا ناویان بردوون بە (١٠) سپاردەکانی خوا، لەمەو پاش خوای مەزن باسی ئەو (١٠) سپاردنەمان بۆ دەکاو ئەفەرموێ:

١- ﴿ قُلْ تَعالَوا أتْلُ ما حَرَمَ رَبُكُمْ عَلَيْكُمْ أنْ لا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً ﴾ تۆبڵێ بە بت پەرستان: ئێوە وەرن و ببینن من ئەخوێنمەوە شتێ پەروەردەکەری ئێوە قەدەغەی کردوە لەسەر ئێوە کە هاوبەش دانێن بۆ پەروەردەکەری خۆتان هیچ شتێ و بەتاك و تەنهای دابنێن، ئێوە بنچینەو لقەکانی ئایین هەر بۆلای ئەو بگێڕنەوە، هەمو ماف و پێویست کراوەکان لەخواوۆ بزانن ، هەر خوایە وەربگرێ پەرستن و کردەوەی چاك ، خوا بێ وێنەیە لەشێوەو کرداردا.

٢- ﴿ وَبِالوالِدَيْنِ إحْساناً ﴾ وەئێوە چاکە بکەن لەگەڵ دایك وباوکاتانا بەچاکە کردن، خوای مەزن سپاردنی چاکە کردنی لەگەڵ دایك و باوکا کردوە بەهاوڕێی پەرستنی خۆی و لەدوای پەرستنی خۆی باسی چاکە کردن لەگەڵ دایك وباوکا ئەکاو ئەفەرموێ: دووهەمین پلەیە پاش هاوبەش دانەنان بۆ خوا، لەباسی مانای ئایەتی (٨٣)ی سورەتی ئەلبەقەرەدا باسی چاکە کردن لەگەڵ باوك و دایکدا تێپەڕیوە .

پاش ئەوەی خوای مەزن سپاردویەتی بە منالەكان چاكە بكەن لەگەڵ باوك و دایكی خۆیانا، بەباوكانیش ئەفەرموێ: چاودێری و ئاگاداری منالەكانیان بكەن و نەترسن بۆ بەخێو كردنیان .

٣- ﴿ وَلا تَقْتُلُوا أَوْلادَكُمْ مِنْ إِمْلاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِياهُمْ ﴾ وەئێوە منالەكانتان مەكوژن بەبۆنەی هەژاری و ترستان بۆ بەخێو كردنیان، ئێمە ئێوەو منالەكانتان بەخێو ئەكەین و خواردەمەنیان ئەدەینێ، هەمو پێویستی منالەكانتان لەسەر ئێمەیە نەك لەسەر ئێوە، ئیتر بۆ ئەبێ بییان كوژن؟. لەباسی مانای ئایەتی (١٣٧) ی ئەم سورەتەدا ئەو باسە تێپەڕیوە جارێ تر .

٤- ﴿ وَلا تَقْرَبُوا الْفَواحِشَ ﴾ وەئێوە نزیكی كردەوە خراپ و ناپەسەندەكان مەكەون. هەمو شتێ لەسنوری دیاری كراوی خوا دەرچوبێ پێی ئەوترێ كردەوەی ناپەسەند و بێزی لێ كراوە، وەك داوێن پیسی و نێربازی و ستەمكردن وناوبردنی دانیشتوان بەخراپەو ڕوتی ژنان و درۆكردن و بوختان كردن و دوو زمانی وتانەدان و بەرچاو تەنگی و سود خواردن، لەهەموان خراپتر هاوبەشدانانە بۆ خوا و بێ ئایینەو، ئازاردانی دایك وباوك و كوشتنی بێ تاوان وخوادرنی دارایی هەتیوان، ئەو گوناهە گەورانە هەریەكەیان باسێكی تایبەتیان بۆ دانراوە، هەرچەندە ئەو ڕستەیە ئەیانگرێتەوە، چونكە ئەو گوناهە گەورانە ئەو پەڕی خراپیان گرتووە بەئاشكرا بكرێن یا بەنهێنی، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

﴿ ما ظَهرَ مِنْها وَما بَطَنْ ﴾ شتێ ئاشكرابێ لەو گوناهە لەسنور دەرچوانە لەنێوان خۆتان و لەنێوان خەڵكیدا و شتێ نهێنیە لەنێوان خۆتان و خوادا، ئەو ڕستەیە لەوەوە هاتووە دانیشتوان پێش ئیسلام بەنهێنی داوێن پیسیان ئەكردو لایان نەنگ و خراپ بوو بەئاشكرا بیكەن بۆیە خوا فێریان ئەكا ئاشكراو نهێنیان پێویستە لێیانزیك نەبینەوە، فەرماندان بەقەدەغەكردنی نزیكبونەوەیان فێرمان ئەكا چونە نێویان و كردنیان زۆر خراپترە .

٥-﴿ وَلا تَقْتُلُوا النَفْسَ التِي حَرَمَ اللهُ إلاّ بِالْحَقِ ﴾ وەئێوە مەکوژن خاوە نگیانێکی ئەوتۆ خوا قەدەغەی کردوە کوشتنی مەگەر بەهۆی مافێکی ڕەواوە بکوژرێ و شتێکی وای کردبێ شایانی کوشتن بێ، ڕەوا بونی ئەو کوشتنە بەهۆی چوار شتەوەیە، وەرگەڕان لەئایینی خوا دوای باوەڕهێنان، داوێن پیسی دوای ژن هێنان. کوشتنی کەسێ بەناڕەوا، کۆشش کردن بۆ بلاّو بونەوەی خراپە لەزەویدا .

﴿ ذالِكُمْ وَصاكُمْ بِهِ لَعَلَكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ ئەو پێنج قەدەغەکراوانە خوا سپاردویە بەئێوە نەیان کەن و نزیکیان نەکەون و ئەو فەرمانانەی خوا بپارێزن، بۆ ئەوەی ئێوە لەگەورەیی خوا بزانن و ئەوانەی داواتان لێی کراوە بیانزانن و کاریان پێ بکەن و سودیان لێی وەربگرن .

٦- ﴿ وَلا تَقْرَبُوا مالَ الْيَتِمِ إلاّ بالتِي هِيّ أحْسَنّ حتى يَبْلِغَ أشُدَهُ ﴾ وەئێوە نزیکی دارایی هەتیو مەکەون بەهیچ شێوەیەك نەبەخواردنی و جگەی خواردن مەگەر بەشتێکی ئەوتۆ ئەو شتە چاکترو شیرینتر بێ هەتا ئەو هەتیوە ئەگاتە کاتی هێزی خۆیی و بالّغ ئەبێت کەکاتی ژیری‌و شارەزابوونی مامەلّەکردن و هاوردن و بردنی سودی خۆیەتی، نزیکبونەوەی دارایی هەتیو بەچاکترو بەپاراستنی بۆ لەناوچوون دروستە وەك لەشارەو شار پێ‌کردنی بۆ بازرگانی و ئالّ ویلّ کردنی وبەشتێ پەرەبسێنێ و نابوت نەبێ، قەدەغەکردنی نزیکبونەوە لەدارایی هەتیو بۆ ئەوەیە پێمان بناسێنێ هەمو جۆرە دەست کاری کردنی هەتیو لەخواردن و سود لێ وەرگرتن و جگەی ئەوانیش ئەوپەڕی قەدەغەیە. یانێ خوای مەزن ڕێگە تەسك ئەکاتەوە لەبارەی دارایی هەتیوەوۆ مەگەر بەجۆرێ چاکبێ ورێك بکەوێ لەگەلّ باری دانیشتوان وئیتر ئەو هەتیوە شێتبێ یا گێل یا لەتەمەندا بچوك بێ و نەگەیشتبێ بە پازدە سالّی پێویستە لەوکاتانەدا باوکی ئەو منالّە و کارپێ سپێردراوەکەی چاودێری سامانی ئەوان بکەن و بیانپارێزن لەلەناوچون، ڕێگەیان پێ دراوە ئالّ و ویلّ بکەن بەدارایی هەتیو بەشتێ سود بگەیەنێ بەو، بگرە لەهەندێ کاتا پێویستە، ڕستەی (مەگەر بەچاکتر ) پشت گیری ئەو زانایانە ئەکا لایان وایە دەست کاری‌کردنی دارایی هەتیو لەلایەن کار پێ سپێردراویانەوە دروست نیە مەگەر قازانج و سودی تیابێ، ئیتر ئەو کارپێسپێردراوە باوکبێ یا باپیر یا کەسێ تر .

پرسیار/ ووشەی هەتیو تایبەتە بەکەسێکەوە باوکی مردبێ و منالٌ بێ، دوایی تـۆ چـۆن ئەیگێڕی بەوەی هەمو کەس بگرێتەوە کە ئەقڵیان ناتەواو بێ، ئیتر هەتیو بن و منالٌ یاشێت و گێل .

وەلاّم/ ئێمە ئەزانین بەبێ گومان ئەو هۆیەکە دەستورێ بۆ ئەوەی پێویستبێ دەستکاری دارایی هەتیو بکرێ بەچاکتر ئەوەیە ئەو هەتیوە ناتەواوە لەلایەن ئەقڵــەوەو بەتەنـها هـەر هەتیوی نیە، ناتەواوی پەیدایە لەهەمویاندا بەبێ جیاواز .

٧- ﴿ وَأَوْفُوا الكَيْلَ وَالْمِيْزانَ بِالْقِسْطِ ﴾ وەئێوە جـێ بـەجێ بکـەن پێوانـە وکێشـانە بەجۆرێکی دادپەروەری و یەکسانی، نەکەم بدەن بەدانیشتوان و نەزۆر بـۆ خۆتـان بـهێنن لەکڕین و لەفرۆشتندا. دوای هاتنە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـە هاورێکـانی پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ بەخزمەت پێغەمەریان گەیاند و ووتیان: ئەی فرستادەی خـوا وائـەبێ لـەتوانامان نـەبێ و کاتێ وائەبێ نەختێ زمانی ترازو لابدا یا کەم یـا زۆر ڕابکێشـێ بـە لایـەکا خـوا وەلاّمـی دانەوەو فەرموی:

﴿ لا نُكَلِفُ نَفْساَ إلاّ وَسْعَها ﴾ ئێمە داوا لـەهیچ کەسێ ناکەین بۆ کردنـی هیـچ شـتێ مەگەر لەتوانای ئەو کەسەدا هەبێ کردنی ئەوشتەو بۆی بگونجێ .

زۆر ئاشکرایە بەگوێرە ڕەوشت و دام و دەزگای دانیشتوان چاوپۆشی لـەیەکتر ئەکـەن بەشتێ کەم یا زۆر لـەکڕین و فرۆشتندا، پەیوەست بون بەیەکسانیە زۆر گرانـە، بەهـەمو جۆرێ ئالٌ ویٌلٌ و کڕین و فرۆشتن بەستراوە بەخۆشی و لێ بوردن لـەنێوان یەکتریدا، ئەگەر بە ئارەزوو دەستوری خۆیان دابەزین ئەوکاتە یەکسانی چاوپۆشی لێ ئەکرێ، ئیتر ئەو شتە پێورابێ یا کێشراو یا ژماردن یا بەگەزبێ، چونکە زۆر گرانە تەماشاکردنی هەمو پەڕەکانی پەرتوك و دانەدانە و تاڵەتاڵەی کڕاو و فرۆشراو .

٨- ﴿ وَإذا قُلْتُمْ فَأعْدِلُوا وَلَوْ كانَ ذا قُرْبى ﴾ وەهەر کاتێك ئێـوە گفتوگۆتـان کـرد لەفەرماندان و شایەتی داندا لـە دادگاو جگەی دادگا ئێوە ڕاست بکەن و بەڕاستی بیلێـن لەهەمو کێشەو کارتانا دەربارەی یەکتری بۆ قازانجێ یا بۆ زیانتانبێ و بۆ هەمو کەسـێ و، بائـەو کەسـە خـزم و خۆیشـتان بـن. نـاوەڕۆکی ئـەو ڕستە بەنرخـە تاکـە شـتێکە بـۆ

تاقیکردنەوەی کەسانێ لەخوابترسن و هەست بەلێی پرسراوی بکەن لەبەردەم خوای مەزندا، نەك لەبەردەم ژن و باوك و دایك یا کاربەدەستان نابێ هیچ شتێ نرخی پێ بدرێ مەگەر دادپەروەری و ڕاستی نرخی پی بدرێ بەتەنها، هەرکەسێ خۆی بەئایینەوە هەلّکێشێ و بەناویی ئایینەوە بدوێ لەپاشا ڕوی خۆی وەرگێڕێ بۆ لای خزم و دۆست لەدژی جگەی ئەوان بەنارەوایی ئەو کەسە فڕی بەئایینەوە نیە .

٩- ﴿ وَبَعْهدَ اللهِ أوفوا ﴾ وەئێوە بەپەیمانی خوا هەلّسن و بەو پەیمانەوە خۆتان ببەستن، لەنوێژ کردن و زەکاتدان و ڕۆژو گرتن و حەج کردن و پەیمانی نێوان خۆتان و جگەی خۆتان، لەدژی بەلێندانتانا کارمەکەن، ڕاست گۆو دەست پاك و خاوەن بەزەیی و گوێ ڕایەلّی فەرمانەکانی خوا بن .

﴿ ذالِكُمْ وَصاكُمْ بِهِ لَعَلَكُمْ تَذَكَرُونَ ﴾ ئەو شتانە فەرمانیان پێ درا لەئایەتەکاندا خوا سپاردویەتی بەئێوە کاریان پێ بکەن ،بۆ ئەوە ئێوە ئامۆژگاری وەربگرن و بێ ئاگا نەبن لەپەرستنی خوادا.

١٠- ﴿ وَأنَ هذا صِراطِي مُسْتَقِيماً فَأتَبِعُوهُ وَلا تَتَبِعُوا السُبُلَ فَتَفَرَقَ بِكُمْ عَنْ سَبِلِيهِ ﴾ وەلەبەرئەوە بەڕاستی ئەو شتەی باسکرا لەم سورەتەدا ڕێگەی منە لەکاتێکا ڕاستەو چەوتی تێدا نیە کەبریتیە لەدانانی خوا بەتاك و تەنها و برِوا بەپێغەمەران و روونکردنەوەی یاساکانی من، ڕێگەیە جگەی ڕێگەی خوابێ نەمان و گومڕایی و بێ باوەڕ بە و دووای ئەو ڕێگەی منە بکەون و دوای چەندین ڕێگەی تر مەکەون، وەك بت پەرستی و بێ ئایینی و تاقمەکانی تر و ئایینە پڕوپوچەکانی تر، دوایی ئەو ڕێگایانە ئێوە لەیەك بترازێنێ و پارچە پارچەتان بکا و درۆتان بخاتەوەلەریگەی خوا کەئایینی پیرۆزی ئیسلامە، هەر ڕێگەیە جگەی یاسای قورئان و ئیسلامی پیرۆزبێ هەواو هەوەس و دەستوری دەست کردی پوچە، ئەوکەسانەیش سنور و جێگەو دەستورێکی ڕێك وپێکی بۆ دانەنرا هەرکاتێ ئادەمیزاد دووایان کەوتن تاقم تاقم و پارچە پارچە ئەبن ودژی یەکتر ئەوەستن و دوژمن زالّ ئەبێ بەسەریاندا، وەك ئەم سەردەمەی ئێمە. بەلاّم ئەگەر هەموو ئادەمیزاد. دوایی

ئایینی خوا بکەون ئەو بیرو باوەڕە ڕاستە ئەیانگیڕێ بەیەك پارچەو گیرو گرفت لەنێو یانان نامێنێ .

﴿ ذَالِكُمْ وَصاكُم بِهِ لَعَلَكُمْ تَتَقُونَ ﴾ ئەو دوواگەوتنەی ئاییني خواو ڕێگەیە خوارو خێچی تێدانیە، خوا سپاردویە بەئێوە دووای بکەون بۆ ئەوەی ئێوە خۆتان بپارێزن لە بێ فەرمانی خوا و دواکەوتنی ڕێگەیە ئێوە پارچە پارچە بکا لەدژی یەکتری و دوای ڕێگەی شەیتان بکەون .

بۆ زانین: خوای مەزن لەئایەتی یەکەمدا فەرموی: ( لَعَلَكُمْ تَعْقِلُونَ ) بۆ ئەوەی ئاگادارمان بکاتەوە کە خوا لەو ئایەتەدا داوای پێنج شتی لێ کردووین: قەدەغەکردنی هاوبەشدانان بۆ خواو. قەدەغەکردنی کوشتنی منداڵان لەترسی هەژاری و بێ ئابڕویی. قەدەغەکردنی کاری ناپەسەندو بێزلێکراوە بەئاشکرایی وبەنهێنی. قەدەغە کردنی کوشتنی کەسێ قەدەغەکرابێ کوشتنی. فەرماندان بەچاکەکردن لەگەڵ باوك و دایکا، ئەوانە هەموویان ئاشکران و دیارین و بەرچاوین، بەهۆی ئەقڵەوە بەبێ ماندوبوون ئەزانرێ سوودی هەردوو جیهانیان تێدایەو بەئاسانی لێیان تێ ئەگەن. لەئایەتی دووهەمدا فەرموی: (لَعَلَكُمْ تَذَكَرُونَ ) بۆ ئەوەیە تێمان بگەیەنێ کەئەو ئایەتە چوار شتی تێدا باسکراوە: قەدەغەکردنی نزیك بونەوە لە دارایی هەتیو مەگەر بەڕێگەیەکی باشتر بۆ گەشە پێکردنی دارایی یەکەی. هەڵسان بەپێوانەو بەکێشانە و بەتەواوی و بەبێ کەم و کوڕی و چاودێری بکرێن بە دادپەروەری و یەکسانی. فەرمانی داوە بەشایەتی دان بە ڕاستی بە گفتو گۆو بەکردار، با بۆ زیانی خۆمان بێ. فەرماندان بەجێ بەجێ کردنی پەیمانی خوا لەهەمو ڕویەکەوە و ئەوانیش هەرچواریان نهێنی و نادیاربن پێویستیان بە خۆماندوکردن هەیە بۆ ئەوەی هەتا ئادەمیزاد ڕاغویی وەرگرن و جێگەی دادپەروەرییان بۆ دیاری بکەن .

لەئایەتی سێهەمدا فەرموی: ( لَعَلَكُمْ تَتَقُونَ ) بۆ ئەوەی فێرمان بکا ئەو شتانەی کە خوا داوایان دەکا لە ئێمە ڕێگەی ڕاست و پەسەندی خوان پێویستە چاودێری بکرێن و ئێوە خۆتانی لێ گێل نەکەن، خۆتان بپارێزن لەبێ فەرمانی خوا و سزای دوارۆژ، هەتا خوای گەورەش ئێوە لەسزای ئاگر بپارێزێ و بۆیشمان بنوسێ بەختیاری بەردەوام .

بێ باوەڕان لەمەکەی پیرۆزدا ئەیانزانی کەجوەکان خاوەنی نامەیەکن ناوی تەوراتە، گاورەکانیش نامەیان هەیە ناوی ئینجیلە، بۆیە ئەوانیش ئاواتیان ئەخواست ئەوانیش نامەیەکیان بۆ بهاتایەتە خوارەوە وێنەی جوەکان و گاورەکان. سوێندی قورسیان ئەخوارد ئەگەور هات بۆلایان باوەڕی پێبهێنن. کەچی کاتێ قورئان هاتە خوارەوە پشتیان تێ کرد، بۆیە خوای مەزنرائەگەیەنێ بەڕەوانە کراوی خۆی: ئەم ئایەتەی خوارەوەیان بەسەردا بخوێنێتەوە. بەبت پەرستان ڕابکەیەنێ بەو جۆرەی قورئان لەزۆر جێگەدا باسی کردووە و ئەفەرموێ:

ثُمَّ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٤﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٥٥﴾ أَن تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَٰفِلِينَ ﴿١٥٦﴾ أَوْ تَقُولُوا۟ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ مِنْهُمْ ۚ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ ۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَا ۗ سَنَجْزِى ٱلَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْدِفُونَ ﴿١٥٧﴾

﴿ ثُمَّ آتَيْنا مُوسى الْكِتابَ تَماماً عَلَى الذي أحْسَنَ وَتَفْصيلاً لِكُلِ شَيْءٍ ﴾ لەپاشا ئێمە بەخشیومانە بە موسا نامەیە تەواوکەری ڕێزو چاکەکردنە لەسەر کەسێکی ئەوتۆ بەچاکی بەو نامەیە کاربکاو، ڕون کەرەوەی هەمو فەرمانەکانی ئەوتۆیە ئادەمیزاد پێویستیان پێیان هەبوو .

﴿ وَهُدى وَرَحْمَةً لَعَلَهُمْ بلقاء رَبِهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴾ وەئەو نامەیەی موسا ڕاغویی کەرە ڕاستی و چاکە ئەناسێنێ بەئادەمیزاد و میهرەبانیە بۆیان و ئەژین بەژیانێکی پاك و بێ ئاشوب. بۆئەوەی بەنی ئیسرائیلی باوەڕ بەگەیشتنی پەروەردەکەری خۆیان بهێنن. بەجۆرێ تر مانای ئەوڕستانە کراوە: لەپاشان بەخشیمان بەموسا نامەیە لە بەرێزگرتن و چاکە ڕژاندن بەسەر کەسێکی ئەوتۆ بەچاکی هەڵساوە بەناوەڕۆکی ئەو نامەیە. وەئەو کەسە بەدرێژی هەموو شتێ پێویستبێ لەئایینداا ڕوونی ئەکاتەوەو، شارەزایی کەری بەنی ئیسرائیلەو میهرەبانی و خۆشیە بۆیان .

ووشەی (ثم) بۆ ئەوە نیە کاتی بەخشینی تەورات بە موسا دوای هاتنی قورئان بوبێ بەگوێرەی کات. بۆ باسکردنی هەواڵێکە دوای هەواڵێ تر، بەچاوپۆشی کردن لەکاتەکانیان .

﴿ وَهذا كِتابٌ أنْزَلْناهُ مُبارَكَ فَأتَبِعُوهُ لَعَلَكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ وەئەم قورئانە نامەیەکە ئێمە ناردومانەتە خوارەوە پیرۆزەو خاوەنی سودی زۆرە، ڕەوانە کراوە بۆلای تۆ بەوێنەی ڕەوانەکردنی تەورات بۆ سەر موسا، دوایی ئێوە پەیڕەوی ئەو فەرمانانە بکەن لەقورئاندان و بڕوا بەڕاستی ئەو نامەیە بێنن و کاری پێ بکەن، خۆتان ئەزانن کەبەزمانی خۆتان نێرراوە، هەتا لەپاراوی ورەوان بێژی ئەو نامەیە بگەن و بزانن کەس ناتوانێ وێنەی ئەو نامەیە دانێ یاسێ ئایەتی ئەو نامەیەدانێ جگەی خوا .

﴿ وأتَقُوا لَعَلَكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ وەئێوە خۆتان بپارێزن لەبێ فەرمانی خوا، لەنهێنیشدا دژی فەرمانی خوا مەوەستن بۆئەوەی بەزەیی و میهرەبانی خوا لەهەردوو جیهاندا بتانگرێتەوە.

﴿ أنْ تَقُولُوا إنَمّا أنْزِلَ الْكِتابُ عَلَى طا~فَتَيْنِ مَنْ قَبْلِنا ﴾ ئێمه ئـەو قورئانـە پیرۆزەمـان ناردوەته خوارەوەبۆ ئەوەی ئێوه نەڵێن: بەڕاستی نێرراوەته خوارەوە نامەی خـوا بـۆ سـەر ئەو دوو هۆزە لـەپێش ئێمەوە بوون لـەگاورو لـەجوەكان .

﴿ وَإنْ كُنا عَنْ دِراسَتِهِمْ لَغافِلُونَ ﴾ وەبەڕاستی ئێمه عەرەب بێ ئاگـاین لـەخوێندنی نامەی ئەوان و نازانین ئامۆژگاری ئەو نامەیە چ شتێكەو لەزمانی ئەوان تێ ناگـەین، یـانێ ئەی گەلی عەرەب: بەڕاستی ئێمە ناردومانەتە خوارەوە قورئان بەزمانی خۆتان و بـۆ سـەر پیاوێ لـەڕەگەزی خۆتـان هـەتا بیانوتـان نـەمێنێ و نـەڵێن: خـوا لـەئاسمانـەوە نامـەی بـۆ نەناردووین بەزمانی خۆمان: بەڵكو بەزمانی گاورو جو ناردویـەتی بـۆ لای ئێمـە وفـێری زمانیان نەبووین .

﴿ وَأتَقُوا لَوْ أنْزَلَ عَلَيْنا الْكِتابُ لَكُنا أهْدى مِنْهُمْ ﴾ یـائێوه بلێـن: ئەگـەر بنێردرایەتـە خوارەوە بەسەر ئێمەدا نامە بەزمانی خۆمان بەوینەی هاتنە خوارەوەی نامە بۆ سەر ئـەوان بەڕاستی ئێمە ڕاغویی تر ئەبوین لـەوان و بەر لـەوان باوەڕمان ئەهێناو پـەیڕەوی فـەرمان و دەستوری خوامان ئەكرد چونكە مێشكمان پاكترو كراوەترەو زمانمان پاراوترە لـەوان بـۆ گفتو گۆو دانانی پەخشان و هۆنراوە .

﴿ فقَدْ جاءَكُمْ بيّنة مِنْ ربكُمْ وَهُـدىً وَرَحْمَـةً ﴾ دوایـی بەڕاسـتی هـاتوە بـۆلای ئێـوە بەڵگەیەكی ڕون و ئاشكرا كە قورئانەو بەزمانی خۆتان و نیشانەی ڕونـە لـەسـەر ڕاسـتی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ هەمو یاسای تێدایە بۆ ئێوەو جگەی ئێوەش و ئێوە لەتاریكیەكان دەرئـەكا بۆلای ڕوناكی وە شارەزایەتیان ئەكا و لاتان ئەدا لـەگومڕایی و چاكەی خوایە ڕژاندویەتی بەسەرتانا .

﴿ فَمَنْ أظْلَمَ مِمَنْ كَذِبَ بِأياتِ اللهِ وَصَـدَفَ عَنْـها ﴾ دوایـی چ كەسـێكە سـتەمكارتر لـەكەسێ باوەڕ بەئایەتەكانی قورئانی خوا نەیەرێ و بزانێ ڕاستن و بۆی گونجاوە فێربونیـان واز لـەو ئایەتانە بهێنێو ڕێگە بگرێ لەباوەڕیێ هێنانیان .

﴿ سَيَجْزِي الذيْـنَ يَصْدِفُـونَ عَـنْ أياتِنـا سُـوءَ الْعَـذابِ بِمـا كـانُوا يَصْدِفُـونَ ﴾ ئێمـە لەپاشەڕۆژدا پاداشتی كەسانێكی ئەوتۆ ئەدەینەوە واز لـەئایەتەكانی قورئانی ئێمە ئـەهێنێ و

ڕێگەلە ئایین ئەبەستن بەسزایەکی خراپ بەهۆی ئەو شتەوە وازی لێهێناوە و ڕێگەی لێگرتووە دووای ئەوەی خوای مەزن ڕونی کردەوە بت پەرستان وازیان لەئایەتەکانی خوا هێناوە لەماناکانیان .ووردنەبونەتەوە ئەفەرموێ :

هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِى شَىْءٍ ۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿١٥٩﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾

ئەوەی لەو ئایەتانەی پێشودا باسی کراوە ئەوەیە کە بت پەرستانی مەکەو بێ باوەڕان بەڕاستی ئەوان باوەڕناهێنن مەگەر بە هۆی یەکێ لەم شتانەوە بێ کەخوای مەزن باسی ئەکاو ئەفەرموێ :

١- ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إلاّ انْ تَأْتِهِمُ الْمَلائِكَةُ ﴾ بت پەرستان و بێ باوەڕان باوەڕ بەتۆ نایەرن و چاوەڕووان ناکرێ باوەڕبهێنن مەگەر بێت بۆ لای ئەوان فریشتەکانی گیان کێش و گیانیان بکێشن .

٢- ﴿ أوْ يَأْتِ رَبُّكَ ﴾ یابێت فەرمان و سزای پەروەردەکەری تۆ لەرۆژی دواییدا تۆڵەیان لێ بسێنێ، یالەجیهاندا لەناویان ببا بەوێنەی گەلانی پێشوو .

٣- ﴿ أو يَأتي بَعْضَ أياتِ رَبُكَ ﴾ یابێت هەندێ لەنیشانە ئاشکراکانی پەروەردەکەری تۆ بەڵگەبن لەسەر پەیدابوون و هاتنی ڕۆژی دوایی، وەك هەڵاتنی خۆر لە ڕۆژئاواوە بە پێچەوانەی ئێستا .

خوای مەزن بەوڕستانە ڕوونی کردەوە مۆڵەتی بێ باوەڕان لەجیهاندا، بەڵام کاتێ ڕۆژی دوایی هات مۆڵەتیان نادرێ، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ يَوْمَ يَاتي يَعْضَ أياتِ رَبكَ لا يَنْفَعُ نَفساً إيمانُها لَمْ تَكُنْ أمَنَتَ مِنْ قَبْلُ ﴾ باوەڕهێنان ڕۆژێ سودی ئەبێ بۆ کەسێ، باوەڕهێنانەکەی بەر لەوکاتە بێت هەندێ لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی پەیدابێ، بەوێنەی سەرەمەرگ، ئەو کاتە ئەو باوەڕپێهێنانە سودی پێ نابەخشێ، چونکە ناچارە باوەڕ ئەهێنێ.

﴿ أو كَسَبَتْ في إيمانِها خَيْراً ﴾ یارۆژێ ڕزگاری ئەبێ بەرلەهاتنی هەندێ لەنیشانەکانی پەروەردگاری تۆ، ئەو کەسە بەجۆرێ بوبێ کارێکی چاکی کردبێ لەباوەڕهێنانەکەیا و پەشیمان بوبێتەوە لەبێ باوەڕی، تەنها باوەڕهێنان سوود بەخش نیە، هەرچەندە بەباوەڕهێنان خاوەنەکەی بەردەوام نابێت لەنێو ئاگردا ورزگاری ناکا لەسزای ئاگر. بەڵام کەسێ باوەڕی هێنابێ و کردەوەی چاکی کردبێ‌چ ناچێتە ناوئاگر هەرگیز.

﴿ قُلِ أنتَظِرُوا إنا مُنْتَظِرُونَ ﴾ تۆ بڵێ ئێوە چاوەڕوانی یەکێ لەوسێ نیشانانە بکەن بەڕاستی ئێمە چاوەڕوانی هاتنیان ئەکەین، ئەو کاتە ئەزانن چ کەسێ دێت بۆلای ئەو سزایەی بۆی ئامادەکراوە .

﴿ إنَ الذيْنَ فَرَقُوا دِنَهُمْ وَكانُوا شِيَعاً لَسْتَ مِنْهُمْ ﴾ بەڕاستی کەسانێ پەراگەندەو پارچە پارچەی کردبێ ئایینەکانی خۆیان یان باوەڕ ئەهێنن بە هەندێ لە پێغەمەران و نامەکان و باوەڕ بەهەندێکیان نایەرن و بوون بەچەندین تاقم و کۆمەڵ وێنەی ئەمانەی خوارەوە:

١- بت پەرستان بوون بەچەند پارچەیە: هەیانە ئەستێرە پەرستن، هەیانە ڕوناکی و تاریکی ئەپەرستن، هەیانە بتەکان ئەپەرستن .

٢- جولەکەکان بوون بە ( ٧١) تاقم و بەناوبانگەکانیان ئەمانەن ( فریسین ) یانی گۆشە گیرەکان و تێکەڵاوی هیچ کەسێ ناکەن. ( الصدیقیین ) سەربەسە دوق ناوێکن بڕوایان وایە زندوبونەوەو پرسیار و سزاو بەهەشت و دۆزەخ نین. (القرایین) باوەڕیان بەتەورات هەیە بەتەنها .

٣- گاورەکان بوو بەچەندین کۆمەڵ، بەناوبانگەکانیان ئەمانەن: هەیانە سەربەکلێسای ڕۆژئاوان. هەیان ەسەربە کلێسای ڕۆژهەلاتن، ئەو دوو کۆمەلأنە ئەگەنە (٧٢) تاقم .

٤- موسوڵمانان بوون بە (٧٣) تاقم، بەجۆرێ هەندێکیان ئەوانی تر بەبێ باوەڕدائەنێن، بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ هەمویان ئەچنە نێو دۆزەخ جگەی ئەو تاقمەی دوای ڕەوشت وکردەوەی پێغەمەرو هاورێکانی کەوتون.

﴿ لَسْتَ مِنْهُمْ في شَيءٍ انما أمْرُهُمْ الى الله ثُمَ يُنَبِئَهُمْ بِما كانُوا يَفْعَلُونَ ﴾ تۆ لێپرساوی ئەوان نیت ،لەبارەی پرسیارلێ کردنیان و پارچە پارچەیی ئەوان و سزادانیان و پەشیمان بونەوەیان لەبت پەرستی. بەڕاستی کارو فرمان و پاداشت و سزای ئەوان ئەگەرێتەوە بۆ لای خوا بەتەنها لەپاشان خوا هەواڵئەدا بەوان لەرۆژی دواییدا بەشتێ ئەیکەن لەپەیداکردنی ئاشوبدا .

﴿ مَنْ جاءَ بالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أمْثالِها وَمَنْ جاءَ بالْسَيئَةِ فَلا يُجْزى إلاّ مَثَلَها ﴾ هەرکەسێ بێت بۆ لای خوا بەچاکەو کاری پەسەندەوە، دوایی بۆ ئەو کەسە هەیە (١٠)ە ئەوەندەی ئەو چاکەیە کردویێتی لەپاداشت و، هەرکەسێ بێت بۆلای خوا بەخراپەو کاری نارەواوە دوایی پاداشتی ئەو کەسە نادرێتەوەمەگەر بەوێنەی خراپەکەی، لەمانای ئایەتی (٢٦١)ی ئەلبەقەرە باس کراوە، دوای ئەوەی خوا باسی ئەو کەسانەی کرد ئەبن بەچەند تاقم، فەرمان ئەدا بەپێغەمەر و ئەفەرموێ :

قُلْ إِنَّنِي هَدَىٰنِي رَبِّيٓ
إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ دِينٗا قِيَمٗا مِّلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۚ وَمَا كَانَ مِنَ

ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ
رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ
﴿١٦٣﴾ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ ۚ وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ
نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ
فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿١٦٤﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ
خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ
فِي مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿١٦٥﴾

﴿ قُلْ أني هَدانيْ رَبي إلى صِراطِ مُسْتَقِيمْ ﴾ تۆ بلێ بەو گەلە ئایینی خۆیانیان پارچە پارچەبوون بەڕاستی خوای پەروەردگاری من شارەزایی منی کردوە بۆلای ڕێگەی ڕاست بەبۆنەی پاکی دەروونی خۆمەوە بەخشیویە بەمن ئەو ڕێگە ڕاستە، دوری خستومەتەوە لەئایینی پوچ .

﴿ دِيْناً قَيِماً مَلَةَ إبْراهِيمَ حَنِيفاً وَماكانَ مِنْ الْمُشْرِكيْنَ ﴾ ئە وڕێگە ڕاست ئاینێکە کاری ئادەمیزاد بەوەوە ڕائەوەستێ ئایینی ئیبراهیمە لایداوە لە هەمو ئایینە پڕو پوچەکان بۆ لای ئایینی ڕاست زۆر ئاشکرایە ڕێگەو ئایینێ ڕاستبێ ئەو ئایینەیە تۆ لەسەریتی و هەموو ئایینەکان ڕێزی لێی ئەگرن بەبێ جیاوازی، ئیبراهیم لەبت پەرستان نەبووە و جو و گاوریش نەبووە کە هەریەکە لەوانە ئەڵێن: ئیبراهیم لەسەری ئایینی ئێمە بووە.

لەئایەتی پێشودا باسی بنچینەی بیرو باوەڕی ئیسلام کرا، لەمەودوایش باسی لق و دەستوری پەرستنەکانی خوا ئەکا و لەو بارەیەوە ئەفەرموێ :

﴿ قُلْ إني صَلاتي وَنُسُكي وَمَحْيـاي وَمَماتي اللهِ رَبِ الْعـالَمِينَ ﴾ تـۆ بلّـێ: بەڕاسـتی نویژکردنی من و پەرستنەکانی تری من و ئەوەی من ئەیکەم لەژیانمدا و ئـەوەی لەسـەری ئەمرم بۆ خوایە کەپەروەردەکەری هەموو بونەوەرانە .

﴿ لا شَّرِيكَ لَهُ وَبِذلِكَ امِرْتُ وَأنا أوَلَ الْمُسْلِمينَ ﴾ هیـچ هاوبەشـێ بـۆ خـوا نیـە لـە پەرستن و لـە دروست کردن و لـە فەرماندانداو لـە دیاری کردنی هەموشتێکا و من بـەوە فەرمانم پێدراوە هاوبەش بۆخوا دانەنێم و نیازم پاکبێ و من یەکەمین کەسم لەموسڵمانانداو باوەڕم بەئایینی پاکی ئیسلام هێنـاوە، بێگومـان پێغەمـەر یەکـەم ئیسـلامە چونکـە خـۆی داواکاری گەیاندنی ئایینی ئیسلام ڕائەگەیەنێ .

﴿ قُلْ أغَيْرَ اللهِ أبْغي رَباً وَهُوَ رَبُ كُلّ شَيءٍ ﴾ تۆ بلّێ: ئایا من جگەی خوا داوا بکـەم و بیکەم بە گەورەو پەروەردگاری خۆم و لەکوێم دەسـت ئەکـەوێ خوایـە تـر و، خـوا پەروەردەکەری هەموو شتێکە، ڕو بۆ هەر شـوێنێ بکـەم خـوا لـەو شـوێنەدایە و تـاك و تەنهایە .

﴿ ولا تكسب كل نفس الا عليها ﴾ وەهەمو کەسێ هیچ شتێ ناکا مەگـەر زیانەکـەی لەسەر خۆیتی کەواتە داواکردنی جگەی خـوا سـود نابەخشـێ، پاداشـتی هـەمو کـارێ لەسەر خۆیتی، گوناهی تاوانباران لەسەر خۆیانە و لەسەر جگەی خۆیان نیە. ئەوڕسـتەیە لـەوەوە هـاتووە بـت پەرسـتان ئـەیان ووت: ئێـوەی بـاوەڕدار دوای ئێمـە بکـەون و گوناهەکانتا هەڵئەگرین، یانێ هەمو شتێ ئـادەمیزاد بیکـەن لەچاکـە و لەخراپـە دەسـت کەوتی سروشتی خۆیانە و لەجێگە و کاتی تایبەتی خۆیانان، هەرکەسێ کردەوەی کەسـێ تر بدا بەسەر کەسێ تردا ڕاستەو خۆ وێنەی کەسێکە بلّـێ: ئـەو منالّـە لـەدایکی خـۆی نەبووە، ئەو میوەیە لەو درەختەی خۆی پەیدا نەبووە .

﴿ وَلا تَرِزُ وازرَةَ وزْرَ أخْرى ثُـمَ الى رَبِكُـمْ مَرْجِعَكُـمْ ﴾ وەهیـچ کەسـێ هـەڵناگرێ گوناهی هیچ کەسێ ترو سزای نادرێ هیچ گوناهبارێ بەگوناهی کەسێ تر. لەپاشـا ئێـوە ئەگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردەکەری خۆتان لەپاشەڕۆژدا .

﴿ فَيُنَبِّئُكُمْ بِما كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾ دووایی پەروەردەکەری خۆتان هەواڵئەدا بەئێوە بەشتیٚ ناکۆکی و جیاوازیتان لەوا پەیدا کردووە لەکارو بارو پێویستی ئاینیتانا، ئەو کاتە ڕاستی و پوچی بۆ ئێوە ڕون ئەبێتەوە، خۆتان شایەتی لەسەر خۆتان ئەدەن. بەلاٚم ئەوەیش سود بەئێوە نابەخشیٚ .

پرسیار/ ئەو ئایەتە ئاماژە بۆ لای ئەوە ئەکا کەئادەمیزاد هەربەرپرسیارە لەخۆی و بەس کەواتە پێوەیست کردنی جەنگ بۆ بەرزی ئایین و خۆماندوکردن بۆ ئامۆژگاری کردن و یارمەتی دانی یەکتری لەسەر چاکە و لەخواترسان دەوریان نیەو پێویست نین ؟

وەلاٚم/ ئەو ئایەتە تایبەتە بۆ تۆڵەکردنەوەو سزادان و ئادەمیزاد سزای نادریٚ بەتاوانی جگەی خۆی، پەیوەندی بەجەنگ کردن و ئامۆژگاری کردنەوە نیەو پەیوەندی بەجەنگ کردن و ئامۆژگاری کردنەوە نیە و پەیوەندی بەجگەی ئەوانیشەوە نیە بەهیچ جۆریٚ، چونکە سزادان لەسەر گوناهی جگەی خۆ - شتێکەو پێویستکردنی جەنگ و چاککردنی شتی پوچ شتیٚ ترە و پەیوەندیان بەیەکەوە نیە .

پرسیار/ ئادەمیزاد زۆریان دەقیان گرتووە بەوەوە دارایی و خواردەمەنی خۆیان ئەدەن بە هەژاران و پاداشتەکەی ئەنێرن بۆ لای گیانی مردووەکانیان، چەند سورەتیٚ لەقورئان ئەخوێنن پاداشتی ئەکەن بەدیاری ئەینێرن بۆیان، دواییئایا وێنەی ئەو کارانە دروستن بەپێی یاسا؟ یا مردووەکان سودیان لیٚ وەرئەگرن؟ چۆن ئەبیٚ وابیٚ وادانراوە مردووەکان بە خراپەی زیندووەکان سزا نادرێن، واپێویستە بەچاکەیشیان سود وەرنەگرن ؟

وەلاٚم/ ئێمە ئەڵێین: ئەقڵ و دەستور قەدەغەیان کردوە مرۆڤی بیٚ تاوان بەتاوانی گوناهبار سزانادریٚ و هاوبەشی ناکا لەسزادانیان. بەلاٚم دەربارەی پاداشتی چاکە هیچ شتیٚ نیە ڕێگە بگریٚ لەلای ئەقڵ، چاکە نەکەریٚ بەهاوبەشی چاکەکەریٚ لەچاکەکەیداو ئەو پاداشتەی شایانە بیدرێتیٚ لەسەر کارەکەی، یاسای ئیسلام ڕێگەی پێداوە کە واتە ئەبیٚ بڕوای پیٚ بکری. پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ فەرموێتی: ( هەرکاتیٚ ئادەمیزاد بمریٚ دوایی بەکارەکانی دێت مەگەر لەسیٚ شتا: چاکەیەکی بەردەوام، زانستێکی سود بەخش،

منالێکی چاك بپارێتەوە بۆ دایك و باوکی، ئەفەرموێ: کەسێ بمرێ و ڕۆژوی بەسەرەوە بێ، دوایی باخزمە نزیکی بۆی بگێڕێتەوە. ئەفەرموێ: کەسێ بچێ بۆ گۆڕستان و سورەتی یاسینی خوێند سزایان سوك ئەبێت و هەموو مردوەکان چاکەیان توش ئەبێ. ئەوفەرمودانەی پێغەمەر و جگەی ئەوانیش بەڵگەن لەسەر ئەوەی مردو سود وەرئەگرێ بەناردنی پاداشتی کاری چاك، ئەقڵیش پاڵی پێوە نانێ و ڕێك ئەکەوێ لەگەڵ گەورەیی خوادا بەلاّم ئادەمیزاد فراوانی زۆریان پێداوەو لەدەستور لایان داوە، زانایان پێك هاتون لەسەرئەوەی هەرکەسێ شتێ بکا دەقی یاسا بڕیاری پێ نەدابێ، ئەو شتە کارێکی تازەیە و لەیاساوە دوورە ( بدعة ) چاك وایە پاداشتەکە بە دیاری نەنێرێ بەنیازی سود وەرگرتن و لاوەکی تایبەتی پێوە نەنرێ .

خوای مەزن یاسای پێویستی داناوە لەنێو بونەوەراندا بۆ مانەوەیان و بەردەوامیان و بۆ سەپاندنی بیرو باوەڕیان کەهەندێ لە بونەوەران جیگەی هەندێکیان بگرنەوە هەتا کۆتایی جیهان، هەندێکیان بەهێزترن لەهەندێ تریان و سەرکەوتوترن لەلایەن سامان و پلەو پایەو زانست و جگەی ئەوانیش. کەواتە جیاوازی لەنێو یەکتریدا هۆی مانەوەیانە لەم ڕۆژەدا، هەرکاتێ ئادەمیزاد لەهەمو ڕویکەوە وێنەی یەکتری بوون ئەبێتە هۆی لەناوچونیان لەجیهاندا، بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو مەبەستە خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَهُوَ الذي جَعَلَكُمْ خَلائِفَ الأَرْضِ ﴾ وەپەروەردەکەری ئێوە کەسێکی ئەوتۆیە ئێوەی ئادەمیزادی گێراوە بەجێگە نشینی یەکتری لەزەویدا چین لەدوای چین، زەوی بۆ کردون بەجێگەی خۆتان و حەسانەوەتان و پەرەپێدانیان و زۆربونیان، بەوجۆرە شێوەو قەوارەو ئاووهەوا و فەرِوپیتەبەسەر زەوی و لەناویدایە کەخوا دروستی کردوە، بەدروستکردنی خۆرو مانگ بەسەر زەوییەوە بۆ سودی ئێوە، هەمویانی بۆ کردون بەهۆی ژیان بۆتان، خۆشی و ڕابواردن و خواردنی لێی وەربگرن. خوا ئادەمیزادی نیشتەجێ کردوە لەسەر زەوی هەمو هۆی توانا و ئامادەیی پێ بەخشیون بۆ سود وەرگرتن لەپیت و فەڕو بەرو بەرهەمی زەوی .

﴿ وَرَفَعَ بَعْضُكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجاتٍ لِيَبْلُوَكُمْ في ما آتاكُمْ ﴾ وەپەروەردەکەری تۆ هەندێ لە ئێوەی بەچەند پلە بەرزکردوەتەوە لەژورەوەی هەندێ ترتاندا لەڕەوشت و

جوانی و ناشرینی و ساماندارى و هـەژارى و ڕێـز و نـارێزى زانـایی و نـەزانی و هـێز و لاوازی و چەندین پلە وپایەی تر لـەبەرئەوەی ئێوە تاقی ئەکاتەوە لـەوشتەدا بەخشیوێتی بە ئێوە ئایا ئێوە ئەوە پلە و پایە دراوە پێتان بەکاری دێنن بۆ سـود یابـەکاری دێـنن لـەدژی یەکتری، خوای مەزن هەموو شتێ ئەزانێ. بەڵام ئەو تاقی کردنەوە بۆ ئەوەیە بەدانیشتوانی بناسێنێ جێگە بەکارهێنانی ئەو شتانە ئێوە چۆنی بەکار ئەهێنن لـەچاکـەدا یـا لـەخراپـەداو دەربکەوێ بەگوێرەی یاسای خوا ئەوشتانەی لـەشیاوی خۆیا دای ئەنێن یا نە ؟

پرسیار/ ئێوە ناوەڕۆکی ئەو ئایەتەو ئایەتی ﴿ وَما خَلَقْتَ الْجِنَ والأنْـسَ إلا يعبـدون ﴾ چۆن کۆ ئەکەنەوە بەجۆرێ دژی یەکتر نەبن، چونکە لـەئایەتەکەدا ئەفەرموێ: بۆیە ڕێزی هەندێکتانم بەرزکردوەتەوە، ئێوەی پێ تـاقی ئەکەمـەوە، لـەئایەتیکـەی تـردا ئەفـەرموێ: (من جنۆکەو ئادەمیزادم دروست نەکردوە مەگەر لـەبەرئەوەی پەرستن بۆ من بکەن) ؟

وەلام/ دژایەتی لـەنێوان ناوەڕۆکی ئەو دووئایەتـە دانیـە: زانسـت و کـردەوەی سـود بەخش پەرستنە بۆ خوا. بەڵکو گەورەترین پەرستنەو تەواوترین پەیڕەوی کردنی خوایە.

﴿ أنَ رَبَـكَ سَـرِيْعُ الحِسـابِ وَإنَـهُ لَغَفُـورٌ رَحِيـمٌ ﴾ بەڕاسـتی پەروەردەکــەری تــۆ پرسیارکردن و سزادانی بەگورجی دێت بۆ لـەناو بردنی دوژمنانی خۆی، چونکـە ئـەوەی بێت نزیکـە لای خـوا. بەڕاسـتی خـوا لـەتاوانی تاوانـاران ئـەبورێ، خـاوەنی بـەزەیی و میهرەبانیە بۆ کەسێ باوەڕبهێنێ.

## بەیاریدەی خوا کۆتایی پێهات داواکارم لەخوای مەزن لەگوناهم ببورێ

لەمەکەی پیرۆزەوە هاتوەتە خوارەوە ،جگەی ئایەتی ﴿١٧١﴾ ژمارەی ئایەتەکانی ﴿٢٠٦﴾ ئایەتن .

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

[ بەناوی خوای بەخشندەی میرەبان ]

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓمٓصٓ ﴿١﴾ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيْكَ فَلَا يَكُن فِي صَدْرِكَ حَرَجٌ مِّنْهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾

﴿ المص ﴾ بەوجۆرەی ئەبینرێ ئەو پیتانە ئەنوسرێن. بەڵام خوێندنوەیان بەم جۆرەیە: ئەلیف، لام، میم، صاد، بۆزانینی ماناکانیان تەماشای سورەتی ئەلبەقەرە بکەن.

﴿ كِتابٌ أنزِلَ إليك فلا تَكُن في صَدرِكَ حَرَجٌ ﴾ ئەو نامەیە نێراوەتە خوارەوە بۆ لای تۆ قورئانە، دوایی بانەبێ لەدڵی تۆدا تەنگی و گومان لەگەیاندنی پەیامی خوادا بەدرۆخستنەوەی تۆ لەلایەن خزمەکانتەوە، زۆر ئاشکرایە ئەو گەیاندنە زۆر گەورەو گرانە کە سپێردراوە بەپێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ کەبەو قورئانە بەرامبەر بە ئەو کەسانە ڕادەوەستێت بت پەرستن، بەسەخت و گەورە دائەنرێ لەلایەن هەموو بێ باوەڕانەوە، چونکە مەبەستی قورئانی پیرۆز پوچ کردنەوەی بیرو باوەڕی بێ باوەڕانە و تێکدانی شوێن و لاسایی کردنەوەی باووباپیریانە لەسەدان ساڵەوە لەسەری بوون، بۆیە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ دڵتەنگ ئەبوو خوای مەزنیش دڵخۆشی ئەدایەوەو فەرموی :

﴿ لِتُنذِرَ بِهِ وَذكرىٰ لِلمؤمنينَ ﴾ بۆ ئەوەی تۆ بەهۆی ئەو ئایەتەوە بێ ئایینان و بت پەرستان بترسێنی لەئاگری دۆزەخ و، بۆئەوەیش بەونامەیە ئامۆژگاری کەری بێ باوەڕان

بێ، بەوئایەتە خوا فەرمان ئەدا بە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ یاساکانی قورئان بگەیەنێ و گوێی نەدا بە دوژمنان و ڕەگەزپەرستان، بەم ئایەتەی دوایی فەرمان ئەدا بە ئادەمیزاد دوای پێغەمەر بکەون و کردەوەیان بەگوێرەی فەرمودەی قورئانبێ و ئەفەرموێ:

﴿ إتبعُوا ما أنزِلَ إلَيكُم مِن رَبكُم ﴾ ئێوەی ئادەمیزاد دوای شتێ بکەون نێرراوەتە خوارەوە بۆ لای ئێوە لەلایەن پەروەردەکەری خۆتانەوە کە قورئانی پیرۆزەو گوێ ڕایەڵی فەرمودەی پێغەمەر بن بەتەنها.

﴿ وَلا تَتَبعُوا مِن دونَهُ أولِياءَ ﴾ وەئێوە دوای چەندین کاربەدەستان مەکەون لەجگەی خوا مەیان کەن بە دۆستی خۆتان و بەپێشەوای خۆتان و ناچارتان نەکەن بۆ پەرستنی بتەکانیان. خوای مەزن بەو جۆرە فەرمودەی خۆیە فەرمانمان پێ ئەدا کە جگەی خواو قورئان گومڕایی و هەوەس کاری و تەڵە نانەوەن بۆ خراپە کردن .

﴿ قَلِيلاً ماتَذكرُونَ ﴾ ئێوە کەمێ ئامۆژگاری وەرئەگرن، چونکە ئێوە خۆتان لەخراپە ناپارێزن و لەپاشەڕۆژ ناترسن، ئەوانەی ئامۆژگاری وەربگرن کەمن. دوای ئەوەی خوای مەزن فەرمانی دا بەپێغەمەری خۆی کەئادەمیزاد بترسێنێ و فەرمانی دا بەئادەمیزاد پەیڕەوی پێغەمەر بکەن و دوای جگەی خوا نەکەون، لەم ئایەتانەی دواییدا بیریان ئەخاتەوە کە لەناوبردن و بنەبڕکردنی گەلانی ڕابردو بەو بۆنەوەبووە وازیان لەفەرمودەی خواو پێغەمەرەکانیان هێناوە و ئەوانیان بەدرۆ خستوەتەوە بۆ روون کردنەوەی ئەو مەبەستە خوا ئەفەرموێ:

وَكَم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَا فَجَآءَهَا بَأْسُنَا بَيَٰتًا أَوْ هُمْ قَآئِلُونَ ﴿٤﴾ فَمَا كَانَ دَعْوَىٰهُمْ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَآ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٥﴾ فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ

ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٦﴾ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴿٧﴾ وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿١٠﴾

﴿ وَكَم مِن قريةٍ اهلَكناهـآ ﴾ وە زۆر کـەس لەدانیشـتوانی بـێ بـاوەڕانی گونـد و شارەکان ئێمە ویستمان لەناویان ببەین لەوکەسانەی لەپێش ئێوەوەبـوون کەلەوکاتانـەدا فروستاەکانیان بەدروئەخستەوە کە ئامۆژگاریان ئەکردن .

﴿ فَجاءَ ها بَأْسُنا بَياتاً أو هُمْ فأيلُونَ ﴾ دوای ئـەوەی هـاتبوو بـۆلای دانیشـتوانی ئـەو گوندە سزای ئێمە بۆ لەناوبردنیان لەشەودا لەکاتی خەوتنیانایا ئەو دانیشتوانە سزای ئێمە هاتبوو بۆ لایان لەکاتی خەوتنی نیوەڕۆیاندا کەکاتی پشو دان و حەوانەوەیانە هەتا چاکـتر ئەو سزایە سەختترو گەورەتربێ بۆیان .

﴿ فَما كانَ دَعواهُمْ إذْ جاءَ هُمْ بَأْسَنا إلا أن قالُو إنا كُنا ظـالِمينَ ﴾ دوایـی دانیشـتوانی ئەو گوندە داواکاری و پاڕانەوەکەیان کاتێ هاتبو بۆلایان سزای ئیمـە مەگـەر ئـەو کاتـە ئەیان ووت: بەڕاستی ئێمە ستەممان لەخۆمان کردوە لەمەوبەر کەلە بتـەکان ئەپاڕاینـەوەو پێغەمەرەکانی خۆمانمان بەدرۆ ئەخستەوە، ئێستا بڕیار لـەسەر گوناهباری خۆمـان ئـەدەین، یانی لەوەوبەر هاواریان لەبتەکانیان ئەکرد، کاتێ سزایان بینـی وازیـان لێ ئـەهێنن و ڕوو ئەکەن بۆلای خوا، بەڵام دوای ئـەوەی دەرگـای کـارکردن و پەشـیمانی بونـەوە داخـرا لەلایەن خواوە:

﴿ فَلَنسْأَ أَنّ الذِينَ أُرسِلَ إليهِمْ وَلَنَسأَلَنّ المُرْسَلِينَ ﴾ دوایی ئێمە بەڕاستی پرسیارئەکەین لەو کەسانەی ئەوتۆ نێرراوە بۆلایان فروستاوەکان لەپاشەڕۆژدا دەربارەی چۆنیەتی وەلاّم دانەوەی پێغەمەرەکان و وەرگرتنی پەیامەکانیان و ئێمە پرسیار ئەکەین لەپێغەمەرەکان ئایا پەیامەکانتان گەیاندووە بەئادەمیزاد، فروستادەکان وەلاّمی پرسیار ئەدەنەوەو شایەتی ئەدەن لەسەریان و بەدژی تاقمەکانیان .

﴿ فَلَنَقُصّنَ عَلَيهِمْ بِعلمٍ وماكُنّا غائِبِينَ ﴾ دوایی ئێمە بەڕاستی ئەخوینینەوە بەسەر پێغەمەرەکان و گەلەکانیان هەمو شتێ ووتویانەو کردویانە بەهۆی زانینی خۆمانەوە بەئاشکرایان و بەنهێنییان وە ئێمە بێ ئاگانەبووین لەوان و کردەوەیان ولەگەیاندانی پەیام لەلایەن پێغەمەرەکانەوە و چۆنیەتی وولاّمدانەوەیان لەکاتی گەیاندنی پەیامەکە بەوان .

خوای مەزن بۆ ئەوەی باشتر سزا بچێژن تەنها بە پرسیارکردن لەپێغەمەرەکان وازیان لێ ناهێنێ، بەڵکو هەمو کردەوەکانیان بەسەریانا ئەخوێننەوە، هەنا چاکتر هەست بەخەشمی خوا بکەن بۆ خۆیان .

﴿ وَالوَزنُ يَومَئِذْ الحَقُ ﴾ وەکێشانەی‌کرداری‌هەمو کەسێ لەڕۆژی دواییدا ڕاستە یوونی و بێگومان بەجۆرێکی دادپەروەرانە، دوایی پرسیار لەهەموو کەسێ ئەکرێ لەسەر ئەوشتەی پێشی خۆی خستوە لەکەم ولەزۆر لەچاك ولەخراپ .

زانایان لەبارەی چۆنیەتی ترازووی کێشانەی کردەوەی ئادەمیزاد گفتوگۆی زۆریان فەرمودە، ئەوەی بچێتە مێشکەوە و گومان ڕانەکێشێ، خوایش لەهەمو کەس زناترە: ﴿ الوزن ﴾ کێشانە بریتیە لە ئەندازەیەکی دیاری کراو خوا پەرست و گوناهبار و پاك و خراپ جویێ یکاتەوە، ئەو ئەندازەیە بریتیە لە فەرماندانی خواو قەدەغەکردنی، دوایی کاتی پرسیارکردن هات تەماشا ئەکرێ بۆ لای شتێ ئادەمیزاد کردویەتی و شتێ وازی لێ هێنابێ، ئەو شتانە بەرانبەری ئەکرێن لەنێوان ئەوانداو لەنێوان فەرمانەکانی خوا و بێ فەرمانی خوا، ئەگەر ئەوەی ئادەمیزاد کردویەتی و ئەوەی نەی کردوە وەك فەرمانەکانی خواو قەدەغەکردنی خوا بون ئەوکەسە کێشراوەکەی قورسەو ڕزگاری ئەبێ و ئەگەر بەوجۆرە نەبوو کێشراوەکانی سوکەو زیانی لەخۆی داوە .

بەجۆرێ تر هەمو شتێ لەم ژیانەی ئێستادا بنچینەو دەستورێکی هەیە ئیتر زانستبێ یاهونەر یاشتێ تربێ، بەو بنچینە دیاری کراوانە هەمو شتێ لەیەك جوێ ئەبنەوە لەیەکتری و چاك و خراپیان ئەناسرێن. ئەو بنچینانەو ئەو دەستورانە ناوئەبرێن بەتەرازوو پەیرەو وبەیاسا، هەروەها پرسیارکردن لەپاشەڕۆژدا چەندین دەستوری دیاریکراویی بۆ دانراوە پێی ئەوترێ لەلایەن قورئانەوە بەترازوو بەووشەی ( صراط) ئەو دەستورو یاسایە و ئەو ترازووەی کردەوەکانی ئادەمیزاد و نیشانەکانی فەرماندان و قەدەغەکراوەکانی خوان، هەروەك دادگایی کردنی ئادەمیزادە لەدواڕۆژدا ئەمڕۆی جیهان دادگایی ئەکرێ بەیاسا.

لەدادگاکردنی داوالەسەر کراو لەم ڕۆژەدا. زۆربەی زانایان ئەڵێن: مەبەست لەکێشانە: کێشانەی کارەکانە بەترازوویێ خوادای ئەنێ وەك ترازوی ئێستا وایە، زۆر مانای تری کراوە باسکردنیان درێژە ئەکێشێ .

﴿ فَمَنْ ثَقُلَتْ مَوازِينَهُ فَأُلئِكَ هُم المُفلِحُونَ ﴾ دوایی هەرکەسێ کێشراوی کردارەکانی قورسبێ دوایی ئەوکەسانە ڕزگاریان ئەبێ لەسزای خوا، کەسانێکی ئەوتۆن کردەوەکانیان تاقی کراونەتەوە لەسەر فەرمانەکانیو قەدەغەکراوەکانی خوا بەبێ کەم و کوڕی و لەتاقیکردنەوەدا نەکەوتوون .

﴿ وَمَنْ خَفَتْ مَوازِيْنَهُ فَأُولِئِكَ الذِيْنَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ بِما كانُوا بِآياتِنا يَظلِمُونَ ﴾ وەهەرکەسێ کێشراوی کردەوەکانی سوکبێ، دوایی ئەوکەسانەی ئەوتۆن زیانیان داوە لەخۆیان و کارەکانیان لەخراپەدا بەکارهێناوە بەهۆی باوەڕنەهێنانیان بەپێغەمەرو بەئایەتەکانی قورئانی ئێمەو بێ فەرمانی ستەمیان لەخۆیانداوە .

﴿ وَلَقَدْ مَكْناكُم فِي الآرضِ ﴾ وەبەڕاستی ئێمە ئێوەی ئادەمیزادمان دانـاوە لەزەویدا و کردومانەبە جێگەو شوێنی ڕابوادنتان ، توانامان داوە پێتان زەوی بەکاربهێنن لەخزمەتی خۆتانا بەدەرهێنانی پیتەکەی ورواندن و چێنانی کشت وکاڵ و بییان کەن بەهۆی سەرەفرازیی خۆتان و دانیشتوان .

﴿ وَجَعَلْنا لَكُمْ فِيْها مَعايشَ قَلِيلاً ماتَشكُرُونَ ﴾ وەئێمـە گێراومانـە لـەبۆ سـودی ئێـوە لـەزەویدا چەندین هۆی ژیانتان لـەخواردن و خواردنەوە، هەتا ئێوە بەرەو پێش بڕۆن، ئێـوە فێری دروستکردنی ئامێری وام کردوون بەکاریان بهێنن بۆ خۆشی ژیانتان و لـەماندووبون و ئـازار دورتـان بخەنـەوە، ئەگـەر خـوای مـەزن ئـەو دەسـەڵاتەی نەدایـەوە بـەئێوە دروستکراوێکی لاواز ئەبون، تەنانەت ئەتوانی بەرانبەر بەکارە سروشـتیەکان ڕاوەسـتن و تەنانەت ئەتوانی گیاندارانی سەرزەوی ڕاو بکەن بۆ خۆتان ئێـوە سوپاسـی خـوا بەکـەمی ئەکەن لـەسەر شتێ بۆ ئێوە سازکراوە و خوابەخشیویە بەئێوە. دوای ئەوەی خوای مـەزن بیری ئـادەمیزادی خسـتەوە ئـەو بەخشـشـە گـەورە بەخشـراوە پێتـان لـەڕام کـردن و بەکارهێنانی بەروبوم و پیتی زەوی، بیریشیان ئەخاتەوە گـەورەترین بەخشـیش بـۆ ئـەوان دروست کردنیانە لـە نەبونەوە بۆلای بون و ئەفەرموێ:

وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿١١﴾ قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ ۖ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿١٣﴾ قَالَ أَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَـَٔاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ قَالَ

اخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٨﴾

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْناكُم ثُمَ صَوَرناكُمْ ﴾ وەبەڕاستی ئێمە ئێوەمان دروست کردووە لەپشتی باوکەکەنتان بەبی نەخشەو دیمەن لەپاشا ئێمە نەخشەو دیمەنی ئێوەمان کێشان لەمندالّدانی دایکەکانتان. یانی ئێمە لەبنەڕەتدا ئێوەمان دروستکردووە لەخاك بەبێ نەخشەو دیمەن، دوایی هەرلەیەکەم جاری دروست کردنتانا ئەم شێوەو شێوازە شیرینەی ئێستاتانەوەو گیانم کردووە بەبەرتانا. بەلاّم ( داریون وپەیڕەوی داریون ) بەپێچەوانەی فەرمودەی خوا لایان وایە ئادەمیواد یەکەم جار بەم شێوە شیرینترەی ئێستا دروست نەکراوە، دوایی وورده ورده گۆڕانی بەسەرداهاتووە لە ڕەگەزێکەوە بۆ ڕەگەزێکی تر هەتا وەك ئێستای خۆی لێهاتووە، وەلاّمدانەوەی ئەوە بیرو باوەڕە ناپەسەندەی داریۆن بەزۆر وەلاّم بەدرۆ خراوەتەوە، ئەوەی شایانی باسبێ ئادەمیزاد بەتایبەتی خاوەنی ئەقلّ و هۆش و گیانێکی تایبەتە کەگەڕانویەتی بەڕەگەزێکی سەربەخۆو جیاواز لە هەمو بونەوەرێکی ترو ڕەگەزانی تر هەتا شایستەی ئەوەبێ ببێتە جێگەنشینی خوا و هەلّسوڕێنەر و ڕام کەری هەمو بونەوەرانی تربێ لەیەکەم جاری دروستبونیەوە، بۆیە زۆربەی زانایان بەتایبەتی ئەوانەیشیان بێ ئاین و بێ باوەڕن بەو بیرەی داریۆن ڕازی نین، هەتا زانست بەرەو پێش ترو سەرکەوتو بڕوا چاکتر پوچی ئەو بیرو باوەڕە دەرئەکەوێ و لەبیری خۆیان پەشیمان ئەبنەوە هەر لەبەرئەوەی کەئادەمیزاد خاوەنی ئەقلّ و گیانێکی تایبەتە بەپێچەوانەی جگەی خۆی، گرنگترین بەلّگەی خاوەن بیرو باوەڕی پەیدابونی بونەوەران کەبەرەو لای گۆڕان شێوەی جوانتر بڕۆن هەلّکەندنی زەوییە گۆیا بۆیان دەرکەوتووە

پەیدابوونی چەندین جۆری گیانادران هەندێکیان بالأترو شیرینترن لایـان وایـە کـاتی بـالأ جوانەکان ودوای کاتی شێوە ناشیرینەکان بوە کەواتە لەنێوان ئەوان و لەنێوان ئادەمیزادا زۆرتر لەیەك ئەچن . ئێمە ئەو دەرکەوتوانەی هەڵکەندی زەویی بەدرۆ ناخەینەوە. بـەڵام بیرو بۆچونی ( داریۆن ) دابین ناکەن، چونکە زۆر نزیك و دروستە هەریەکـە لـەگیانداره بالأکان و وێنەچاکەکان و وێنە نزمەکان لەیەك کاتا بن و هەریەکەیان ڕەگەزێکی تایبەتی بن و لەیەك جویّ بن و دوایی نابن بەبەڵگە لەسەر بیرو بۆچونی (داریۆن ) .

﴿ ثُمَ قُلْنا لِلمَلائِكَةِ اسجُدُ والآدَمَ فَسَجَدُوا إلا إبلِيسَ لَمْ يَكُنْ مِنَ الساجِديْنَ ﴾ لەپاشـا ئێمە ووتمان بە فریشتەکان: ئێوە سوژدە ببـەن بـۆ ئـادەم و سـەری بـۆ دانـەوێنن لەبـەر ڕێزگرتنی و بەس: نەك پەرستنی ئادەم، ئادەم بـاوکی هـەموو ئـادەمیزادە، دوایـی هـەموو فریشتەکان سوژدەیان برد بۆئادەم و سەریان دانەواند و فەرمانی خوایان بەجیّ هێنا مەگەر ئیبلیس سەری دانەنەواند بۆ ڕێزگرتن لـەئادەم و بـیّ فـەرمانی خـوای کـرد لەبـەر خـۆ پەسەندی و سالاری و دڵ پیسی نەبو بەیەکیّ لەسوژدە بەران و سەری ڕێـزی دانەنـەواند بۆ ئادەم. لەئایەت (٣٤) ی ئەلبەقەرەدا ئەو باسە کراوە .

﴿ قَال مامَنَعَكَ أنْ لاتَسْجُدَ إذْ أمَرْتُكَ ﴾ خوا فەرموی: چ شتیّ قەدەغـەی کـرد لـەتۆ ئەی ئیبلیس کە سوژدە بۆ ئادەم ببەی و ڕێزی لێی بگری کاتیّ من فەرمانم دا بەتۆ سوژدە ببەی بۆی. ووشەی (لا ) لەورستەیەدا خراوەتەسەری بـۆ پتـەوکردنی نـاوەڕۆکی مانـای مەبەست، بۆ مانای دیاری کراوی خۆی دانەنراوە.

﴿ قَالَ أناخَيْرٌ مِنْهُ خَلَقْتَنْي مِنْ نار وَخَلَقْتُهُ مِـنَ طِـينٍ ﴾ ئیبلیـس لـەوەلامی فـەرمودەی خوادا ووتی: من چاکترم لەئادەم، چاکتر بۆ ناچـاك و گـەرە بـۆ بچـووك سـوژدە نابـا و سەری بۆ شۆڕناکا و چۆن فەرمانی وای پیّ ئەدریّ ؟ چونکە تـۆ منـت لـەئاگر دروسـت کردوە و ئاگرجوانترو ڕوناك تر و بەرێزو بالأیە، تۆ ئـادەمت دروسـت کـردوە لـەخاك و خاك قورس و تاریك و پەستە.

بۆ زانین: جەلالــەدینی سیوطی لەنامــەی ( الکـنز المدفـون والفلـك المشـحون ) دا ئەفەرموێ: ئەوگومانەی ئیبلیس کەلای وایە ئــاگر چاکـترە لـەزەوی پـوچ و بـێ مانایـە لـەبەرئەمانی خوارەوە:

١- بەڕاستی سروشتی ئاگر خراپەکاری و لـەناوبردنە بەپێچەوانەی خاك.

٢- سروشتی ئاگر سوکەو هەڵچوەو توڕەیە، خـاك سروشـتەکەی قورسـی وئـارام و وەستاوە .

٣- خاك دروست کراوەو لـەوەپەیدا ئەبێ خواردنی گیانداران و پۆشـاکی بـەندەکانی خواو جوانیان و ئامێری گوزەرانیان و جێگــەی دانیشـتنیان، ئـاگر هیـچ شـتێ لـەوانـەی تێدانیە.

٤- خاك پێویستی گیاندارانــەو بـێ خـاك نـاژین و بـێ ئـەوەی لــەخاك ئـەبێ ژیـان، گیاندارانی بەسەزمان پێویستیان بەئاگر نیە هەرگیز، ئادەمیزادیش لـەهەندی رۆژ و مـانگدا پێویستیان بەئاگر نیە مەگەر بەکاری بهێنن بۆ سازکردنی شتێ لـەزەویدا وەك خزمەتکار.

٥- خاك ئەگەر ژیانی گیانداران بخرێتە نێوی چەند دووپاتی ئەوشتە دەرئــەکا. فـەرِی زەوی‌یە بەئەمانەتەوە دووچەندانەی ئەمانەتەکە ئەداتەوە، بەڵام ئاگر هەر ئەمانەتێ بدرێتــە دەستی ئەی خوا و هیچ شتێکی نامێنێتەوە .

٦- ئاگر خۆی بەخۆیــەوە ناوەسـتێ و پێویسـتی بەجێگــە هەیـە هـەڵی گـری، خـاك پێویستی بەشتێ نیە هەڵگری، ئاگر پێویستی بەخاك هەیە، خاك پێویستی بەئاگر نیە، خـاك ساماندارەو ئاگر هەژارە .

٧- مـادەو مـاکی ئـاگر شـەیتانیە گڕێکـە لـەئاگرەوەیـەو لاوازە و هـەوەس گاڵتـەی پێ‌ئەکاو بەئارەزووی خۆی بۆ کوێ‌ببا ئـەیبا، لـەبەرئەوەیشـە هەرشـتێ لـەئاگر دروسـت بکرێ ئارەزوو هەوەس فەرمانی پێ ئەدا و سواری ئەبێ. بەڵام ئـادەمیزاد چونکـە لـەخاك دروستبوە بەهێزەو لـەگەڵ ئارەزوودا نارِواو زاڵ ئەبێ بەسەر هەوەسی خۆیاو دیلی ئـەکا و ئەگەرێتەوە بۆ لای پــەروەردگار و دوایـی خـوا هـەڵی ئـەبژێرێ بـۆ فروسـتادەیی، ئـەو

هەوەسەی لەگەڵ ئادەمیزاددایە بەزویی نامێنێ و ئەڕوا، بەپێچەوانەی ئیبلیس، ئادەمیزاد و شەیتان هەریەکەیان بۆلای ئەصلی خۆیان و ڕەگەزی خۆیان ئەچنەوە لەپاکی و پیسیدا، شەیتان بۆ لای خراپەو ئادەمیزاد بۆلای چاکە .

٨- ئاگر هەرچەندە هەندێ سودی تێدا هەیە. بەڵام خراپە شاراوەتەوە لەنێویدا، ئەگەر رێگە لەوخراپەیە نەگری هەمو دانەوێڵەو درەخت و پیتی ژیانی بونەوەران هەیە لەناوی ئەبا. خاك چاکەو فەڕ لەنێویدا هەمو کاتێ ئەم دیو دیوی بکەی فەڕو چاکە و بەرهەم و میوە دەرئەکەوێ بۆ مانەوەی گیانداران .

٩- خوای مەزن زۆرجاران لەنامەی خۆیدا باسی زەوی ئەکات و هەواڵ ئەدا بەسودی زۆری، خوا زەوی دروست کردوەو کردویەتی بەبێشکەو ژێر راخەرو جێگەی دانیشتنی ئادەمیزاد، گیانداران و مردوانی لکاندوە بەخۆیەوە، خوا وای لەبەندەکانی خۆی کردوە بیربکەنەوە لەزەوی و نیشانە و ئەو شتە سەرسوڕێنەرانەو ئەوانەی خوا دایناون لەسەر زەویدا، خوا باسی ئاگری نەکردوە مەگەر بۆ سزادان و ترساندن نەبێ، دووجار باسی ئاگری فەرموە: یەکەم بۆ ئەوەی ئاگری دۆزەخ بیری ئادەمیزاد بخاتەوە، دووهەم بۆ ئەوەی لەچۆڵەوانیدا و لەناو ماڵدا بەکاری بهێنن بۆ سازکردنی خواردەمەنی و شتی تر .

١٠- خوای مەزن باسی زەوی کردووە بەوەی خاوەنی پیت و فەڕە لەزۆر جێگەی قورئانداو ئەفەرموێ زەوی پیرۆزەو خواردەمەنی هەمو بونەوەرانی تێدا دیاری کردوە بەگشتی و بەتایبەتی لەڕزگارکردنی لووت پێغەمەر ئەفەرموێ: ئێمە ڕزگارمان کرد بۆلای زەوی ئێمە فەڕمان تێداداناوەو چەندین وێنەی تر. بەڵام باسی ئاگری نەکردوە بەچاکە مەگەر بۆ ئەوەی فەڕو بەرەکەت لەناوببا.

١١- خوا زەوی گێڕاوە بەجێگەی پەرستنی خۆی ئێواران و بەیانیان بەگشتی، بەتایبەتی خانەی رێزداری خۆی لەمەکەدایە .

١٢- خوا چەندین گانگا و ڕوبارو سەرچاوەی ئاو و بەرهەمی کشت وکاڵ و گیانداران و خواردەمەنیو کێو و باخ و باخچە وێنەی رێگاو رەنگی جوان و شتی تری داناون لەزەویدا، ئەوانە هیچیان لەئاگردا نین .

١٣- ئەوپەڕی شتێ دانرابێ بۆ ئاگر ئەوەیە کەخزمەتکاری ئەوانەن لەسەر زەوین ، ئەو ڕێزەی بۆی دانرابێ ئەو خزمەتەیە.

١٤- ئەگەر چاوی ئادەمیزاد بەتەماشایەکی ناتەواو وئەقڵێکی لاوازەوە تەماشای زەوی بکاو بەبێ نرخی بزانێ و بڵێ خاکێکە شێلراوە بەئاوەوە، ئەوە نەزانێ کە زەوی لە دووشتی سەرەکی دروست کراوە: ئاو کەخوا ئەفەرموێ: لەئاوەوەۆ هەموو شتێکمان دروست کردوە بەزیندویی. خاکیش گەنجینەی هەمو سودو چاکەیەکە، ئەگەر تەماشای ئەوەڵ و ئاخر بکرێ زەوی چاکترە لەئاگر، زۆر شتی تر بۆ چاکترینی زەوی باسکراوە ناتوانرێ باسی هەمویان بکرێ ئەوەندە زۆرن .

پرسیار: بەگوێرەی ناوەڕۆکی ئەو ئایەتە و ئایەتی (١٥) سورەتی (ئەلرەحمان ) کەئەفەرموێ: شەیتان دروست کراوە لەئاگر: وائەگەیەنن ژیان و زیندەگانی لەگەڵ ئاگردا ئەگونجێ ؟

وەڵام: بونەوەرانی زیندوی ئەوتۆ ناویان لەقورئاندا باسکراون لەسەر چەند بەشێکن هەیانە بونەوەرانی فریشتەکان. هەیانە جنۆکن. هەیانە لەسەر زەوی ئەژین وەك ئادەمیزاد و جگەی ئادەمیزاد، ئەم بەشەیان بەهۆی ئاوەوە ئەژین بەوێنەی گیاندران و درەخت و گژوگیا، ئەوەیش دژی ئەمەنیە بونەوەرێ هەبێ ئاگر پێویستبێ بۆ ژیانی وەك جنۆکەو زیندەوەری تر، ئەوزانایانە پسپۆری تایبەتین لە زانستی جرو جانەوەردا ئەڵێن: جۆرێ لەجرو جانەوەر هەن بەهەوای ژەهراوی نەبێ ناژین و لەبیرە نەوتەکانا نەبێ ناژین. ئەبێ بزانرێ ئێمە نازانین خوا فریشتەکانی لەچ شتێ دروست کردوون، ئەوەی ئێمە بیزانین بێ فەرمانی خوا ناکەن و خەو و خواردنیان نیە .

﴿ قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا ﴾ خوا فەرموی بەئیبلیس : دوایی تۆ بکەوەرە خوارەوە لەبەهەشت، ڕاناوی ووشەی ( منها ) بۆچ لایە ئەگەڕێتەوە، لەفەرمودەی خواو پێغەمەرا بۆمان ڕوون نەکراوەتەوە. زانایان هەندێکیان ئەڵێن: ئەگەڕێتەوە بۆلای بەهەشت یا بۆلای ئاسمان چونکە ئەوانە جێگەی خوا پەرستانن، هەندێ تریان ئەڵێن: دارڕاندنی فەرمانی خوا

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ڕاناوی (منها) ئەگەڕێتەوە بۆ لای پلەی بەرزی لای خوا، یانی ئەی شەیتان تۆ بێبەشی لەپلەی بەرز و بەزەیی خوا بەهۆی بێ فەرمانی و سوژدە نەبردنت بۆ ئادەم و ئەو پلە بەرزەت لێ سەنرایەوە، ووشەی ( مما كانا فيه ) لەسورەتی ئەلبەقەرەدا پشتگیری ئەو ڕایە دەكات .

﴿ فَما لَكُ أن تَتَكَبَّر فأخرُج إنكَ مِنَ الصاغرينَ ﴾ دوایی شایستەی تۆ نیە كە خۆت بەگەورە بزانیت لەبەهەشت یا لەئاسماندا یابەهۆی ئەوپلە بەرزەی من داومە بەتۆ، دروست نیە تۆ لەفەرمانی من دەرچی و لەو دیمەنەدابی، لەمەوپاش تۆ شایانی ئەوەنیت لەبەهەشتا بیت لەگەڵ فرشتەكاندا و ئەوپلەو پایەت هەبێ، دوایی تۆ دەرچۆ لەبەهەشت و لەو دیمەنەدا بەڕاستی لەبێ نرخی و سەر شۆرانی لەمەوپاش .

﴿ قالَ أنْظِرني إلى يَومِ يَبْعَثُونَ ﴾ ئیبلیس ووتی: خوایە تۆ من دوابخەو مۆڵەتم بدە هەتا ڕۆژی ئادەمیزاد زیندوو ئەكرێنەوە و هەمو بونەوەران نەماون .

﴿ قْالَ إنكَ مِنَ المُنظِرِينَ ﴾ خوا فەرموی: بەڕاستی تۆ لەوكەسانە ئەبی دوائەخرێن و ئەمێنێتەوە هەتا ڕۆژێ زیندوو ئەكرێنەوە بونەوەرانی مردو بۆ پرسیارلێ كردن .

﴿ قْالَ فَبِمْا أغْوَيْتَنِي لأَقْعُدَن لَهُمْ صِراطُكَ المُستَقِيمَ ﴾ ئیبلیس ووتی: دوای ئەوەی تۆ مۆڵەتی منت دا من تێئەكۆشم بۆ لەرێگە لادانی ئادەمیزاد بەهەرجۆرێ بۆم بكرێ بەهۆی لەرێگە لادانی منەوە لەلایەن تۆوە، بەراستی من دائەنیشم بۆ چاوەڕوانكردنیان لەسەر ئەو رێگە ڕاستەی تۆن و ئادەم و منداڵەكانی لائەدەم لەو رێگەیە، تۆڵەی خۆمیان لێ ئەكەمەوە و لەئایینی ئیسلام لایان ئەدەم .

﴿ ثُمَ لآتَيْنَهُمْ مِنْ بَيْنِ أيْدِيَهِمْ وَمَنْ خَلَفَهُمْ ﴾ لەپاشا بەڕاستی من ئەچم بۆ لایان لەپێشیانەوەو لەدواییانەوە، گومان ئەخەمە دڵیانەوە لەهەمو شتێكا چاكەیان بۆ بسازێنێ لەهەردوو جیهاندا، وایان لێ ئەكەم بڕوایان بەبەهەشت و دۆزەخ و زیندو بونەوەو پرسیارنەبێ، وایان پێ ئەسەلمێنم جیهان بەردەوامە، فەرمانیان پێ ئەدەم بەكۆكردنەوەی سامان و نە بەخشینێ بە هەژاران و بەرچاوتەنگی .

﴿ وَعَنْ أَيْمانِهِمْ وَشَمائِلِهِمْ ﴾ وەئەڕۆم بۆ لایان لەلای ڕاستیانەوەو لەلای چەپیانەوە لەخۆیانیان بایی ئەکەم بەکردنی چاکە هەتا وازی لیٚ بهیٚنن و وابزانن چاکەیان زۆرە، ئەوانەی ئادەمیزاد لەسەر گومڕایین وایان لیٚ ئەکەم بەردەوامبن لەسەر خراپەو ڕابواردنیان لا شیرین ئەکەم .

﴿ وَلایَجد أَكْثَرُهُمْ شاكِرِينَ ﴾ وەتۆ ئەی خوایە دەستت ناکەویٚ زۆرتر لەئادەمیزاد سوپاس گوزاری تۆبن لەسەر ئەو چاکانەی تۆ پیٚت بەخشیون، بۆیان ئەڕازیٚنمەوە باوەڕت پیٚ نەهیٚنن و بە خاوەن چاکەت نەزانن .

بۆ زانین: هاتنی شەیتان بۆ لای ئادەمیزاد لەهەرچوار لایانەوە هیٚمایە لەدوودڵی پەیدا کردن لە دەرونیانا و کۆشش بۆ لادانیان لەڕیٚگەی ئایین، بەجۆریٚ هەرگوناهیٚ بیٚتە بەردەمیان شەیتان وایان لیٚ ئەکا کۆڵی لیٚ نەدەن هەتا ئەیکەن، لەهەمو پەرستنی خوا لایان ئەدا. یانی ئەگەر خوا فەرمانی دەرکرد بۆ جەنگ کردن لەگەڵ بیٚ باوەڕان ئەخاتە دڵیان بۆ خۆتان ئەدەن بەکوشت جیهان شیرینە، ئەگەر فەرمان بدا بەبەخشینی دارایی گومان ئەخاتە دەرونیان خۆتان هەژار مەکەن، لەکاتی قەدەغەکردنی مەیدا و قومارکردن و داویٚن پیسی گومان ئەخاتە دڵیان بۆیان ئەڕازیٚنیٚتەوەو ئەیکەن هەرکاتیٚ خوا موژدەی دا بەبەهەشت و هەڕەشەی لیٚ کردن بەدۆزەخ ئەو دوژمنەی خواو خۆیان ئەڵیٚ: بەهەشت و دۆزەخ نەهەن و نەئەیشبن، هەروەك هەمو ڕاستیەکان بەپوچ دائەنیٚ بۆیان. بائیٚمەیش لەبیرمان نەچیٚ ئەو کەسانەیش ئایینی خۆیانیان فرۆشتوە بەشەیتان لەم سەردەمەی ئیٚمەدا، هەر کردەوەیە داگیرکەران و نۆکەرانیان ئەیکەن لەکوشتن و تالاٚن کردن و دەربەدەری دانیشتون و بەئەنفال کردنیان بەچاکی ئەژمیٚرن .

﴿ قالَ اخْرُجْ مِنْها مَذْؤُ وَمامّد حُوراً ﴾ خوا فەرموی بەشەیتان : تۆ بڕۆرەدەرەوە لەم بەهەشتەی بۆ ئادەمیزاد دانراوە بەسەختترین شورەیی و عەیبەداری و بەبیٚ بەش لەبەزەیی و میهرەبانی خواو ئەو پلە بەرزەی پیٚت دراوە نەمیٚنیٚ .

﴿ لَمَنْ تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنْكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ سوێند بەخوّم کەسیّ دوای تۆبکەویّ لەئادەمیزاد بەڕاستی من پڕئەکەم دۆزەخ لەئێوە هەموتان، سزای دۆزەخ بۆ تۆ و ئەوتاقمەی پەیڕەوی تۆ ئەکەن و بەفەرمانی من هەڵناسن .

زۆر ئاشکرایە ئیبلیس هەرکاتیّ کارێکی بکردایە بیانویەکی بۆ ئەتاشی و مەرج و هۆیەکی بۆ دائەنا هەرلەبەرئەوەی سەرپێچی لەفەرمانی خوابکا، زۆر بەبیّ شەرمانە ئەیووت: لەگفتوگۆکانیدا: خوا ووتی و من ووتم، زۆر بەڕو هەڵماڵڕاوی وناشایستە دژی خوا ئەوەستا و وای دەرئەبڕی شایانتر ئەوەیە تۆ فەرمان نەدەی بەمن شوژدەببەم بۆ ئادەم ، فەرمان بدەی بەو سوژدە ببا بۆمن. کەواتە گەورەیی و ڕێز لای شەیتان ڕەگەزە نەك لەخوا ترسان و پەرستنی خوا. بەڵام لای خوای مەزن گەورەیی وڕێز بەترسان لەخواو بە کردەوەی چاك پەیدا ئەبیّ. نەك بەهۆی ڕەگەز و بنچینە، دوایی ئەبیّ بزانین هەرکەسیّ ڕەگەز پەرست و خۆپەرست بیّ و ئایین بەگوێرەی هەوەس و سودی خۆی بەراوردبکا بێگومان ئەوکەسە شاگرد و پەیڕەوی شەیتانە، ئیتر خۆی بزانیّ یان نا، لەپاشە ڕۆژدا هاوملی شەیتانە لەجێگەی ناخۆشدا .

پرسیار/ ئەو گفتوگۆیەی خوا لەگەڵ شەیتان ئایا ڕاستەوخۆبوە لەگەڵ شەیتان یا بەهۆی نوێنەری ترەوەبوە ؟

وەلاّم/ ئێمە بڕوامان هەیە بەبوونی ئەو گفتوگۆیەی خوا لەگەڵ شەیتان، چونکە فەرمودەی خوایەو دژایەتیشی لەگەڵ ناسینی ئەقڵدا نیە. ئێمە پێویست نیە لەسەرمان بگەڕێین و بزانین بەچۆنیەتی ئەو گفتوگۆیە بەچ جۆریّ بوەو لەبەرچاومانە خوا باسی فەرموە .

پرسیار/ ڕستەی ( فيما أغويتني ) لەلایەن ئیبلیسەوە وادەرئەخا ئەو لەرێگە لادانە خوا ئەیکا، ئیتر بۆ ئەبیّ خوا سزای شەیتان بدا لەسەری ؟

وەلاّم / بەڕاستی ئەو ڕێگەلادانە لەشەیتانەوەیە و لەخواوە نیە ئیبلیس خۆی دگانی پێدانـاوە خۆی لەڕێگە لادەرە ، وەك خوا ئەفەرمویّ لەسورەتی (ئەلحیجردا ):

(لأغويتهم أجمعين)؛ چۆن خوا بەندەی خۆی لائەدا لەرێگەی ڕاست و لەپاشا سزای بـــدا. بەڵام گفتوگۆی شەیتان: ( فيما اغويتني ) بەمانای ئەوەیە بەهۆی شتێ تۆ منــت پـێ تـاقی کردەوە لەسوژدە بردن بۆ ئادەم کەمنی خستە ڕێگە لادان و بێ فـەرمانی تـۆ لـەمـەودووا ئەو کارانە ئەکەم بەئادەمیزاد .

پرسیار/ لەبەر چ شتێ خوا مۆڵـەتی شەیتانی داو خوا ئەزانێ بەخراپەی و خراپەکردنی؟

وەڵام/ ئارەزوو ویستی خوا داوای ئـەوەی کـردوە یارمـەتی ئـادەمیزاد بـدا بەئـەقڵ و بەئامۆژگاری لـە سەردەستی پێغەمەران، بەوەی توانای داوە بەوان کـاری چـاك و خـراپ بکەن، سەربەستی کردون و تاقیان دەکاتەوە بـەئارەزووات و بـەهاندراوەکانی شـەیتان و پەیڕەوانی شەیتان لە بەجوێ بونەوەی پاك و پیس و نیاز پاك و نیاز پیس. تەماشای مانـای ئایەتی (٩٤) ی سورەتی ئەلمائیدە بکەن .

لـەمەوبەر خوا فەرموی بەفریشتەکان: ئێوە سوژدەببەن بۆ ئادەم و سەری بۆ دانـەوێنن، لـەمەودوایش ئەفەرموێ:

وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ فَكُلَا مِنۡ حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسۡوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ لِيُبۡدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنۡهُمَا مِن سَوۡءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنۡ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيۡنِ أَوۡ تَكُونَا مِنَ ٱلۡخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٖۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٢﴾

قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾ قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴿٢٥﴾

﴿ وَيا آدَمُ اسْكُنْ أنتَ وَ زَوْجُكَ الجَنَةَ فَكُلا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمْا ﴾ وەئێمە دوای دەرکردنی ئیبلیس لەبەهەشت ووتمان: وەئەی ئادەم تۆو ژنەکەت کەحەوایە دانیشن و ئارام بگرن لەبەهەشتا، دوایی بخۆن لەمیوەو خواردەمەنی بەهەشت لەهەرشوێنێ خۆتان ئارەزوتان هەیە و لەهەر شتێ ئەتانەوێ بیخۆن .

﴿ وَلا تَقْرُبا هذِهِ الشَجَرَةِ فَتَكُونا مِنَ الظالِمِينَ ﴾ وەئێوە نزیکی ئەو درەختە مەکەون و مەیخۆن، چونکەئەگەر لێی بخۆن و تامی بەرهەمەکەی بکەن، دوایی ئێوە ئەبن لەوکەسانە ستەم لەخۆیان بکەن، شەیتان بەوە خۆشحاڵ بوو بۆشایی دەست کەوت بەو بۆنەوە ئەچێ بۆ لای ئادەم و حەوا خۆی ماندو ئەکا بۆ دەرکردنیان لەبەهەشت .

﴿ فَوَسْوَسَ لَهما الشَيْطانُ لِبُنْدي لَهما ما وُورِيَ عَنْها مِنْ سُؤءاتِهما ﴾ دوایی شەیتان لەبەر زیانی ئادەم و حەوا دوودڵی و گومانی بەکارهێنا و خستیە دەرونیانەوە خواردنی بەرهەمی ئەو درەختە بخۆن لەبەرئەوەی دەربخا لەوان شتی داپۆشرابوو لەوان لەشەرمگا کانیان و عەیبەکانیان، هیچ یەکێ لەوان نەشەرمگای خۆیان و نەشەرمگای هاورێکەیان نەبینی بوو.

بۆ زانین: گفتوگۆی نهێنی شەیتان و دوودڵی دروست کردنی ئەو ئێمە چۆنیەتیکەی نازانین. بەڵام ئێمە باوەڕمان هەیە کەخەفەت و کارەسات و کردەوەیە ببێتە کۆسپ لەرێگەی ژیان و پێش کەوتن و فەرماندانی خوادا لەشەیتانەوەیە، بەهەرشێوەیە بوبێ شەیتان ئامۆژگاری و دڵسۆزی خۆی دەربڕی بۆ ئادەم و حەوا، دڵ پیسی ودەغەڵی خۆی

پەنهاندا بۆیان لەدەرونی خۆیا. ئەو ئایەتە وامان بۆ دەرئەخا شەیتان ئەیزانی هەرکەسی لەو درەختە بخوا شەرمگای دەرئەکەوێ، هەرکەسێکیش شەرمگەی دەرکەوت لەبەهەشت دەرئەکرێ بۆیە داوی سازان بۆ دەرکردنیان .

﴿ وَقالَ مانَهاكُمارَبُكُمْا عَنْ هذِهِ الشَجَرَةِ إلا أنْ تَكُونا مَلَكَيْنِ ﴾ وەشەیتان بەفێلەوە و بەدرۆوە وتی: پەروەردەکەری ئێوە قەدەغەی نەکردووە لەئێوە خواردنی ئەو درەختە مەگەر کەئێوە ئەبن بە فریشتە و لای گرانە و پێی ناخۆشە. یانی ئێوە ئەگەر لەو درەختە بخۆن وەك فریشتە جوان ئەبن و پێویستییتان بەخواردن نامێنێ.

﴿ أوتَكُونا مِنَ الخالِدينَ ﴾ یابێزارەو لای گرانە کەئێوە بن لەو کەسانەی بەردەوامبن لەبەهەشتا، هەرزیندوبن و نەمرن، وێنەی ئەو فریشتانە هەڵسورێنەری کاروباری بەهەشتن، شەیتان دوودڵی ئەخستە دەرونی ئادەم و حەوا، بەدڵیانا ئەرۆیشت بەهەشت ئارامگایەکی خۆشە ئەگەر لەودا بەردەوامبن لەناویا و دەرنەچونایە .

پرسیار/ ئەوئایەتە بەرواڵەت وای دەرئەخا کە فریشتەکان گەورەترن لەپێغەمەران، چونکە ئادەم داوای ئەکرد فریشتە بێ ؟

وەلام/ لەو ئایەتەدا ئەو شتەرونادا، چونکە ئادەم کاتێ داوای کرد لەفریشتەکان بێ رێزدارنەبوو بەپلەی پێغەمەرایەتی، ئەو روداوە بەرلەئێغەمەرایەتی ئادەم بوە، بۆیە داوای کرد لەفریشتەکانبێ یا بەردەوام بێ لەبەهەشتا، ئەگەر لەکاتی پێغەمەرایەتیدا بوبێ، بۆیە داوای کردوە هەتا تەمەنی درێژبێ وەك فریشتەکان، نەك لەبەرئەوەی فریشتەکان لەو گەورەترن.

﴿ وَقاسَمُهما إنّي لَكُمْا مِنَ النّاصِحِينَ ﴾ وەشەیتان سوێندی خوارد بۆ ئادەم و حەوا، ووتی: بەراستی من لەوکەسانەم ئامۆژگاری کەری دڵسۆزی ئێوەم ئەگەر ئێوە لەودرەختە بخۆن نامرن و بەردەوام دەبن هەتا هەتایە. لەژێرەوە دوژمنی سەرسەختی ئەوان بو، ئەیزانێ هەرکەسێ لەو درەختە بخوا ئەنجامەکەی دەرکرد نیە لەبەهەشت و پاشەرۆژی خراپ و مردنە.

شاگردەکانی ئەم سەردەمەی شەیتان ئادەمیزادی ساویلکە ئەخەلەتێنن و بێ فەرمانی خوایان پێ ئەکەن و خوێنی بێ تاوانیان پێ ئەرێژن و ئەیان چەوسێننەوە ودەربەریان ئەکەن و شارو دێهاتەکانیان ئەڕوخێنن و منالێی ساوا لەدایك جوێی ئەکەنەوە، هەتادێ .

﴿ فَدلاهُما بِغُرُورٍ ﴾ دوایی شەیتان ئادەم و حەوای دابەزان لەپلەیەکی بالاّ و بۆ لای پلەیەکی نزم و بێ نرخ بەهۆی فێلی پوچی خۆیەوەو بەفریودانی درۆینە وەئامادەم و حەوای خستە تەماعەوە ئەوانیش دەستیان کرد بە خواردنی میوەی دەرختەکە، بەسوێند خەلەتاندنی و بەتەماعداری کردنی ئەوەی هەتاهەتایە لەبەهەشتا بن بەوێنەی فریشتەکان، بەڕاستی شەیتان دوای ئەوەی سوێندی خوارد بۆیان کە ئامۆژگاری کەری دلسۆزیانە، ئەوانیش وەلاّمیان دایە وگومانیان وابو هیچ کەسێ پەلاماری سوێندی درۆ نادا، شەیتان یەکەمین کەسە سوێندی بەدرۆ خوارد و یەکەمین کەسیش بوو داوای ڕەگەز پەرستی کرد.

﴿ فَلَمّا ذاقا الشَجَرَة بَدَتْ لَهما سَوْءاتُهما ﴾ دوایی کاتێك ئادەم و حەوا تامی ئەو درەختەیان کرد و دەستیان کرد بەخواردنی دەرکەوت بۆیان شەرمگەی یەکتریان بینی و شەرمەزار بوون و دەستیان کرد بەشاردنەوەی شەرمگەی خۆیان .

﴿ وَطَفِقاً يَخصِنعانِ عَلَيهِما مِن وَرَقِ الجَنَةِ ﴾ وەئادەم و حەوا دەستیان کرد بەدارنینی گەلاّ و ئەیاندا بەسەر خۆیاندا لەگەلاّی درەختی بەهەشت گەلاّ لەسەر گەلاّ، لەشەرمەزاریدا لەلایەکەوە ئەچون بۆلایەتر. هەندێ لەزانایان ئەڵێن: ئەو درەختە هەنجیر بوو.

﴿ وَنادا هُمْا رَبُّهُما أَلَمْ أَنْهَكُما عَنْ تِلْكُما الشَجَرَةُ وَ أَقُلْ لَكُمْا إنَ الشَيْطانَ لَكُمْا عَدُوٍ مُبِيْنَ ﴾ وەبەسەرزەنشتەوە پەروەردەکەری خۆیان بانگی کردن: ئایا من قەدەغەم نەکردبوو لەئێوە خواردنی میوەی ئەو درەختە وەپێم نەووتن: بەڕاستی شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە لەوکاتەوە فریشتەکان سوژدەیان برد بۆ ئادەم و ئەو سوژدەی نەبرد لەبەر دلپیسی و ڕەگەز پەرستی .ئەو ڕستەیە هەرچەندە سەر زەنشتە بۆ ئادەم و حەوا لەسەر ئەوەی شەیتان ئەوانی خەلەتان و لاوازبون بەرانبەر بەفێلی شەیتان،

لەهەمان کاتدا ئاگاداریان ئەکا پێویستە پەشیمان ببنەوە، بۆیە کوتو پـڕ دگانیـان بـەتاوانی خۆیاناو داوای لێ خۆشبونیان کرد لەپەروەردەکەری خۆیان .

﴿ قالا رَبّنا ظَلَمْنا أنفُسَنا وإنْ لَمْ تَغفِرْ لَنا وَتَرحَمْنـا لَنَكُونَـنّ مِـنَ الخاسِـرِينَ ﴾ ئـادەم و حەوا وتیان: ئەی پەروەردەکەری ئێمە: ئێمە ستەممان لەخۆمان کرد بەبێ فەرمانی تۆ کە ئێمە لەبەهەشت دەرکراین و، ئەگەر تۆ لەئێمە خۆش نـەبی و بـەزەیت پێمانـا نەیەتـەوەو میهرەبانیمان لەگەڵنەکەی بەگەورەیی خۆت، بەڕاستی ئێمە لەڕیزی ئـەو کەسـانە ئـەبین خۆیان لەناو ئەبەن و زیانۆ مەندین بەهۆی بێ فەرمانی تۆ، خوای مەزن لەوان خـۆش بـو، وەك لەئایەتی (٣٧) ی ئەلبەقەرەدا فەرموی:

﴿ قالَ اهبِطُوا بَعْضَكُمْ لِبَعضٍ عَدُوّ ﴾ خوا فەرموی: ئێوەی ئادەم و حـەواو شـەیتان و منالەکانتان بڕۆنە دەرەوە لەبەهەشت، هەندێ لەئێوە دوژمنی هەندێ ترتانن. یـانی ئێـوەو شەیتان دوژمنی یەکترین، هەندێ لەنەوەکانی ئـادەم و حـەوا دوژمنـی یـەکترین، شـەیتان بەردەوامە لەسەر فریودانی ئادەمیزاد لەتۆڵەی دەرکردنی لەبەهەشت و بێ میهرەبانی خوا لەگەڵی بەهۆی ئەوانەوە بەلام ئادەمیزادی هـەزار شـەیتان نـابینن هـەتا ئـازاری بـدەن و تۆڵەی خۆیانی لێ بکەنەوە .

﴿ وَلَكُمْ فِي الآرْضِ مُسْتَقَرّ وَمَتاعُ إلى حِيْنٍ ﴾ وەبۆ ئێوە هەیـە ئـارام گرتـن و شـوێنی حەسانەوەتان و ڕابواردنتان لەزەویدا هەتا کاتی مردنتان و کۆتایی هاتن بەتەمـەنتان.ئـادەم بەو بەسەرهاتە توشی خەفەت و ئازاربو کەبۆی دەرکەوت جارێ تر ناگەڕێتەوەبەو ژیان و گەڕانەوەی بۆ لای بەهەشت هەتا نەمرێ و زیندو نەکرێتەوە جاریتر .

﴿ قالَ فِيها تَحيَوْنَ وَفِيْها تَمُوتُوْنَ وَمِنْـها تَخرُجُـونَ ﴾ خـوا فـەرموی: ئێـوەی ئـادەم و حەواو منالەکانتان لەزەویدا ئەژین لەڕۆژانی ژیانتان و لەزەویدا ئەمرن و ئەبێ بەجێگـەی گۆڕتان و لەزەویدا ئێوە ئەهێنرێنە دەرەوە لەرۆژی دواییدا زیندوئەکرێنەوە بـۆ پرسـیار و پاداشت و تۆڵە .

خوای مەزن بەسەرهاتی ئادەمی لەئایەتی (٣٣) ی ئەلبەقەرە هەتا ئایەتی (٤١) ولەسورەتی ئەلئەعرافدا لەئایەتی (١١) هەتا ئایەتی (٢٥)، لەسورەتی (تاها) دا لەئایەتی (١١٥) هەتا ئایەتی (١٢١) ،لەسورەتی (سادا) لەئایەتی (٧١) هەتا ئایەتی (٨٥) باسی فەرموە .. کورتەو پوختەی ئەو بەسەر هاتەی ئادەم لەو ئایەتەدا بەم جۆرەی خوارەوەیە :

خوای مەزن هەواڵیدا بەفریشتەکان: بەڕاستی من بونەوەرێ لەزەویدا دروست ئەکەم، ئەو بونەوەرە خۆی و نەوەکانی ئەڕۆن بەهەرچوار لای زەویدا و ئەخۆن و ئەخۆنەوە لەخواردەمەنیەکانی زەوی، دوایی فریشتەکان بەخوایان ووت لەڕوی بەندەیی و بچوکیەوە: تۆ چۆن دروەست ئەکەی لەزەویدا کەسانێ خراپە بلاو بکەنەوە لەزەویدا و خوێنی یەکتر برێژن و ڕێگەی لەیەکتری بگرن بۆ زۆرکردنی سامان لەپیت و فەڕی زەوی؟ ئێمە هەمو کاتێ بەردەوامین لەسەر پەرستنی تۆ .

دوایی خوای مەزن وەلامی فریشتەکانی دایەوە بەفەرمودەیە دڵیان ئارامی پەیداکرد. خوای گەورە داوای لەفریشتەکان کرد پێویستە ئێوە سوژدە ببەن بۆ ئەوبونەوەرە کەناوی ئادەمە کاتێ بو بەتەنێکی ڕێك و پێك و دروستم کرد ودیمەنی یەکجاریم پێ بەخشی و گیانم کرد بەبەریا، دوایی فریشتەکان ڕێزی ئادەمیان گرت و سوژدەیان بۆ برد جگە لە شەیتان کەبەئاشکرایی و بێ ئابڕویی گوناهی دەربڕی و بێ فەرمانی خوای کرد و بێ شەرمانە سەری بۆ ئادەم دانەنواند وسوژدەی بۆ نەبرد .

کاتێ خوای مەزن پرسیاری لەشەیتان کرد لەبارەی سوژدە نەبردنیەوە ووتی: من چاکترم لەئادەم و ڕەگەزم بالاترە لەو، دوایی خوای مەزن لەتۆڵەی بێ فەرمانی ئەودا دەریکرد لەبەهەشت و دووری خستەوە لەبەزەیی و میهرەبانی خۆی، خوای مەزن ناوی هەمو بونەوەرانی فێری ئادەم کرد کەفریشتەکان نەیان ئەزانین، خوا فەرمانی دا بە ئادەم کەهەواڵی ئەو بونەوەرانە بدا بەفریشتەکان و ناوی هەمویان فێری ئەوان بکا، هەتا دەربکەوێ بۆیان ڕێزو زانیاری ئادەم، نهێنی جێگەنشینی ئادەم بۆ خوا لەزەویدا

دەربکەویٚ بۆیان ئادەم یەکەیەکە ناوی ئەو بونەوەرانەی پیٚ ووتن، ڕیٚزی ئادەم و نهیٚنی جیٚگەنشینی ئەویان بۆ ڕون بویەوە .

خوای مەزن دروستی کرد بۆ ئادەم هاوەڵیك و کردی بەژن بۆی، لەبەهەشتا دایانان بە خۆشیەوە کە هەیانبو سەربەستی کردن و ڕەوای کرد بۆیان خواردەمەنی هەمو میوەکانی بەهەشت، قەردەغە کرد لیٚیان تاکە درەختیٚ لەهەموو درەختەکانی بەهەشت، خوای مەزن فەرموی بەئادەم و حەوا، بەڵیٚنی دانیٚ ئەوان فەرمان بەرداری خوا بن و لەفەرمودەی دەرنەچن هەرگیز برسیٚتیو تینویٚتی و ڕوتاڵی ڕویان تیٚ ناکا، خوا فەرموی: ئیٚوە لەشەیتان بترسن و ئاگاداری خۆتان بن لەریٚگە لاتان نەدا و بیٚ فەرمانی خواتان پیٚ نەکا. شەیتان دەرکرا ولەمیهرەبانی خواو زۆری لا گرانبو ئەوان لەو خۆشەدا بژین و شەیتان لەخۆشیدا نەژی.

دوایی شەیتان ڕۆیشت بۆلای بەهەشت بەهەرجۆریٚ بوو هەوڵی دا بۆ ڕاکیٚشان و سەرنجی ئادەم و حەوا بۆ لای خۆی. لەوهەوڵەدا سەرکەوت و ئەوانی گیرۆدە کرد بەهۆی گفتوگۆی پروپوچی ڕازاوەی خۆی. کزۆڵ و کۆیلەی کردن و لەڕیٚگەی ڕاستی لایدان و لەودرەختەیان خوارد، کاتیٚ کەلەمیوەی درەختەکەیان خوارد بەرگەکانیان لەبەر داڕناوشەرمەکانیان دەرکەوتن بەپەلەو بەشەرمەوە خۆیان دائەپۆشی بەگەڵای دەرختەکانی بەهەشت. دوایی خوای مەزنبەسەرزەنشتەوە بانگی ئادەم و حەوای کرد لۆمەی کردن لەسەر ئەوەی ئامۆژگاری خوایان لەبیر خۆیان بردەوە، ئاگایان لەوە نەما کەلەشەیتانی ترساندبوون، بەوبۆنەوە ئادەم و حەوا بەکزۆڵیەوە لەخواپاڕانەوەو پەشیمان بونەوەو داوای لیٚ بوردن و خۆشبونیان لەخوا کرد، خوای مەزن میهرەبانی پیٚ بەخشین و لەوان خۆشبوو. بەڵام دەری کردن لەبەهەشت و بیٚ بەشی کردن لەو خواردەمەنیە خۆشەی بەهەشت و ناردنیە سەرزەوی و کردنی بەجیٚگەداری خۆی و دوو ڕیٚگەی بۆ دانان: ڕاغویی وەرگرتن. ڕیٚگەلیٚی وونبون. بەڵیٚنی دانیٚ هەرکەسیٚ ڕاغویی وەرگریٚ ئەیخاتە بەهەشت لەپاشەڕۆژدا ، هەر کەسیٚ لەڕیٚگەی ڕاستی خوا دەرچیٚ ئەیخاتە دۆزەخ، ئادەم و نەوەکانی ئاگادارکرد کەدوژمنایەتی لەنیٚوان ئەوان و شەیتانا بەردەوامە هەتا

ڕۆژی دوایی و ترساندنی لە ڕێگەلادان و گومان پەیداکردنی شەیتان، ئەوباسانەی ڕابوردن لەوئایەتانەدا پوختەی بەسەرهات و چیرۆکی ئادەم و حەواو شەیتانن. بەلاّم ئادەمیزاد هەیانە باوەڕیان بەو ڕوداوە نیە، هەیانە باوەڕیان بەو بەسەرهاتە هەیە، ئەو باوەڕدارانەیش هەیانە لەسنوری دەرکەوتوی قورئان دەرچوون و پشتیان بەئەفسانەی جوەکان بەستوە لەبارەی شوێنی بەهەشت و جگەی ئەوەیش ئەڵێن: ئەو بەهەشتە لەسەر زەوی بوە، ئەودرەختە ئادەم و حەوا لەمیوەکەیان خوارد درەختی گەنم بوە، ئادەم و حەوا بەگەلاّی هەنجیر شەرمگەی خۆیانیان دائەپۆشت، شەیتان لەقوڕگی مارێکا چووە بەهەشت، هەتا دێ ئەوانە هەمویان نە لەقورئاندا و نەلەفەرمودەی ڕاستی پێغەمبەردا ڕون نەکراونەتەوە، تاقمێ لەسۆفیەکان ئەوپەڕیان گرتووە لەدەرچونی سنوری دیاری کراوی قورئان، مانایەکی نادیاری و ناپەسەندیان بۆ دروست کردوون: ئەڵێن: بەبێ‌شەرمانە درەخت بەمانا تاقی کردنەوەیە. شەیتان بەمانا ئارەزووی جیهانە. شەرمگە بەمانا پەستی و بێ نرخیە هەتا دێ. ئێمە بەجۆرێکی مامناوەندی و دادپەروەری ڕێگەی ڕونی دەرکەوتوی قورئان ئەگرین و دوای پروپوچی جوەکان و لەرێگەی دەرچونی سۆفیەکان و ئەوانی تر ناکەوین. بەکورتی باوەڕمان بەوشتانە هەیە بەسەر ئادەمدا تێپەڕیون بەگوێرەی مانای دەرکەوتوی قورئان هەڵئەسین. یانی درەخت و شەرمگەو گەلاّو شەیتان بەشێوەی بیسنراو مانایان ئەکەین وڕاست و چەپ ناگرین، ئەقڵیش تەنها مانای دەرکەوتووی ئەوشتانە وەرئەگرێ. ئێمە داوامان لێ ناکرێ بزانین ئەو بەهەشتە چۆنە و لەم سەر زەویەدا بووە یانە نە؟ ئەو گەلاّیە ئادەم و حەوا خۆیانیان پێداپۆشت چ ڕەگەزێ بووە؟ ئەو درەختە چ شتێ بووە؟ شەیتان چۆن چوە بەهەشت؟ ئەوانە هەمویان درێژەو شی کردنەوەیان و چۆنیەتی ڕاستیان هەواڵەی زانیاری بێ وێنەی خوان، هیچ پەیامێ بۆ دیاری کردنیان نەهاتووەتە خوارەوە و ئەقڵیش لەوبارەوە کۆڵەو بۆی دیاری ناکرێ.

خوای مەزن لەئایەتی ( ١٤١ ) ی ئەلئەنعامدا باسی ئەوشتەی فەرموە کە بەگەورەیی خۆی بەخشیویەتی بەبەندەکانی خۆی لەخواردەمەنیەکان. لەئایەتی (٢٧) ی پێشووی ئەم سورەتە ڕونی کردوەتەوە کە ڕوتاڵی و دەرکەوتنی شەرمگە هۆی ئابڕوچون و بێ نرخیە بۆ ئادەمیزاد بۆیە ئادەم و حەوا بەهۆی پاکی دەرونیانەوە هەوڵی داپۆشینی خۆیانیان ئەدا،

لەم ئایەتانەی دووایشدا باسی ئەوەمان بۆ ئەکا کە بەخشنێکی زۆر گرنگتری بەخشیوە بەبەندەکانی خۆی وەك بەرگ و پۆشاك، بۆیشمان ڕون ئەکاتەوە پێویستە ئادەمیزاد شەرمگەی خۆیان داپۆشن بەهەر پۆشاکێ بێ، بیریشمان ئەخاتەوە کە عەرەبەکان بەرلەهاتنی ئایینی ئیسلام بەڕوتی ئەگەڕان بەم لاولای خانەی خوادا، ئایینی ئیسلام ئەوکارە خراپەی قەدەغەکرد. ئەفەرموێ:

يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٧﴾

﴿ يٰابَنِيْ آدَمْ قَدْ أَنزَلْنا عَلَيْكُم لِبْاساً يُواري سَوْاتِكُمْ ﴾ ئەی ئادەمیزاد بەڕاستی ئێمە بەخشیومانە بەئێوە و ناردومانەتە خوارەوە بەسەر ئێوەدا بەرگ و پۆشاکێ داپۆشێ شەرمگەی ئێوە، یانی ئێمە ناردومانەتە خوارەوە بەسەر ئێوەدا بارانێ زەوی زیندو ئەکاتەوەو هەمو شتێکی پێ سەوز ئەکەین. بەتایبەتی لۆکەو کەتان کە شەرمگەی خۆیانیان پێ دائەپۆشن ، هەروەها ئاژەڵیشم بۆ دروست کردون کە بەگژوگیای زەوی ئەژین و بەخوری و کورگ و موی ئەوان بەرگ بۆ خۆتان ئەسازێنن .

﴿ وَرِيشاً ﴾ وەئێمە بەخشیومانە بەئێوە بەرگێکی تری بەنرخ و نایاب لەپۆشاك و کەل و پەلی مالتان خۆتانی پێ ئەڕازێننەوە بەوێنەی باڵندەکە خۆیانی پێ جوان ئەکەن بەتوك و

پەڕەکانیان. یانی ئێمە ئەو دوو بەرگەمان پێ بەخشیون: یەکێکیان شەرمگەی خۆتانی پێ دائەپۆشن، ئەوی تریان خۆتانی پێ ئەڕازێننەوە. ووشەی ( ریشا) زۆر شت ئەگرێتەوە لەبەخشراوەکانی خوا بەوێنەی دارایی و هەرزانی و ئاووسابون و زۆر شتی تر کە ئەبنە هۆی خۆ جوان کردن .

﴿ وَلِبَاسُ التَقْوى ذلِكَ خَيْرٌ لَكُمْ ﴾ وەبەرگی لەخوا ترسان ئە وبەرگە چاکترە لەهەمو بەرگێ، چونکە خاوەنەکەی ئە پارێزێ لە سزای خوا بە وێنەی بەرگێ خاوەنەکەی ئەپارێزێ لەگەرماو سەرما. بەرگی لەخوا ترسان جۆرەکانیان زۆرن: خۆپاراستن لە قەدەغەکراوەکان، کردنی کردەوەی چاك، داوێن پاکی، ڕاست گۆیی، شەرم کردن، ڕەوشتی چاك هەتادێ. ئەوانە هەمویان ناوبراون بەبەرگ. لێرەدا بەمانا بەرگ و کەل و پەلی نایابی ناومالّە .

﴿ ذلِكَ مِنْ آيَاتِ اللهِ لَعَلَهُمْ يَذّكَرُونَ ﴾ بەبەخشینی ئەو بەرگانە بە ئادەمیزاد لە وبەلّگانەن لەسەر ناسینی خواو بەیەکدانانی خوا، بۆ ئەوەن بیر بکەنەوە لەچاکەی خوا، دوایی سوپاسی خوا بکەن لەسەر پاراستنیان لەگەرما و سەرماو ڕوتالّی و ڕوداوی ترو شەرمگەیان دائەپۆشێ و ئەیشیان پارێزێ لە سزای خوا .

لەوئایەتانەی پێشوودا خوا باسی دوژمنایەتی شەیتان و باسی بەرگ و پۆشاك کردو ڕونی کردەوە شەیتان داوی دانا بۆ ئادەم و حەوا و دەری کردن لە بەهەشت، ئاسایش و خۆشی ئەوانی گێڕا بەئازار و ماندوو بون و خەفەت و کولەمەرگی، لەم ئایەتەی دواییدا کوڕانی ئادەم ئەترسێنێ کەشەیتان نەیان خاتە داوی خۆیەوە و باریان گران نەکا بەگوناە هەتا نەیەلّێ بچن بۆ بەهەشت لەپاشەڕۆژدا بۆ درێژەی ئەو باسە خوا فەرموی:

﴿ يَابَنِي أدَمَ ﴾ ئەی ئادەمیزاد و کوڕانی ئادەم. بێژراوە ئەم ئایەتە ڕوی پێ کراوە بۆ لای ئەوانە بەڕوتی تەواقی مالّی خوایان ئەکرد .

﴿ لايَفْتِنَنَكُمُ الشَيْطانُ كَمَا أخْرَجَ أبَوَيْكَمْ مِنَ الجَنَّة ﴾ شەیتان ئێوە بێ ئاگانەکا بەفێلّی خۆی و سەرتان لێ تێکبدا، بەوجۆرەی باوك و دایکی ئێوەی دەرکرد لەبەهەشت، بەهۆی هاندانیان بۆخواردنی میوەی ئەو درەختەو دەرکەوتنی شەرمگەیان .

﴿ يَنْزِعُ عَنْهما لِبَاسَهُما لِيُرِيَهما سَوْآتِهِما ﴾ شەیتان دای ڕنی لەوان بەرگەکانیان بۆئەوەی دەربخا بۆیان شەرمگەکانیان و شەرمگەی یەکتر ببینن کەلەوەوبەر شەرمگەی یەکتریان نەبینی بوو. بائەوەیشمان لەبیر بێ بەکردنی گوناهێکەوە ئادەم و حەوا لەبەهەشت دەرکران. دوای چونیان بۆ بەهەشت، دوایی چۆن نەوەکانی ئادەم و حەوا ئەچنە بەهەشت کە گوناهی زۆر کۆمەڵ بووە لەسەریان؟ لەوەڵامدا ئەبێژرێ میهرەبانی خوا زۆرترە لەگوناهی ئێمە بەومەرجەی کەئێمە لەتاوانی خۆمان پەشیمان ببینەوە.

﴿ إِنَّهُ يَراكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لاتَرَوْنَهُمْ ﴾ بەڕاستی شەیتان خۆی و تاقم و سەربازەکانی ئێوە ئەبینێ لەجێگەیەك ئێوە ئەوان نابینن، چونکە خوا لەچاوی ئەوانا جۆرە بینینێکی دروست کردوە لەچاوی ئێوەدا دروستی نەکردو. کەواتە ئێوە خۆتان لەداو و فێڵی ئەوان بپارێزن، دوژمنایەتی ئەوانتان لەبیر نەچێ، ئەوان وێنەی ماری ژێر کان، کاتێ ئەزانن پێیانەوە ئەدەن. زانایان لەنێو ڕوناکی مانای ئەوڕستەیە بیریان جیاوازە، هەندێکیان ئەڵێن: جنۆکەو پەری ئادەمیزاد نایانبینن، هەندێ تر لایان وایە دروستە ببینرێن، بەڵام نەك لەسەر ئەو شێوە تایبەتی‌یەی لەسەری دروست کراون، کاتێ خوا بیەوێ نیشانی ئادەمیزادیان بدا ئەیان گۆڕێ بە شێواوزێ شیاوبێ ببینرێن، لەوێنەی شێوەی ئادەمیزاد، ئیبراهیم پێغەمەرو خاتون سارای ژنی فریشتەکانیان ببینی، هەندێ لەزانیان ئەڵێن: جگە لەپێغەمەران کەسی تر نایانبینن، هەندێ تر لایان وایە لەجیهاندا نابینرێن، چونکە لەوانەیە ژن و کوڕی خۆی بەوان بزانێ و توشی هەڵە بێ، بەڵام لەدوای تەماشاکردنێکی زۆر لەنامەکان بیری زانایانی بڕوا پێکراو بەڵگەیەکی ئاشکرای بێگومان دەست نەکەوت لەسەر چاوپێکەوتنی جنۆکەو پەری. مانای دەرکەوتوی ئەو ڕستەیە لەئایەتی سەرەوەدا زۆرتر بەڵگەی بێگومانە لەسەر ئەوەی نابینرێن. ئەوباسانەی سەرەوە هەمویان بۆ ئەوەی جنۆکەکان لەشێوازی تایبەتی خۆیانا نابینرێن، بەڵام لەشێوە یە تردا بێگومان بینراون. بەسەرهاتی سولەیمان لەگەڵ ( نەڕنایشی ) جنۆکەو هاودرنی تەختی ( بەلقیس ) و بەکارهێنانی دێوەکان لەکارێ کردنیان بەڵگەی بێگومانن لەجگەی شێوەی خۆیانا ئەبینرێن. چاوپێکەوتنیان بۆ جگەی پێغەمەرانیش دروستە ئەگەر خوا ئارەزۆی هەبێ .

﴿ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِيْنَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لاَيُؤْمِنُونَ ﴾ بەڕاستی ئێمە شەیتانەکانمان کردوە بەدۆست وکار هەڵسوڕێنەر بۆئەو کەسانەی ئەوتۆ باوەڕناهێنن بەخواو بەتاك و تەنهای دانانێن و بێ فەرمانی ئەو ئەکەن. بەڵام باوەڕداران بەهیچ جۆرێ شەیتان دەستەلاٌت و توانای بەسەریانا نیە، چونکە بەندەی پوختی خوان و ئیش و کاری خۆیانیان سپاردەی خوا کردووە، خوایش دۆست و کار هەڵسوڕێنەری ئەوانە .

پرسیار/ کاتێ شەیتان ئێمە ببینێ و ئێمە ئەو نەبینین، وامان بۆ دەرئەکەوێ شەیتان دەسەلاٌتی بەسەر ئێمەدا هەیە و ئێمە بەرانبەر ئەو لاواز و ژێردەستەین، ئەتوانێ بە پەنهانی لەناومان بدا هەرکاتێ ئارەزوی هەبێ، ئێمە توانای ئەوەمان نەبێ خۆمانی لێ بپارێزین، کاتێ ئەوەمان زانی بەچ جۆرێ مانای ئەوە ئەکرێ کە خوا فەرمان ئەدا بەوە شەیتان لەرێگە لاتان نەدا و قەدەغەی فەرموە گوێ گرتن لەشەیتان .

وەلاٌم زۆر ئاشکرایە ئێمە شەیتان نابینین. بەهەموو کردەوە خراپەکانی کار ئەکەنە سەر مێشکمان. گومانو خواستی خۆی بخاتە دەروغان بەهەشت و دۆزەخ نین، هەتادێ باوەڕداران هەستیان بەو خواستەی ئەو کردو وریا ئەبێتەوە، باوەڕی خۆیان بەخواو ڕۆژی دوایی بەهێزتر ئەبێت و ڕولەخواستی شەیتان وەرئەگێڕن و وەلاٌمی نادەنەوەو پەنا لەشەیتان ئەگرن بەهۆی یارمەتی خوای مەزنەوە. کەواتە شەیتان بەرانبەر بەباوەڕداران دەستەلاٌتی نیەو لاوازە، خۆی لەو کەسانە لائەدا خواستەکەی بۆ ناچێتە سەر.هەرکەسێکیش باوەڕی بەخواو بەڕۆژی دوایی نەبێ لەگەڵ خواستی شەیتان ئەڕواو دەستەلاٌتی خۆی بەسەرائەکێشێ و ڕای ئەکێشێ بۆلای هەرجێگەو هەر شتێ ئارەزووی هەبێ و لەهەرکاتێکا بیەوێ، بەپێچەوانەی ئەوانەوە باوەڕدارن خۆیان نادەن بەدەست و گومان و خواستی شەیتانەوە .

هەندێ لەسەرگەردانەکان ئەڵێن: ئەو شەیتانە ئێمە نایبینین بریتیە لەو میکرۆبانەی مێشەکان هەڵیان ئەگرن بۆلای ئادەمیزاد، دوایی لەلەشی ئادەمیزاددا زاوزێ ئەکەن و

بەگورجی گەشە ئەکەن و ئەبنە هۆی نەخۆشی بەشێوەیەك چارەسەرنەکریٚ، بیری ئەو کەسانە بەگۆترە وبەبیٚ بەڵگە ئەیدەنەپاڵ خوای مەزن، پەیوەندی بەیاساو پەیڕەوی ئیسلامەوە نیە. بیٚ باوەڕان بەرلەهاتنی ئایینی ئیسلام پیاوەکانیان بەڕۆژدا بەڕوتی ئەسوڕانەوە بەم لاولای خانەی خوادا، ژنەکانیان لەشەودا ئەسوڕانەوە، ئەگەر بیان ویستایە حەج یا عەمرە بکەن ئەیان ووت: نابیٚ ئێمە بەبەرگەوە بسوڕێینەوە بەچوارلای خانەی خوادا کە گوناهمان پێوە کردوە، بۆ ئەو مەبەستە هاواریان ئەکرد: چ کەسێکە بەرگێکمان بداتیٚ حەج یا عەمرەی پێوەبکەین، ئەگەر کەسیٚ وەلاٚمی بدانایەوە وئەو شتەی بدانایە ئەسوڕانەوە ئەگەررووەلاٚمیان نەدرایەتەوە یابەڕوتی ئەسوڕانەوە یا بەبەرگی خۆیانەوە ئەسوڕانەوە لەدواییدا بەرگەکانی خۆیانیان فڕیٚ ئەدا، بۆ باسکردنی ئەو باسانا لەو بارانەوە خوا فەرموی :

وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ قُلْ أَمَرَ رَبِّى بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَقِيمُوا۟ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۚ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾ فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُ ۗ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٠﴾

﴿ وَإِذا فَعَلُوا فاحِشَةً قالُوا وَجَدْنا عَلَيْها آبائَنا ﴾ وەهەر کاتێ بێ باوەڕان کارێکی بێز لێ کراوە و خراپیان ئەکرد بەوێنەی پەرستنی بتەکان و کردنی هەموو قەدەغەکراوەکان، لەوکاتەدا بەوان بووترایە ئەوکارە قەدەغەکراوانە مەکەن ئەیانووت لەڕووی لاسایی کردنەوە بەبێ بەڵگە ئێمە باوکەکانی خۆمانمان دەست کەوتووە لەسەر کردنی ئەو کارە بێزلێکراوەو لەوانەوە بۆمان بەجێماوەو ئێمەیش ئەیکەین، کردەوەی ئەوان یاسای بت پەرستان و جگەی ئەوانە بەتایبەتی لەم سەردەمەی ئێمەدا ئەو جۆرە لاسایی کردنەوانە زۆرن. وەك دانیشتن بۆ پرسەو سەردان بۆلای گۆڕستان و لای مردوان بۆ وەرگرتنی فەڕ، ماچ کردنی کێل و درەخت و گڵ و بەردی سەر گۆڕی پیاو چاکان وئەو لاسایی کردنەوە لەلایەن نەخوێندەواران بەتایبەتی لای ساویلکەکان و پەیڕەوانی پیرانی ئەم سەردەمەی ئێمە یەکجار لەسنوری یاسای ئیسلام دەرچوون. لەهەموان خراپتر بیرکردنەوەی ساڵ و ڕۆژی مردوی هەندێ پیاوان .

﴿ وَاللهُ أَمَرَنا بِها قُلْ إِنَّ اللهَ لايَأْمُرُ بِالفَحْشاءِ ﴾ وەئەیان ووت خوا فەرمانی داوە بەکردنی ئەو خراپانە و لاسایی کردنەوەی باوك و باپیران، جگە لەبوختان و درۆ بەڵگەی تریان نەبو و خوای مەزن بەرپێچی دانەوە فەرموی: تۆ بڵێ: بەڕاستی خوا فەرمان نادا بەکردەوەی خراپ و بێزلێ کراوەو ناپەسەند. یاسای خوا بەجۆرێ هاتوەتە خوارەوە فەرمان بە جگەی چاکە نادا، زۆر ڕاست و بێ گومانە هەموو فەرماندانی خوا چاکە.

﴿ أَتَقُولُونَ عَلَى اللهِ مالاتَعْلَمُونَ ﴾ ئایا ئێوە چۆن شتێ بەدرۆ ئەڵێن و بەبوختان ئەیدەن بەسەر خوادا شتێ ئێوە نایزانن فەرمودەی خوایە: ئێوە بەبێ نوێنەر یەکەمجار فەرمودەی خواتان نەبیستوە لەپێغەمەرانەوە وەرتان نەگرتووە کەنوێنەری نێوان خواو نێوان بەندەکانی خوان، ئیتر ئێوە ئەو شتانە چۆن لەخۆتانەوە ئەڵێن، هەرکەسێ بەنەزانینەوە شتێ بڵاو بکاتەوە بوختان و دۆریەو جێگەی بڕوا نیەو بێ ئابڕوییە .

﴿ قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالقِسْطِ وَأَقِيمُوا وُجُوهَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ ﴾ تۆ بڵێ بەو بێ باوەڕانە پەروەردەکەری من فەرمانی داوە بەدادپەروەری‌و بەڕاستی و یەکێتی خواو هەمو کردەوە چاکەکان. کەواتە گومانی بێ باوڕان کە ئەڵێن: خوا فەرمانی داوە بەو کردەوە خراپانە ئەخرێنە سەر سەنوێلکەوە و،تۆ بڵێ بەوان ئێوە ڕووی خۆتان بکەن بۆ لای پەرستنی خوا

بەرێکی ڕاوەستن و ڕوبکەن بۆلای ڕوانگـە لەهـەموو کـاتی سـوژدەبردنتانا لـەلای هەمو مزگەوتیێ لەکاتی نوێژکردنتانا.

﴿ وَادعُوهُ مُخلِصينَ لهُ الدِينَ ﴾ وەئێوە پەروەردەکەری خۆتان بپەرستن و لەو بپارێنەوە وئیوە نیازتان پاکبیێ لەپەرستندا بۆ خواو مەبەستتان هەر پەروەردگارتان بیێ بۆ جگەی خوا نەبیێ.

﴿ كَمَا بَدَأكُمْ تَعودون ﴾ بەوێنەی شتیێ یەکەم جار پەروەردگار ئێوەی دروست کردوە ئێوە ئەگێڕێتەوەلەڕۆژی دواییدا بۆ پرسیار و پاداشت. دوایی ئێوە ئەبن بە دوو تاقم :

﴿ فَرِيْقاً هُدى وَ فَرِيْقاً حَقَّ عَلَيْهِمْ الضَلالَةِ ﴾ تـاقمی یەکـەمی ئـادەمیزاد خـوا ڕاغویـی ئەوانی کردوە و یاریدەی داون بۆ لای باوەڕهێنان و ناسینی خـــواو، ئـەو تاقمـە ئەوانـەن خوایان کردووە بە دۆست بۆیان و سەرپەرشتی کەری خۆیان، گویێ ڕایــەڵی فـەرمودەی خوابـون و شـەیتانیان نـەکردوە بەدۆسـتی خۆیـان و، تـاقمی دووهـەمیان خـوا ڕسـوای کردوون، پێویست بووە لەسەریان لە ڕێگـەی خـوا لابـدەن و شایسـتەی ڕسـوایی بـن، بەگوێرەی ئەقڵ و پاکی دەرونی خۆیان هەڵنەساون لەپاشەڕۆژدا سزای سەختیان ئەدریێ.

﴿ إنَهُمْ اتّخَذُوا الشَيْاطِيْنَ أوْلِياءَ مِنْ دُوْنِ اللهِ وَيَحْسَبُونَ أنَهُمْ مُهْتَدُونَ ﴾ بەڕاسـتی ئـەو تاقمەی دووهەمیان شـەیتانەکانیان کـردووە بەدۆسـت و هەڵسـوڕێنەری کـاری خۆیـان لەجگەی خواو کەسێکیش جگـەی خـوا وەربگـریێ بەدۆسـت و بەسـەردار، بـۆ خـۆی شایستەی ڕێگە لێی ونبونە، وەگومان ئەبەن ئەو تاقمە کە ئەوان ڕانـموییان وەرنـەگرتووە بەکردنی کردەوە خراپەکان بەلاسایی کردنەوەی باوکـەکانیان و بـەبوختان ئـەیان ووت: خوا فەرمانی داوە.

زۆر ڕاستە هەمو خاوەن بیرو باوەڕیێ لەکۆن و لەتازەدا خۆیان بەڕاست ئەزانن و هەر کاریێ بکەن بەلای خۆیانەوە بەچاکی ئـەژمێرن. عەرەبـەکان بەرلـەهاتنی ئـایینی ئیسـلام ئەسوڕانەوە بە چوارلای خانـەی خـوادا، پیاوانیـان و ژنانیـان بـەڕوتی، لـەڕۆژانی حـەج کردنیاندا چەوری و خواردەمەنی بەتامیان نەئەخوارد، خوای مەزن بـۆ ڕوون کردنـەوەی یاسای خۆی فەرموی:

يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٣١﴾ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا خَالِصَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٣٢﴾ قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلۡإِثۡمَ وَٱلۡبَغۡيَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٞۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَأۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ﴿٣٤﴾

﴿ يابَنِيْ آدَمَ خُذُوْا زِيْنَتَكُمْ عِنْدَ كُلِ مَسْجِدٍ ﴾ ئەی کوڕانی ئادەم: ئێوە جوانی خۆتان وەرگرن و بپۆشن و بەکاری بهێنن ئەو شتانەی خۆتانی پێ جوان ئەکەن و ئارایشتی خۆتانی پێ ئەدەن لای هەمو مزگەوتێ، شەرمگەی خۆتان داپۆشن و بەڕووتی نوێژ و تەواف مەکەن، کاتێ ئەچن بۆ مزگەوت خۆتان بۆن خۆش بکەن و شانە هەڵگرن و موی سەرو ریشتانی پێ دابهێنن، وەك لەپێشەو باسکرا عەرەبەکان بەرلەهاتنی ئایینی ئیسلام ژن وپیاویان بەڕووتی ئەسوڕانەوە بۆ تەواف کردنی خانەی خوا، خوای مەزن بەو ڕستەیە قەدەغەی کرد لێیان و لەهەمو ئادەمیزادی تر دەرخستنی شەرمگەو جێگە ناشرینەکان لەکاتی پەرستنی خواو سوڕانەوە بەم لاو لای خانەی خوادا، هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە هەرشتێ بێ، خوای گەورە قەدەغەی فەرموە سەیرکردنی شەرمگەی پیاوان و ژنان،

پێویستیشی کردووە لەسەر ئادەمیزاد داپۆشینی هەردوو شەرمگەکانیان و نێـوان نـاوك و ئەژنۆیان لەهەمو کاتێکا بەتایبەتی لەکاتی سوڕانەوەدا بۆ تـەوافی خانـەی خـواو لـەکاتی نوێژکردندا .

لەووشەی ( زینتکم ) دا بۆمان ڕوون ئەبێتەوە خوای مەزن ئادەمیزاد هان ئـەدات بـۆ ئارایشت کردن و خۆ جوان کردن و پاك کرنـەوەی خۆیـان لـەچڵك و چەپـەڵی و بـێ دەست نوێژی و لەش پیسی، ڕازاندنەوەی خۆیان بەبەرگی خاوێن لەکاتی نوێـژ و نوێـژی بەکۆمەڵ کردن ونوێژی هەینی و دانیشتن لـەنێو کـۆڕو کۆمـەڵدا، بـۆ ئـەوەی بـێزی لێ نەکرێتەوەو جێگەی سەرنج نەبێ بەهۆی نارێکی بەرگ و پۆشاکەوە .

لەمەوبەر باسکرا: عەرەبەکان خواردەمەنی بەتام و چەوریان لەکاتی حەج و عـەمرەدا نەئەخوارد.خوای مەزن لەو باوەڕەوە یاسای ئیسلامی دیاری کرد و فەرموی :

﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا ﴾ وەئێوە بخۆن خواردەمەنی بەتام وچەور لەکاتی حـەج و عەمرە ولـەهەمو کاتانی تردا، بخۆنەوە خواردنەوەکانیش لەشیر و شـەربەت و ماسـتاو، ئەو ڕستانە بەرپێچی ئەو کەسانە ئەداتەوە خواردن و خواردنەوەکانیان قەدەغەئەکرد، ئێوە لەسنور دەرمەچن لەخواردن و خواردنـەوەدا و لەبـەرگو ڕزانـەوەی بـەرگ و شـێوەی خۆتانا. بەڵام بەداخەوە لەم سەردەمەی ئێمـەدا دانیشـتوان بـەزۆری لەسـنور دەرچـوون لەخواردن وخواردنەوە و بەرگ و کاڵا و لەپێشانگای ماڵاندا. بـەچاو ئـەبینرێ بـەدەیان خواردن و خواردنەوە ومیوە دائەنرێ لەسەر مێزو سفرە. بەدەیان بەرگ و قات دروسـت ئەکرێ و دائەنرێ بـەگوێرەی مۆدێـل. بەتایبـەتی ژنـان ئەوپـەریان گرتـووە لـەدەرچونی سنوردا لەبەرگ و بەکارهێنانی بێن و بۆیە کردنی سەرو لێو و شتی تریانا .

﴿ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ ﴾ بەڕاستی خوا خۆشـی نـاوێ کەسـانێ لەسـنور دەرچـوون لەخواردن وخواردنەوەو بەرگ و شتی تردا. ئەبێ ئاگاداربین خواردن وخواردنـەوەی زۆر ئەبێتە هۆی نەخۆشی زۆر و بەفیڕۆدانی دارایی. بەرگی بی سنورو خۆڕازاندنەوەی لەش و پیشانگای هۆدەکانی دانیشتن ئەبن بە هۆی دڵ ئازاری هەژاران ولەناوچوونی سامان وبـێ ڕەوشتی وخۆهەڵکێشان و نەگەیشتن بەئاوات و لادانـە لـەئایین و نیشـتمان پـەروەری و خزم و دراوسێ پەروەری.

﴿ قُلْ مَنْ حَرَمَ زِيْنَةَ اللهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ ﴾ تۆ بڵێ: چ کەسێ قەدەغەی کردووە ئارایشت و خۆڕازانەوەیەکی ئەوتۆ خوا دەری هێناوە، لەڕووەکەکاندا وەك لۆکەو کەتان و لەگیاندارانداا بەوێنەی ئاوریشم و خوری، لەکانگاکاندا وەك ماشین، خوا ڕەوای کردوە بەرگ و خانوی جوان و سواربوونی وولاّخ و کەل وپەلو ئەوشتانەی خۆتانی پێ جوان و ئارایشت بدەن، ئەو شتانە خوا هەموویانی بەخشیوە بە ئادەمیزاد و بۆ بەندەکانی خۆی دروست کردوە و دەری هێناون بە توانای خۆی و ئیۆەیشی فێر کردوە لەزەویدا دەریان بهێنن. بەتایبەتی زێڕ وزیوو ئەڵماس و پیرۆزەو یاقوت و نەوت و قیرو هەزاران شتی تر .

﴿ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ ﴾ وەتۆ بڵێ: چ کەسێ قەدەغەی کردووە چەندین شتی پاك لە خواردەمەنی و خواردنەوەی پاك و بەتام و خۆش کە خوا ڕەوای کردون و دروستی کردوون بۆ ئادەمیزاد لەسەر زەویی. ووشەی (الطيبات ) هەمو شتێ پاك ئەگرێتەوە لەپیاوان بۆ هاورێتی ژنان و ژنان بۆ هاودەمی پیاوان، لەدەنگی خۆش و بینی خۆش و دیمەنی جوان و باخ و بۆلاخ وچیمەن وگوڵ و گوڵزار، ئەوشتانەی تریش خوا ڕەوای کردوون لەهەمو ڕوێکەوە .

هەمو شتێ بەگوێرەی یاسا قەدەغەنەکرابێ پاك و خاوێنە، هەرشتێ خوا قەدەغەی کردبێ پیس و بێزلێکراوەیە: زانایانی ئیسلام بەگشتی لایان وایە هەمو شتێ ڕەوایە هەتا بەئاشکرایی قەدەغەنەکرابێ . بەگوێرەی ئەقڵ ئادەمیزاد سزای نادرێ لەسەر هیچ شتێ هەتا فەرماندان بە سنوری دیاری کراو دەرنەچێ بۆ هەمو شتێ .

﴿ قُلْ هِيَ لِلَّذِيْنَ آمَنُوا فِي الحَيَاةِ الدُنْيَا ﴾ تۆ بڵێ: ئەو شتانە خۆتانی پێ ئارایشت ئەدەن و ئەیخۆن و ئەی خۆنەوە و ئەی پۆشن لەرۆژی بۆ کەسانێکی ئەوتۆیە باوەڕیان هێناوە لەزیندەگانی جیهاندا بەجۆرێکی سەرەکی و لەبنچینەدا، بێ باوەڕانیش ئەبنە

هاوبەشی باوەڕداران لەبەرهەمەکانی زەویدا بەپلەی دووهەم دوای باوەڕداران، بۆ ئەوەی هەردوولایان پێی بژین لەجیهاندا .

﴿ خَالِصَةً لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ ئەوشتانەی بەرهـەمی زەویـن بەتایبـەتی بـۆ باوەڕدارانـە لەرۆژی دواییدا هاوبەشیان نییە و بێ بـاوەڕان نابنـە هاوبەشـی بـاوەڕداران لەخۆشـی و خواردن و خواردنەوەی پـاك و بـەتام. بەپێچەوانـەی جیـهان. گوزەرانـی خـۆش هـەربۆ باوەڕدارانە لەپاشەڕۆژدا .

﴿ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يُفْلِحُـونَ ﴾ هربـەو جـۆرە ئێمـە ڕوون ئەکەینـەوە شـتە ڕەواکان و ئەو شتانەی قەدەغەکراون لەئایەتەکانی قورئاندا لەبۆ تاقمێ زاناو تێگەیشـتون وباوەڕیان بەیەکێتی خوا هەیـە و ئـەزانن بـەچ جـۆرێ سـوود وەرئـەگرن لەئارایشـت و خواردەمـەنی و خواردنـەوەدا و جگـەی ئـەوان. بـەهۆی ناسـین و گـوێ ڕایـەڵی لەفەرماندانی خوا ئەبن بەزانایانی ئایین وەبەڵگە دائەنێن لەسەر ئەو شتانە ڕەوان و ئـەوەی قەدەغەکراوە بەهۆی ئایەتـەکانی خـوا بەتەنـها. دوای ئـەوەی خـوای مـەزن باسـی ئـەو کەسانەی کرد لەخۆیانەوە ئارایشت و خواردەمەنی خوا قەدەغە ئەکەن، ڕونـی ئەکاتـەوە بنچینەو سەرچاوەی قەدەغەکراوەکان بەم جۆرەی خوارەوە:

﴿ قُـلْ إِنَّمَـا حَـرَّمَ رَبِّـيَ الْفَوَاحِـشَ مَاظَـهَرَ مِنْـهَا وَمَـا بَطَـنَ ﴾ تـۆ بڵـێ: بەڕاسـتی پەروەردەکەری من بەتەنها قەدەغەی کردووە ئەو شتانەی خراپەیان زۆرە لـەگوفتارو لـە کردار شتێ ئاشکران لەو خراپانەو شتێ نهێنین و لەگوناهەگەورەکان ئەژمێررێن و هـۆی سزادانی سەختن. وەك دەربڕینی بێ باوەڕیو داوێن پیسی و کوشتنی نـاڕەوا، نهێنییـەکان وەك دووڕوی و گومان و گوناه. مانای ئەو ڕستەیە لەمانای ئایـەتی (١٥١) ی سـورەتی ئەلئەنعامدا باسی کراوە .

﴿ والآثْمَ وَالبَغْيَ بِغَيْرِ الحَقِ ﴾ وەقەدەغەی کردوە گوناە کردن بەگشتی بـە گوفتـار و بەکردار، ئیتر سـنوریان بـۆ دیـاری کرابـێ وەك کوشـتن و داوێـن پیسـی بەکوشـتنەوەو دارلێـدان و بـەردەباران و دەسـت بڕیـن یـان سـنوری دیـاری کـراوی بـۆ دانـەنرابێ، وەقەدەغەیشی کردوە ستەم و خۆبەگەورە دانـان بەجگـەی مـافی ڕەوا، بەوێنـەی سـتەم

کردن لەدانیشتوان و خواردن و لەناوبردنی دارایيان و بـەرتیل وەرگرتـن و دەربـەدەری کردنیان و جگەی ئەوانیش .

﴿ وَأنْ تَشْرِكُوا بالله مْالَمْ يُنْزِلَ بِهِ سُلْطَانَاً﴾ وەقەدەغەی کردووە کـەئێوە هاوبـەش بـۆ خوا دابنێن لـەپەرستندا بەشتێ خوا بۆ ئەو شتە بەڵگەیـەکی نەناردبێتـە خـوارەوە لـەسـەر دروست بوونی هاوبەشدانان بۆ خوا لـەپەرستندا. مانـای ئـەو ڕسـتەیە لـەئایـەتی (٥٣) ی سورەتی ئەلـئەنعامدا باسی کراوە بەدرێژی .

﴿ وَأنْ تَقُولُوا عَلَى الله مْالاتَعْلَمُونَ ﴾ وەقەدەغەیشـی کـردووە کـەئێوە شـتێ بلێـن و بەدرۆو بەبوختان بیدەن بەسەر خوادا شتێ ئێوە نایزانن لـەبێ ئایینی و کردنی شتی ناڕەوادا و لاسایی کردنەوەی باوکەکانیان بۆ کردنی کاری قەدەغەکراو .

﴿ وَلِكُلِ اُمَةٍ أجَلٌ فَإذا جَاءَ أجَلَهُمْ لايَسْتَأضِرُونَ سَـاعَةَ وَلا يَسْـتَقْدِمُون ﴾ وەبـۆ هـەمو کۆمەڵ و نەتەوەیە ماوەیەکی دیاری کراو هەیە بۆ کۆتایی هاتن بە ژیانیان و بنەبڕکردنیان، ئیتر بێ باوەڕبن یا باوەڕدار، سەرۆکبن یا ژێردەستە ساماندارين یا هەژار، دوایی هـەرکاتێ ماوەی ژیانیان و تەمەنیان کۆتایی پێ هات دوواناکەون و پێش ناکەون کەمترین مـاوە بـۆ بنە بڕکردنیان و سزادانیان. لـەپاشەڕۆژدا هەمو ئـادەمیزاد پرسـیاریان لێ ئـەکرێ لـەسـەر کردەوەی چاك و خراپيان و پاداشت و تۆڵەی خۆیـان وەرئـەگرن. لـەئایـەتی (١٤٥) ی سورەتی ئەلـەنعامدا مانای ئەو ڕستەیە کراوە .

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی چاکەکانی خۆی کرد بەسەر ئادەمیزادەوە لـەجیـهاندا وباسی چاکەکانی خۆی ئەکا بەسەریانەوە لـەپاشەڕۆژداو ئەفەرموێ:

يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ إِمَّا يَأۡتِيَنَّكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ

فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٦﴾ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ
بِـَٔايَٰتِهِۦٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يَنَالُهُمْ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتْهُمْ
رُسُلُنَا يَتَوَفَّوْنَهُمْ قَالُوٓا۟ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ
قَالُوا۟ ضَلُّوا۟ عَنَّا وَشَهِدُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾
قَالَ ٱدْخُلُوا۟ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ
فِى ٱلنَّارِ ۖ كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُوا۟ فِيهَا
جَمِيعًا قَالَتْ أُخْرَىٰهُمْ لِأُولَىٰهُمْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمْ
عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ ٱلنَّارِ ۖ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾
وَقَالَتْ أُولَىٰهُمْ لِأُخْرَىٰهُمْ فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ
فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٣٩﴾

﴿ يٰابَنِيْ آدَمَ إِمّا يَأتِيَكُمْ رُسُلٌ مِنكُمْ يَقصُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي ﴾ ئەی ئادەمزاد ئەگەر هـاتن بۆ لای ئێوە نێرراوەکان لەڕەگەزی خۆیان و بەزمانی خۆتانەوە ئەخوێننەوە بەسـەر ئێـوەدا ئایەتەکانی نامەی من ،هەواڵی دا بە ئێوە بەیاساو دەستوریٚ من ناردومەتە خوارەوە بۆتان.

﴿ فَمَنْ إتَقى وَأصْلَحَ فَلاْخَوْفَ عَلَيْـهِمْ وَلاهُـمْ يَحْزَجُـونَ ﴾ دوایـی هەرکەسـیٚ خـۆی پاراستبیٚ لە هاوبەشدانان بۆ خوا و لەبەدرۆخستنەوەی ئەو نێرراوانەی مـن و کـردەوەی چاکی کردبیٚ دوایی ئەو کەسانە هیچ ترسیٚ لەسەریان نیەو ئەوان خەفەتبارنابن لەهەردوو

جیهاندا، کورتەی مانای ئەو ئایەتە: خوای مەزن ئادەم و نەوەکانی دروست کردن، یاساو دەستوری بۆ دیاری کردن کەلەسەری برۆن. پێغەمەرانیشی بۆ ناردن هەتا ئەو یاسا ودەستورانەیان پێ ڕابگەیەنن و ئەو پێغەمەرانە لەڕەگەزی خۆیان بوون، چونکە بەو جۆرە باشتر کارئەکەنە سەریان و بەڵگەی بەهێز ئەبێ لەسەریان، دوایی هەرکەسێ گفتو گۆی ئەو پێغەمەرانەی بیست و فەرمانبەرداری ئەوانبن لەئاسایشدا ئەژی و دور ئەبێ لەخەشمی خواو لەسزای خوا .

﴿ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ لەئێوە باوەڕ بەئایەتی نامەی ئێمەی نەهێنابێ و پێغەمەرەکانی بەدرۆ خستبێتەوەوئەوەی خوا نەیفەرموێ. بیدەنە پاڵ خواو خۆی بەگەورە بگرێ بەرانبەر بەوئایەتانەی ئێمەو لای گرانبێ باوەڕ پێ هێنانیان.

﴿ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَاخَالِدُونَ ﴾ ئەو کەسانە دانیشتوانی نێو ئاگرن و بەردەوامن لەنێویدا و نایەنە دەرەوە، چونکە لەسنوری پەرستنی من و فەرمانی ئایەتەکانی من دەرچوون .

﴿ فَمَنْ أَظْلَمَ مِمَنْ إِفْتَرى عَلَىٰ اللهِ كَذِباً أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ ﴾ دوایی چ کەسێ ستەمکارترو بێ باوەڕترە لە کەسێ درۆ هەڵبەسێ و بیدا بەسەر خوادا بەبوختان شتێ خوا فەرمانی پێ نەدابێ یا قەدەغەی کردبێ، یاباوەڕی بەئایەتەکانی خوانەهێنابێ. یابەجۆرێ مانایان بکا بە دژی ویست و فەرمودەی خوا بێ. لەباسی مانای (٢١) ی سورەتی ئەلەنعامدا ئەوباسەکراوە .

﴿ أُوْلَئِكَ يَنَالُهُمْ نَصِيبِهِمْ مِنَ الْكِتَابِ ﴾ ئەو کەسانە بوختان کەرو درۆ هەڵئەبەسن بەدەم خواوە ئەگا بەوان بەشێ لەوشتە بۆیان دیاری کراوە لەخواردەمەنی و تەمەن لەنامەی خوادا. یانی خوای مەزن وازیان لێ دێنێ لەجیهاندا هەتا ئەوبەشەی خۆیان وەرئەگرن بۆیان نوسراوە لەتەمن و لەڕۆزی .

﴿ حَتَى إِذَا جائَتْهُمْ رُسُلُنَا يَتَوَفَوْنَهُمْ قَالُوا أَيْنَ مَاكُنْتُمْ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللهِ ﴾ هەتا کاتێ دێ بۆلایان نێردراوەکانی ئێمە لەفریشتەکانی گیان کێش و یاریدەرانیان گیانی ئەو

کەسانە وەرئەگرن و کۆتایی بەتەمەن و ڕۆژی ئەوان ئەهێنن لەجیهاندا، فریشتەکانی گیان کێش ئەڵێن بەو بوختان و درۆ کەرانە: لەچ جێگەیەکن شتێ ئێوە ئەتان پەرستن لەجگەی خواو لەوان ئەپاڕانەوە هەتا ڕزگارتان کەن لەسزای خوا .

﴿ قالُوا ضَلُّوا عَنّا وَ شَهِدُوا عَلى أَنْفُسِهِمْ إِنَّـهُمْ كـانُوا كـافِرِينَ ﴾ بێ باوەڕان ئەڵێن لەوەڵامی فریشتەکاندا: ئەوشتەی ئێمە ئەمان پەرست لەئێمە وونبوون و نازانین لەچ جێگەیەکن؟ ئەوان نایەن ڕزگارمان بکەن لەسزای ئەمرۆژە، ئەوبێ باوەڕانە شایەتی ئەدەن لەسەر خۆیان کەئەوان بەڕاستی بێ باوەڕبوون. بەڵام لەپاش چی؟ لەکاتێکا سود لەو شایەتی دانەی خۆیان وەرناگرن.

دوای ئەوەی کەبێ باوەڕان شایەتیان دا لەسەرخۆیان و پرسیارو وەڵام کۆتایی پێ دێ فەرمان دەرئەچێ بەسەریانا لەلایەن خوای مەزنەوە بەسزای گرانیان و ئەفەرموێ:

﴿ قالَ أدْخِلُوا فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِكُمْ مِنْ الجِنِ وَلآنْسِ فِي النّـارِ ﴾ خوا فەرموی بەو بێ باوەڕانە: ئێوە بچنە نێو ئەو تاقمانەو بن بە هاوڕێی ئەوانە بەڕاستی لەپێش ئێوەوە ڕابوردوون لەجنۆکەو لەئادەمیزادە بێباوەڕەکان و ئێوە لەگەڵیان بچنە نێو ئاگری دۆزەخ. بێگومان ئەوکەسانە بڕوایان بەخواو پێغەمەرایەتی پێغەمەر نەبووە لەکۆن و لەتازەدا وێنەی یەکن لەچونیان بۆ نێو ئاگری دۆزەخ .

﴿ كُلَما دَخَلَتْ أُمَةٌ لَعَنَتْ أُخْتِهَا ﴾ هەمو کاتێ تاقمێ لەبێ باوەڕان چونە نێو ئاگری دۆزەخ نەفرەت ئەکەن لەتاقمە بێ باوەڕو خوشکە هاوئایینەکەی خۆیان، زۆر ڕوون و ئاشکرایە لەوکاتانەدا نەفرەت بۆ یەکتر ئەنێرن و کەچی لەوەوبەر بەبڕواو بەدۆست و بەهاوئایین و خزم و خەزورەی یەکتری بون و پشتی یەکتریان ئەگرت، هەروایش هەمو کۆمەڵێ هەوەس باز و لەرێگە وونبوو تاوانبار دۆست وخۆشەویستی یەکترین لەهەمو کاتێکداو بەتایبەتی لەکاتی خۆشیدا: بەڵام کاتێ توشی ئازارو ناخۆشی بوون دۆستایەتی پێشوویان لەبیر ئەچێ و نەفرەت بۆ یەکتری ئەنێرن و لەدژی یەکتری هەڵئەسن و سودی

یەکتریان لەبیر چوەو بەتەمای سودی یەکتری نین، بێ باوەڕان دۆستی یەکترین هەتا کاتێ ئەچنە نێو ئاگری دۆزەخ .

﴿ حَتَى إذَا أدارَكُوا فِيْهَا جَمِيْعَاً ﴾ هەتا کاتێ ئەوبێباوەڕانە یەك لەدوای یەك ئەچنە نێو ئاگری دۆزەخ و هەمویان بەیەکەوەکۆ ئەبنەوە، ئەوکاتە دۆستایەتی نامێنێ و دوژمنایەتی و بگرەوبەردە دەست پێ ئەکەن.

﴿ قَالَتْ أخراهُمْ لأوْلاهُمْ رَبّنَا هَؤُلاءْ أضَلَوْنَا فَآتِـهِمْ عَذَابَاً ضُعْفَاً مِنَ النّارِ ﴾ ئەڵێن دواکەوتوو ژێر دەستەکانیان بەپێشەواو سەرکردایەتیەکانیان: ئەی پەروەردەکەری ئێمە ئەو پێشەوانەی جیهان ئێمەیان لادا لەرێگەی ڕاست، چونکە ئەوان گەورەو راوێژکارو چاوڵێ کراوی ئێمە بوون، دوایی تۆ ببەخشە بەوان سزایەکی دووچەنانە لەئاگری دۆزەخ، چونکە ئەوانە هۆی گومڕاکردنی ئێمە بوون .

﴿ قَالَ لِكُلٍ ضُعْفَ وَلَكِنَ لاتَعْلَمُونَ ﴾ خوا فەرموی: بۆ هەمو یەکێ لەئێوەی ژێردەستە وپێشەواکان هەیە دووچەندانەیە لەئاگری دۆزەخ، پێشەواکان لەبەرئەوەی خۆیان گومڕا بون وجگەی خۆشیان لەرێگە لادراوە، ژێردەستەکانیش لەبەرئەوەی بێ باوەڕبوون و لاسایی پێشەواکانیان کردوەتەوە. واتە هەریەکەیان خاوەنی دوو تاوانن، بۆیە سزاکانیان دووچەنانەیە و بەڵام ئێوە نازانن کە بۆ ئێوە و ئەوان هەیە دووچەندانەیە لەسزاو هەریەکە لەودووتاقمە چەند ئەندازەیە لەسزا بۆ ئەوی تریان هەیەو نازانن سزای کامیان سەختە ؟

﴿ وَقَالَتْ أوْلادُهُمْ لآخراهُمْ فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِنْ فَضْلٍ ﴾ وەتاقمە پێشەواکان ئەیان ووت: بەژێر دەستەکان لەوەڵامی ئەواندا: دوایی نیە بۆ ئێوە بەسەر ئێمەوە هیچ رێزو چاکەیە، ئیتر ژاوەژاو مەکەن هەمومان لەتۆڵەدا یەکسانین و جیاوازی لەنێوانماندا نیە هەتا خوا سزای لایەکمان زۆرتر بدا، پێشەواکانیان لەوەڵامی داواکردنی سزای زۆرتر بۆیان ووتیان:

﴿ فَذُوقُوا العَذابَ بِمَا كُنْتُمْ تَكْسِبُونَ ﴾ دوایێ ئێوە بچێژن سزای خوا بەهۆی شتێ خۆتان کردوتانە لەگوناە بەئارەزووی خۆتان. کەواتە ئێمەی پێشەوا هیچ توانایەکمان بەسەر ئێوەدا نەبوە، مافی خۆمانە هەردوولامان بەدووچەندانە سزا بدرێین .

دوای ئەوباسانەی پێشوو خوای مەزن باسی ئەو شتانەمان بۆ ئەکا توشی هەردوولای پێشەواو ژێردەستە ئەبن و ئەفەرموێ :

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤٠﴾ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٤٢﴾ وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَـٰرُ ۖ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى هَدَىٰنَا لِهَـٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِىَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ۖ لَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ ۖ وَنُودُوٓا۟ أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾

﴿ إنَ الذيْنَ كَذَبُوا بِآيَاتِنا وَ اسْتَكْبَرُوا عَنهَا لاتُفَتَحُ لَهُمْ أبْوابُ السَماءِ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان بەئایەتەکانی ئێمە نیە لەقورئاندا کە بەڵگەی ڕونن لەسە توانای ئێمەو ڕاستی پێغەمەران و خۆیان بەگەورە دائەنێن لەبۆ وەرگرتنی فەرمانی ئەوئایەتانە ناکرێتەوە بۆ ئەو کەسانە دەرگاکانی ئاسمان و کردەوەکانیان وەرناگیرێ بەوێنەی کردەوەی پیاو چاکان، پاڕانەوەیان وەرناگیرێ .

﴿ وَلايَدْخِلُونَ الجنَةِ حَتى يَلُجَ الجمَلُ فِي سَمِ الخَيْاطِ ﴾ وەئەوکەسانە ئایەتەکانی ئێمە بەدرۆ ئەخەنەوەو خۆیان بەگەورە دائەنێن لەوەرگرتنی فەرمانەکانی ئایەتەکانی مندا ناچنە نێو بەهەشت دوای مردنیان هەتا هوشتر نەچێ بەکونی دەرزی بچوکدا. هەندێ لەزانایان لایان وایە ووشەی (الجمل) بەمانا گوریسی گەورەیە، بەهەرمانایەبێ ئەوڕستەیە هێمایە لەوەبێ باوەڕان هەرگیز ناچنە ناو بەهەشت و گونجاو نیە بۆ ئەوان، بەوێنەی ئەوشتانە کە گونجاونیە بچن بەکونی دەرزی بچوکدا .

﴿ وَكَذلِكَ نُجْزِي المُجْرِمِينَ ﴾ وەبەوێنەی ئەوسزا خراپە ئێمە پاداشتی تاوانبارن ئەدەینەوەو دەرگای بەهەشتیان بۆ ناککرێتەوە هەتا ئەو شتانە نەڕۆن بەکونی دەرزی بچوکدا .

﴿ لَهُمْ مِنْ جَهَنَمَ مِهْادٍ وَمِنْ فَوْقِهِمْ غَوْاش ﴾ بۆ ئەو کەسانە هەیە ئایەتەکانی ئێمە بەدرۆئەخەنەوە و خۆیان بەبەرز ئەگرن ژێر ڕاخەرێ لەئاگری دۆزەخ کەلەسەری دائەنیشن، بۆیان هەیە لەسەریانەوە سەرەخەرێ دایان ئەپۆشێ لەدۆزەخدا. واتە ئاگر هەرچوارلای لێی گرتوون .

﴿ وَكَذلِكَ نُجْزِي الظْالِمِينَ ﴾ وەهەر بەوێنەی ئەو سزایانە کە ئاگر سەرو ژێریان داگرتوون ئێمە سزای هەمو ئەو کەسانە ئەدەینەوە ستەمیان لەخۆیان کردووەو بێ باوەڕبوون. دوای ئەوەیخوا لەپێشەوە هەڕەشەی فەرموە لەبێ باوەڕان بەمانەوەیان لەدۆزەخدا بەبەردەوامی، موژدەیش ئەدا بەباوەڕداران بەمانەوەیان لەبەهەشتا هەتا هەتا و ئەفەرموێ :

﴿ وَالذِيْنَ أمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتْ لاتَكْلُفَ نَفْسَاَ إلا وَسَعَها أُولئِكَ أصْحَابُ الجَنَـةِ هُـمْ فِيهْا خالِدُونَ ﴾ وەكەسانێكی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە بەخواو كردەوە چاكـەكانیان كـردوە بەفەرمانبەرداری یاسای نامەكانی ئێمە و باوەڕ بەپێغەمەران بەهەمو ئەوجۆرەی لـەقورئاندا ڕون كراوەتەوە، ئێمە داوا ناكەین لەهیچ كەسێ بۆ كردنی هیچ شتێ مەگـەر بـەگوێرەی توانای خـۆی ،ئەوكەسـانە باوەڕیـان هێنـاوەو كـردەوە چاكـەكانیان كـردوە دانیشـتوی بەهەشتن بەبەردەوامی .

﴿ وَنَزَعْنْا ما في صُدُورهِمْ مِنْ غَلٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمْ الآنْهارَ ﴾ وەئێمــە دەرمـان هێنـاوە لـەدڵیانا شتێ لـە دڵپیسـی و حەسـوودی تییـابوە، ئـەچێ بـەژێریانا وبـەم لاولای كۆشكەكانیانا چەندین روباری ئاو ،ئـەو باوەڕدارانـە وینـەی بـێ بـاوەڕان نـین كەهـەمو تاقمێكیان پەلاماری یەكتری ئەدەن و كینە بۆ یەكتری دەرئەبڕن لەهەردوو جیهاندا. بەڵام ئە وباوەڕدارانە لـەبەهەشتا یەكیان خۆش دەوێ كینەو دڵ پیسـیو دوژمنایـەتی لـە دڵیانـا دەركراوە لـەهەردووجیهاندا. باوەڕداران بۆچی ئەبێ كینـەیان لـەیـەكتری بـێ ؟ كەسـانێ دژی یەكتری ئەبن دڵیان لەئاستی یەكتری پیس بـوەو درۆیـان لـەگـەڵ یـەكتری كـردوە، چونكە بێ باوەڕان هەندێكیان ساماندارو هەندێكیان هـەژاربوون وهـەندێكیان سـتەمكارو هەندێكیان ستەم لێكراو بوون، لەبەهەشتا نەهەژاری و نەسـتەم و نـەئابڕو بـردن هەیـە و هـەمویان هەسـت بەخۆشـی ئەكـەن و ڕزگاریـان بـوە لـەئاگری دۆزەخ، بەپێچەوانـەی دۆزەخیەكان، ئەو بەهەشتیان هەرگیز بۆلای زۆری خۆیان ناڕوانن لە پلەو پایەدا هەروەك لەجیهاندا وابوون، هـەموویان بـەگوێرەی شـایەنی خۆیـان لـەخۆشـی و لـەكامـەرانیدان، چونكە هەموو كینەیە لەدڵیانا نەماوە، بەپێچەوانەی بێ باوەڕان .

﴿ وَقالُوا الحَمْدُ للهِ الَذْي هَدانْا لِهذا وَماكُنَا لَنَهْتَدْيْ لَوْلا أنْ هَدانا اللهُ ﴾ وەبەهەشتیەكان ئەڵێن كەجێگەی خۆیان ئەبینن لـەبەهەشتا: هەمو سوپاس وچاكەیە بۆ خوایــەكی ئەوتۆیـە كەبەگەورەیی خۆی ڕاغوی ئێمەی كردوە بۆ لای باوەڕێ كەبوە بـەهۆی ئـەوەی كەئـەم جێگە بەرزەی بەهتشتی داوە بەئێمە و، ئێمە لـەوانـە نـەبووین كەئـەم ڕاغوییـە وەرگریـن ئەگەر خوا شارەزایی ئێمەی نەكردایە بۆلای كـارێ كەئـەم جێگەیـە پاداشـتی بـێ، ئـەو

ڕستەی سوپاس کردنەی خوایە لەلایەن ئەو بەهەشتیانەوە بۆ ڕاغویی کردنیان بۆلای بەهەشت کەچاکە زۆر گەورە و بەنرخە .

﴿ لَقَدْ جاءَتْ رُسُلُ رَبِّنا بِالحَقِ ﴾ جاریٚ تر بەهەشتیەکان ئەڵێن: بەڕاستی نێرراوەکانی خوای پەروەردەکەری ئێمە بەڕاستی هاتون کە بەڵێنیان داوە بەم بەهەشتە بۆ باوەڕداران، شارەزایی ئێمەیان کردوە بۆلای ڕاغوبایی و ئێمەش ڕاغوییمان وەرگرت بۆ لای یەکێتی خواو موژدەیان داینیٚ بەبەهەشت ئێمەش باوەڕمان هێنا. کاتیٚ باوەڕداران ئەو بەهەشتە ئەبینن دڵخۆش ئەبن کەلەجیهاندا باوەڕیان هێناوە لەڕۆژی دواییشدا بەهەشتیان دراوەتیٚ.

﴿ وَ نُودُوا أنْ تِلْكُمْ الجَنَةِ أوْرَثْتُمُوها بِمْا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ وەبانگی بەهەشتیەکان ئەکریٚ لەلایەن جارچێکەوە ئەی دانیشتوانی بەهەشت: بەڕاستی ئەو بەهەشتەی پێغەمەران بەڵێنیان بەئێوەدا وبەخشراوە بەئێوە ئەوشتەی ئێوە کردوتانە لەجیهاندا، وەك میرات وایە بەگوێرەی یاساو پەیڕەوی ڕەوشتی پێغەمەران و خوایشتان بەتاك و تەنها داناوەو گویٚ ڕایەڵی فەرمودەی خوابوون. ئەو ڕستەیە وامان بۆ ڕوون ئەکاتەوە کەئەوبەهەشتە لەلایەن خواوە پێویستە بۆمان دانراوە بەوێنەی میرات لەکاتی مردنی میرات لیٚ گیراو لەجیهاندا بۆ میراتبەران پێویست کراوە بیٚ بەرانبەرە. زانایان بیریان جیاوازە ئەبیٚ ئەوبانگ کەرە چ کەسیٚ بیٚ؟ هەندێکیان ئەڵێن: خوای مەزنە، هەندیٚ لایان وایە فریشتەکانن بەدەستوری خوا .

لەدواییدا خوای مەزن ئەوشتەمان بۆ ئەفەرمویٚ کەلەنێوان دۆزەخیەکان و بەهەشتیەکان دێت و ئەڕوات پاش ئەوەی هەریەکەیان ئارامیان گرت لەجێگەی تایبەتی خۆیاندا لەبەهەشت و دۆزەخدا .

وَنَادَىٰٓ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا قَالُوا۟ نَعَمْ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌۢ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴿٤٥﴾

﴿ وَنَادَى أَصْحَابُ الْجَنَةِ أَصْحَابُ النَار أَنْ قَدْ وَجَدْنَا ماوَعَدَنَارَبّنَا ﴾ وەدانیشتوانی بەهەشت بانگ ئەکەنە دانیشتوانی ئاگری دۆزەخ لەرۆژی دواییدا، بەڕاستی ئێمە دەستمان کەوتووە و دراوە پێمان شتێ خوا بەڵێنی داوە ئەوشتەمان بداتیچ بەڕاستی و بێگومان لەپاداشت لەسەر زمانی پێغەمەران و لەسەر گوێ ڕایەڵی ئێمە .

﴿ فَهَلْ وَجَدْتُمْ ماوَعَدَ رَبُكُمْ حَقَاً قَالُوا نَعَمْ ﴾ دوایی ئایا ئێوە دەستان کەوتووە شتێ پەروەردەکەری ئێوە بەڵێنی پێداون بەڕاستی لەتۆڵەو سزا لەسەر گوێ نەگرتنتان لەفەرمودەی خوا، دانیشتوانی دۆزەخ ئەڵێن لەوەڵامی پرسیاری دانیشتوانی بەهەشت بەڵێ: دەستمان کەوت ئەو شتە بەڵێنی پێ دابووین لەتۆڵەو سزای گران بەڕاستی و بەبێ گومان، لەوکاتەدا چارەیان نامێنێ جگەی ووتنی ڕاستی بڵێن .

﴿ فَأَذَنَ مُؤَذِنُ بَيْنَهُمْ أَنْ لَعْنَةَ اللهِ عَلى الظَالِمِينَ ﴾ دوایی بانگ ئەکا بانگ کەرێ لەنێوان دۆزەخی و لەنێوان بەهەشتیاندا و هەردوولایان بانگەکە ئەبیسن کەبەڕاستی نەفرەت و دووربوون لەبەزەیی خوا لەسەر ئەوکەسانەبێ ستەمیان لەخۆیان کردووەو باوەڕیان نەهێناوە و پەرستنیان لەجێگەی خۆیان دانەناوە .

بەڕاستی دانیشتوانی بەهەشت زۆر بەچاکی ئەزانن کە دانیشتوانی دۆزەخ ئەوەی بەڵێنیان پێ دراوە وەریان گرتووە. بەڵام ئەوپرسیارەیان لێ ئەکەن هەتا سوپاسی خۆیان بۆ خوا دەربرن، گوێچکەی بێ باوەڕانیش بلەرزێنن. خەفەتیان بدەنێ لەسەر باوەڕنەهێنانیان، بیریان بخەنەوە ئەوشتەی لەجیهاندا ئەیان ووت: ڕوبەڕوی باوەڕداران لەگاڵتە پێ کردنیان.

﴿ الَذِيْنَ يَصِدُونَ عَنْ سَبِيلِ اللهِ وَيَبْغُونَهَا عَوَجَاً وَهُمْ بِالآخِرَةِ كَافِرُونَ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ بوون ئەو ستەمکارانە ڕێگەیان لەئادەمیزاد ئەگرت لەباوەڕهێنان بەئایینی خواو ئەیان گێڕانەوە، هەوڵیان ئەدا ئایینی خوا بگۆڕن و خوارو خێچی بکەن. ئەوستەمکارانە ڕاست وێژی و دڵپاکی یان ناوێ. بەڵکو درۆو دووڕوویی وناڕاستیان ئەوێ، ئەو ستەمکارانە ئەوانەن باوەڕیان بەرۆژی دوایی نەبووە، لەپرسیاروسزاو تاوانی خۆیان نەترسان، چونکە بڕوایان بە زیدنووبونەوەو بەهەشت و بەدۆزەخ نەبوە.

دوابی خوای مەزن بەجۆرێ تر باسی بەهەشتیەکان و دۆزەخیەکان ئەکا و ئەفەرموێ :

وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ وَعَلَى ٱلْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّا بِسِيمَاهُمْ وَنَادَوْا أَصْحَابَ ٱلْجَنَّةِ أَن سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ ﴿٤٦﴾ وَإِذَا صُرِفَتْ أَبْصَارُهُمْ تِلْقَاءَ أَصْحَابِ ٱلنَّارِ قَالُوا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّالِمِينَ ﴿٤٧﴾ وَنَادَىٰ أَصْحَابُ ٱلْأَعْرَافِ رِجَالًا يَعْرِفُونَهُم بِسِيمَاهُمْ قَالُوا مَا أَغْنَىٰ عَنكُمْ جَمْعُكُمْ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٤٨﴾ أَهَٰؤُلَاءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمْتُمْ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحْمَةٍ ٱدْخُلُوا ٱلْجَنَّةَ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمْ وَلَا أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٤٩﴾

ئێمەی موسڵمان باوەڕمان هەیە بەڕۆژی دوایی و بەپرسیارو پاداشت و تۆڵە بەجۆرێکی کورت، وێنەی هەمو ئایینەکانی تر و هەمو پایەکانی ئایین. بەڵام درێژەی چۆنیەتی ئەو ڕۆژە لەزانراوە نەبینراوەکانە و هەواڵەی زانیاری بێ وێنەی خوای مەزنە . بەهۆی پەیام و سروشەوە زانراوە کەلەڕۆژی دواییدا جێگەیە لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا پێی ئەوترێ ( ئەعراف ) نەخۆشی بەهەشتی تێدایەو نە سزای دۆزەخ. بەڵام ئەو لایەی بەستراوە بەبەهەشتەوە دەرگایەکی تێدایە میهرەبانی و خۆشی تێدا ئەبینرێ، لایەکەی تری بەستراوە بەدۆزەخەوە لەبەرانبەریەوە سزا ئەبینرێ، بەسەر ئەو جێگەوە کە پێی ئەوترێ ئەعراف چەند پیاوێ هەن هەمو دانیشتوانی دۆزەخ و بەهەشت ئەناسن نەك بەناو بەڵکو بە چەندین نیشانەیە بەڵگەن لەسەریان، ئەو پیاوانە ڕو ئەکەن بۆلای

دانیشتوانی بەهەشت و سلاویان لێ ئەکەن و ئاواتە خوازن کاتێ لەکاتان ئەمانیش لەگەڵیان بن، کەچاویشیان ئەکەوێ بەدۆزەخیەکان داوالەخوا ئەکەن نەیان خەنە لای ئەوان، لەپاشا ئەو پیاوانە لەئەنجامدا ئەچنە نێو بەهەشت، چونکە ئەوان خاوەن باوەڕبوون، خوای مەزن یارمەتیو میهرەبانیەکی تایبەتی دەربارەیانە هەیە ئەو باسانە ی پیشوو کورتەی فەرمودەی قورئانە لەبارەی ئەعراف و دانیشتوانی سەر ئەعراف. ڕێزم بۆ هەندی لەزانایانە بۆ باسکردنی ئەو مەبەستانە بەبێ بەڵگەی ڕوون درێژەیان داوە بەوباسە لەسنوردەرچوون، بۆ ڕونکردنەوەی ئەو باسانە خوا ئەفەرموێ :

﴿ وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ ﴾ وەلەنێوان بەهەشت و دۆزەخ دا پەردەیە هەیە، یا لەنێوان دانیشتوانی بەهەشت و دۆزەخ دا پەردەو شورایە هەیە لەیەکی جوێ کردونەتەوە، ئەو پەردەیە بریتیە لەئەعراف. وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ وَعَلَى الْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّا بِسِيمَاهُمْ ﴾ وەبەسەر بەرزاییەکانی ئەو شورایە کەئەڕوانێ بەسەر بەهەشت ودۆزەخدا چەند پیاوێ هەن هەموودانیشتوانی بەهەشت و دۆزەخ ئەناسن بەهۆی چەند نیشانەیەکەوە، بەهەشتیەکان بەڕەنگی سپی و زەردەخەنەی لێویان و شادمانی چاویان. دۆزەخیەکان بە ڕەشی ڕەنگیان و گرژی و تۆزاوی ڕومەتیان.

بۆ زانین: دەرکەوتوی مانای ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو نیشانە هەر پیاوانی سەرئەعراف ئەیان ناسن، هەندێ لەزانایان ئەڵێن: هەمویان هەمو ئادەمیزاد ئەیان ناسن.هەرچۆنێ بێ کارەکە ئاسانە کەئێمە بەرپرسیارنین و داوامان لێ ناکرێ ئەونیشانانە بناسین بەتەواوی و بەشێوەی گشتی یابەتایبەتی شێوەیان بناسین .

پرسیار / ئەوپیاوانە بەسەر ئەعرافەوەن چ کەسێکن ؟

وەلاّم / زانایان لەوبارەیەوە بیرو بۆچونی زۆریان هەیە: زۆرتریان لەسەر ئەوەن ئەو کەسانە ئەوانەن کردەوەی چاك و خراپیان یەکسانە، چونکە ئەگەر تۆزقاڵێ چاکە یا خراپە یان زۆرتر بێ لەوی تریان ئەبوایە شوێنەکانیان یالەبەهەشت دیاریبکرایە بەگوێرەی زۆرەکەیان یا لەدۆزەخدا .

پرسیار / دانیشتوانی بەهەشت هەربەچونیان بۆبەهەشت ئەناسرێن ،هەروەها دۆزەخیەکانیش، دوایی چ پێویست هەیە بەچەندین نیشانە بۆ نایسنیان ؟

وەلأم / بەراستی وائەبێ ئەو نیشانانە بۆ ئەوەبێ هەردوو تاقمەکە بەر لەپرسیار و سزا لەنێو یەکتریدا جوێ ببنەوە، وەك ئەوەی تاوانبار بناسرێ بەدەرکەوتوی ڕومەتیان کە ڕەوانەی لای دادگا ئەکرێ .

﴿ وَنادُوا أصْحابِ الجَنَةِ أنْ سَلامٌ عِلَيْكُمْ ﴾ وەپیاوە دانیشتوەکانی سەر ئەعراف بانگ ئەکەنە دانیشتوانی بەهەشت و ئەڵێن: سلأوی خواتان لەسەربێ و بەبێ ئازار بژین. یانێ کەتەماشای دانیشتوانی بەهەشت ئەکەن خۆشحاڵی خۆیان دەرئەبڕن بۆیان و بەرێزەوە سلأویان لێ ئەکەن .

﴿ لَمْ يَدْخُلُوهْا وَهُمْ يَطْمَعُونَ ﴾ پیاوانی دانیشتوانی سەرئەعراف هێشتا نەچونەتە بەهەشتەوەو ،ئەوان بەئاواتەوەن و بەتەمان بچنە بەهەشت و لەگەڵ بەهەشتیەکان بن، چونکە ئەوان خاوەنی باوەڕبوون، ئاشکرایە هەرکەسێ باوەڕی بەخوا هەبێ بەتەمای لێبوردن و بەزەیی خوایە و تەمابڕنابێ لەلێ بوردن، بەدژی بێ باوەڕانەوە کەتەما بڕبوون.

ئەو ڕستەیە پاڵ بەبیروبۆچونی ئەوکەسانەوە دەنێ ئەڵێن: ئەوپیاوانەی سەر ئەعراف بریتین لەپێغەمەران و پیاوچاکان و زانایان، چونکە نەچوونی ئەوپیاوانەی سەر ئەعراف بۆ بەهەشت و بەتەمای چونی بەهەشتن شیاوی ئەو ڕێزە نیە خوا بەوانی بەخشیوە .

﴿ وَإذا صُرِفَتْ أبْصارهِمْ تِلْقاءَ أصْحابُ النار قْالُوا رَبّنْا لاتَجْعَلْنْا مَعَ القَوْمِ الظالِمِينَ ﴾ وەهەر کاتێ چاوی پیاوانی سەر ئەعراف وەربچەرخایە بۆلای دانیشتوانی دۆزەخ ئەڵێن: ئەی پەروەردەکەری ئێمە تۆ ئێمە مەگێڕە لەگەڵ تاقمێ ستەمیان لەخۆیان کردووە بێ باوەڕبوون و چونەتە نێو دۆزەخ. دوای بانگ کردنی بەهەشتیەکان، پیاوانی دانیشتوی سەر ئەعراف بانگی دانیشتوانی دۆزەخ ئەکەن. ئەوەیە خوا ئەفەرموێ :

﴿ وَنادَی أصْحابُ الأعْرافِ رجْالًا يَعْرِفُوْنَهُمْ بِسِمْاتِهِمْ قْالُوا مَاأغْنَی عَنْكُمْ جَمْعَكُمْ وَماكُنْتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ ﴾ وەدانیشتوانی سەر ئەعراف بانگی پیاوانی پێشەوای بێ باوەڕان ئەکەن ئەیانناسن بەهۆی نیشانەکانیانەوە ئەڵێن: نەگەیشتە فریاتان داراییە کۆکراوەکەتان و کۆڕو کۆمەڵی زۆرتان و شتێ ئێوە خۆتانیان پێیەوە بەگەورە دائەنا و خۆتانتان لەلای

ڕاستی و لای دانیشتوان بەگەورە دائەناو ئەتان ووت بە باوەڕداران: ئێوە هەرگیز بەمیهرەبانی خوا ناگەن. کاتێ ڕاستی ڕۆژی دوایی هات و بێ باوەڕان بەسزای کردەوەکانی خۆیان ئەگەن دانیشتوانی سەر ئەعراف دووشت بیری بێ باوەڕان ئەخەنەوە: یەکەمیان ئەڵێن دارایی کۆکراوەکەتان و خۆتان بەگەورە دانان نەگەیشتە فریاتان: دووهەمیان ئەوەیە بەبێ باوەڕان ئەڵێن: ئێوە ئەتان ووت بەباوەڕدران ،ئێوە ناچنە بەهەشت وەك ئاماژەی بۆ ئەکاو ئەفەرموێ :

﴿ أَهؤُلاءَ الَّذِيْنَ أَقْسَمْتُهُمْ لايَنَالُهُمْ اللهُ بِرَحْمَةٍ ﴾ ئەو باوەڕدارە هەژارانە ئەو کەسانەی ئەوتۆن ئێوەی بێ باوەڕان لەجیهاندا سوێندتان ئەخوارد خوا ئەوان ناگەیەنێ بەمیهرەبانی خۆی و نایان خاتە بەهەشت. بێگومان ئەچنە بەهەشت. ئەوەتا ئەفەرموێ: دوای ئەوەی دانیشتوانی سەر ئەعراف لەوتووێژی خۆیان ئەبنەوە لەگەڵ بێ باوەڕاندا خوای مەزن بەبەخشندەیی و گەورەیی خۆی ئەفەرموێ:

﴿ أُدْخِلُوُا الَجَنَةِ لاخَوْفَ عَلَيْكُمْ وَلا أَنْتُمْ تَحْزَنُونَ ﴾ ئێوە ی دانیشتوانی سەرئەعراف بچنە نێو بەهەشت بەهۆی گەورەیی و بەزەیی خۆمەوە، ئێوە لەمەوپاش ترستان لەسە نیە، ئێوە خەفەتبار نابن بۆ ئەوەی پاداشتی کردەوەیەکتان لەکیس بچێ، هەموتان لەئاسایش و خۆشیدا ئەژین، بەبێ باوەڕان و خۆ بەگەورەدانانەکانیش ئەبێژێ: ئێوەش بچنە نێو دۆزەخ.

دوای ئەوباسانەی پێشوو خوا باسی گفتوگۆی دانیشتوانی دۆزەخمان بۆ ئەکا و بەکزۆڵیەوە ئەڵێن لەڕۆژی دواییدا بانگی دانیشتوانی بەهەشت ئەکەن، وەك ئەفەرموێ:

وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ لَهۡوٗا وَلَعِبٗا

وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فَٱلْيَوْمَ نَنسَىٰهُمْ كَمَا نَسُوا۟ لِقَآءَ يَوْمِهِمْ هَٰذَا وَمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٥١﴾ وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ يَوْمَ يَأْتِى تَأْوِيلُهُۥ يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشْفَعُوا۟ لَنَآ أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ قَدْ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٥٣﴾

بەڕاستی خۆشحاڵی دانیشتوانی بەهەشت بە ڕزگاربونیان ئەبێتە هۆی چاکە لەسەر چاکە بۆیان. خەفەتی دانیشتوانی ئاگر لەسەر چاکەیە لە کیسیان چوە ئەبێتە هۆی سزا لەسەر سزا بۆیان دانیشتوانی ئاگر ئەوانن دانیشتوانی بەهەشت لەنێو چاکەو خۆشی بەردەوامدان بۆیە ئەفەرموێ :

﴿ وَنادَى أصْحابُ النّارِ أصْحابَ الجَنَةِ أنْ أفِيْضُوا عَلَيْنا مِنْ الماءِ وَمِمْا رَزَقَكُمْ الله ﴾ وەدانیشتوانی ئاگری دۆزەخ بانگ ئەکەنە ادانیشتوانی بەهەشت: کەئێوە بڕێژن بەسەر ئێمەدا لەئاوی بەهەشت ئەندازەیەکی وا تینوێمان بشکێنێ، یا پێمان ببەخشن لەو خواردەمەنیە خوا بەئێوەی بەخشیوە شتێ بیخۆین .

﴿ قالُوا أنَ الله حَرَمَها عَلى الكافِرِيْنَ الَذِيْنَ أتْخَذُوا دِيْنَهُمْ لَهُواً وَلِعْباً وَغَرَتْهُمْ الحَياةُ الدُنْيا ﴾ دانیشتوانی بەهەشت ئەڵێن: بەڕاستی خوا ئاوو خواردەمەنی بەهەشتی قەدەغەکردووە لەسەر بێ باوەڕان ئەوانەی ئەوتۆن ئاینی خۆیانیان وەرگرتووە و گەڕانویانە بەخۆ خەریك

کردن بە پروپوچ و بەیاری کردن و گاڵتەکردنیئەوانی فریودابوو ژیان و خۆشی جیهان لەهەرزانی و پلەو پایەو سامان .

﴿ فَالْيَومَ نَنْسٰاهُمْ كَمٰا نَسَوا لِقٰاءَ يَوْمِهِمْ هٰذٰا وَمٰاكانُوا بِآيٰاتِنٰا يَجْحَدُونَ ﴾ دوایی ئێمە ئەمڕۆ ئەوان بەجێ ئەهێڵین لەنێو سزاداو لەبیری بەزەیی خۆمانیان ئەبەینەوە، هەروەك چۆن لەبیری خۆیانیان بردەوە پێ گەیشتبێ ڕۆژی خۆیان تا ئەم ڕۆژە و هەروەك ئەوەی باوەڕیان بەئایەتەکانی ئێمە نەبو کەبەڵگەبون لەسەر یەکێتی خواو هاتنی ئەم ڕۆژە و بەردەوامیشبون لەسەر بێ باوەڕی.

﴿ وَلَقَدْ جِئْنٰاهُمْ بِكِتٰابٍ فَصَّلْنٰاهُ عَلى عِلْمٍ هُدى وَرَحْمَةً لِقَومٍ يُؤمِنُونَ ﴾ وەبەڕاستی ئێمە هاتبوین بۆلای ئەو تاقمە بێ باوەڕانە بەنامەیەکەوە ئێمە ڕونمان کردبوەوە بەونامەیە بیرو بیروباوەڕو فەرمان وئامۆژگاری یەکان بەدرێژی لەسەر زانستی خۆمان بەو ڕون کردنەوە، ئەو نامەیە شارەزایی‌کەرە بۆ فەرمانی خواو، میهرەبانیە بۆ تاقمێ باوەڕئەهێنن و کار بەفەرمانەکانی ئەکەن. بەڵام ئەو کەسانە ڕوو وەرئەگێڕن لەونامەیە دوای هەوەسی خۆیان ئەکەون و پاشەڕۆژیان دۆزەخە .

﴿ هَلْ يَنْظُرُونَ ألا تَأويْلَه ﴾ ئەو بێ باوەڕانە باوەڕیان بە ئایەتەکانی ئێمە نەهێنا چاوەڕوانی هیچ شتێکیان نەئەکرد مەگەر چاوەڕوانی ئەوەیان ئەکرد بەڵێنیان پێ درابوو بەو شتە لەسزاو چوونیان برلای ئاگرو ئەنجامی ناوەڕۆکی ئەونامەیە کەلەسەر زمانی پێغەمەران بەڵێن درابو توشیان ببێ .

﴿ يَوْمَ يَأتِي تَأويلَه يَقُولُ الذِيْنَ نَسُوهُ مِنْ قَبْلُ ﴾ ڕۆژێ دێت پەیدابونی شتێ ئەونامەیە هەواڵی پێداوەو بێ باوەڕان بەچاوی خۆیان ڕاستی ئەوەی ئەونامەیە هەواڵی پێداوەو ئەی بیننن. ئەو ڕۆژە کەسانێکی ئەوتۆ وازیان لەونامەیە هێنابوو لەبیری خۆیانیان بردبووەوە لەوەوبەر لەجیهانداو ڕاستیان بۆ دەرکەوت ئەڵێن:

﴿ قَدْ جٰاءَتْ رُسُلُ رَبِّنٰا بِالحَقِ ﴾ بەڕاستی هاتبون نێرراوەکانی پەروەردەکەری ئێمە بەڕاستی و بەدروستی بۆ ڕون کردنەوەی زیندووبونەوەو بەهەشت و دۆزەخ و شتە نادیاریەکانی تر. بەڵام ئێمەی بێ باوەڕ لەجیهاندا بەدرۆمان ئەخستەوە، ئەوانەیان کاتێ

ئەووت سزایان بینی بەچاوی خۆیان، لەجیهاندا بەپێغەمەرانیان ئەووت: جادوگەرو بوختنا چین .

﴿ فَهَلْ لَنَا مِنْ شُفَعَاءِ يَشْفَعُوا لَنَا ﴾ دوایی ئایا بۆ ئێمە هەیە یەکێ لەتکا کاران هەتا تکامان بۆ بکەن لەم ڕۆژەدا لەخزمەت خوادا بۆ لێ بوردنمان لەگوناهەکانمان و بەکردەوەی نالەباری خۆمانمان لەگەڵ نەکا. بێگومان ئەو ئاواتەیان پوچ و بێ سودە و بێ ئەنجامە .

﴿ أو نُرَدَ فَنَفْعَلُ غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ ﴾ یائێمە بگێڕنەوە بۆ لای ژیانێ تری جیهان دوایی ئێمە بیکەین جگەی ئەوشتەی ئێمە کردومانە لەمەوبەر و باوەڕ بەپێغەمەران و ڕۆژی دوایی بهێنین و بەدرۆیان نەخەینەوە یاباوەڕبەیەکێتی خوا بهێنن و هاوبەشی بۆ دانەنێن لەپەرستندا. ئەگەر خوا وەڵامی داواکەیان بداتەوە بەڕاستی هەمونرخاندنێ پوچ ئەبێتەوەو ئەوکەسەی بەتیرو بەشیر نەبێ باوەڕ نەیەرن یەکسان ئەبێ لەگەڵ کەسێ بەخۆشی و بەویستی خۆی باوەڕ بەڕاستی بهێنێ و سەرودارایی خۆی دانێ لەرێگەی خوادا، ئەوەش گونجاو نیە .

﴿ قَدْ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُمْ ماكانُوا يَفْتَرُونَ ﴾ بەڕاستی ئەو کەسانە زیانیان لەخۆیان داوە، تەمەنی خۆیانیان بەفیرۆ بردوەتەسەر، ونبوە لەوان شتێ ئەوان بەدرۆوبەبوختان ئەیانپەرست لەبتەکانیان کەتکایان بۆ بکەن، هەروەها هەمو کردەوەی تاوانباران بەهەوادا ئەڕواو سودی نابێ بۆیان، هەمو تکاکارو دۆستەکانیان لێ وون ئەبێ کەلەجیهاندا بەفەرمانی ئەوان هەڵ ئەسان و هەڵیان ئەگرتن بۆ کاتی تەنگانە .

کاتێ خوای مەزن باسی بێ باوەڕان و پەرستنی جگەی خوای فەرمو، دوایی بەڵگەیان لەسەر دائەنێ بەهۆی ئەوشتانەوە دروستی کردوون. ئەفەرموێ جگەی خوا پەرستراوێکی تر نیە، ڕوئەکاتە هەمو بونەوەران و دروست کراوانی خۆی و ئەفەرموێ:

إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِي ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِي ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ۚ إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾

﴿ أنّ رَبَكُمْ الله ﴾ بەڕاستی پەروەردەکەری ئێوە خوایە کەلەهەمو ڕوێکەوە خاوەنی توانای بێ وێنەیە، هەرخوایە تەنها لەنەبونەوە بونەوەرانی هێناوەتە بونەوە، خاوەنی تواناشە دوای نەمانیان لەسەر پاشماوەی لەشیان دروستیان بکاتەوەو زیندوویان بکاتەوە، جگەی ئەو خوایە کەسی تر خاوەنی توانای وا نیە. کەواتە ناگونجێ جگەی ئەو پەرستراوێ تر هەبێ. یەکێکە لەتواناکانی خوا کە ئەفەرموێ :

﴿ ٱلذي خَلَقَ السَماواتِ والأرض في سِتَةِآيامِ ﴾ خوایەکی ئەوتۆیە دروستی کردوە ئاسمانەکان و زەوی لەماوەی شەش رۆژی ئێستادا .

زانایان لەباسی مانای ووشەی (في ستة أيام ) بیری جیاوازیان هەیە: هەریەکەیان بەجۆرێ مانایان کردووە، هۆی جیاوازی بیرو بۆچونیان ئەگەرێتەوە بۆلای دووشت:

١. بەڕاستی کردەوەکانی خوای مەزن دیاری ناکرێ بەهۆی کاتەوە، ئەوەتا لەئایەتی پەنجای سورەتی ئەلقەمەردا ئەفەرموێ ( وما أمرُنا إلآ كلحِ بِالْبَصَرِ ) وەکاری ئێمە نابێ مەگەر بەئاماژەو بریقەی چاوە.

٢. ڕۆژ کـاتێ دیـاری ئـەکرێ دوای بوونـی ئاسمانـەکان و زەوی و پـەیدابوونی ڕوداوەکان، بەرلەوان نەکات هەبوە نەڕۆژ .

ئەبێ ئەوەبزانین مەبەست ڕۆژی دیاری کراوی وێنەی ڕۆژانی ئێستا نیە کەبەهۆی خولانەوەی گۆی زەوی بێ بـەدەوری بازنـەی خـۆردا، چونکـە بەرلەدروست کردنـی ئاسمانەکان و زەوی خۆر نەبوە هەتا کات و ڕۆژی پـێ دیـاری بکـرێ. بـەڵکو مەبەست ئەوەیە کەخوای مەزن بەیەکجارو لەیـەك کاتـا دروسـتی نـەکردوون لـەگـەڵ ئەوەیشـدا خاوەنی توانایە. یانی دروست کردنەکەیان لەشەش جاردا بووە، بۆئـەوەی خـوای مـەزن ئێمە ووریا بکاتەوەو فێرمان بکا ئێمە کارو کردەوەمان لەسـەر خـۆو هیدیانـە بـێ، دورە پەرێز بن لەپەلەکردندا و ڕام بین لەکردنی هەمو کارێکا بەبێ پەلـە، ووردبـین لـەکارو کردەوەماندا، هەرزەو لاوازو هەڵەشە نەبین لەهەڵسـوکەوتماندا خوایـش لەهـەمو کـەس زاناترە بۆ مانای هەمو شتێ. کەواتە پێویستە مانای ( الآيام) بەجۆرێ بکرێ وەربگـیرێ و بچێتە ئەقڵەوە، بەڕاستی بۆ دیاری کردنی ئەم مانایە زانایان بیرو بۆچونی جیـاوازی تریـان هەیە جگەی ئەوانەی پێشوو، هەیانە ئـەڵێن: لەڕستەکەدا ووشـەیە فرێـدراوە واتـە ( في مقدار ستة أيام ) لەئەندازەی شـەش ڕۆژدا. هەیانـە ئـەڵێن هێمایـە لەچـەند جـار، خـوا بونـەوەرانی بەیـەکجار دروسـت نـەکردوە. بـەڵکو بەشـەش جـار دروسـتی کـردون، لەبەرئەوەی بۆ هەمو شتێ هەبێ سنورێکی دیاری کراو وکاتی دیاری کراو، هەیانە ئەڵێن: ( الايام ) هێمایە لەچەندین گۆڕانکاری، خـوا یەکەمجاربونـەوەرانی وەك ئێسـتا دروست نەکردوە. بەڵکو دروست کردنەکە گۆڕاوە لەگۆڕانێکەوە بۆ گۆڕانێتر بـەگوێرەی بـیرو ڕای پەیدابون و بەرزبونەوەی هێزێ بۆلای هـێزێ تـر. (نظرية النشؤ والارتقاء ) هـەتا بونەوەران وەك ئێستای لێهاتووە. وەك ئێستا ئـەیان بینـین. ئـەو بـیرو بۆچونانـە هـەمویان ئەگونجێن و ئێمە بەڵگەیەکمان نیە بۆ دیاری کردنی یەکێکیان، هەرچەندە زانایانی کۆن و تازە مانای زۆریان بۆ کردووە، بۆیە لەبەرئەوە ئێمـە ئـەڵێین: (الايـام ) بـۆ ئەوانـە هـەمو ئەگونجێ و بۆ شتی تریش هەر ئەگونجێ و بەراوردی ناکەین بەئەندازەکانی ئێمـە. کەواتـە

پێویست نیە هیچ کەسێ پێ داگرێ لەسەر مەبەستی ئەو ژمارەیە بەجۆرێکی تەنهاو دیاری، گومان بردن بەناوی زانستەوە ڕوخاندنێکی گیانییەو هەوڵدانێکی تەوەزمیە لەبەردەم زانستا .

﴿ ثُمَ اْستَوى عَلَى العَرْشِ ﴾ لەپاش دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی خوا بەتەواوی دەسەڵاتی پەیدا کرد بەسەر عەرشدا. عەرش لەزمانی عەرەبیدا بەمانا کورسیە، لێرەدا هێمایە لەدەسەڵات و پاشایەتی بۆ هەمو بونەوەران و هەمو کاروباریان لەخواوەیە، ئایەتی (٥٤) ی لەمەودوای ئەم سورەتە مانای ئەوڕستەیە ئەکا کە ئەفەرموێ:

﴿ آلا له الخلق والامر ﴾ یانی خوا خاوەنی بونەوەرانەو کاروباریان ئەبا بەرێوە، وێنەی ئەوەی ئێستا ئەبێژرێ پاشا لەسەر کورسی و تەختی خۆ دەسەڵاتی هەیە بەسەر هەرێمی خۆیا. یانی خوا دوای دەسەڵاتی پێشوی ئەو دەسەڵاتەیشی هەیە، ئەگینا خوای مەزن هەر لەکۆنەوە خاوەنی توانای بێ بڕاوەیە وکاتی دیاری کراو پاش و پێشی بۆ نیە .

وەك باسمان کرد ووشەی ( العرش ) هێمایە لەوەی کە خوا دەسەلات و توانای و هێزی بلاو بوەتەوە بەسەر هەمو بونەوەراندا، بەمانای ئەوەنیە کەخوا شوێنێکی تایبەتی هەیەو لەسەری دانیشتوە، وەك ڕون کرایەوە وێنەی ئەوەیە تەختی پاشایەتی جێگەی فەرماندانیەتی بۆ دانیشتوان و هەڵسوڕاندنی کاروباریان، ئەوەی شایانی باسبێ تەختی خوا بونەوەران نایزانن، بەڕاستی یەکێکە لەکارە نهێنیەکان وێنەی ڕۆژی دوایی پێویستە ئێمە باوەڕمان پێ‌ی هەبێ .

بۆ زانین: ماناکردنی عەرش بەکورسی و ( الاستواء ) بەدانیشتن وەك هەندێ کەس ئەیڵێن پوچ و بێ مانایە ، چونکە خوا بەرلەعەرش هەبووە و بێ جێگە بوە ئێستاش هەروایە خوا گۆڕانی بەسەردانایەو گۆڕان بۆ بونەوەرانە: زانای بەرز ( راغیب ) لەنامەی خۆیدا ( مفردات القرآن ) ئەفەرموێ: عەرشی خوا کەس بەڕاستی نایزانێ. لەزانایان سادیق و حەسەن و ئەبو حەنیفە ومالیکەوە گێڕاوەتەوە: ئیستیواء ماناکەی دیارە، چۆنیەتیەکەی نازانرێ. باوەڕپێ بونی پێویستە، باوەڕپێ نەبونی بێ باوەڕیە، پرسیار لێ کردنی تازەبابەتە ( بدعة ). توانایەکی تری خوا ئەمەیە:

﴿ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا﴾ خوا بەتاریکی شەو ڕوناکی شەو دائەپۆشیٚ و دوایی ڕۆژ ئەکەویٚ بەگورجی و بەبیٚ دواکەوتن. یانی شەو دوای ڕۆژ ئەکەویٚ و بەپەلە دیٚت بەدووای ڕۆژدا ئەوجیٚگایانەی ڕۆژیان تیٚدایە شەو زاڵ ئەبیٚ بەسەریانا تاریك ئەبن دوای ڕوناکی، هەرچەندە باسی داپۆشینی ڕوناکی ڕۆژ ناکا بۆ تاریکی، چونکە ڕستەکە بەڵگەیە لەسەری، هەروەها شەو و ڕۆژ و تاریکی و ڕوناکی دیٚن وئەڕۆن بەهۆی میهرەبانی خواوە لەبەر بەرژەوەندی و پەرەپیٚدانی ژیان و ئاسایشی بونەوەران، بەو جۆرە لەسەر ڕیٚگەو ڕەچەیەکی دامەزراوی بەردەوام ڕۆژ پەیدا ئەبیٚ هەتا هۆی زیندەگانی پەیدا ببیٚ وپایەداربیٚ، دوایی شەو دروست دەبیٚ بۆ ئارام و حەسانەوە و پشوی بونەوەران. یانی ڕۆژ بۆ جوڵەو کارکردن و هاتوچۆ، ئەگەر واریٚك بکەویٚ ئادەمیزاد بەشەو کاربکەن و بەڕۆژ بسرەون و پشو بدەن لەبەرئەوەیە شیٚوەی پیشەکانیان ناچاریان ئەکا، کەم جاران وەك یەك ئەبینریٚ بەوشیٚوەیە بۆیان هەڵئەسوڕیٚ و جۆریٚکی نائاساییە و پیٚچەوانەی ئەو پەیڕەو وپرۆگرامەیە دەقیان پیٚوەگرتوە بۆ ڕیٚکخستنی هۆی ژیانیان .

توانای خوا تەنها دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و توانای هەڵسوڕاندنی کاروباری ئەوانی نیە تەنهایش هاوردن و بردنی شەو ڕۆژ نیە بە دوای یەکا، یەکیٚ تر لەتوانا زۆرەکانی خوای مەزن ئەمەیە کە ئەفەرمویٚ:

﴿ وَالشَّمْسَ وَالقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ ﴾ وەخوا دروستی کردوە خۆرو مانگ و ئەستیٚرەکان بەڕام کراوی ئامادەکراوی بەهۆی فەرمانی خواوە و هەڵسوڕاندنیان بەگویٚرەی سودی بونەوەران و دانانی هەریەکەیان لەشویٚنی شیاوی خۆیانا بۆ سودی گیانداران .

بۆ زانین: گفتوگۆکردن لەبارەی ئەو ئەستیٚرانەوە پیٚویستیان بەزانینی ئاسمان ناسینەوە هەیە، ئیٚمەش لەو بارەوە هیچ نازانین، بەتایبەتی ئەو شتانەی لەژورەوەی خۆرو مانگەوەن لەبونەوەران و بۆشایی کەزانایانی ئاسماناناس ڕونیان کردونەتەوە زۆربەیان بەجۆریٚکی ڕاستی نەزانراون، بۆیان ڕون بوەتەوە زۆربەی ئەو ئەستیٚرانە گەورەترن لەزەوی بەهەموو گییان لەبەر و بیٚ گییانەوە بەجنۆکە و فریشتەکانەوە، ئەو چۆڵایەتیە پانەی ئەم گەردونە هەیەتی جگە لەخوا کەسی تر ڕیٚگەی پیٚ نەبردوون و ڕیٚگەشی پیٚ نابەن، بۆیە پیٚویستە

زانین و بەرێوەبردنی بونەوەران هەواڵەی لای زانیاری خوای بکەین، هەر خوایشە بتوانیٚ بیانبا بەرێوە ئەوەی ئێمە بزانین زۆرکەم وکورە، وەك ئەفەرمویٚ :

﴿ ألا لَهُ الخَلْقُ والأمر ﴾ ئاگاداربن و بزانن بۆ خوایە دروست کردن و فەرماندان بۆ هەمو شتیٚ ،لەبەرئەوەی دروستی کردون و بۆ خوایە فەرمانیان پیٚ بدا بەهەرشتیٚ ئارەزووی هەبیٚ. بەوڕستەیە ناوەڕۆك ومەبەست ومانای ڕستەی ( ثم استوى على العرش ) ڕون بویەوە، وەك لەمەوبەر ڕون کرایەوە .

﴿ تَبارَكَ اللهُ رَبُّ العَالَمِيْنَ ﴾ بەرز و باڵاو گەورەیە خواکە پەروەردەکەری هەمو بونەوەرانە، پیت و فەڕو چاکەی خوا یەکجار زۆر و بیٚشومارە بۆیان و پایەدارو بەردەوامە و خاوەنی هەمویانە .

﴿ أدْعُوا رَبَكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفيَةً ﴾ ئێوە بپارێنەوە لە پەروەردەکەری خۆتان بەکزۆڵی و گریانەوەو لە خوا بترسن و خۆتان لەگوناه بپارێزن و، بەپەنهانی لەدەروونی خۆتانابیٚ پاڕانەوەکەتان و ڕاست ونییاز پاکبن لەکارو گفتوگۆتانا، خۆتان دوورخەنەوە لەبەرچاوی دانیشتواندا وجگەی خوا کەسیٚ ترتان مەبەست نەبیٚ، بەئاشکرایش لەخوا بپارێنەوەو دەرونی خۆتان لەدووڕوی وبپارێزن .

﴿ إنَهُ لايُحِبُ المُعْتَديْنَ ﴾ بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی لەسنور دەرچوون خۆشی ناوێن و بەدەنگی بەرزو ناقۆڵا ئەپارێنەوەو بەقیڕەقیڕو هاوار ئازاری دانیشتوان ئەدەن و خۆیان هەڵئەکێشن لەپەرستندا لەدەرونیانا پیس و چەپەڵی ئەشارنەوەو نیاریان پاك نیە .

﴿ وَلاتَفْسِدُوا فِي الآرْضِ ﴾ وەئێوە خراپە مەکەن لەنێو زەویدا، ستەم لەدانیشتوان مەکەن و هاوبەش بۆ خودا دامەنێن، زەوی کاول مەکەن و شارو گوندەکان مەڕوخێنن، کڵێسەو مزگەوتەکان تێك مەدەن، سەرچاوەی ئاوەکان پڕمەکەنەوە، بەنداوەکان بەرمەدەنەوە بەبیٚ هودە، دانیشتوان لە نیشتمانی خۆیان دەرمەکەن وبەندیان مەکەن و مەیان چەوسێننەوە، دارایی و سامانیان تالاّن مەکەن، زەوی پڕمەکەن لە خراپە بەهۆی بەرتیلو دزی کردن و دەست درێژی و دەست برین لەکڕین و فرۆشتندا، بەرزۆرو تۆپزی

بێ باوەڕی مەسە پێنن بەسەر دانیشتواندا و بەوبۆنەوە بیانویان پێ مەگرن، مێشکیان تێـك مەدەن بەخواردنەوەی مەیی و کردنی قومـــار و وانەگرتنـەوە و خوێندنـەوەی ناولــەپ و ئامادەکردنی گیانان، گۆڕانی یاســای ئـایین و پـەیدا کردنـی بیروبـاوەڕی پـوچ، بڕیـن و سوتاندنی دارو درەخت، نەهێشتنی ئاسایش. هـالدانی کاربەدەسـتان بـۆ خراپـە کـردن و سستی‌کردن بۆ کاری پێویستی سەرشـانیان و رێگـە گرتنیـان لـەڕاسـتی و پـەیدا کردنـی ناکۆکی لـە نێوانیان دانیشتوانداو کڕینی ناموسی تاوانباران بۆ گێرە شێوێنی، لایەن گرتنـی ناڕەوای دادوەران لـەدادگادا بۆ لایەکی تایبەتی، هەتا دێ، ئـەو کارانـەی پێشـو مەکـەن لـەزەویدا .

﴿ بَعْدَ إِصْلاحِهَا ﴾ دوای چاکردنەوەو پاك کردنەوەی زەوی لـەخراپە و خۆشـەکردنی بە دادپەروەری و باوەڕهێنان بە ئایین و پەرستنی خوا، بانگ کردن بـۆلای چاکـەو رێـك وپێکی نێو گەلان چاودێری کردنی ئەندامان و پاراستنی زمانی گەلان و ناردنی پێغەمـەران بۆ لایان .

خوای مەزن ئەو زەوییـەی چـاك و پـاکو خۆشـەکردوە بـەو هـەموە کانگـاو پیت و فەڕەشاراوانە داینـاون لـەناویا کەبەهیچ کەسێ نایەنـە ژمـارە، زەوی ڕازانوەتـەوە بـەمانای خوارەوە:

١- بەجوانی و ڕابواردن و پەیداکردنی خۆشی گییان وژیان لـەدروست کردنـی ژن و پیاو بۆ یەکتری و چاکەکردن ،دایك وباوك و دۆست بۆ ڕێز گرتن لـەیــەکتری و ناسـینی یەکتری، دەنگی خۆش و گۆرانی بۆ زاخاوی مێشك. هەتادێ ...

٢- بنەمای پاك و خۆشەکان لـەخواردەمـەنی: وەك گـەنم و دانەوێڵـەی تـر سـەوزەو گۆشت و میوە بەهەموو ڕەگەز و قەوارەو ڕەنگیانەوە. لـەپۆشاك و ژێررەخەر سـەرەخەر: وەك لۆکـەو پێـس و ئەوریشـم، دوای ئەوانـەش ئـادەمیزاد نـایلۆن و بەرهـەمی تـری دۆزییەوە، لـەمەولا شتی تری وابەدۆزنەوە لای گومـانی ئێمـە ئێسـتا نایـانزانین و ناچێتـە مێشکمانەوە، هەروەها زۆر شتی سەرسوڕهێنەر دۆزراوەتەوە بۆ نزیك خسـتنەوەی جێگـە

دورەکانی ئاسمان و زەوی، تێپەڕبون لەکیشوەرەکاندا لەماوەی ووردەیەکی کاتژمێر و لەماوەیەکی کەمدا، بینینی یەکتری و شتی پێویست لەدوورترین جێگەوە بەهۆی تەلەفزیۆن و سەتەلایەتەوە. بیستنی دەنگی یەکتری لەوپەڕی جیهانەوە بەهۆی ڕادیۆو تەلەفزیۆنەوە. پەیداکردنی سوتەمەنی خەڵوزی بەردو دوای نەوت و بەنزین وگاز و درەخت، لەڕوناکی ئاگر ونەوتەوە بۆلای کارەبا لەوانیشەوە بۆ لای گەرمایی زەوی و خۆرو زەڕڕە بەتایبەتی پەیداکردنی گەرماو سەرما بەهۆی کارەباوە .

لای هەموان ڕونە ئادەمیزاد دروست ئەکەن لەنەوت تایەی ماشین و فڕۆکەو جگەی ئەوانەیش، شوشەی نەشکاو نەبڕاوی بەگوللە لێی دروست ئەکەن، بۆمباو ناپاڵم و نایلۆن و پەیینی کیمیاوی و لولەی ئاو ڕشتن و تۆزی خۆ جوان کردن مێز و کورسی دانیشتن و بەرگی مێزی نان خواردن و گوڵی دەست کرد و سوراوی لێوو کلی چاوو بۆیەی نینۆك و پۆشاکی ژێر بەرگ و فلچەی دگان و ڕەنگی چاپخانەو فیلمی سینەماو هەزاران شتێ نایەنە ژمارە، ئەوانە هەمویان لەنەوت دروست ئەکرێن و لە زەوی دەرئەهێنرێن بۆ ئاشتی و هێمنی و ئاسایش بلاَوکردنەوە بەسەرزەویدا نەك بۆ گێرە شێونی لەسەرزەوی .

ئەو ئایەتە بۆمان ڕوون ئەکاتەوە کە ئادەمیزاد ئەوپەڕی بێ باوەڕی و ستەمکاری بەکاردێنن لەهەمو شتێ خراپتر ویاخی بونتر ئەوەیە :لەبریتی خواردەمەنی پەیداکردن بۆمبای ناپاڵم وکازی کیمیاوی و خەردەل دروست ئەکەن بۆ کوشتنی منالاَن وبێ چارەکان و ناشیرین کردنی گەورەکان بەوەیش کۆڵنادەن دووکەڵی ژەهراوی و گڕی ئاگری سوتێنەر دروست ئەکەن، دوای ئەوانەیش بۆمبای زەڕڕەو هیدرۆجین دروست ئەکەن بۆ لەناوبردنی گیانداران و گییانان، ئەوانەو چەندین تریش بۆ تێکدانی زەوی و دوواکەوتنی گەشەی زەوی .

بەڕاستیئادەمیزاد پەرستنی خوایان گۆڕی بەبێ باوەڕی، خۆشیو بەرهەمی زەویان گۆڕی بەدۆزەخ، پاشەڕۆژی مرۆڤایەتیان بەستوە بە بەبەکارهێنانی بۆمبای زەڕڕەو هایدرۆجینەوە. بێگومان خوای مەزن دروستی کردوە لەزەویدا خۆشی و خواردەمەنی پاك

بۆ دانیشتوانی سەرزەوی، ستەمکاران و بێ باوەڕان دایان ناوەو ئامادەیان کردوە بۆ لەناوبردن هەزاران بۆمباو فڕۆکە ئەگەڕێن بەبۆشایی هەوادا بەشەوو بەڕۆژ. چاوەڕوانی هەل ئەکەن بۆ کاول کردنی زەوی و گێڕانی بەخۆڵەمێشێ هەتا نەوەی ئادەم بەسەر زەوییەوە نەمێنێ. کەواتە پێویستە ئێمە بزانین چ کەسێکە زەوی لەناو ئەبا وتێکی ئەدا، دوای ئەوە خوای مەزن ئاوەدانی کردوەتەوەو خۆشی و ڕابواردنی بۆ ئێمە داناوە لەزەویدا. کەواتە پێویستە بەگوێرەی توانا ڕێگە بگرین لە خوێن ڕژاندن و کاول کەرانی زەوی، بەهەمو توانامانەوە کۆسپ دابنێین لەڕێگەی دوژمنانی خواو زەوی و مرۆڤایەتی و نیشتمان و ئادەمیزاد، بەلای کەمەوە دەستنیشانیان بکەین هەتا خۆمانیان لێ بپارێزین .

﴿ وَأدْعُوهُ خَوْفاً وَطَمَعًا ﴾ وەئێوە بپارێنەوە لەخوا بەترسانتان لەسزای خواو بەتەما بونتان بۆ پاداشتی چاکی خواو بەئومێدی ڕەزامەنی خوا، مرۆڤی ژیر کارئەکا بۆ سودی خۆی و لەخوایش ئەترسێ کەوەری بگرێ لەڕیزی پیاو خراپاندا بەهۆی کەمو کوڕی وخراپەی خۆیەوە، لەهەمان کاتدا بەتەمای سەرکەوتن و وەرگرتنی پاداشتی چاکەیە، چونکە ترس و تەما ئەبنە هۆی خۆپاراستن و کردنی کاری چاك و لادان لەستەم کردن و گێرە شێوێنی .

﴿ إنّ رَحْمَةِ اللهِ قَرِيْبٌ مِنَ الُمحْسِنِينَ ﴾ بەڕاستی بەزەیی و بەخششی خوا نزیکە لە چاکەکەرانەوە، ئەوانیش بەتەمای میهرەبانی و بەزەیی بێ ژمارەی خوان .

لەو ئایەتەوە دەرئەکەوێ ئەو کەسەی لەخوا ئەترسێ و بەئومێدی پاداشتی چاکبێ لەڕیزی چاکە کەراندا ئەژمێررێ و خوای مەزن پاداشتی چاکەکەرانیش ئەداتەوە.

کاتێ خوای مەزن لەئایەتەکانی پێشودا هەواڵی دا پێمان ئاسمانەکان و زەوی و ئەو شتە سەر سوڕهێنەرانە لەوانان، دوای ئەوانە باسی دروست کراوێکی ترو توانایەکی تری خۆیمان بۆ ئەکا و ئەفەرموێ :

وَهُوَ ٱلَّذِى يُرۡسِلُ
ٱلرِّيَـٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَىۡ رَحۡمَتِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتۡ سَحَابًا

ثِقَالًا سُقْنَـٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَشْكُرُونَ ﴿٥٨﴾

﴿ وَهُوَ الَذِي يَرْسِلُ الرِيْاحُ بِشرَا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ ﴾ وەخوا کەسێکی ئەوتۆیە بایـەکان ئەنێرێ بەهەر چوار جۆرەکانیەوە: بای ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوا وبـای بـاکورو باشـور بـە موژدەو بەباران بەرلـەچاکەی خوا کەبارانە. پیشەی بای ڕۆژئاوا هەور پـەیدا ئـەکا، بـای باکور هەور کۆ ئەکاتەوە، بای باشور باران ئەبارێنێ ،بـای ڕۆژئـاوا هـەور پارچـە پارچـە ئەکا، هەروەها خوا ئەو بایانە ئەنێرێ .

﴿ حَتَى إِذْا أَقَلَتْ سَحَاباً ثُقالًا سُقْنْاهُ لِبَلَدٍ مَيْتٍ فَأَنْزَلْنا بِـهِ المـاءَ ﴾ هـەتا کـاتێ ئەوبایانـە هەڵئەگرن و بەرز ئەکەنەوە هەورێکی قورس بەباران و چڕو پڕ لـەئاو ئێمە ئەو بایانـە پـاڵ پێوە ئەنێین و ئەیان نێرین بۆ لای زیندوکردنەوەی شارێکی مردوی بێئاو وبـێ سـەوزایی، دوایی ئێمە ئەینێرینە خوارەوە بۆ ئەو شارە مردوە ئاوێ ئەیرێژین بەسەریا .

﴿ فَأَخْرّجْنا بِهِ مِنْ كُلِ الثَمَراتِ ﴾ دوایی ئێمە دەرئەهێنین بەهۆی ئەو ئاوەوە لـەهـەمو بەروبوم و سەوزاییەکان. پوختەی مانـای ئـەو ڕستانە بـەم جۆرەیـە: بەڕاستی بایـەکان هەڵئەکەن، خۆر ئاوی زەریاکان و تەڕایی زەوی ئـەکا بەهـەڵم و بەتـەم ئـەو بایانـە بـەو هەڵمەوە بەرز ئەبنەوە بۆلای سەرەوە پاشان زەوی ڕایان ئەکێشێ بۆلای خۆی و ئەکەوێ بەسەریا دڵۆپەکانی ئاو یەك لـەدوای یەك، ئەوانـە هـەمویاندێن و پـەیدا ئـەبن بـەگوێرەی دەستوری دیاری کراوی سروشت بەبێ گومان، بەڵام چ کەسێکی ئەوتۆیە ئەو سروشتەی پەیدا کردوە و ئەو یاسایانەی ئەوتۆ لـەسـەری ئـەڕوا بـەرێك پێکـی بـەماوەی چـەندین

مەلایینی خولەك كەناگۆڕێن بەجۆری تر؟ ئایا سروشت لەخۆیەوە پەیدا بووە؟ ئایا ئەو یاساو دەستورانە فەرمانیان داوە بە سروشت لەیەكەم كاتەوە هەتا كۆتایی، بەرێكەوت بوەو بەبێ هۆیە پەیدایان بكا ؟ دوایی چاكتر وایە ئەو گومانە گۆترەكاری و بێ بەڵگە بێ، چۆن شتێكی بێ پەیڕەو بێ پرۆگرام پەیڕەو پەیدا ئەكا و چۆن شتێكی بێ ئاگا لە خۆی شتێكی خاوەن ئاگا پەیدا ئەكا. دوای ئەو پرسیارانە وەلامێكی وەرگیراو بچێتە ئەقڵەوە نیە مەگەر بونی دروستكەرێكی خاوەن توانا، بەرێوەبەرێ هەمو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دابنێ، خوایێكی ئەوتۆ نیە سروشتی دروست كردبێ و ئەو دەستورە یاسانەی دانابێ و هەمو شتێ بۆلای ئەو كۆتایی پێ بێت ،هەمو شتێ پێویستی هەربە ئەوبێ و ئەو پێویستی بەهیچ شتێ نەبێ، دوایی بایەكان و بارینی باران و زیندوبونەوەو بوژاندنەوەی شارە مردوەكان یەكەمجار لەخواوە پەیدا ئەبن ڕاستەوخۆ دووەم جار بەهۆی سروشتەوە كەخوا دروستی كردوە .

﴿ كَذٰلِكَ نَخْرِجُ الْمَوْتىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾ هەر بەوجۆرەی ئێمە زەوی مردوو زیندوئەكەینەوە هەروایش ئێمە دەرئەهێنین مردوەكان و زیندویان ئەكەینەوە لەڕۆژی دواییدا، بۆئەوەی ئێوە بزانن كەسێ دەسەڵاتی بەسەر زیندوو كردنەوەی زەوی مردوبێ دەسەڵاتی هەیە لەڕۆژی دواییدا ئێوەی مردوو زیندو بكاتەوە، بێ ئایینەكان ئەڵێن: ئێمە چۆن باوەڕ بەزیندوو بونەوە بهێنین و كەسمان نەبینیوە دوای مردن زیندەگانی بۆ بێتەوە؟ ئەوە ئەڵێن و كەچی بەچاوی خۆیان ئەبینن زەوی مردوو بێ سەوزایی زیندوو ئەبێتەوە و سەوزایی بۆ دێتەوە، بەڵام ئەوان ئاگایان لەوە نیە هۆی زیندووبونەوەی هەردوولایان یەكە، دوایی بۆ ئەبێ بیر نەكەنەوەو سوود وەربگرن؟ .

﴿ وَالبَلَدُ الطَيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُ بِأُذْنِ رَبِّهِ ﴾ وەزەوییەكی پاك و بێ دڕك و داڵ و بێ دۆچ و هەرێزو بەهێزو خاوەن پیت كاتێ باران لێی دا گیاو سەوزاییەكانی دێتە دەرەوە بەهۆی دەستورو ئاسان كردنی پەروەردەكەری خۆیەوە، بەرهەم وسودی زۆری لێ پەیدا ئەبێ بۆ ئادەمیزاد .

﴿ وَالَّذِيْ خَبُثَ لايَخْرُجْ إلا نَكِداً ﴾ وەشـارو جێگەیـەکی ئـەوتۆ زەویەکـەی پیـس و نسیەو شۆرەکاتبێ هیچ لـەو زەویە نایەتە دەرەوە لـە سەوزایی مەگەر بەگرانیو بـەئازارەوە و بێ سودەو ناگاتە فریای خاوەنەکەی و شتی تریش. ئـەو ئایەتـە وێنـە لـێدانـە بـۆ دڵ و دەرونی باوەڕداران و بێ باوەڕان، چونکە وەك زەوی وان و هەمو خاوەن گیبانێ لـەزەوی دروست کراون، هەیانە سود وەرئەگرن بەزانیاری و چاکەی ئایین و کردەوەی پیاوچاکان و زانایان و کردەوەی خۆیشیان چاك و زۆرن، هەیانە دڵ ڕەق لـەچاکە دوورن و سـودیان بۆ کەس نیە و بگرە خاوەنی ئازاردانن بۆ دانیشتوان .

﴿ كَذلِكَ نَصْرِفُ الاياتِ لِقَـوْمٍ يَشْـكُرُونَ ﴾ هەربـەوجۆرەی ئـەو وێنەیـەمان لـێـی دا وبەڵگەی ئاشکرامان دانا لـەسەر پوچ کردنەوەی بێ فەرمانی خوا، ئێمە ڕونی ئەکەینەوەو دووپاتی ئەکەینەوە نیشانەو ئایەتەڕونەکان بۆ تاقمێ سوپاسی خوا ئەکەن و تەماشا ئەکـەن وبیرئەکەنەوەو ئامۆژگاری وەرئەگرن و باوەڕ ئەهێنن، بەڵگەی بەهێز بۆ بـێ بـاوەڕانی دڵ پیس دائەنێین و بڕو بیانویان پوچ ئەکەنەوە .

وەك لـەمەوپێش زانیمان ئەم سورەتە هاتوەتە خوارەوە، بۆ ئەوەی ئێمە تەمێ خوار بـین بەهۆی نەتەوە ڕابردوەکان و لـەناو بردنیان، بـەهۆی شـارە کـاول بونەکانیانـەوە، ئـەوەبو یەکەم جار باسی ئادەم و حەواو شەیتان دەستی پێ کراو بون بەجێگـەی تـەمێ خواردنـی ئێمە کەشەیتان ئادەم و حەوای ژنەکـەی خەڵـەتاند و ناردنیـە سـەر زەوی، هـەتا ڕۆژی دوایی دوژمنایەتی نێوانیـان بەردەوامـەو واز لـەنـەوەکانی نـاهێنێ، خـوای گـەورە ڕونـی کردەوە بۆ ئێمە بەڵگە لـەسەر یەکێتی خۆی، لـەمەودوایش باسی ئەو کەسانەمان بۆ ئـەکا کە ئازاری پێغەمەرەکانی خۆیانیان داوە، دڵخۆشی پێغەمەر ئەداتەوە کەئارام بگرێ لـەسەر ئازاری گەلـەکەی خۆی، وێنەی پێغەمەرانی پێشوو بێت لـەئارام گرتندا و ئەفەرموێ :

لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥٩﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٦٠﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى ضَلَٰلَةٌ وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦١﴾ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٢﴾ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُوا۟ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٦٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا عَمِينَ ﴿٦٤﴾

﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنا نُوحاً إلى قَوْمِهِ ﴾ بەڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کردبو نوحی کوڕی مەلك کوڕی منوشەنح کوڕی ئوخنوخ ( إدريس ) بۆلای گەلەکەی خۆی و خزمەکانی ،ئەو گەلەی نوح بت پەرست بوون ، لەجگەی خوای تاق و تەنیا ئەیان پەرستن .

﴿ فَقالَ ياقَوْمِ اعْبُدُوا اللهَ مالَكُمْ مِنْ إلهٍ غَيْرُهُ ﴾ دوایی ووتی: ئەی تاقمی من ئێوە خوایەکی تاك و تەنها بپەرستن و واز لەبت پەرستی بهێنن، نیە بۆ ئێوە هیچ پەرستراوێ جگەی خوا. کەواتە ئێوە فەرمانبەرداری خوا بن و هەر ئەو بپەرستن و هاوبەشی بۆ مەسازێنن .

﴿ إني أخافُ عَلَيْكُمْ عَذابَ يَوْمَ عَظِيْمَ ﴾ بەڕاستی من ترسم هەیە لەسەر ئێوە ئەگەر باوەڕ نەهێنن لەسزای ڕۆژێ کەلەجیهاندا ئاو ڕوی زەوی داپۆشێ و ئێوە بخنکێنێ، لەپاشەڕۆژیشدا توشی سزای گەورەتر بن بەئاگری دۆزەخ، نوح بەو ڕستە کورتە ڕووی کردە گەلەکەی و مەبەستەکەیشی ئەوەبوو ئەترسا توشی سزا بن و بەزەیی پێیانا هاتەوە .

﴿ قالَ المَلأُ مِنْ قَوْمِهِ إنّا لَنَراكَ فِي ضِلالٍ مُبِيْنْ ﴾ کۆمەڵێ لەپیاوە بەرێزو ماقوڵەکانی خزمەکانی نوح کەچاویان پڕبوو لە سامان و پلەوپایەی جیهان وتیان: بەڕاستی ئێمە تۆ ئەبینین لەنێو گومڕاییەکی ئاشکرادای کە داوا لەئێمە ئەکەیت کەلاماندەی لەپەرستنی چەند خوایەو خوایەکی تەنها بپەرستین !، ئەو گەلەگومڕایی و کەم ئەقڵییان ئەدایە پاڵ نوح لەبەرهیچ شتێ نەبو مەگەر هەرلەبەرئەوەی قەدەغەی لێی ئەکردن لەشتێ دەقیان پێوە گرتبوو لەپەرستنی بەردەکان و بۆیان جێ مابوو لەپێشوەکانیانەوە، وێنەی ئەو گەلەی نوحن کە دانیشتوان گێل و گومڕایی ئەدەنە پاڵ ئەو کەسانە ئامۆژگارییان ئەکەن، گفتوگۆی نارەواو ناپەسەند ئەهاوێژن بۆ ئەو کەسانە کەوتونەتەسەر ڕێگەی شارەزایی و ڕاغویی، وێنەیان لەم ڕۆژەی ئێمەدا یەکجار زۆرن. بەتایبەتی ئەیانەوێ لەڕێزی ئایین پەروەران و زانایانی ئایینی کەم بکەنەوە.

﴿ قالَ ياقَوْمْ لَيْسَ بِيْ ضِلالَةٍ وَلكِنِيْ رَسُولُ مِنْ رَبّ العْالَمِيْنَ ﴾ نوح لەوەڵامی ئەواندا ووتی: ئەی خزمانی من: نیە بەمنەوە گومڕایی لەڕێگەی ڕاست و دروست، بەڵام من نێراوێکم لەلایەن پەروەردەکەری هەموو بونەوەرانەوە، بەڕێزترین و پیرۆزترین ڕێگەی ڕاست و پیشەی گرنگم پێ سپێردراوە .

﴿ أبْلِغُكُمْ رِسْالاتِ رَبّي وَأنْصَحُ لَكُمْ ﴾ من ڕائەگەیەنم بەئێوە پەیامەکانی پەروەردەکەری خۆم ،بۆ ئەوەی ئێوە ڕزگارتان بێ لەبنە بڕبون و لەسزای هەردووجیهان و من ئامۆژگاری ئێوە ئەکەم و مەبەستم چاکەی ئێوەیە بەدڵێکی پاکەوە .

﴿ وَأعْلَمْ مِنَ اللهِ مْالاتَعْلَمُونَ ﴾ وەمن شتێ لەخواوە ئەزانم ئێوە نایزانن، ئەبێ بزانن کە خوا خاوەنی دادپەروەریە، هەر کەسێکیش بەوجۆرە بێ من ئەی پەرستم لەڕێگەی ڕاست

لامان نادا، من ئەزانم تواناو زانیاری خوا بێ وێنەیە، سزای خۆی لەبێ باوەڕان ناگێڕێتەوە، گەلی نوح گفتوگۆی نوحیان نەبیستبو وەریان نەگرت کە هیچ گەلێ لەسەر بەدرۆخستنەوەی پێغەمەرەکانیان سزای درابێ و نەیان ئەزانی کە سزای گەلانی پێشووو دراوە، کاتێ ناوی پێغەریان بیست سەریان سوڕما، بۆیە نوح فەرموی :

﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَنْ جاءَكُمْ ذِكْرٌ مِنْ رَبِّكُمْ عَلى رَجُلٍ مِنْكُمْ ﴾ ئایا ئێوە بۆ پێغەمەران بەدرۆ ئەزانن سەرتان سورئەمێنێ کەهاتوە بۆلای ئێوە ئامۆژگاری کردن لەلایەن پەروەردەکەری خۆتانەوە بۆسەر پیاوێ لەرەگەزی خۆتان کە ئادەمیزادە .

﴿ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُوا وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ بۆ ئەوەی ئێوە بترسێنێ لە سزای تۆڵەکردنەوەی بێ باوەڕی و گوناهەکانتان، بۆ ئەوەی ئێوە کەلەخوا بترسن و خۆتان لەخەشمی خوا بپارێزن بەهۆی ئەو ترساندنەوەو، بۆئەوەیش ئێوە میهرەبانیتان لەگەڵ بکرێ لەلایەن خواوە سزاتان نەدرێ بەهۆی بت پەرستتانەوە، گەلەکەی نوح ئەیان ووت: ئەگەر خوا بیویستایە ئێمە باوەڕبهێنین فریشتەی ئەناردو ئێمەی ئاگادار ئەکرد، ئێمە شتی وامان نەبیستوە لەباوك و باپیر مانەوە .

پوختەی مانای ئەو ئایەتە، خزمەکانی نوح ووتیان: تۆ هەر ئادەمیزادێکی وێنەی ئێمە ئەگەر خوا بیویستایە نوێنەر و رەوانەکراوی بناردایە فریشتەیەکی ئەنارد، نوح وەڵامی دانەوە بەوەی کەسەر سوڕێنەر نیە کەخوا پیاوێ بنێرێ بۆلای خزم و هاو رەگەزی خۆی کە هیچ سودێکی ئەو پیاوەی تێدانەبێ مەگەر شارەزایی گەلەکەی بکا بۆلای چاکەیان، ئەوەی سەر سوڕێنەر بێ ئەمەیە وازیان لێ بهێنێ بەبێ سود و بەبێ شارەزایی کردنیان. بەراستی مەبەست لەناردنی پێغەمەران ترساندنە، مەبەست لەترساندن خۆپاراستنە، مەبەست لەخۆپاراستن رزگاربونە بەهۆی میهرەبانی و بەزەیی خواوە لەرۆژی دوواییدا.

﴿ فكذبوه ﴾ دوایی گەلی نوح نوحیان بەدرۆخستەوە. نوح لەخوا پارایەوە ئەو گەلە بنە بڕبکا، خوا فەرمانی دا بەنوح کەشتیەك دروست بکا، خۆی و باوەڕداران بچنە ناو ئەو کەشتیە، دوایی خوای مەزن پەرەی دا بەهەڵسان و بەرزبونەوەی ئاو لەسەر زەوی و هەمو بێ باوەڕان خنکان، نوح و باوەڕداران رزگاریان بوو، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ فَأَنْجَبْنَاهُ وَالَّذِيْنَ مَعَهُ فِي الفَلَكِ وَ أَغْرَقْنَا الَّذِيْنَ كَذَّبُوا بِأيَاتِنَا إِنَهُمْ كَانُوا قَوْماً عَمِينَ ﴾ ئێمە نوح و ئەو کەسانەی ئەوتۆ لەگەڵیدا بوون لەنێو کەشتیەکەدا ڕزگارمان کردن لەخنکان، ئێمە خنکاندمان بەئاو کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان بەنیشانە ڕونەکانی ئێمە نەبوو، بەتایبەتی هەڵسان وزۆربوونی ئاو. بەڕاستی ئەو گەلەی نوح تاقمیٚ بوون دڵیان کوێر بوو ڕاستی یان نەئەزانی، لەئاستی توانای ئێمە وپێغەمەرایەتی نوح کوێربون .

بەکورتی دەرگای ئاسمان بەئاو کرایەوە بەسەر ئەو گەلەی نوح دا، کانیەکانی ڕوی زەوی هەڵقولاّن بەئاوی ناهەموارو زۆر، ستەمکاران و ئەو کەسانەی پێغەمەرەکەی خۆیانیان بەدرۆ خستەوە خنکان وبنەبڕبوون، نوح و ئەکەسانەی لەگەڵی بوون و باوەڕیان هێنابوو ڕزگاریان بوو، بەدرێژی بەسەر هاتی نوح گەلەکەی و چۆنیەتی تۆفان لەسورەتەکانی تردا دێن، بەیاریدەی خوای مەزن باسیان ئەکەین .

زانایان ئەڵێن: ئەوکەسانەی باوەڕیان هێنابوو لەپیاوان (٤٠) کەس بون و لەژنان (٤٠)، هەندیٚ تریان ئەڵێن: (٩) کەس بون: سام وحام و یافیس وکوڕانی نوح و شەش کەسی تر. دوای بەسەرهاتی نوح و خزمەکانی خوای مەزن باسی بەسەر هاتی هودو خزموکانیمان بۆ ئەکا و ئەفەرمویٚ :

وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى سَفَاهَةٌ وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٧﴾

أُبَلِّغُكُمْ رِسَالَاتِ رَبِّي وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ أَوَعَجِبْتُمْ
أَن جَاءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ۚ
وَاذْكُرُوا إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاءَ مِن بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ
فِي الْخَلْقِ بَصْطَةً ۖ فَاذْكُرُوا آلَاءَ اللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ
﴿٦٩﴾ قَالُوا أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ اللَّهَ وَحْدَهُ وَنَذَرَ مَا كَانَ
يَعْبُدُ آبَاؤُنَا ۖ فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ
﴿٧٠﴾ قَالَ قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌ ۖ
أَتُجَادِلُونَنِي فِي أَسْمَاءٍ سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم
مَّا نَزَّلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ ۚ فَانتَظِرُوا إِنِّي مَعَكُم مِّنَ
الْمُنتَظِرِينَ ﴿٧١﴾ فَأَنجَيْنَاهُ وَالَّذِينَ مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا
وَقَطَعْنَا دَابِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ۖ وَمَا كَانُوا مُؤْمِنِينَ
﴿٧٢﴾

﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ﴾ وەئێمە ڕەوانەمان کرد بۆلای هۆزی عادی کوڕی عەوسی کوڕی ئیرەم کوڕی سام کوڕی نوح. برای پشتی خۆیان و لەڕەگەزی خۆیان هودی کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی ڕەماح کوڕی ئەلخلود کوڕی عاد کوڕی عەوس ،هود یەکەمین

کەسە گفتوگۆی بەزمانی عەرەبی کردوە، هود چوار کوڕی هەبوە: قەحتان، مەقحەت، قاحیت، فالیغ، یەمەنیەکان لەنەوەی قەحتانن، موزەریەکان نەوەی فالیغن، دووکوڕەکەی تری منالّیان نەبووە، گۆڕی هود لەیەمەنە. خاوەنی تەفسیری تەبەری ئەڵێ: عەلی کوڕی ئەبو تالیب فەرمویەتی گۆڕی هود لەیەمەنە. کەواتە ئەونوسینەی شیعەکان لەسەر گۆڕەکەی نوسراوە کە گۆڕی هود لای گۆڕی عەلیە پێویستە بکوژرێتەوە .

﴿ قالَ يٰاقَوْمَ اعْبُدُوا اللهَ مالَكُمْ مِنْ إلهٍ غَيْرُهُ ﴾ هود فەرموی: ئەی تاقمی من: ئێوە خوا بپەرستن بەتەنها و باوەڕتان هەربەخوا هەبێ. نیە بۆ ئێوە هیچ خوایە بپەرسترێ جگەی خوا، بتەکان شایستەی پەرستن نین .

﴿ أفَلا تَتَّقُونَ ﴾ ئایا داویی بۆ ئێوە لەسزای خوا ناترسن کەئێوە جگەی خوا بپەرستن ؟ ئەو ڕستەیە وامان فێر ئەکا کەگەلی هود ئاگاداری لافاوی کاتی نوح بون، چونکە نزیکبون لەوکاتە، بۆیە ئەفەرموێ: بۆ ئێوە لەسزای خوا ناترسن. بەلاّم گەلی نوح بەرلەوان گەلی تر توشی سزا نەبوون، بۆیە بەڕاشکاوی ناوی سزای گەورەی پێ ووتن.

﴿ قالَ المَلأ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ إنّا لَنَراكَ فِي سَفٰاهَةٍ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان بەخوا نەهێنابو لەپیاو ماقولاّن و بەڕێزەکانی تاقمەکەی هود ووتیان: بەڕاستی ئێمە تۆ ئەنیین لە نێو کەم ئەقڵێدا جێگەت گرتووە، چونکە تۆ واز لەئایینی خزمەکانی خۆت ئەهێنی .

﴿ وَإنّا لَنَظُنَّكَ مِنَ الكاذِبِينَ ﴾ وەبەڕاستی ئێمە گومانمان وایە تۆ لەوکەسانەی درۆزنن لەم داوایەتا ئەیڵێی: من نێرراوم لەلایەن خواوە .

بۆزانین: خزمەکانی نوح بەنوحیان ئەووت: ئێمە تۆ لەگومڕایی دا ئەبینین، گەلی هود ئەیان ووت: ئێمە تۆ لەنێو بێ ئەقڵێدا ئەبینین و گومانمان وایە تۆ لەدرۆزنەکانی، چونکە نوح کەشتی دروست ئەکر بەبێ دەریا و زەریا وڕوبار، ئەو کردەوەیە بەڕواڵەت نەزانین و گومڕاییە، بەلاّم هود هیچ شتێکی لەوبابەتە دروست نەئەکرد وڕوی ئەکردە گەلەکەی و

پیّی ئەووتن: ئێوە بیّ ئەقلن، ئەوانیش بەگوێرەی گفتوگۆی ئـەو وەلأمیـان ئەدایـەوە تـۆ گێلی، چونکە بەئێمە ئەلٚێی :بتەکان مەپەرستن ، بۆیە وەلأمی دانەوە:

﴿ قالَ ياقَوْمَ لَيْسَ بِي سَفاهَةٌ وَلكِنِي رَسُـولٌ مِـنْ رَبِّ العْـالَمِينَ ﴾ هـود فـەرموی: ئـەی خزمـانی خـۆم: بەمنـەوە نیـە کـەم ئـەقلّی و گێلـی، بـەلأم مـن نـــێرراوێکم لەلایـــەن پەروەردەکەری هەمو بونەوەران .

﴿ أبْلِغُكُمْ رسالاتِ رَبِي وَأنا لَكُـمْ نـاصِحٌ أمِـيْنٌ ﴾ مـن ڕائەگەیـەنم بـەئێوە پەیامـەکانی پەروەردەکەری خۆم، وەمن بۆ ئێوە ئامۆژگاری کەرێکی نیازپاك و هێمن و بیّ گەردم .

﴿ أعْجَبْتُمْ أنْ جاءَكُمْ ذِكْرٌ مِنْ رَبِكُمْ عَلى رَجُلٍ مِنْكُمْ لِيُنْذِرَكُمْ ﴾ ئایـا ئێـوە پێغەمـەران بەدرۆ ئەخەنەوە سەرتان سوڕئەمێنیّ کەهاتوە بۆلای ئێوە سروش لـەلایەن پەروەردەکـەری خۆتانەوە بۆ سەر پیاویّ لەڕەگەزی خۆتان بۆ ئەوەی ئێوە بترسێنیّ لەسزای و تۆڵەی خـوا لـەسەر بیّباوەڕی و بەدرۆخستنەوەی پێغەمەرەکان .

﴿ وَاذْكُرُوا إذْ جَعَلَكُمْ خُلَفاءً مِنْ بَعْدِ قَوْمِ نُوحَ وَزادَكُمْ فِي الخُلْـقِ بَسْـطَةً فَـأذْكُرُوا آلاءَ اللهِ لَعَلَكُمْ تُفْلِحُوْنَ ﴾ وەئێوە بیری چاکەی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە کـاتیّ خـوا گـەلی نوحی لەناوبرد و ئێوەی گێڕا بەجێگەداری ئەوان لەزەویدا وهەندیّ لەئێوەی کرد بەپاشـا وەك شەدادی کوڕی عاد کە ئاوەدانی ( ڕەملّی عالجبی هەتا دەریای عومانی داگیر کـرد ) لەدوای گەلی نوح، خوا لە دروست کردنتانا ئێـوەی زۆرکـردوە لەلـەش و لـە هێزتانـا کەواتە ئێوە بیری چاکەکانی خوا بکەنەوە کەئێوەی کردوە بە جێگەداری ئەوان و درێژی لەش و هێزی داوە پێتان، بۆئەوەی بیرکردنەوەتان ئێوە ڕابکێشـیّ بـۆ لای سوپاسـی خـوا کەئەبێتە هۆی ڕزگاربونتان لەسزای خوا .

﴿ قالُوا أجِئْتَنا لِنَعْبُدَ اللهَ وَحْدَهُ وَنَذَرُ ماكانَ يَعْبُدْ آباؤُنا ﴾ خزمەکانی هود ووتیان: ئایا تۆ هاتووی بۆلای ئێمە بـۆ ئـەوەی ئێمـە خـوا بپەرستین بەتەنـهاو ئێمـە وازبـهێنین لەشـتیّ باوکەکانی ئێمە ئەی پەرستن، ئێمە بەهیچ جۆریّ واز لەپەرســتنی بتـەکان نایـەرین. زۆر سەیرە لەسزا ئەمانترسێنیّ .

﴿ فَآتِنْا بِمْا تعدنا إنْ كُنْتَ مِنَ الصْادِقِينَ ﴾ دوایی تۆ بیهێنە بۆلای ئێمە شتیٚ تۆ بەڵێنی بەئێمە ئەدەی و ئەمانترسێنی بەهاتنی ئەوشتە ئەگەر تۆ لەڕاست ویژانی و درۆزن نیت کەسزای خوا دێتە خوارەوە بۆ سەر ئێمە. فروستاەی خوا بەگورجی وەڵامی دانەوەو فەرموی:

﴿ قالَ قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُمْ مِنْ رَبِكُمْ رَجْزُ وغَضَبٌ ﴾ هود فەرموی: بەڕاستی پێویست کراوە لەسەر ئێوە لەلایەن پەروەردەکەری خوتانەوە سزاو خەشم و تۆڵە سەندنەوە لەئێوە بەهۆی بیٚ باوەڕیتانەوە .

﴿ أتُجْادِلُونَني في أسْماءٍ سَمَيْتُمُوهْا أَنْتُمْ وَ أبْاؤُكُمْ مائزِلَ اللهُ بَهْا مِنْ سُلْطانَ ﴾ ئایا ئێوە دژایەتی من ئەکەن و ئەتانەویٚ سەربکەون بەسەر مندا لەبارەی ئەوناوانەوە ئێوە خۆتان وباوکوکانتان ناوتان ناون و بیٚ ناوەڕۆکن، خوا نەیناردوەتە خوارەوە بۆیان هیچ بەڵگەیە، هیچ هێزێکی پیٚ نەبەخشیون بۆ ئەوەی خاوەنی سودو زیان بن، فەرمانی نەداوە بۆ پەرستنیان. ئێوە خۆتان ناوێکتان بە هەریەکە لەو بتانە داناوەو کارێکتان بۆ دروست کردوون، ئەڵێن: هەیانە باران ئەبارێنن. هەندێکیانتان ناوناون پارێزەر، یانی ئاگاداریتان ئەکەن، هەندێکیان رۆزی دەر و ئاشتی دەرن بەگومانی خۆتان رۆزی و ئاشتی بەدەست ئەوانە، ئەوانە هەمویان ناوی بیٚ ناوەڕۆکن، ئێوە خۆتان وباوکەکانتان ناوتان ناون .

﴿ فَأنْتَظِرُوا إني مَعَكُمْ مِنَ الْمُنتظَرِيْنَ ﴾ دوایی ئێوە چاوەڕوانی هاتنە خوارەوەی سزایە بکەن، بەڕاستی من لەگەڵ ئێوەدا لەوکەسانەین چاوەڕوانی ئەو سزایە ئەکەین، ئەو ڕستەیە وەڵامی ئەو بیٚ باوەڕانەیە ئەیان ووت: ئادەی سزامان بۆ بهێنە .

﴿ فَأَنْجَيْناهُ وَالَّذيْنَ مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِنّا ﴾ دوایی ئێمە هودو کەسانێکی ئەوتۆ لەگەڵ ئەودا باوەڕیان هێنابو بەهۆی بەزەیی ومیهرەبانی لەلایەن ئێمەوە ڕزگارمان کردن لە سزای ئێمە.

﴿ وَقَطَعْنا دابِرَالَّذِيْنَ كَذَّبُوا بِآياتِنا وَ ماكانُوا مُؤمِنِينَ ﴾ وەئێمە لەناومان بردو بنەبڕمان کرد بنچینەو ڕاوێژکاری کەسانێکی ئەوتۆ کارە پەك خەرەکانی هوديان بەدرۆ ئەخستەوە و باوەڕیان بەخواو پێغەمەری خوا نەهێنابوو. خوای مەزن جۆری ئەوسزایە ناردیە خوارەوە بۆ سەر خزمەکانی هود کەلەناوی بردن لەئایەتی ( ٦ ) ی ئەلئەحقافدا ڕونی کردوەتەوە و ئەفەرموێ: وە بەلاّم خزمەکانی هود لەناو بردنیان بەهۆی بایەکی سارد و سەختی لەسنور دەرچووی بێ سود ماوەی حەوت شەو و هەشت ڕۆژ بەردەوام بوو .

وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْۖ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةًۖ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًاۖ فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦۚ قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ

مُؤۡمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِيٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٧٦﴾ فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٧٧﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٧٩﴾

﴿ وَإلى ثَمُودَ أخاهُمْ صالِحاَ ﴾ وەئێمە ڕەوانەمان کرد بۆلای هۆزی سەمودی کوڕی عامیر یا عابیر کوڕی ئیرەم کوڕی سام کوڕی نوح برای خۆیان و لەڕەگەزی خۆیان سالّح کوڕی عوبەید کوڕی ماسیخ کوڕی عوبەید کوڕی حازیر کوڕی سەمور ،ئەو هۆزە یەکێکە لە هۆزەکانی عەرەب کەبنە بڕبوون .

﴿ قالَ ياقَوْمَ اعْبُدُوا الله مالُكُمْ مِنْ إلهِ غَيْرَهُ ﴾ سالّح فەرموی کاتێ بەپەیامەوە ڕەوانەکرابو بۆ لایان: ئەی خزمانی من: ئێوە پێویستە خوای تاك و تەنها بپەرستن، نیە بۆ ئێوە هیچ خوایێ شایانی پەرستن بێ جگەی خوای تاك و تەنها .

﴿ قَدْ جاءَتْكُمْ بَيِنَةِ مِنْ رَبِكُمْ ﴾ بەڕاستی هاتوە بۆلای ئێوە نیشانەیەکی رون و ئاشکرا لەلایەن پەروەردەکەری خۆتانەوە کەئەو نیشانەیە ئاگاداری تەواو ئەدا لەسەر توانای خواو پێغەمەرایەتی من. لێرەدا یەکێ پرسیار ئەکاو ئەڵێ: ئەونیشانەیە چ شتێکە لەوەلآمدا؟.

﴿ قالَ هَذِهِ نَاقَةُ اللهِ لَكُمْ آيَةً ﴾ ساڵح فەرموی: ئەو نیشانەیە بریتیە لەهوشتری خوا، ناوبردنی ئەو هوشترە بە هوشتری خوا ئەمەمان نیشان ئەدا کەزۆر بەرێزە، چونکە خوای مەزن داوییەتیە پاڵ خۆی و لەلایەن خۆیەوە نێرراوە و بەس بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر توانای بێ وێنەی خواو ڕاستی پێغەمەرایەتی ساڵح .بەکورتی ئێمەی موسڵمان بڕوامان هەیە کەئەو هوشترە لەلایەن خواوە نەهاتوە بەبێ هویەکی ئاسایی و ناسراو لەوە زیاتر ناتوانین درێژە بەدروست بوونی بدەین، پێویستە ئێمە بڕوامان هەبێ کەئەو هوشترە نیشانەیەکی سەرسوڕێنەرە خوای مەزن پاڵی داوە بەخۆیەوە، بڕوایشمان هەیە بەهۆیەکی ئاسایی ئەو هوشترە پەیدا نەبوە وەك هوشترەکانی تر، ئێمە لەوە زۆرتر بۆی ناڵێین، چونکە بەهۆی نیگاوەو لەلایەن خوای مەزنەوەو پێغەمەرەوە هیچ هەواڵێکی بێگومان بۆ ئێمە دەست نیشان نەکراوە بۆ چۆنیەتی دروست بوونی ئەوهەرچەندە زانایان بۆ باسی ئەو هوشترە فەرمودەی زۆریان هەیە .

﴿ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرضِ اللهِ وَلاتَمَسُّوها بسوء يَأخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيْمْ ﴾ دوایی ئێوە واز لەو هوشترە بهێنن لەگژوگیای نێو زەوی بخوا، ئەو هوشترە هوشتری خوایەو لەزەوی خوایشدا ئەلەوەرێ و ئازارێ بەئێوە ناگەیەنێ و، ئێوە نزیکی ئەو هوشترە مەکەونەوە بەهیچ جۆرە ئازارێ: نەبەسەربڕین و نەبەلێدان و نەبەڕاونان و جگەی ئەوانەیش، دوایی توشی ئێوە ئەبێ سزایەکی زۆر گەورە بەهۆی ئازاردانی ئەو هوشترە، بەتایبەتی بەهۆی سسەربڕینیەوە، دوایی صالح فەرموی:

﴿ وَاذْكُرُوا إذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاءَ مِنْ بَعْدِ عادْ ﴾ وەئێوە بیری ئەو خۆشی و چاکەیە بکەنەوە کەخوا ئێوەی گێراوە بەجێگە داری دانیشتوانی سەرزەوی لەدوای لەناوبردن و بنە بڕکردنی گەلی عاد بەهۆی خراپەو گوناهی زۆریانەوە .

﴿ وَبَوَّأَكُمْ فِي الأَرْضِ تَتَخِذُونَ مِنْ سُهُولِهَا قُصُوراً وَتَنْتَحِيُونَ الجبالَ بُيُوتاً ﴾ وەخوا ئێوەی داناوە لەزەویدا، بەخشیوبە بەئێوە جێگەی خۆش ومناڵ وسامانی فراوان، ئێوە دروست ئەکەن لەدەشت و پانایی زەویدا چەندین کۆشك و خانوی بەرزو گەورە بۆ

کاتی هاوین و، ئێوە ئەتاشن بۆ خۆتان لەکێوەکان چەندین خانو بەتاشین و بڕینی بەردەکانیان بۆ کاتی زستان .

﴿ فَأذْكُروا ألاءَ اللهِ وَلا تَعْثُوا في الآرضِ مُفْسِدِيْنَ ﴾ دوایی ئێوە بیری چاکە و خۆشیەکانی خوا بکەنەوە، خوا ڕژاندی بەسەرتانا لەجێگیر کردنتان لەسەر زەوی و بەخشینی سامانی زۆر و، ئێوە لەسنوری خوا دەرمەچن و خراپە بلاّ ومەکەنەوە لەزەویدا و کاول کاری بۆ خۆتان مەسازێنن .

بەکورتی کاتیٚ گەلی عاد لەناوچون بەهۆی کردەوەی خراپ و ستەم و گوناهەوە ، لەدوای ئەوان گەلی سەمود شارەکانی سەر زەویان ئاوەدان کردەوە ، خوای مەزن تەمەن درێژی و سامان زۆری پیٚ بەخشین لەجیاتی ئەوەی سوپاسی خوا بکەن دەستیان کرد بەبلاّوکردنەوەی خراپە و ستەم و بت پەرستن، خوای گەورە سالّحی پێغەمەری بۆ ناردن بۆ گەڕانەوەیان لە بت پەرستی، ئەو گەلە عەرەب بوون و سالّح لەخۆیان بوو کەچی جگە لەتاقمێکی هەژار و بیٚ دەسەلاّت کەسیان دوای نەکەوتن، سالّح ترساندانی لەسزاو خەشمی خوا، گەلەکەی بیانویان پیٚ گرت و داوایان لێی کرد لەبەردێکی دیاریکراو هوشتریٚ بێتە دەرەوە، دوایی هوشتریٚ بەگوێرەی داواکەیان لەو بەردە هاتە دەرەوە، تاقمێکی هەژار باوەڕیان پیٚ هێنا، تاقمە سامانداەکان باوەڕیان پیٚنەهێنا، وەك خوا ئەفەرمویٚ :

﴿ قالَ المَلآ الَذِيْنَ أسْتَكْبَرُوا مِنْ قَوْمِهِ لِلَذِيْنَ أسْتَضْعِفُوا لِمَنْ آمَنَ مِنْهُمْ ﴾ تاقمە ماقولّ و بەرێزەکانی ئەوتۆ خۆیان بەگەورە دائەنا و سەرکێشبون لەخزمەکانی سالّح لەسامانداەکانیان و باوەڕیان نەهێنابو ووتیان بەکەسانێکی ئەوتۆ بەلاوازو هەژاریان ئەژماردن و ئەچەوسێنرانەوەکەبریتی بون لەهەندیٚ لەوانەی باوەڕیان هێنا لەهەژارەکان: یانی سامانداری خزمی سالّح بون بە دوو بەشەوە: بەشێکیان باوەڕیان هێنا، بەشیٚ تریان چاویان لەسامانداەکان کرد باوەڕیان نەهینا، ئەو تاقمە سامانداە بەهەژارە باوەڕدارەکانیان ووت بەگالّتە پیٚ کردنەوە :

﴿ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَالِحاً مُرْسَلٌ مِنْ رَبِّهِ ﴾ ئایا ئێوە ئەزانن بەڕاستی سالّح نێرراوە لەلایەن پەروەردەکەری خۆیەوە، ئەوەشیان بەڕاستیەوە نەئەووت لەپرسیارەکەیاندا .

﴿ قالُوا إِنا بِمَا أُرْسِلَ إِلَيْهِ مُؤمِنُونَ ﴾ هەژارەکان ووتیان لەوەلاّمیانا: بەڕاستی ئێمە بەشتێ سالّحی پێوە نێراوە بڕوامان هەیە، ئەوەیان ئەوت و لەهەڕەشەو گالّتە پێکردنی بێ باوەڕان نەئەترسان، چونکە لەسەر بڕوای تەواو وبێ گومان بون بەئایینی خۆیان و بڕوایان بەکاری خۆیان هەبو .

﴿ قالَ الَّذِيْنَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا بِالَّذِي آمَنْتُمْ بِهِ كافِرُونَ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ خۆیانیان بەگەورە ئەزانی و باوەڕیان بەخواو پێغەمەری خوا نەهێنابوو ووتیان: بەڕاستی ئێمە بەشتێکی ئەوتۆ ئێوە باوەڕتان پێ هێناوە بێ باوەڕین، سەربارەی ئەوەیش بەلّگە و نیشانەی زۆر هەبون لەسەر پێغەمەرایەتی سالّح، چونکە ئەوان سودی تایبەتی خۆیانیان لەسەرەوەی هەمو ئاینێکی ئاسمانیەوە دائەنا، ناوەڕۆکی ئەو ئایەتە گەورەترین شتێکە بکرێ بەبەلّگە لەسەر ئەوەی خۆ بەگەورە دانان بەزۆری لەسامانی فراوان و پلەوپایەوە پەیدا ئەبێ، چونکە ئەو سامانە فراوانە وایان لێ ئەکا یاخی بن و باوەڕ نەهێنن و دەست بدەنە ستەمکاری .

﴿ فَعَقَرُوا النَاقَةَ وَعَتوا عَنْ أمْرِ رَبِهِمْ ﴾ دوایی گەلی سالّح لەبێ باوەڕان هوشترەکەیان سەربڕی و لەفەرمان و ڕاسپاردەی پەروەردەکەری خۆیان دەرچون کە ئەو هوشترە بپارێزن و ئازاری نەدەن ئامۆژگاری سالّحیان خستە پشت گوێ و بەدزییەوە هەلّسان و شاراوەی دەرونی پیسی خۆیانیان دەرخست، ڕون بویەوە کە جگە لەسودی تایبەتی خۆیان هیچ شتێ تریان ناوێ، بەگالّتەوە داوایان لەسالّح کرد ئەگەر ڕاست ئەکەی باسزا بێتە خوار بەسەر ئێمەدا .

﴿ وَقالُوا يَاصَالِحَ ائْتِنا بِمَا تَعِدُنا إِنْ كُنْتَ مِنَ الْمُرْسَلِيْنَ ﴾ وەخزمانی بێ باوەڕانی سالّح ووتیان: ئەی سالّح: تۆ بیهێنە بۆ ئێمە شتێ تۆ بەلّێنت پێ داوە لەسزاو هەڕەشەی ئێمەی

پێوەئەکەی ئەگەر تۆ لەوکەسانەی ڕەوانەکراوی خوان وخوا یاریدەی نێرراوەکانی ئەداو بەدرۆیان ناخاتەوە، ئەوکەسانە هەرشتێ سالّح هەوالّی پێ بدا بەدرۆیان ئەخستەوە، خوای مەزن مۆلّەتی دان بۆ ماوەیەك، دوایی کوت وپڕ سزای نارده خوارەوە بۆ سەریان، وەك خوا فەرموی :

﴿ فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةَ ﴾ دوای کوشتنی هوشترەکە دەنگێکی زۆرگەورە زەوی لەرزان و بو بەهۆی بومەلەرزەیەکی سەخت دانیشتوانی خستە پەلەکوتێ و لقەفرتێ زۆر بەگرانی وسامناکی. ئەو دەنگە خوا پەیدای کرد بەهۆی لەیەکدانی دووهێزی کارەبایی لەدژی یەکتری دا لەساردو لەگەرم .

﴿ فأصبَحُوا في دارِهِمْ جاثِمينَ ﴾ دوای ئەو تاقمە بێ باوەڕەی سالّح لەخانوەکانی خۆیانا گەڕان بەمردو هەمویان لەناوچون و جولّەیان لێی بڕا بەبێ گفتوگۆ مانەوە .

﴿ فَتَولى عَنْهُمْ ﴾ دوایی سالّح وازی لەخزمەکانی خۆی هێنا و پشتی تێ کردن و ڕۆیشت بەخەفەتەوە و خۆی لەپاشەڕۆژی ئەوان دورخستەوە کەتوشیان بو بەهۆی کوشتنی ئەو هوشترەوە.

﴿ وَقالَ ياقَوْمَ لَقَدْ أبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّيْ وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلكِنْ لاتُحِبُونَ الناصِحِيْنَ ﴾ وەسالّح لەڕوی خەفەتەوە فەرموی: ئەی خزمانی خۆم بەڕاستی من بەئێوەم گەیاند پەیامی پەروەردەکەری خۆم وەمن ئامۆژگاری ئێوەم کرد لەکاتی خۆیا، بەلاّم ئێوە منتان بەدۆستی خۆتان دانەناو خۆشتان ناوێ کەسانێ ئامۆژگاری ئێوە بکا بۆ گرتنی ڕێگەی چاك و دورتان بخاتەوەە لەخراپە.

وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ

شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿٨١﴾ وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٨٤﴾

﴿ ولُوطًا ] وەئیمە ڕەوانەمان کرد لوتی کوڕی هاران کوڕی ناحور و برازای ئیبراهیم، لوت لە ئوڕی پایتەختی کلدانیەکان لەدایکبو، ئەوشارە کەوتوەتە لای ڕۆژهەلاٌتی باشوری رۆژئاوای عیراق لەپارێزگەی بەسرە ئەو جێگەیە ناوئەبرێ بەزەوی بابول ودوایی لەگەڵ ئیبراهیمی مامی چۆن بۆ نێوان زەوی (مابین النهرین ) کەجێگەیەکە ڕوباری دیجلە دەورەی داوە لەو جێگەیەکە وولاٌتی ئاشور بوە، ،دوایی ئیبراهیم لوتی لەرۆژهەلاٌتی ئەردەن دانا .

﴿ إِذْ قالَ لِقَوْمِهِ أَتَأْتُونَ الفاحَشَةَ ماسَبَقَكُمْ بِهٰا مِنْ أَحَدٍ مِنْ العٰالَمْينَ ﴾ ئەوکاتەی لوت بەگەلەکەی خۆی فەرمو کە دانیشتوی شاری سەدوم بون، خوا ڕەوانەی کردبو بە پێغەمەرایەتی بۆلایان بانگی کردنٌ بۆلایٌ پەرستنی خواو بەوانی فەرمو: ئایا ئێوە بۆ ئەو کارە پیسە بێزلێکراوە ئەکەن، ئەو کارەیش ئەوەبو لەپشتەوە ئەچونە لای پیاوان ،یانی نێربازی یان ئەکرد ووتی: پێشی ئێوە نەکەوتوە بۆ کردنی ئەو کارە پیسە بێزلێکراوە هیچ کەسێ لەبونەوەران، ئەو ڕستەیە بەڵگەیە لەسەرئەوەی کەگەلی لوت یەکەمین گەلێ بوون ئەو جۆرە کارە پیسەیان پەیدا کردوە، ئەو کردەوە بێزلێکراوە ئەمەیە کەخوا ئەفەرموێ:

﴿ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِجَالَ شَهْوَةً مِنْ دُونِ النِسْاءَ ﴾ ئێوە ئەو کارە بێزلێکراوە ئەکەن لەگەڵ پیاوان هەرلەبەر ئارەزووی ئاژەڵی خۆتان لەجگەی ژنان کەڕەوایە ئەو کارە بکرێ لەگەڵیان لەپێشەوە، یانی پشتەوەی پیاوان لای ئێوە خۆشترو بەتامترە لەپێشەوەی ژنان. مەبەست لەو ئارەزویە چونە لای پیاوانە لەجگەی ژنان کەکارێکی بەکەس نەکردەبوە بەبێ هۆیە جگەی کوژانەوەی کاری ئاژەڵی کەپیشەی هەندێ لەچوارپێکانە.

﴿ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ مُسْرِفُونَ ﴾ بەڵکو بەڕاستی ئێوە تاقمێکن لەسنوری دیاری کراوی خواو دەستوری ئادەمیزاد دەرچوون، گەیشتونەتە ڕادەیەك کارێ ئەکەن سروشت ئەی بێزێنێ و دژی دەستوری ژیان و پەرەپێدانی ئادەمیزادە، لەکاری ڕەوا لائەدەن بۆ لای کاری نارەوا .

﴿ وَماكانَ جَوابَ قَوْمِهِ إِلا أَنْ قالُوْا أَخْرِجُوهُمْ مْنْ قَرْيَتَكُمْ ﴾ وەتاقمەکەی لوت وەلامێکیان نەبو لەوکاتەدا سەرزەنشتی ئەکردن لەسەر کردنی ئەو کارە خراپە و لەپەلاماردانیان بۆ ئەو شتە خوا قەدەغەی کردبو مەگەر کەئەیانووت هەندێ لەدانیشتوانی شاری سەدوم بەهەندێ تریان: ئێوە دەربکەون و ڕاوبنێن لوت و کچەکانی ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە لەگوندو شارەکەی خۆتان .

﴿ أَنَهُمْ أُناسٌ يَتَطَهَرُونَ ﴾ بەڕاستی لوت و تاقمەکەی ئادەمیزادێکن خۆیان بەپاك ئەگرن لەکردنی کاری بێزلێکراوە یانی لەکردنی ئەوکارەدا لەگەڵ ئێمە نین. بەڵێ زۆر ڕاستە داوێن پاکی و خۆپاراستن لە کردەوەی خراپ لای داوێن پیس وخراپەکەران ودەست پاکی تاوانە لای بەکرێ گیراوو خوێن مژان، هەروەها هەمو کۆمەڵێ خراپ وکردەوە پیسبن پیاوچاکان و پیاوانی سروشت پاکیان ناوێ، لەبەر هیچ شتێ نیە جگەی ئەوەی پاك و چاکەکەرن .

﴿ فَأَنْجَيْناهُ وَأَهْلَهُ إِلا إِمْرَأَتُهُ كانَتْ مِنَ الغابِرِينَ ﴾ دوایی ئێمە لوت و خێزانەکەی لەکچەکانی وباوەڕداران ڕزگارمان کردن مەگەر ژنەکەی لوت کەلەژێرەوە بێ باوەڕبوبەیەکێ لەو کەسانە لەگوندەکەدا مانەوەو لەگەڵ دانیشتوانی تردا لەناوچون.

یانی ژنەکەی لوت کەناوی (واهیلە ) بو هاوڕێیەتی نەکردن لەشەو ڕەویدا بـۆ هەڵـهاتن لەتوشبونی سزای خوا، چونکە ئەو ژنە دوو روی و فێڵی لەلوت کردبو بـۆ سـودی بـێ باوەڕان، بۆیە توشی سزابو لەگەڵ بێ باوەڕان و هاوڕێیتی پێغەمەری خوا هیچ سودێکی پێ نەبەخشی و توشی سزا بوو .

﴿ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ مَطَراً فَأَنْظُرْ كَيْفَ كانَ عاقِبَةُ الْمُجْرِمِيْنَ ﴾ وەئێمە بارانمان بەسەر گـەلی لوتا بارانێ چ بارانێ بریتی بو لەبارینی بەردی گۆگرد بەسەریانا نەك بارانێ بریتی بـێ لـە ئاو، وەك لەمەوپاش لەئایەتی ( ٨١) ی سورەتی هودا خوا باسـی ئەفـەرموێ: دوایـی تـۆ تەماشا بکەو بنواڕە چۆن بو پاشەڕۆژی تاوانباران .

پرسیار/ بەڕاستی هەمو یەکێ لەنوح و هود وسالح بانگی گەلی خۆیانیان ئەکرد بۆلای پەرستنی خوای تەنها. بەلاّم لوت بـانگی گـەلی خـۆی کـرد بـۆلای وازهێنـان لـەوکارە بێزلێکراوە، دوایی ئایا گەلی لوت خوایان بەتەنها داناوەو بەلاّم لەسنورلایان داوە بـەهۆی کردنی ئەو کارە بێزلێکراوە ؟

وەلاّم/ بەڕاستی گەلی لوتیش بێ باوەڕبوون، داوای لێکردون بۆلای یەکێتی، قەدەغەی کردوە لەوان بێ باوەڕی و هاوبەشـدانان بـۆ خـوا، هـەروەك قەدەغـەی کـردوە لـەوان نێربازی، بۆ ڕون کردنەوەی ئەو مەبەسـتە تەماشـای مانـای ئایـەتی (١٦٣) ی سـورەتی شوعەرا بکە، بـەلاّم لـوت گرنگـی داوە بـەو کـارە خراپـە. چونکـە پـەرەی سـەندبوو لەنێوانیاندا و سەری ئەکێشا بۆ لای هەمو خراپەیـە، پـاڵی پێوەنـان لـەخوا یـاخی بـبن و پێغەمەران و نێرراوانی خوا بە درۆ بخەنەوە .

بۆ زانین: هەمو زانایانی ئیسلام بەتێکڕایی پێك هاتوون لەسەرئەوەی نێربازی قەدەغەیە یەکێکە لەگوناهە گەورەکان، بەلاّم لەسزادانی نێربـازی و سـنورەکەی بیریـان جیـاوازە، پێشەوا حەنەفی ئەفەرموێ: سزاکەی تەمیٚکردن بەشتی دادوەر بەشییاوی بزانێ بەجگـەی کوشتن. زانایانی تر لایان وایە سزاکەی کوشتنە ئیتر بە بـەردەباران بـێ یـا بـە شـتێ تـر، هـەردوولای کردەوەکـەرو کردەوەلەگـەڵ کـراودا لـەو سـنورەدا یەکسـانن ئەگـەر

هەردوولایان گەورەبن، پێشەوا شافیعی ئەڵێ: سنوری سزای نێربازی وێنەی داوێن پیسی‌یە لەگەڵ ژنان .

ڕژێمی پیسی بەریتانیا نێربازی لایان ڕەوایە بەگوێرەی یاسای دەست کردی خۆیان بەهۆی دەنگدانی ئەنجومەنی گشتی بەریتانیا لەساڵی (١٩٦٧) زایینی، ڕۆژنامەی (الاهرامی ) میسری ئەو هەواڵەی بڵاوکردەوە لەڕۆژی ٦ / ٩/ ١٩٦٧. ڕۆژنامەی ( تایمزی ) بەریتانیای لەندەنی نوسی کەکۆمەڵێ لەدانیشتوانی پەرلەمان لەپێش چاوی ئەو کۆڕەدا ئەو کارە نالەبارەیان لەگەڵ یەکتری کرد، کۆڕەکەیش بەدانیشتنی هەندێ لەژنان ڕازێنرابووەوە، کۆمەڵێ لەگەورە پیاوان لەئینگلتەرەدا کۆڕێکی پێ خۆشبونیان لەو بارەیەوە پێك هێنا. بەگوێرەی تاقیکردنەوەی زۆرکەس ئەو کارە ناهەموارە لەزۆربەی ڕژێمەکانی ڕۆژئاوادا کراوە بەیاسا ڕەوابونی ئەو کارە .

وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ فَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨٥﴾ وَلَا تَقْعُدُوا۟ بِكُلِّ صِرَٰطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا ۚ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا فَكَثَّرَكُمْ ۖ وَٱنظُرُوا۟

كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨٦﴾ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ فَٱصْبِرُوا۟ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَا ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨٧﴾

﴿ وَإِلَى مَدينِ أخَاهُمْ شُعَيْباً ﴾ وەئێمە ڕەوانەمان كرد بۆلای منالەكانی مەدیەنی كوڕی ئیبراهیم برای خۆیان شوعەیبی كوڕی میكیل یا سووەیب كوڕی بەشحور كوڕی مەدیەن، ئەو هۆزە عەرەب بوون دانیشتووی زەوی مەعان لەكەناری شام و باكوری حیجاز، ساماندار بون و بەبازرگانیەوە خەویك بون. بەلام بت پەرست بوون، لەكێشانە وپێوانەدا زۆریان بۆ خۆیان ئەهێنا و كەمیان ئەدا بە جگەی خۆیان لەمامەڵەدا، لەگوناهەكانی تریشدا خۆیانیان نەئەگێڕایەوە، شوعەیب بەزمانی سیریانی، بەمانا ( پیرۆزە ) ناوی دایكی میكائیلی كچی لوت بوە، شوعەیب ناوی دەركردوە بەخوتبە خوێنی پێغەمەران .

﴿ قَالَ يٰاقَوْمَ اعْبُدُوا اللهَ مالَكُمْ مِنْ إلهٍ غَيْرُهُ قَدْ جاءَتْكُمْ بَيْنَةً مِنْ رَبكُمْ ﴾ شوعەیب فەرموی ئەی تاقمی من: ئێوە هەر خوا بپەرستن بەتەنها، نیە بۆ ئێوە هیچ خوایێ شایانی پەرستن بێ جگەی خوا، بەڕاستی هاتوە بۆلای ئێوە بەڵگەیەكی پەكخەر و ڕون و ئاشكرا لەلایەن پەروەردەكەری خۆتانەوە، هەرشتێ ڕاستیەكی پێ ڕون بێتەوە پێی ئەوترێ : بەڵگەی ئاشكرا، ئیتر ئەو بەڵگەیە ئەقڵ بێ یا كارێكی تری نائاسایی پەكخەر بێ. گومانی تێدانیە شوعەیب بەبەڵگەیەكی ڕوونی پەكخەرەوە چوە بۆلای گەلەكەی خۆی، بەلام دەقێكی دیاری كراوی بۆ دەست نیشان ناكرێ لەقورئاناد، دیاری كردنی ئەو بەڵگەیە بەگۆترە كاریە و بەدرۆ ئەدرێتە پاڵ خوای مەزن .

﴿ فَأوْفُوا الكَيْلَ وَالمِيْزانَ ﴾ دوایی ئێوە تەواو بكەن پێوانە وكێشانەكانتان و بەیەكسانی كاریان پێ بكەن بۆ خۆتان وجگەی خۆتان، ئامێری پێوانەو كێشانەتان یەكبێ، ڕەوشتی ئەو گەلە بەجۆرێ بو پێوانە و كێشانەیان كەم و كوڕی تێدائەكرا بەزۆربردن بۆخۆیان و كەمدان بەجگەی خۆیان .

﴿ وَلاتَبخسُوا الناسَ أشْياءَهُمْ ﴾ وەئێوە مافی ئادەمیزاد کەم مەکەنەوە لە پێوانەو کێشانەدا، ئەو ڕستەیە وامان پیشان ئەدا کەئەو گەلە لەکڕین و فرۆشتندا مامەڵەیان ناڕەواو نالەباربوو، ئەو ڕەوشتە لەناویانا بەفراوانی بڵاو بوبوەوە، بۆیە خوای مەزن فەرمانی پێدان پێوانەو کێشانەیان تەواو بێ و کەم وکوڕی تێدانەبێ، پاش ئەوەیش خوا فەرمانی پێدان خوا بەتەنها دابنێن، دوای ئەوانەیش فەرمانی پێدان مافی ئادەمیزاد کەم نەکەنەوە، نرخی شتەکانیان دانەبەزێنن، ئیتر لەبارەی کڕین و فرۆشتنابێ لەبارەی ڕەوشت وزانیارییەوە، یانی تاوانج نەگرنە کەس ونەڵێن بەهیچ کەسێ: نەزان و دەست پیس و دەست بڕ، بەهیچ کەسێکا هەڵنەشاخێن، هەتادێ..

﴿ وَلاتُفْسِدُوا فِي الارْضِ بَعْدَ إصْلاحِهَا ﴾ وەخراپە بڵاو نەکەنەوە لەنێو زەویدا بەبێباوەڕی و دەست بڕین و کەم کردنەوەی پێوراو وکێشراو بڵاو کردنەوەی گوناهانی تر لەدوای چاك و پاك کردنەوەی زەوی بەهەرزانی و ئاوەدان کردنەوەی بەکشت و کاڵ و ڕاغویی کردنی ئادەمیزاد بۆ پەیڕەوی کردنی پێغەمەران و کارکردن بە ناوەڕۆکی نامەی خوا کە پڕە لەئامۆژگاری. لەباسی مانای ئایەتی (٥٦) ی ئەم سورەتەدا مانای ئەو ڕستانە تێپەڕیوە .

﴿ ذٰلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إنْ كُنْتُمْ مُؤمِنِينَ ﴾ ئەو کردەوانە ڕابوردن، وەك پەرستنی خواو تەواوی پێوانەوکێشانە و کەمکردنەوەی مافی ئادەمیزاد وبڵاونەکردنەوەی خراپەو گوناه چاکترە بۆ ئێوە لەوشتانە ئێوە لەسەرینی، وەك بێ باوەڕی وستەم کردن و زەوت کردنی مافی ئادەمیزاد، ئەگەر ئێوە باوەڕداربن و بەنیازی پاکەوە باوەڕتان هێنابێ .

خزمەکانی شوعەیب ڕێگەیان ئەبەست لەهاتوچۆکەران بۆ ناو شارەکەی خۆیان و ئەیان ترساندنلەوەی پەیوەندی بکەن بەشوعەیبەوە، ئەیان ووت: بڕوا بەشوعەیب مەکەن چونکە درۆزنە. خوای مەزن ئەو کارانەی قەدەغەکرد لەوان و فەرموی :

﴿ وَلاتَقْعِدُوا كُلَ صِراطٍ تُوعِدُونَ ﴾ وەئێوە دامەنیشن لەسەر هەمو ڕێگەیە بۆ لێ فڕاندنی دارایی دانیشتوان بەناڕەوایی هەڕەشەیان لێی بکەن، پەیوەندی بەشوعەیبەوە لەوان قەدەغەبکەن .

﴿ وَتَصدُونَ عَنْ سَبِيْلِ اللهِ مَنْ آمَنَ بِهِ ﴾ وەئێوە دامەنیشن لەسەر هەموو رێگەیە ئێوە قەدەغە بکەن لەرێگەی خوا کەسێ باوەڕی هێناوە بەو رێگەیەو بەو ئاینەی خوا .

﴿ وَتَبْغُونَهَا عَوَجَاً ﴾ وەداوا بکەن لەبۆ رێگەی خواو بڵێن: رێگەی خوا خواروخێچ ونارێکە، باسی ئەو رێگەیە بکەن لای دانیشتوان بەدژی خۆی و بەجگەی ئەو شێوەیە خوا ڕونی کردوەتەوە .

ئەو ئایەتە هەتا ئێرە ڕوونکردنەوەی مانای ڕستەی ( وَلا تُفْسِدُوا فِي الارْضِ ) یە یانی ئێوە وازبهێنن لەئادەمیزاد بۆ خۆیان بژین، قەدەغە مەکەن لەوان دروشم و یاسای ئایینەکەیان بەجێی بێنن و ڕای وەستێنن، رێگەیان لێی مەگرن بڕۆن بەرێگەی ڕاستا بۆلای ئایینی خوا، هەوڵ مەدەن ئادەمیزاد بخەنەسەر رێگەی خواروخێچ، شاگردی ئەو گەلە خراپانە لەم سەردەمەی ئێمەدا زۆرن .

﴿ وَأذْكُرُوا إذْكُنْتُمْ قَلْيْلًا فَكَثَرْكُمْ ﴾ وەئێوەی گەلی شوعەیب بیری چاکە ومیهرەبانی خوا بکەنەوە بەئێوەی بەخشیوە کاتێ ئێوە کەم بون لەلایەن ژمارەو چەکتانەوە و هەژاربون، دوایی خوا ئێوەی زۆرکردو دای پێتان دارایی وسامان و چەك ومناڵ، لەوەوپێش هەژاربون، هێزداری کردن دوای بێ هێزیتان، کەواتە پێویستە لەسەرتان خوا پەرستی بکەن و سوپاسی بکەن.

﴿ وَأنْظُرُوا كَيْفَ كانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِيْنَ ﴾ دوایی ئێوە تەماشابکەن و بنوارن چۆن بوە کۆتایی و پاشەڕۆژی تاقمە خراپەکارەکانی گەلانی ڕابوردو، ئەگەر ئێوەی گەلی شوعەیب سوپاس وپەرستنی خوا پیادەنەکەن ئەو نەگبەتی و سزاو لەناوچونە توشی ئەوان بو لەمەوبەر توشی ئێوەیش ئەبێ. بەتایبەتی گەلی لوت زۆر لەئێوەوە نزیکەو خۆتان ئەزانن بەردە باران کران .

﴿ وَإن كانَ طائِفةٌ مِنْكُم آمَنوُا بالَذي اُرْسِلْتُ به وطائِفَةٌ لَمْ يُؤمنوا ﴾ وەبەڕاستی کۆمەڵێ لەئێوە باوەڕیان هێناوە بەشتێکی ئەوتۆ منی بۆ ڕەوانە کراوە ڕای گەیەنم و بڕوایان بەپێغەمەرایەتی من هێناوە و گفتوگۆی منیان پەسەندکردوە، کۆمەڵێ تریان باوەڕیان نەهێناوە بەمن. یانی دانیشتوانی مەدیەن هەندێکیان باوەڕیان هێنابوبە شوعەیب،

هەندێکیان باوەڕیان نەهێنابو، ئەم تاقمەی دوایی ئەیان ووت: هێزو سامان بۆ ئێمەیە نەك بۆ باوەڕداران، کەواتە ڕاستی لای ئێمەیە، ئەگەر باوەڕداران ڕاستی لای ئەوان بوایە ساماندار و خاوەن دارایی بونایە. بەئەقڵی تەواوی خۆیان وایان ئەزانی ڕاستی ئەبێ لای سامانداربێ. وەك ئەم ڕۆژەی ئێمە، زۆربەی دانیشتوان واتێ گەیشتون، شوعەیب لەوەلامیانا فەرموی: لەبەرئەوەی ئێوە بوون بەدووپارچە .

﴿ فَاصْبِرُوا ﴾ دوایی ئێوە ئارام بگرن وچاوەڕوان بکەن هەردولاتان و بەئاشتیەوەو بەبێ ئاژاوە بژین بەیەکەوەو واز لەیەکتری بهێنن ،هەریەکەتان بۆ خۆتان کاربکەن، هیچ لایەکتان دەست درێژی مەکەنە سەریەکتری و ئازاری یەکتری مەدەن .

﴿ حَتى الحِكْمَ اللهُ بَيْنَنا وَهُوَ خَيْرُ الْحاكِمِيْنَ ﴾ هەتا خوا فەرمان ئەدا لەنێوان ئێمەدا، بەسەرکەوتنی ئەوکەسانەمان کاری ڕەوایان وەرگرتوە بەسەر ئەوکەسانەدا دوای کاری پڕوپوچ وستەمکاری کەوتون، ئەو ڕستەیە موژدەدانە بەباوەڕداران و هەڕەشەیە لەبێ باوەڕان و، خوا چاکترینی هەمو دادوەرانە، چونکە فەرماندانی خوا ڕاستەو لایەنی کەس ناگرێ، مەترسی لەفەرماندانیانا پەیدانابێ و دادپەروەرە، پاداشت و تۆڵە لای خوا بەگوێرەی کردەوەی شایستەی ئادەمیزادە. دانیشتوانی ڕۆژهەلاتی ناوەند گیرۆدەی بێ ڕەوشتی دانیشتوانی ڕۆژئاوابون ودەستەمۆی کردەوەیان بون، لەژێرەوە نیشتمانەکانیان داگیر کردون، گاڵتە بەئایینیان ئەکەن و نرخیان بۆ دانانێن، واز لەڕەوشتی بەنرخی باوباپیریان ئەهێنن، خۆیان بەزۆڵ دائەنێن و یەخەلەباوباپیری خۆیان هەڵئەتەکێنن، ڕۆژئاوایان کردوە بەچاولێکراو و گەورەی خۆیان لەبەرگ ولەزمان وبەرەڵاییدا، فەرمانڕەواو موچەی خۆیانیان لا بێ نرخە. بێگانە پەرستن و ڕێزیان لێ ئەگرن ئەگەر چی نەزانیشن، ئەمانەی ئەم سەردەمەی ئێمە زۆر خراپترن لەگەلانی نوح و لوت و هود و شوعەیب، چونکە ئەوکردەوە خراپەی ئەوان هەیان بوە بەزۆری لەمانەی ئەم سەردەمەی ئێمەدا هەیانە. گوناهی وا ئەکەن ئەوانەی پێشو ڕێگەیان پێ نەبردوە وئەوپەڕی بەرەڵاییان دەست داوەتێ .

سوپاس بۆ خواو بەیارمەتی خوا جزمی هەشتەم کۆتایی پێ هات ،لەسەرەتای جزمی نۆهەمدا پاشماوەی بەسەرهاتی شوعەیب و گەلەکەی باس ئەکەین
ئەمڕۆ ڕێکەوتی (٣) ی مانگی ڕەبیعی یەکەم ساڵی (١٤٢٠) ی کۆچی
بەرانبەر ١٦/ ٦/ ١٩٩٩ زایینی

تەفسیری زمناکۆیی

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. سوپاسی بێ پایان بۆ خوای هەمو بونەوەران. درودی بێ ئەندازە لەسەر پێشەوای ئادەمیزاد پێغەمەری ئیسلام و لەسەریارو یاوەران و پەیڕەوانی بێ.

قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرۡيَتِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۚ قَالَ أَوَلَوۡ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴿٨٨﴾ قَدِ ٱفۡتَرَيۡنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنۡ عُدۡنَا فِي مِلَّتِكُم بَعۡدَ إِذۡ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنۡهَاۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَاۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَاۚ رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا بِٱلۡحَقِّ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ ﴿٨٩﴾

لەمەپێش باسمان کرد کەشوعەیب بانگی ساماندارە بێ باوەڕەکانی کرد بۆلای ئەوەی بەئاشتی بژین لەگەڵ باوەڕدارانا و واز لەیەکتری بهێنن، هەمو کەسێ سەربەستبێ بەئارەزووی خۆی بچێتە نێو هەر ئاینێ کەئەیەوێ. بەلأم ساماندارەکان هەرچەندە داواکاری شوعەیبیان وازلێ هێنا، بەوەیشەوە نەوەستان شوعەیبیان تەرخان کرد لەنێوان دووشتا وبەس، یاخۆی و ئەوانەی لەگەڵ ئەون دەربکرێن لەگوندەکەیاندا یابگەڕێنەوە خۆی وئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە بۆلای بێ باوەڕی و بت پەرستی، بۆلای ڕەوشت و خۆی پێشەوە بەرلەپێغەمەرایەتی ،وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَقالَ المَلآ الَّذِيْنَ اسْتَكْبَرُوا مِنْ قَوْمِهِ لَنخرُجَنَكَ ياشُعَيْبُ وَالَّذِيْنَ آمَنُوا مَعَكَ مِنْ قَرْيَتَنا ﴾ وەپیاو ماقوڵ و ساماندارەکانی ئەوتۆ داوای گەورەییان ئەکرد لەتاقمەکانی ووتیان:

بەڕاستی ئێمە ئەی شوعەیب: تۆ وکەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە لەگەڵ تۆ یادەرتان ئەکەین لە گوندەی ئێمە .

﴿ أوَلَتعُودُنَ فِيْ مِلَتِنا قالَ أوَلَوْكُنّا كارِهِيْنَ ﴾ یابەڕاستی ئەبێ ئێوە بگەڕێنەوە بۆ لای ئایینەکەی ئێمە و لەئایینی خۆتان پەشیمان ببنەوە. شوعەیب ووتی: ئێمە چۆن ئەگەڕێینەوە بۆلای ئایینی ئێوە، ئێمە بێز لەئایینەکەتنا ئەکەینەوە، ئێمە ناگەڕێینەوە بۆلای ئایینی ئێوە، با ئێوە ئێمەتان خۆش نەوێ و زۆریشمان لێ بکەن ؟

﴿ قَدْ إفْتَرَيْنا عَلى الله كَذِباً أنْ عُدْنا في مِلَتَكُمْ بَعْدِ إذْنَجانا الله مِنْها ﴾ بەڕاستی ئێمە دروست ئەکەین و هەڵئەبەسین درۆ وبوختان و ئەیدەین بەسەر خوادا ئەگەربگەڕێنەوە بۆلای ئایینی پوچی ئێوە دووای ئەوەی خوا ئێمەی ڕزگار کردوە لەوئایینەی ئێوە، ئیتر چۆن ئێمە بوختان و درۆ ئەدەین بەسەر خوادا؟ چونە نێو ئایینی ئێوە بت پەرستیەو بە ئێمە ناکرێ .

﴿ وَمايَكُوْنْ لَنا أنْ نَعُودَ فِيْها إلا أنْ يَشْاءَ الله رَبُنّا ﴾ وەشایستە نیە بۆ ئێمە کەئێمە بگەڕێینەوە بۆ نێو ئایینی ئێوەو واز لەو مافەڕەوایە بهێنین، ئێمە لەسەرینی، ئاشکرایە ئەو ئایینەی ئێوە هاوبەشدانانە بۆ خوا، مەگەر خوای پەروەردەکەری ئیمە ئارەزووی سەرلێ شێوان و گەڕانەوەی ئێمەی هەبێ بۆلای ئەو ئایینەی ئێوە، بێگومان خوای مەزن ئارەزووی وەرگەڕانی ئێمە ناکا لەئایینی خۆی وبۆیە ئەفەرموێ :

﴿ وَسِعَ رَبُنّا كُلَ شَيءٍ عِلْماً عَلى الله تَوَكَلْنْا ﴾ زانین و زانستی پەروەردەکەری ئێمە هەمو شتێ ئەگرێتەوە، ئەزانێ بەوەی ڕابوردن وبەوانەی لەمەوپاش دێن و بەوشتەی لەدەوری ئادەمیزادان، ئێمە هەربەخوا پشتمان بەستوە بۆ پتەوکردنی باوەڕمان یاریدەمان بدا .

﴿ رَبّنا إفتَح بَينَنا وَبَينَ قَومِنا بِالحَقّ وَآنتَ خَيرُ الفاتِحِينَ ﴾ ئەی پەروەردەکەری ئێمە: تۆ فەرمان بدە بەڕاستی و بەدادپەروەری لەنێوان ئێمەو لەنێوان خزمانی ئێمەدا، ڕاستی، کاری پوچ جوێ بکەرەوە، تۆچاکترینی هەموو دادوەرانی و هەمو کاری تۆڕون

ئەکەیتەوە، هەرتۆ سەرچاوەی هەمو شتێکی و هەرتۆ دەرگای چاکە ئەکەیتەوە. ئەوە پاڕانەوەی شوعەیبە لەکاتێکا بو بەتەمای باوەڕهێنانی بەوان نەبو، بۆیە پەنای بردە لای خوا کەڕزگاریان ببێ لەبێ باوەڕان .

وَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعْتُمْ شُعَيْبًا إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَـٰسِرُونَ ﴿٩٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَـٰثِمِينَ ﴿٩١﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَا ۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَانُوا۟ هُمُ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٩٢﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَـٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَـٰلَـٰتِ رَبِّى وَنَصَحْتُ لَكُمْ ۖ فَكَيْفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوْمٍ كَـٰفِرِينَ ﴿٩٣﴾

﴿ وَقالَ المَلآ الَّذينَ كَفَرُوا مِن قَومِهِ لَئِن إتَّبعتُم شُعَيباً إنَكُم إذاً لَمِنَ الخاسِرينَ ﴾ تاقمێ لە پیاو ماقولاَن و بەرێزەکانی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنابو لەخزمەکانی شوعەیب بەژێردەستەکانیان ووت: ئەگەر ئێوە بەڕاستی دوای شوعەیب بکەون لەورێگەیەی ئەو لەسەریەتی واز لەئایینی خۆتان بهێنن ئەو کاتە ئێوە لەزیان لێکەوتوەکان ئەژمێرێن کەئایینی خۆتان بگۆڕنەوە بەم ئایینە تازە پەیدابوە، دەست مایەو سامانتان ئەڕواو نامێنێ کەشوعەیب فەرمانتان پێ بدا بەکەم فرۆشی .

﴿ فأخَذَتهُم الرَّجفَةُ فَأصبَحُوا في دارِهِم جاثِمِينَ ﴾ دوایی ئەو گەلەی گرت بومەلەرزەیەکی سەخت دوایی دەنگێکی زۆر گەورەی یەکجار ناهەموار، دوایی ئەو

گەلــەی شـوعەیب لــەخانوەکانی خۆیـان گـەڕان بـەمردوو بەلەشێکی بێ‌گیـان و بـــە دەماکەوتن لـەسەر زەوی فڕێدران .

﴿ الَّذِينَ كَذَّبُوا شُعَيْباً كَأَن لَمْ يَغنَـوا فِيـها ﴾ کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕیـان بەشـوعەیب نەهێنابوو بەدرۆیان خستبوەوە وەك ئەوە وابون کە لەو جێگەو لەو شارەدا دانەنیشـتبن و نەژیابن ولـەناوچون ونیشانەیان نەمایەوە، هەمو تاوانبارێ وەك ئەوان تۆڵــەی لێ ئەسـەنرێ دێر بێ یا زو .

﴿ الذيـنَ كَذَبُـوا شُـعَيباً كـانُوا هُـم الخاسِـرُونَ ﴾ کەســانێکی ئــەوتۆ شــوعەیبیان بەدرۆخستەوەو باوەڕیان پێ‌نەهێنا هەرئەوان زیان لێ کەوتو بـون، ئەوکەسـانەی باوەڕیـان هێنابوو قازانجیان کرد ورزگاریان بو، مرۆڤی ژیر هەرگیز بەپیاوانی دەست بـلاوی خـۆش گوزەران نابێ بلێ نۆشی گیانتان بێ و بەهەژاران بلێ: هاوارو لـەناوچون بۆ ئێوە، چونکە ئەم جیهانە زۆر شتی تێدایە پەنهان دراوە و زۆر کاتی کوتوپڕی پەیدا ئەبێ و هەمو کـارێ بەئەنجامی دوایی دەرئەکەوێ لەچاك ولـەخراپ توشی دانیشتوان ئەبێ .

﴿ فَتَولى عَنهُم وقـالَ يـاقومِ لَقَـد أبلَغتُكـم رسـالاتِ رَبّـي وَنَصحـتُ لَكُـم ﴾ وەدوایـی شوعەیب پشتی کردە گەلەکەی و دەرچو لـەناویانا کەسزا هاتە خوارەوە بــۆ سـەریان و، ووتی: ئــەی خزمـانی مـن بـەئێوەم ڕاگـەیاند پەیامـەکانی پەروەردەکـەری خـۆم و، مـن ئامۆژگاری ئێوەم کردبو لـەبەر خزمایەتی ولـەڕوی میهرەبانیـەوە و خەفـەتتان بـۆ ئـەخۆم، ئێوەم ئەترسان لـەسزای خواو بانگم کردن بۆ لای باوەڕهێنان و پەشیمان بونەوە.

﴿ فَكَيفَ أسَى عَلى قَوْمِ كٰافِرِيْنَ ﴾ دوایی من چۆن خەفەت ئەخۆم وغـەمناکم لـەسـەر لـەناوچونی گەلێ بێ باوەڕبون و خۆیان بنەبڕکرد بەهۆی بـەردەوامیان لـەسـەر بڕوانـەبون بەخواو بەکارە ڕەواکان و بەنامەکان، لـەسەر گاڵتەپێکردن بەوکەسانەی باوەڕیـان هێنـابو لـەئایەتە پێشوەکانا خوای مەزن باسی بۆ فەرموین: بنەبڕی ولـەناوچونی ئەو گەلانە بەهۆی بەدرۆخستنەوەی پێغەمەرەکانیانەوە بوو، وەك گەلی نوح و هود وساڵح و شوعەیب، باسی بۆ کردین کــەکۆتایی هاتنیـان ئامۆژگـاری و تـەمێ خـواری و پـەندی زۆری تێدایـە بـۆ

ئادەمیزاد، بەڕاستی بنەبڕی ئەسوریّتەوە بەم لاولای بێ باوەڕان و ناڕاستانەوە، لەم ئایەتەی دواییدا بۆمانی ڕون ئەکاتەوە ئەوشتەی توشی گەلی ئەو پێغەمەرانە نەبوە بەتایبەتی. بەڵکو دەستوری تێپەڕیوەو تێ ئەپەڕێ بەسەر هەمو گەلێکا پێغەمەرەکانی خۆیان بەدرۆبخەنەوە، ئیتر زوبێ یا درەنگ، خوای گەورە ئەیانگرێ بەناخۆشی وبەنەخۆشی و ئاژاوە وئازاری لەش و بە لەناوبردنی سامانیان هەرلەبەرئەوەی تەمێ خواربن و لەخراپە کۆڵ بدەن، بۆ ئەوەیش کەسانی تری دووای ئەوانیش تەمێ خواربن وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّبِىٍّ إِلَّآ أَخَذْنَآ أَهْلَهَا بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَضَّرَّعُونَ ﴿٩٤﴾ ثُمَّ بَدَّلْنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلْحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَوا۟ وَّقَالُوا۟ قَدْ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩٥﴾

﴿ وَماأرسَلنا في قَريَةٍ مِن نَبي إلاّ أخَذنا أَهْلَهْا بِالبأساءِ وَالضَراءِ ﴾ وەئێمە ڕەوانەمان نە کردوە لەهیچ گوند و لەهیچ شارێکا هیچ پێغەمەرێ کە دانیشتوی ئەو گوندە ئەو پێغەمەرەیان بەدرۆ خستبێتەوە مەگەر ئێمە دانیشتوانی ئەو گوندە ئەو پێغەمەرەیان بەدرۆ خستبێتەوە ئێمە دانیشتوانی ئەو گوند وشارەمان سزا داوە بەکاری سەخت و تەنگی و زیانی دارایی و بیماری نەخۆشی .

﴿ لَعَلَهُمْ يَضرَعُونَ ﴾ بۆ ئەوەی بپارێنەوە و خراپە لەخۆیان فڕێ بدەن و تەمێ خواربن و پەشیمان ببنەوە و باوەڕ بەپێغەمەرەکەیان بکەن، هەتا ئەو سزایانە لەسەریان هەڵگیرێ، ئەگەر بەو سزایانە تەمێ خوارنەبون و نەهاتنەوە هۆشی خۆیان ئەوان بەلەناوچون گیرۆدە ئەبن .

﴿ ثُمَ بَدّلنا مَكانِ السّيئَةِ الحَسَنَةِ حتي أعفوا ﴾ لەپاشا ئێمە دائەنێین لەجێگەی تەنگی و ناخۆشی، خۆشیو گوشادیو هەرزانی هەتا زۆر ئەبن و گەشەئەکەن خۆیان و دارایيان فراوان ئەبێ، هەتا بەتەنگی و ناخۆشی تەمێ خوار بن و بەنەخۆشی و بەختیاری سوپاسی خوا بکەن. بەلاّم بەداخەوە کەم کەس تەمێخوار ئەبێ وکەمیشیان سوپاسی خوا ئەکەن .

کاتێ سامان و نەتەوەیان زۆربو، ڕاستی بەسوك دائەنێنو گاڵتە بەدانیشتتوان ئەکەن، مانای دەستورو یاسای خوا بەنەزانین و بەهەوەسی خۆیان ئەکەن و ئەڵێن: ئەوشتانە لەناخۆشی توشی باوباپیرامان تۆڵەی گومڕاییو خراپەکاری ئەوان نەبوە، هەروەها خۆشی و بەختیاری ئەوان لەبەرپاداشتی چاکەکردن وڕاغویی وەرگرتنیان نەبوە، بەڵکو ئەوانە توشی هەمو کەس ئەبن باوەڕداربن یابێ باوەڕبن، دەستور و یاسای گەردون هەروایە، وەك خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە و ئەفەرموێ :

﴿ وَقالُوا قَد مَسّ آباءنا الضراءُ وَالسَراء ﴾ وەئەڵێن: بەڕاستی توشی باوکانی ئێمە بوە ناخۆشی وسەختی و ئاسایش و هەرزانی لەکاتانی ڕابوردودا. جارێ گرانی، جارێ هەرزانی و خۆشی کاتێ ساعیو کاتێ بیماری، کاتێ خەفەت و کاتێ شادی، ئەوانە هەمویان لەبەر باوەڕداری و بێ باوەڕی نەبوە. بەڵکو یاساو دەستوری گەردون وایە. هەر کاتێ ئەو کەسانەو وێنەی ئەوان بێ ئاگاییان کرد لەفەرمانەکانی خواو لە کارێ لەشوێنی شیاوی خۆیا دانراوە، خوایش لەوان و لەکردەوەیان بێئاگا نیە، بۆیە ئەفەرموێ :

﴿ فَأَخَذناهُم بَغْتَةَ وَهُمْ لايَشعِرون ﴾ دوایی ئێمە ئەوانمان سزاداوە و لەناومانبردوون کوتوپڕ لەکاتێکا لەخۆشیو ئاسایشدا ئەژین، بۆئەوەی خەفەتیان زۆرتربێ و هەناسەی سارد هەڵکێشن و. ئەوان نازانن وهەست ناکەن بەوسزایەی دێتە خوارەوە بۆ سەریان، هەتا ببێتە تۆڵەی لەخۆبایی بونیان و ڕۆیشتنیان بۆلای کردەوەی خراپ و بەرەلاّییان و دوواکەوتنیان بۆلای هەواو هەوەس و ویستی نالەباری خۆیان، خوای مەزن بەهۆی قورئانی پیرۆزەوە هەمو ئادەمیزاد لەهەمو کاتێکا ئەترسێنێ هەتا بترسن و خۆیان لەخراپە بگێڕنەوە، ئەیشیان ترسێنێ لەوەی کوتوپڕ خوا سزایان بدا. خەرکاتیچ ئادەمیزاد بڕوایان

بەخوا هەبێ و هەمو فەرمانەکانی بەجێ بهێنن، دادپەروەری بۆ هەمو شتێ و لەهەموکاتێکا بەرپابکەن، هەمو بەختیاری وئاسایشێ ئەبەخشێ بەوان. بەڕاستی دادپەروەری بلاّوبویەوە، کارو فەرمان بەچاکی و ئاسانی ئەچێتەسەر. تەنگی وناخۆشی نامێنێ، بۆیە خوا ئەفـەرموێ پێمان:

وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَٰتٍ
مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذْنَٰهُم بِمَا كَانُواْ
يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾ أَفَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَٰتًا
وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا
ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩٨﴾ أَفَأَمِنُواْ مَكْرَ ٱللَّهِ ۚ فَلَا يَأْمَنُ
مَكْرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ
ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩٨﴾ أَفَأَمِنُواْ مَكْرَ ٱللَّهِ ۚ فَلَا يَأْمَنُ
مَكْرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ
يَرِثُونَ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ أَهْلِهَآ أَن لَّوْ نَشَآءُ أَصَبْنَٰهُم
بِذُنُوبِهِمْ ۚ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾

﴿ وَلَو أنَ أهلَ القرى آمنُوا وأتَقوا لَفتَحنا عَلَيهم بَرَكاتٍ مِن السّماءِ وَ الآرضِ ﴾ وەئەگەر دانیشتوان و خاوەنی گوندەکان کەبەوسزایانە گیرۆدە بون باوەڕیان بهێنایـە و خۆیانیان بپارێزایە لەبێ فـەرمانی ئێمـە وپێغەمـەرەکانی ئێمـە بەڕاستی ئێمـە ئاشـکرامان

ئەکردبەسەریانا چەندین پیت و فەڕ لە ئاسمان وزەویدا و لەئاسمانندا بەوەرگرتنی پاڕانەوەیان و هاتنە خاورەوەی باران، لەزەویدا هەمو شتێکمان بۆ جێ بەجێ ئەکردن و هەمو پێویسیەکانمان بۆ ئەڕواندن و بۆمان سەوز ئەکردن، ئاژاڵ وگیانەوەری بەسودمان ئەدانێ، بەتایبەتی زیری ڕەش .

﴿ وَلَكِنْ كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ وەبەلام ئەوان باوەڕیان بەپێغەمەرەکان نەهێنا و بەدرۆیان خستنەوە، بەفەرمانی خوا کاریان نەکرد. بەڵکو زەویان تێکدا بەستەمکردن و ئازاردانی دانیشتوان، بەتالان و کوشتن وداگیرکردنی سامانی ئادەمیزاد و بەفیرۆدانی سامان ودارایان لەسەر گییان وڕوتانەوەیان و چەوسانەوەی هەژاران، دوایی ئێمە ئەوانمان گرت و سزاماندان بەهۆی ئەوشتەی ئەوان ئەیکەن، وەك بەدرۆخستنەوەی پێغەمەران و بلاوکردنەوەی گوناه، سەرپێچی کردن لەفەرمانەکانی خوا .

﴿ أَفَأَمِنَ أَهلُ القُرى أن يَأتِيَهُمْ بَأسُنَا بَيَاتاً وَهُم نَائِمُونَ ﴾ ئایا دوای دانیشتوانی ئەو گوندانە ئاسودەن و ناترسن پاش ئەوەی بۆمان ڕون کردنەوە کە سزای بێ باوەڕانی تری پێغەمەرەکانی ترمان داوە وتۆڵەمان لێ کردنەوە کەسزای ئێمە بێت بۆلایان لەشەوداو لەکاتێکا ئەوان خەویان پێداکەوتبێ .

ئەوئایەتەو ئایەتەکانی دوایی ترساندنە بۆ یاخیەکان و خوێن مژان کە خوا کوتوپڕبیان گرێ بەسزای خۆی لەکاتی بێ ئاگاییدا، وەك گەلانی پێش ئەوان، ئایا ئادەمیزاد خاوەنی ئەو توانایەن کە لادەن لەخۆیان سزای خوا لەکاتی هۆشیاریدا و لەکاتی مەترسیدا زۆر ڕونە ناتوانن لەهیچ کاتێکا، ئیتر چۆن لەخەودا ئەتوانن کەوەك مردوو وان .

﴿ أَفَأَمِنَ أَهلُ القُرى أن يَأتِيَهُم بَأسُنَا ضُحىً وَهُم يَلعَبُونَ ﴾ ئایا دوای دانیشتوانی ئەو گوندانە لەبێ باوەڕانی مەکەو جگەی ئەوان ئاسودەن و ناترسن کەبێت بۆ لایان سزای ئێمە لەڕۆژداو خۆر بەرزبوبێتەوە و لەکاتێکا ئەوان یاری ئەکەن وخەریکی کارکردنن و ئاگایان لەخۆیان نیە .

پرسیار/ هەرگیز جیاوازی نیە لەنێوان ئاگاداری ئادەمیزاد و بێئاگاییان لە بەردەم سزای خوادا دوایی مەبەست لەباسکردنی خەو و یاری کردندا چ شتێکە ؟

وەڵام/ مەبەست ئەوەیە کەئادەمیزاد هۆش لەلاوازی خۆیان بکەنەوە لەهەمو رویەکەوە، بۆ ئەوەی راغویی وەرگرن وبیر بکەنەوە وبترسن لەسزای خوا هەمو کاتێ.

﴿ أفأمنوا مَكْرَ الله فَلايأمَنُ مَكرَ الله ألا القَوم الخاسِرُونَ ﴾ ئایا داویی ئاسودەن و ناترسن لەسزای خوا ئەو کەسانەی پێغەمەرەکان بەدرۆ ئەخەنەوە کە توشیان بێ سزای خوا لەکاتێکا پێ‌نەزانن وبێ ئاگابن، دوایی ئاسودە نابن و بێ ترس نین لەسزای خوا مەگەر تاقمێ زیانۆمەندبن بەهۆی بێ‌باوەڕی‌یانەوە و لەپاشەڕۆژی گەلان بیر نەکەنەوەو تەمێ خوار نەبن .

﴿ أوَلَم يَهدِ للَذينَ يَرِثُونَ الآرضَ مِن بَعدِ أهلِها أن لَو نَشاءُ أصَبناهُم بِذنُوبهِم ﴾ ئایا خوا رونی نەکردوەتەوە بۆ کەسانێکی ئەوتۆ جێگەی گەلانی رابوردویان گرتوەتەوەو بون بە میرات گریان لەزەویدا، دوایی بنەبربونی دانیشتوانی پێش ئەوان کەئێمە ئەگەر ئارزومان هەبێ ئەم کەسانەی جێگەی ئەوانیان گرتوەتەوە ئێمەتوشی سزایان ئەکەین بەهۆی گوناهەکانی خۆیانەوە ،وەك ئەوانەی پێشوومان توشی سزا کرد کەزۆرتر لەمانەی ئێستا بەهێزتر بون. ئایا بت پەرستان نازانن وبۆیان رون نەکراوەتەوە فەرمانی ئێمە دەربارەی ئەمان هەروەك فەرماندانە بۆ لەناوبردنی گەلانی رابوردو کەویستمان وەك ئەوان لەناویان ئەبەین. بەڕاستی دەستوری خوا یەکە لەهەمو بونەوەراندا و خوا بێ ئاگانیە، هەتا تەمێ خواربن بەجگەی خۆیان، بەدارایی و سامان وهێز لەخۆیان بایی نەبن، مەبەست لەمانای ئەو ئایەتە ئادەمیزادە بۆئەوەی ئاگاداری خۆیانبن وبێ فەرمانی خوا نەکەن بەوێنەی ئەوانەی توشی سزابوون .

بۆ زانین: زانایان بۆ دیاری کردنی ( فاعیلی ) ووشەی ( لم یهد ) بیریان جیاوازە: هەندێ لایان وایە فاعیلەکەی بریتیە لە (الله) هەندێ تریان ئەڵێن: بریتیە لە ( ماتَلۆنـا مِن أبناءِ الْقرى ) هەندی‌تریان لایان وایە بریتیە لە ( أن لَو نَشاء ) .

﴿ وَنَطبَعُ على قُلُوبِهِم فَهُم لايَسمعُونَ ﴾ وەئێمە مۆر ئەدەین بەسەر دڵی ئەو کەسانەدا ئامۆژگاری وەرناگرن و بیر لەبەسەرهاتی رابوردووان ناکەنەوە، دوایی ئەوان ئامۆژگاری نابیسن و بەسەرهاتی گەلانی رابورد و تەمێ خوارنابن .

خوا ڕوی فەرمودەی خۆی ئەکاتە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بۆ ئەوەی هەواڵ بدا بەموسڵمانان دەربارەی بنەبڕکردنی گەلانی پێشو، بۆئەوەی تەمێ خواربن و لەسزای خوا بترسن وئەفەرموێ :

تِلْكَ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآئِهَا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ مِن قَبْلُ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٠١﴾ وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ ۖ وَإِن وَجَدْنَآ أَكْثَرَهُمْ لَفَٰسِقِينَ ﴿١٠٢﴾

﴿ تِلْكَ القُرى نَقُصُ عَلَيكَ مِن أنبائها﴾ ئەو چەندین گوندانە کە دانیشتوەکانیان بریتی بوون لەگەلی نوح و هود وساڵح و لوت و شوعەیب و جگەی ئەوانەیش ئێمە ئەی خوێنینەوە بەسەر تۆدا و بۆتی ڕون ئەکەین هەواڵەکانیان و بەسەرهاتنیان لەخۆیان و لەپێغەمەرەکانیان، بۆئەوەی تۆ بزانی ئێمە یاریدەی پێغەمەران و باوەڕداران ئەدەین و سەریان ئەخەین بەسەر دوژمنانی خۆیان وئێمەدا .

﴿ وَلَقَدْ جاءَتْهُمْ رُسُلهِمْ بِالْبَيْناتِ فَمْا كانُوا لِيُؤمِنُوا بِمْا كَذبُوا مِنْ قَبْلُ ﴾ وەپێغەمەرەکانیان چوبو بۆلای دانیشتوانی ئەو گوندانە بەچەندین بەڵگەی ڕون و ئاشکرا و یەکخەر، دوایی لەوانە بوون بۆ ئەوەی باوەڕبهێنن دوای چونی ئەوان بۆ لایان، بەهۆی شتێ بەدرۆیان خستبوەوە لەنیشانە ڕونەکانی ئێمە لەپێش هاتنی پێغەمەرەکان .

پوختەی مانای ئەو ڕستانەی پێشوو بەم جۆرەیە: دانیشتوانی دێهاتەکان بەرلەوەی بنێردرێ بۆلایان پێغەمەرەکانیان لەسەر ئەوەی بت پەرست و گومڕابوون، ئەوان هەر

بەردەوامبون لەسەر بت پەرستی دوای ئەوەیش پێغەمەران چون بۆلایان بەبەڵگەی ڕون وکاری پەکخەرەوە، هیچ شتێ کاری تێ نەکردن، هەتا بەشێوەیەکی وا ئەت ووت: پێغەمەران نەنێرراون بۆلایان بۆ ئەوەی بیانترسێنێ و موژدەیان بداتێ، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ كَذلِكَ يَطبَعْ اللهُ عَلى قُلُوبِ الكافرِيْنَ ﴾ وێنەی ئەو مۆرەی دراوە بەسەر دڵی بێباوەڕانی پێشودا هەربەوجۆرە خوا مۆر ئەدا بەسەر دڵی بێ باوەڕانی ئێستادا بەتایبەتی بێ باوەڕانی قورەیش، دڵیان ڕەقەو لەگومڕایی ناگەڕێنەوەو بەئاواتی چاکەیان مەبە .

﴿ وَماوَجَدْنا لاَكْثَرُهُمْ مِنْ عَهَدَ وَإنْ وَجَدْنا أكْثَرُهُمْ لَفاسِقْيْنَ ﴾ وەئێمە دەستمان نەکەوتووە بۆ زۆرلەگەلانی ڕابوردو کوهەواڵیانمان خوێندەوە بەسەر تۆدا هیچ پەیمانێ بیدەن و بیبەنەسەرو نەی شکێنن و بەڕاستی زانیومانە و دەستمان نەکەوتوە زۆرتریان لەسنورد ەرچون وپەیمانیان شکاندوە بەڕاستی لەمەوبەرژماریە زۆر لەوئایەتانەی ڕابوردن کەباسی بەسەرهاتی موسایان کرد لەگەڵ کوڕانی ئیسرائیلدا ، لەم ئایەتانەی دواییدا باسی چیرۆك و بەسەرهاتی موسامان بۆ ئەکاو ئەفەرموێ :

ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٠٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰفِرْعَوْنُ إِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ۚ قَدْ جِئْتُكُم بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِىَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٠٥﴾ قَالَ إِن كُنتَ جِئْتَ بِـَٔايَةٍ فَأْتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٠٦﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ

لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٩﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿١١٠﴾ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَأَرْسِلْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿١١١﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿١١٢﴾

﴿ ثُمَ بَعَثْنَا مِنْ بَعدِهِمْ مُوسى بِآياتِنا إلى فِرْعَونَ وَ مَلَئِهِ ﴾ لەپاشا ئێمە هەڵمان بژارد موساو ڕەوانەمان کرد لەدوای نوح و هود وساڵح و شوعەیب بۆلای فیرعەون وتاقمەکەی بەچەندین نیشانەو کاری پەك خەر لەسەر ڕاستی موسا، ئەوانەیش بریتی بون لە داردەستەکەیی و دەستە سپیەکەی و شتی تریش. موسا کوڕی عیمرانە وخاوەن نامەکان ئەڵێن: عیمرام، ووشەی موسا پێك هاتوە لە( مو ) بەمانا ئاوە ولە( سا ) بەمانا درەختە، چونکە دایکی موسا موسای نایەناو سندوقێ و فڕەی دایە نێوئاوی نیلەوە. ووشەی فیرعەون نازناوی پاشاکانی کۆنی میسرە، بەمانا زۆردار. کیسرا نازاناوی پاشای فارسە :یانی وڵات فراوان. نەجاشی نازناوی پاشایانی حەبەشەیە واتە بەخشش. خاقان نازناوی پاشایانی چینە: واتە سەردار یاشێر. توبەغ نازناوی پاشایانی یەمەنە: پاشا لەدووای پاشا. قەیسەر نازناوی پاشایانی ڕۆمە یانی پاشا. مێژونوسان بیریان جیاوازە لەبارەی ناوی فیرعەونەوە: هەندێکیان ئەڵێن: ناوی قابوسە. هەندێکیان ئەڵێن: ناوی وەلیدە. هەندیَتریان ئەڵێن: ناوی مونقەتاحە. زانین و نەزانینی ناوەکەی لەپێویستیەکانی ئایین نیە. میسریەکان بەفیرعەونیان ئەوت: کوڕی خوا، فیرعەون داوای خوایەتی کردو نەتەوەی ئیسرائیلیەکانی ئەچەوساندەوە، خوای مەزن موسای کرد بەپێغەمەر ناردی بۆ سەر فیرعەون و تاقمەکەی هەتا بیانگێڕێتەوە لەبێباوەڕی و یاخی بون بە هۆی کارەپەك خەر و نیشانە ڕونەکانی ئێمەوە .

﴿ فَظَلِمُوا بِهاْ فَأنْظُرْ كَيْفَ كانَ عاقِبَةُ المُفْسِدِينَ ﴾ دوایی تاقمەکەی کەباوەڕیان نەهێنا بەو کارەپەکخەرو ئاشکرایانە وستەمیان لەخۆیان کرد، دوایی تۆ تەماشاکەو بنوارە بەچاوی ئەقلّ کەچۆن بۆ ڕۆژی دوایی خراپەکاران وبیّ باوەڕان، ئەوەبو خنکان بەئاوی دەریای سور .

بۆئاگاداری: دەنگ وباسێکی پڕوپوچ و دڕاوە بلاّوبوەتەوە لەنێو نەخوێندەوارو نەفاماندا لەنێو ئەوانەدا ئەیانەویّ دارایی دانیشتوان تالاّن بکەن و دەرگای خانوەکانیان بکەنەوەو سامانیان بدزن، ئەلّێن: هەرکەسیّ ناوی دایکی موسا ببا و دەست بداتە هەرقوفلّیّ بۆی ئەکرێتەوە، ئەبیّ بزانین ئەو دەنگ و باسە درۆو دەلەسەیە هیچ سەرچاوەیەکی بۆنیە و هیچ شتیّ بەناوی دایکی موساوە ناکرێتەوە، هەندیّ لەزانایان کۆن وتازە ووتویانە: ناوی دایکی موسا ( بوکابیدە ) ئەو ووتەیەی ئەوانیش گۆترە کاریە، لەهیچ سەرچاوەیەکەوە نەیان گێراوەتەوە. کەواتە ئەو جۆرە باسانە جێگەی برواو متمانە نیە .

﴿ وَقالَ مُوسى يافِرْعَوْنَ إني رَسُوْلٌ مِنْ رَبّ العْالَمْينَ ﴾ وەموسا فەرموی: ئەی فیرعەون بەراستی من نێرراوێکم لەلایەن پەروەردەکەری هەمو بونەوەرانەوە بۆ لای ئێوە، موسا ڕوی کردە فیرعەون بەبیّ ئەوەی ڕێزیّ بۆ فیرعەون دانیّ، چونکە بەزمانی خواوە گفتوگۆی ئەکرد وپەیامەکانی خوای ڕائەگەیاند ئەو پەیامی هەمو کەسیّ بەبچوك دائەنریّ، بەوبۆنەوە ئێمە ئەیزانین نهێنی مێژووی پیاوچاکان کەخۆیان لەئاستی ئەو کەسانە لەسنوری خوا دەرچون بەگەورە ئەگرن. بالّی ڕێزگرتن بۆ باوەڕداران دائەنەوێنین .

﴿ حَقَيقٌ أنْ لاأقُولَ إلا الْحَقَ ﴾ شایستەو پێویستە بۆ فروستاوەیی من لەسەرئەوەی کەهیچ شتیّ نەلّێم مەگەر گفتوگۆی ڕاست و هەرگیز درۆ بۆ هیچ شتیّ ڕەوا نابینم. ناوەڕۆکی ئەو ڕستەیە کارو کرداری هەمو پێغەمەرانە کە سروشیان پیّ سپێردراوەو هەلّبژێرراون بۆ گەیاندنی پەیام .

﴿ قَدْ جِئْتُكُمْ بِبَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِيَ بَنِيْ إِسْرائِيْلَ ﴾ بەڕاستی من هاتووم بۆلای ئێوە بەبەڵگەیەکی ڕون و کارێکی پەك خەر لەلایەن پەروەردەکەری خۆتانەوە کە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی فروستاوەیی من، دوایی ڕەوانە بکە لەگەڵ مندا کوڕانی ئیسرائیل و وازیان لێبهێنە هەتا بگەڕێنەوە بۆلای خاکی پیرۆزی نیشتمانی خۆیان وباو باپیریان، بەرەلایان بکە بۆچ جێگەیە ئەڕۆن بابڕۆن، مەیان خەرە سەرکاری گران وسەخت .

﴿ قالَ إِنْ كُنْتَ جِئْتَ بِآيَةٍ فَأْتِ بِهَا إِنْ كُنْتَ مِنَ الصادِقِيْنَ ﴾ فیرعەون ووتی و بەسوکیەوە تەماشای موسای کرد: ئەگەر تۆ هاتوی بۆلای ئێمە بەبەڵگەیەکەوە ،دوایی تۆ ئەو بەڵگەیە بهێنە ئەگەر تۆ لەوکەسانەیت ڕاست ئەکەن لەکاری خۆتانا. لەم فەرمودەیەوە وادەرئەکەوێ فیرعەون گومانی وابو کەموسا لەو داوایەی خۆیدا درۆ ئەکا، ویستی لەبەردەم دانیشتوانا ئابڕوی ببا، بۆیە داوای ئەو کارەی کرد لەموسا، دوایی موسا بەردی ڕەقی دا بەدەمیا بەو بەڵگە پەکخەرە، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ فَأَلْقى عَصَاهُ فَإِذا هِيَ ثُعْبانٌ مُبِيْنٌ ﴾ دوایی موسا داردەستەکەی هاویشتە سەرزەوی، دوایی کوتوپڕ داردەستەکەی بوبە ئەژدیهایەکی ئاشکرا، یانی لەناوەڕۆکیشدا هەربوو بەئەژدیها و بەداری نەمایەوە. نەك بەچاوبەست وگومان وجادو، دوایی فیرعەون ترسا. بەڵام زۆری لەخۆی کرد و خۆی تێك نەدا بەڕووالەت، چونکە داوای خوایەتی ئەکرد، موسا جارێکی تر دای بەدەمیاو نەیهێشت پشوبدا، وەك خوائەفەرموێ:

﴿ وَنَزَعَ يَدَهُ فَإِذاهِيَ بَيْضاءُ لِلنّاظِرِيْنَ ﴾ وە موسا دەستی خۆی لەباخەڵی دەرهێنا ،دوایی کوتوپڕ ئەو دەستەی سپی هەڵگەڕاو بریسکەی دایەوە بۆ تەماشاکەران، ئەبێ بزانین دەستی موسا گەنم ڕەنگ بوو سپی هەڵگەرا بەبێ نەخۆشی و بەبێ شورەیی ولەبەلەکیەوە دووربوو .

دوایی فیرعەون هەستی کرد بەداماوی و بێترخی خۆی بەرانبەر بەموسا ،خۆی بەلاواز وبچوك هاتە پێش چاو، دانیشتوانی دەورووپشتی هەستیان پێکرد کەموسا فیرعەونی لەپۆپەی بەرزاییەوە هێنایە خوارەوە، دوایی دانیشتوان هەوڵیاندا کەئەو ڕوداوە بەسوك

دابنێن و ئارەقی شەرمەزاری فیرعەون ووشــك بکەنــەوە بــەدرو دروســت کــردن و خــۆ ڕزگارکردن بەم ڕستەی خوارەوە:

﴿ قالَ المَلآ مِنْ قَوْمِ فِرْعَوْنَ إنْ هَـذا السّـاحِرِ عَلْيِـمَ ﴾ کۆمــەڵێ لــەپیاوماقوڵانی گــەلی فیرعــەون و کــار بەدەســت وپــرس پێکــراوی فیرعــەون بــون و گــرێدان و کردنــەوەی کاروباریان بەدەستبوو ووتیــان بەڕاســتی ئــەم موسایە جادوگــەرێکی زۆر زانایــە، چــۆن ئەودەستەی بەسپیەتی هێنایە دەرەوە، ئەو داردەســتەی چــۆن کــرد بەئەژدیــها، ئــەوجۆرە تاوانج وپڕوپاگەندانەی ئەوان بڕوبیانوی لاوازن کەئەیدەنــە پــاڵ پیــاوانی پــاك و خــاوێن، ئەیانەوێ بەهاشەو هوشــە لــەرێزی پیــاوانی خــوا کــەم بکەنــەوە، دوایــی پیــاو مــاقوڵانی گەلەکەی فیرعەون ووتیان:

﴿ یُرِیدُ أنْ یَخْرِجُکُمْ مِنْ أرْضِکُمْ فَماذا تَأْمُرُونَ ﴾ ئــەو جادوگــەرە ئەیــەوێ کــەئێوەی قیبتی دەربکا لەم زەویە چاکەی خۆتان لەم میســرەدا و کوڕانــی ئیســرائیل لــەوێدا بــبن بەکاربەدەست وفیرعەون کەئەو وتەیەی بەپەسەند هاتە پێش چاو ووتــی: دوایــی ئێــوە چ شتێ ئەڵێن وڕاوێژتان چ شتێکەو چ بریارێ ئەدەن و ئەتانەوێ چ شتێ بکەن؟

﴿ قْالُوا أ َرْجْــهُ وَأخــاهُ وَأرسَــلَ فِي المدائــنِ حْاشِــرِینَ ﴾ ووتیــان بەفیرعــەون: تۆموســاو براکەی هارون بەندیان بکەو دوایان بخەو مەیان کوژە و پەلەمەکە، چونکــە ئەگــەر بیــان کــوژی بــیری گشــت دانیشــتوان ئــەگۆڕێ دەربــارەی تــۆ و ڕقیــان ئــەجولێ، خــۆت و فەرمانڕەوایت ئەکەونە مەترسییەوە و، تۆ ڕەوانە بکە بەنێو شــارەکانی میســردا چــەندین پیاوێ لەیاریدەدەر و سەربازی خۆت کۆبکەنەوە لەلای تۆ هەمو جادوگــەرانی کارامــەو پسپۆر لەجادوگەریدا .

﴿ یَأتُونَ بِکُلِ سْاحِرٍ عَلْیْمْ ﴾ ئــەوان بــهێنن بــۆ لای تــۆ هەموجادوگــەرێکی زۆر زانــا بەپیشەی جادو. مێژوو نوسان ووتویانــە: بەڕاســتی زەوی میســر لەســەردەمی فیرعــەوندا شەپۆلی ئەدا بەجادوگەران، زانا ئایینەکانی میسر و زێــوان و خزمــەت گــوزاری خواکــان هەرئەوان بون خەریکی پیشەی جادوگەری بون. فیرعەونەکان خۆیان پەنایان ئەبرد بۆلای

جادوگەران بیانپارێزن و زاڵ بن بەسەر گیانە نهێنیەکان لەدێو و مۆتەکە.. لەوسەردەمەدا جادوگەریان بەش ئەکرد بەچەندین بەش: کۆمەڵێ کیان داوای یارمەتیان ئەکرد بەشتێ لەتوانای خوای چاکە، بۆ ئەوەی سەربکەون بەسەر خوای خراپەدا. بەشێ تر داوای یارمەتیان ئەکرد بەهۆی توانای شەیتانی گەورەوە سەربکەون بەسەر شەیتانی بچوکدا. بلاوبونەوەی جادو لەسەردەمی فیرعەوندا ئەمەمان فێرئەکا بۆچی داردەست کرا بەکاری پەکخەر بۆ موسا ؟ هەتا بزانین کاری پەکخەری هەمو پێغەمەرێ هاتوە لەجۆری شتێ باوی سەردەمی خۆی بێ هەتا بەرەنگاری‌یەکەی بیانوی ئەو سەردەمە نەیەڵێ . ئەوەبو موسا جادوی پوچ کردەوە لەسەردەمی خۆیا. عیسا مردوی زینوو ئەکردەوە .موحەمەد زمانی پیاوانی زمان پاراو و زۆرزانی لاڵ کرد بەشتێ لەوەی ئەوان تەڕتر وپاراوتر بوو کەقورئان بوو .

بۆ ئاگاداری: ڕستەی ( أرجه ) ئەسڵەکەی ( أرجئه ) بوە، هەمزەکە لابراوە لەبەرئاسان کردن بۆ زمان، بۆری ( هایەکە) ئەکەین بە زەنە لەبەر وەستان لەسەری .

بۆ زانین: کورتەو پوختەی مانای ئەو ئایەتانەی پێشوو بەم جۆرەیە: فیرعەون داوای خوایەتی ئەکرد لەجگەی خوا، بەنی ئیسرائیلیەکانی ئەچەوسانەوە، خوا موساو هارونی نارد بۆلایان، بەبێ ترس لەیاخی بون و دەسەلاتی فیرعەون چونە لای لەجێگەی دانیشتن، ڕووی کردە فیرعەون و ووتی: ئەی فیرعەون من نێرراوی پەروەردەکەری ئێوەم و بۆلای تۆو هەمو بێ باوەڕێ. بەڵگەم لایە بۆڕاستی پەیامی خۆم. پێویستە لەسەر تۆ بەنی ئیسرائیلی لەدیلی خۆت بەرەلایان بکەی، وازیان لێ بهێنی خۆیان ئازاد بن بۆ چ لایە ئەڕۆن بابڕۆن، فیرعەون بەبێ‌نرخ موسای داناو ووتی:چ شتێکت لایە بیهێنە، داردەستەکەی هاویشت بوبە ئەژدیهایە، دەستی لەباخەڵی دەرهێنا بەسپێتی و ڕوناکی پەخش کردەوە بەنێو دانیشتواناو پێشتر گەنم ڕەنگ بو، پیاوانی فیرعەون ووتیان بەڕاستی موسا جادوگەرێکی کارامەیە، فیرعەون جادوگەرانی کۆکردەوە، بەرلەوەی دەست بکەن بەیاریەکانیان بەفیرعەونیان ووت: ئەگەر ئێمە زاڵبوین بەسەر موسادا پاداشتی گەورەو بەنرخمان ئەوێ، فیرعەون ووتی: پاداشتتان ئەدرێتێ و ئەبن بەپیاوانی نزیک لەخۆم،

جادوگەران گوریس و دارایی خۆیانیان هاویشت دانیشتوان وایان ئـەزانی بـوون بەچـەند مار و ڕائەکەن، موسا داردەستی خۆی هاویشت و ئەوانەی بەبوختان دایان نابو هـەمویانی قوت دا، دوایی جادوگەران موسڵمان بوون و باوەڕیان بەپێغەمەرایەتی موسا هێنا .

فیرعەون موسـاو هـارون و کوڕانـی یـەعقوبی ترسـان بەسـزا و چەوسـانەوە، ئـەوان گرنگیان بەو هەڕەشەی فیرعەونەیان نەداو بەردەوامبون لـەباوەڕهێنانی خۆیـان و ئـازاری زۆرداران. بەنی ئیسـرائیلی شـڵەژان ووتیـان بەرلـەتۆو ئێسـتاش سـزا ئـەدرێین ،موسـا فەرموی: ئارام بگرن وبەرزگاری خۆتان ئەگەن، خوا تاقمی فیرعەونی توشـی گـەرۆڵی و گرانی کرد، بارانی وای بۆ ناردن کشت و کارو بەرهـەمی لـەناوبردن، دوایـی کولـەش ئەوەی مابوەوە لـە دووا لافاو خواردیان. ئەسپیʼی بۆ ناردن لـەشیانی ئازارئەداو خوێنیـانی ئەمژی، بۆقی بۆ ناردن ژیانی لیٚ تێکدان، سەرەڕای ئەوانە هـەمو ئـاوی گـۆڕان بـەخوێن، دوایی هاواریان بردە لای موساو ووتیان ئەگـەر خـوای تـۆ ئـەم سـزایەمان لـەسـەر لابـا باوەڕئەهێنین، خوا ماوەیە لـەسەری لابردن هەتا بگەڕێنەوە بەڵام پەیمانی خۆیانیان شکاند و بەردەوامبون لـەسەر بیٚ باوەڕی ، خوا بنەبڕی کردن بەخنکان .

وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالُوٓاْ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحْنُ ٱلْمُلْقِينَ ﴿١١٥﴾ قَالَ أَلْقُواْ فَلَمَّآ أَلْقَوْاْ سَحَرُوٓاْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾ ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا

يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ الْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُوا
هُنَالِكَ وَانقَلَبُوا صَاغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ ﴿١٢٠﴾
قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَارُونَ ﴿١٢٢﴾ قَالَ
فِرْعَوْنُ آمَنتُم بِهِ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ
فِي الْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُوا مِنْهَا أَهْلَهَا ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿١٢٣﴾ لَأُقَطِّعَنَّ
أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَافٍ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٢٤﴾
قَالُوا إِنَّا إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا تَنقِمُ مِنَّا إِلَّا أَنْ آمَنَّا
بِآيَاتِ رَبِّنَا لَمَّا جَاءَتْنَا ۚ رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ
﴿١٢٦﴾

﴿ وَجاءَ السَحَرَةُ فِرعَون قالُوا إن لَنا لآجراً إن كُنا نَحنُ الظالِمين ﴾ جادوگەران دوای ئەوەی سەربازەکانی فیرعەون کۆیان کردنەوە بۆلای فیرعەون، کاتێ چاویان بەفیرعەون کەوت ووتیان: ئەگەرئێمە سەرکەوتین بەسەر موسادا بەڕاستی بۆ ئێمە ئەبێ کرێی و پاداشت و ڕێزمان لێی ئەگرێ ؟ جادوگەرەکان لەگەڵ فیرعەون ڕێك کەوتن لەدژی موسا، جادوگەران نوێنەری ئاین بوون لەوکاتەدا. ئەوجادوگەرانەی پێشوو نوێنەر وشاگردیان زۆرن لەهەمو سەردەمێکاورێك ئەکەون لەگەڵ ئەو کەسانە پارەیان بدەنێ کەلەدژی ئاین وویژدان و مرۆڤایەتی هەڵسن، دانیشتوان و نیشتمانی خۆیان ئەفرۆشن. لەم سەردەمەی ئێمەدا هەندێ ڕژێمی تاوانبار تاس کڵاوبەسەرو مێزەر بەسەری زۆریان

کڕیوە لەگاورو لە موسڵمان پارەیان ئـەدەنێ و فەرمانبـەرداری و یـاریدەی داگیرکـەران بدەن لەدژیبەرژەوەندی دانیشتوانی بێ تاوان. ڕژێمی بەعسی راوێژکاری زۆری کـوردی خۆفرۆشـی بـەپارەی زۆرکـڕی کەلـەدژی نەتـەوەی کـورد جـەنگ بکـەن و ئەنفالـــە بەدناوەکانیان بەجێ هێنا، هەروەها ڕژێمـەکانی دەرواسێی کـوردان لـەوان خرابـترن بـۆ کوردان، بۆ ئەو مەبەستە خراپەی خۆیان بە هەزاران کۆمەڵگا و ڕێك خراویان پێکهێناوە بۆ دژی دانیشتوان، خۆڕاست و ڕونە هـەمو کاربەدەسـتێکی ستەمکار تـاقمێ لـەپیاوانی ئاینی و جگەی ئایینی ئەکڕن هەتا بەمەبەســتی خراپـی خۆیـان بگـەن بـۆ چەوسـانەوەی هەژاران بەناوی ئایین و نیشتمان پەروەریە هەتا سەرنزمیان بکەن بۆیان بەلاّم ڕوڕەشی بــۆ ئەوانەو زۆری پێ ناچێ ئابڕویان ئەچێ و ئەبن بەپەڕۆی بێ نوێژ .

﴿ قالَ نَعَمْ وَأَنَكُمْ لَمِنَ الْمُقَرَّبِيْنَ ﴾ فیرعەون ووتی: لەوەلاّمی داواکاری جادوگـەران: بەڵێ. بەڕاستی ئێوە دووای سەرکەوتن لەپیاوە نزیکەکانی لای من ئەبنو خاوەنی ڕێز ئەبن و هەرکاتێ بتانەوێ لەمن نزیك ئەبنەوە. ژمارەی جادوگەران چەند بوون. سەرۆکەکانیان چ کەسێ بوە؟ چەند کەس بون و ناویان چی بوە؟ گرنگ نیە. پێویستە ئێمە بڕوامـان بـەو ڕوداوە هەبێ ،ئیتر هەرچۆنێ بوە؟

﴿ قْالوُا يٰامُوسى إمّا أنْ تَلْقِيْ وَإمّا أنْ نَكُونَ نَحْنُ المُلْقِيْنَ ﴾ جادوگــەران ووتیـان: ئـەی موسا: یاتۆ بهاوێژە داردەستەکەی خۆت و یا ئێمــە بیـهاوێژین گوریـس و داردەسـتەکانی خۆمان .

﴿ قالَ ألقُوا﴾ موسا چونکە بڕوای بەخۆی هەبو، ئەوانی بـەبێ نـرخ دائـەنا فـەرموی: ئێوە بییان هاوێژن و چیتان لایە بەکاری بهێنن و خۆتان خـاڵی بکـەن و جادەگـەران دارو گوریسی خۆیانیان فڕێدا ،هەریەکەیان دارێك و گوریسێکیان پێ بو.

﴿ فَلَمّا ألقَوا سَحُروا أعيُنَ الناسِ وَاستَرهَبُوهُم ﴾ دوایـی کـاتێ جادوگـەران ئەوشـتانە فەراهـەمیان هێنـابو فڕەیـاندان جادویـان کـرد لـەچاوی ئـادەمیزاد وچاویان لەڕاسـتی وەرگەڕاندن بەشتێ ڕازاندبویانەوە بەبێ ئەوەی ناوەڕۆکی هەبێ، یـانی ئـەوکارەی ئـەوان

چاوبەستبو لە ناوەڕۆکا هەر گوریس و داربون بەپێچەوانەی داردەستی موسا ئەو بەڕاستی گۆڕا بۆلای ئەژدیها و،جادوگەران بەوکارەی کردیان دانیشتوانیان زۆر ترساندن .

﴿ وَجاءَ واسِحرِ عَظيمٍ ﴾ وەجادوگەران هاتبون بۆلای فیرعەون و دانیشتوان بەجادویەکی زۆر گەورەوە، شیوێکیان پڕکردبو لەبەرچاوی دانیشتوان بەماری زۆر گەورە و ناقۆلا، وەك كێو سواری یەكتری بوبون لەبەرچاوی دانیشتوانا، موسا ترسی لێ نیشت کەنەزان و نەفامەکان سەریان لێی تێك بچێ بەهۆی ئەوجادوە دەستکردەوە کەبەدرۆ ساختەیان هێنابو، دوایی خوای مەزن نیازی موسای بەهێز کرد و فەرموی :

﴿ وَأوصَيْنا إلى مُوسى أَنْ أَلقِ عَصاكَ ﴾ وەئێمە نیگامان نارد بۆلای موسا و خستمانە دڵی کە تۆ ئەی موسا داردەستەکەی خۆت فڕێ بدە، ئەوشتانە جادوگەرەکان هێناویان شتێکی گرنگ نین و ئێمە ئەوشتانەی ئەوان کردویانە پوچی ئەکەینەوە ،موسا داردەستەکەی فڕێدا .

﴿ فَإذا هِي تَلقَفْ ما يأفَكونَ ﴾ دوایی کوتوپڕ داردەستەکەی موسا بوبە ئەژدیهایە ئەوشتەی جادوگەران بەدرۆو بەبوختان و بێ ناوەڕۆك دروستیان کردبو قوتی داو هەمو شتێکی ئەوانی پوچ کردەوە، بۆیە خوا فەرموی :

﴿ فَوَقَعَ الحَقُ وَبَطَلَ ما كانُوا يَعلَمُونَ ﴾ دوایی جێگەی خۆی گرت، پەیدابونی ڕاستی بۆ دانیشتوان بەڕونی و پوچ بویەوە شتێ ئەو جادوگەرانە کردبویان بەفڕوفێڵ و بەدرۆو بەبوختان و بێ ناوەڕۆك. فیرعەون سەرسام بو لەناهەمواری ئەوکارەی بەسەری هات، بەڕاستی ئەو کۆڕێکی پێك هێنابوو، جادوگەری لەهەمولایێکەوە هێنابو هەتا تەخت ودەستەلاتی خۆی بپارێزێ وڕای وەستێنێ کەچی ئاواتەکەی بەپێچەوانە گەڕا، خوا فەرموی :

﴿ فَغُلِبُوا هُنالِكَ وَأنْقَلِبُوا صاغِرينَ ﴾ دوایی فیرعەون و جادوگەران ژێرکەوتن و شکان و دۆڕاندیان لەو جێگەدایە و، گەڕان بەسەرشۆڕو لاواز و چونەوە بۆ ناوشار بەنائومێدی و بەشەرمەزاری دوای ئەو فیزو خۆهەڵکێشانە و لەخۆبایی بونە ئەگەر بەوەیشەوە

بوەستانایە کەمی ســوکی ڕوی ئـەکردە فیرعـەون .بـەڵام کوتوپـڕ کـارێکی تـری تـاڵ و ناهەمواری تر یەخەی بەفیرعەون گرت. وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَألقي السَحرَةُ ساجدينَ ﴾ وەجادوگەران کەوتن بەدەما بەســوژدەبردن بـۆ خــوا و وای پێ کردن سوژدە ببەن هەتا فیرعەون بەتەواوی بیدۆڕێنێ لەبەردەم ئەوکەسانەدا ئەیان ویست موسا بشکێنن، ڕاستی هەر سەرئەکەوێ زوبێ یادرەنگ، مرۆڤ کە لەسەر ڕاستی بوو هەر سەرئەکەوێ بەیاریدەی خوا .

﴿ قالُوا آمَنّا بِرَبِ العالَمينَ ﴾ جادوگەران ووتیان: ئێمە باوەڕمان هێنا بەپەروەردەکەری هەمو بونـــەوەران کەهەڵســوڕێنەری کاروبـاری فرمانیانـە، فیرعـەون لـەوکاتـەدا ووتـی: مەبەستتان بەپەروەردەکەری بونـــەوەران منــە، ووتیـان تـۆ چیـت؟ هـەتا پەروەردەکـەری بونەوەران و هەڵسوڕێنەی کاروباریان بی. بەڵکو مەبەستمان :

﴿ رَبِ مُوسى وَهارُونَ ﴾ پەروەردەکەری موســاو هـارون و هــەمو بونەوەرانـە، ئـەو جادوگەرانە کەفیرعەون بەوانەوە پەلاماری بۆردانی موسا و هارونیان ئەدا ، بەپەرســتنەوە سەریان بۆ خوا دانەواند و سوژدەیان بۆ برد. نەك بۆ فیرعەون کەئەوانی هێنــابو بـۆ پـوچ کردنەوەی ڕاستی خوای پەروەردەکەری هەمو بونەوەران و ڕاستی ئاییني خوا .

بۆ زانین: لەمانای ئایەتی ( ١٠٢ ) ی سورەتی ئەلبەقەرەدا باسـی جادومـان بـەدرێژی کرد. ئێمە لەگەڵ کەسانێکی ئەوتۆین ناوەڕۆکێ بۆ جادو نابینن، ئێمە لـــەوێدا بەڵگـەمان داناوە لەسەر بێ ناوەڕۆکی جادو بــەڵام ئێمــە ئەمانــەی دواتــر، هـاوپێچ بکـەین لەگــەڵ ئەوانەی پێشو، بەڕاستی فــەرمودەی خــوا لـێرەدا. جادویـان کــرد لــەچاوی ئـادەمیزاد. بەڵگەی ئاشکرایە کــە بەڕاســتی جـادو نـاوەڕۆکی نیـە و بـێ ناوکـەو سـوکی دەســتەو بۆیەکردنـە، فـەرمودەیخوا ئەفـەرموێ: جـادوێکی گـەورەیان هێنـا ،یـانی لەبــەرچاوی دانیشتوان گەورەبو ئەوپەڕی گرتبو لەدرۆکردندا، جادو قەدەغەیەو پێغەمــەر ئەفـەرموێ: هەرکەسی بڕوا بۆلای جادوگەرو بڕوای پێ بکا ئەوکەسە بێ باوەڕە بەوەی خوا ڕەوانەی کردوەو .

زۆرترین لـەو زانایانـە مانـای قورئانیـان کـردوە ئـەڵێن: جادوگـەرانی فیرعـەون بـۆ جولاندنی دارو گوریسەکانیان فێڵیان سازاندبو بـەوەی جیوەیـان ئـەکردەناویان تابـەهۆی گەرمایی خۆرەوە بکەونە جم و جوڵ و هـاتوچۆ، هـەر هۆیـەکیان هـەبوبێ ئێمـە بـڕوای بێگومانمان هەیە کە جادوگەر درۆزنەو جگە لەگێل وگاوار نەبێ کەس بـڕوای پـێ ناکـا. ئەوەی جادوگەرانی فیرعەون کردیان و جادوگەرانی هیندوجگەی هیند ئەیکەن لـەوکارە سامناکانە بەبێ گومان ئەبێ هۆیەکیان هەبێ و بێهۆنین. ئێمە هەرچەندە جۆری ئەوهۆیانـە نازانین بەلام بەبێ گومان ئەزانین کەهیچ شتێ ناکۆڕن لە ڕەگەزێکـەوە بـۆلای ڕەگـەزێ. ئەگەر وانەبێ ئەبوایە توانای ئەوەیان هەبوایە زیانیان لەخۆیان دووربخستایەتەوە وبونایە بـە خاوەنی هەمو چاکەیەو جیهانیان بەویستی خۆیان و بەچنەچینیان داگیر بکردایـەو ئـازاری خۆیانیان نەدایە بۆ پەیداکردنی پارەو پول .

﴿ قالَ فِرعَونُ آمَنتُم بـهِ قَبلَ أن أذَنَ لَكُـم ﴾ فیرعـەون ووتـی بەجادوگـەران: ئێـوە باوەڕتان هێنا بەموسا بەرلـەوەی من دەستوربدەم. لەوئایەتەوە گێلی و گـەوجی فیرعـەون دەرئەکەوێ، چونکە فیرعەون ئەیەوێ بەویستی خۆی فەرمانبداو کاربکاتە سـەرکردەوەو ویستی دڵیان لەباوەڕهێناو خۆشەویستی و ڕق لێبوون. هیچ مرۆڤـێ نـاتوانێ دەسـتەلاتی هەبێ بەسەر نیازی دڵی ئادەمیزادا . بەلام ستەمکاران لەوە گێل وگەوج ترن.

﴿ إنَّ هذا لَمَكرٌ مَكَرتُموه فِي المَدينةِ لِتُخرِجُوا منها أهلَها فَسَوفَ تَعلَمونَ ﴾ بەڕاستی ئـەم کردەوەی ئێوە فێڵێکە ئێوەو موسا دروستتان کردوە لەناو شـاری میسـردا ،لەبەرئـەوەی ئێوە بەرلـەوەی ئێوە بچنە دەرەوە، دانیشتوانی ئەم شارەی میسـر کـەبریتین لـە قیتیـەکان دەریسان بکەن و بەنی ئیسرائیلیەکان جێگـەیان بگرنـەوە لـەم شـارەدا دانیشـن، دوایـی لـەمەوپاش ئێوە ئەزانن چیتان بەسەر دێنم، فیرعەون ئەوبوخنانەی ئەدایە پـاڵ جادوگـەران کەباوەڕیان بەموسا لەباوەڕەنەبوە. بەڵکو ڕاوێژێکی فێلاوی بـوەو پێـك هـاتون لەسـەری لەگەڵ موسادا، مەبەستیان دەرکردنی دانیشـتوانی میسـر بـوە، فیرعـەون ئـەدەی ووت و ئەشیزانی درۆ ئەکا لەترسی ئـەوەی نـەوەك دانیشـتوان دەسـت بدەنـەیاخیبون و بـاوەڕ

بەموسا بهێنن. بەلآم دانیشتوان ئەیانزانی جادوگەران بەباوەڕی ڕاستیەوە بڕوایان هێناوە بەموسا، موسا کۆنەبوەتەوە لەگەڵیان، چونکە فیرعەون ئەوانی کۆکردوەتەوە لێرەو لەوێ، فیرعەون بەشێوەیەکی کورت هەڕەشەی لێکردن، لەپاشا بەدرێژی یەوە ئەڵێ:

﴿ لأُقَطِعنّ أيديَكُم وأرجلَكُم مِن خِلافِ ثُمَ لأُصلُبَنَكُم أجمَعينَ ﴾ بەڕاستی دەست وپێی ئێوە ئەبڕم بەپێچەوانە. یانی دەستی ڕاست ئەبڕێ لەگەڵ پێی چەپدا وبەپێچەوانەیشەوە، لەپاشا من ئێوە هەڵئەواسم بەگشتی، ئەوجۆرە هەڕەشەیە چەکی ستەمکارانە بەرانبەر بەکردەوەی ڕاست .

﴿ قالُوا إنا الى رَبّنا منقلِبُونَ ﴾ جادوگەران ووتیان: هەڕەشەی کوشتنمان لێ ئەکەی و کارمان تێ ناکا، ئێمە ئاواتەخوازی مردنین زۆرتر لەخواردنەوەی ئاوی شیرین، چونکە ئێمە بەهۆی مەرگەوە بەڕاستی ئێمە بۆلای پەروەردەکەری خۆمان ئەگەڕێینەوە، پاشەڕۆژی هەموان بۆلای خوایە هەتا فەرمانی خۆی دیاریبکا. کەواتە چی ئەکەی بیکە، ئێمە نەخۆت ونەکوشتن بەهیچ نازانین .

﴿ وَما تَنْقُمَ مِنّا ألا أنْ آمَنّا بِآياتِ رَبِنا لِمّا جاءَتْنا ﴾ وەتۆ ڕقت لەئێمە نیەو تانەی تۆ لەسەر ئێمە نیە، هیچ گوناهێکمان نەکردوە سزای ئێمەی لەسەربدەی مەگەر ئێمە باوەڕمان هێناوە بەنیشانە ڕونەکانی پەروەردەکەری خۆمان کاتێ ئەونیشانەیە هاتن بۆلای ئێمە، باوەڕهێنانی ئێمەو سزادانمان لەسەر باوەڕهێنانی بەختیاری و ڕزگاری ئێمەیە کە ئێمە سەربەست ئەبین مردن زۆر چاکترە، دوایی لەخوا پاڕانەو ووتیان:

﴿ رَبّنا أفْرِغْ عَلَيْنا صَبْراً وَتُفنا مَسْلِمِيْنَ ﴾ ئەی پەروەردەکەری ئێمە: تۆ بڕێژە بەسەر ئێمەدا ئارم گرتن لەسەر ئەو ئازاردانەی ئێمە هەتا خەفەت نەخۆین و تۆ گیانی ئێمە بکێشە لەسەر ئایینی ئیسلام و لەسەر باوەڕبەخۆت و بەپێغەمەر و بەڕێگەی ڕاستی خۆت.

وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوۡمَهُۥ لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَنَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ وَإِنَّا فَوۡقَهُمۡ قَٰهِرُونَ ﴿١٢٧﴾ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ

ٱسْتَعِينُوا بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓا۟ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوٓا۟ أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن تَأْتِيَنَا وَمِنۢ بَعْدِ مَا جِئْتَنَا قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٢٩﴾

﴿ قالَ المَلا مِنّ قَومِ فِرْعَونَ أتَذَرَ مُوسى وَقَوْمِهِ لِيُفسُدَوا في الارْضَ ﴾ تاقمیْ لەپیاو ماقولآنی گەلی فیرعەون ووتیان: ئایا تۆ واز لە موساو خزمەکانی ئەهێنی بۆ ئەوەی خراپە بلآوبکەنەوە لە نێو زەوی میسردا؟ دانیشتوان لەتۆ بگۆڕن بەهۆی پەرستنی خوای تاك وتەنها و واز لوخوایەتی تۆ بهێنن، ئەو وتووێژەیان پاش ئەو کۆبونەوەیە بو کەموسای تێداسەرکەوت و ئابڕوی فیرعەونی تێداچو ،موسایش بانگی دانیشتوانی کرد بۆلای پەرستنی تاك وتەنها، بەوبۆنەوە کۆمەڵێکی زۆر لەدەوری موسا کۆبوبونەوە، بۆیە پیاوە گەورەکانی گەلی فیرعەون ترسان کاروباری ڕژێمان لێ بگۆڕیۆ ببێتە هۆی نەمانی خۆیان وفیرعەون، بۆیە فیرعەونیان لەموسا هاندا و ووتیان: تۆ هەتاکەی بێدەنگ ئەبی لەموساو ووازی لێ ئەهێنی زەوی میسر کاول بکاو لەدژی تۆ هەڵسێ .

﴿ وَيَذَرَكَ وَالِهَتَكَ ﴾ وەموسا واز لەتۆو پەرستنی خواکانی تۆ ئەهێنێ، ئەوڕستەیە وائەگەیەنێ فیرعەون چەندین خوای هەبوە بۆ پەرستن، ئەوەیش بەڕواڵەت دژی ئەوەیە: کە فیرعەون ئەیوت: نازانم ئێوە خواتان هەیە جگەی من؟ من خوای گەورەی ئێوەم، زانایان وەڵامیان داوەتەوە: فیرعەون چەندین خوای هەبوەو گومانیشی وابوە کوخۆی کوڕی خۆشەویستی ئەوانە، هێز و توانای خۆی لەوانەوە وەرئەگرێ، هەر خۆی بەتەنها مافی ئەوەی هەیە بەناوی خواکانەوە فەرمان دەربکا، ەومافەدا کەس هاوبەشی ئەونیە .

﴿ قالَ سَنُقَتِّلُ أَبْناهُمْ وَنَسْتَحيِي نِسائَهُمْ ﴾ فیرعەون ووتی: ئێمە لەمەوداو وبەم نزیکە کورەکانیان ئەکوژین و ئێمەژنەکانیان بەوزیندویی ئەهێڵینەوە بۆ کارەکەری خۆمان. فیرعەون بەر لەدایکبونە موسا ئیسرائیلیەکان هەرمناڵێکی نێرینەیان ببوایە ئەی کوشت و مێینەکانی ئەهێشتەوە. کاتێ پیاوەگەورەکان هانی فیرعەونیاندا لەدژی موسا ووتی: ڕەوشتە کۆنەکەی خۆمان ئەگێڕینەوە بەکوشتنی کورەکانیان و هێشتنەوەی ژنەکانیان هەتا بنەبڕئەبن .

﴿ وَأَنَا فَوْقَهُمْ قاهِرُونَ ﴾ وەئێمە بەڕاستی بەسەر ئەوانا زاڵ ئەبین و ئەوان ئەکەین بەژێردەستەی خۆمان لەپاش ئەوکارانە ئێمە بیکەین، کاتێ ئەوکردارە دڵنەتەزێنە ناهەمو ارە توشی بەنو ئیسرائیلیەکان هات سکالأی خۆیان بردە لای موسا .

﴿ قالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ أَسْتَعِيْنُوا بِاللهِ وَأَصْبِرُوْا ﴾ موسا بەگەلەکەیخۆی ووت: داوای یارمەتی و کۆمەکی لەخوا بکەن وئارام بگرن لەوەی توشتان ئەبێ، چونکە ئێوە هەر خواتان هەیە و ئەویشە بگاتە فریاتان و کورِ و ژنەکانتان ڕزگاربکا، موسا فەرموی :

﴿ أَنَ الارْضَ لله يُورِثُهَا مِنْ يَشْاءَ مِنْ عِبْادِهِ ﴾ بەڕاستی ئەم زەویەی میسر و هەمو زەویەکانی تر بۆ خوایە ئەیکا بەمیرات بۆ کەسێ ئارەزووی هەبێ لەبەندەکانی خۆی، ئەو ڕستە موژدەیە بەوە کە قیبتیەکان فەرمانڕەواییان نامێنێ و کوڕانی ئیسرائیل جێگەی ئەوان ئەگرنەوە لەفەرمانڕەواییدا ،وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ وَالعْاقِبَةُ لِلْمُتَقِيْنَ ﴾ وەپاشەڕۆژ و ئەنجامی چاك بۆ ئەو کەسانەیە خۆیان ئەپارێزن لە خراپە لەئێوەو جگەی ئێوە لەهەردووجیهاندا.

﴿ قالُوا أُوْذِينا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَأْتِنَا وَمِنْ بَعْدِ كا جِئْتَنا ﴾ نەوەکانی ئیسرائیل ووتیان: ئێمە ئازارمان دراوە لەلایەن قیبتیەکانەوە لەپێش ئەوەی کە تۆ هاتیتەوە بۆلای ئێمەو بکرێی بەپێغەمەر، ئازارمان دراوە بەکوشتنی کورەکانمان وبەکارەکردنی ژنەکانمان و، لەدوای ئەوەیش تۆ هاتیتەوە بۆلای ئێمە کرای بەپێغەمەر ی خوا، لەوکاتەدا ئیسرائیلیەکان ئەوەیان ووت موسا فەرموی:

﴿ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي الأَرْضِ ﴾ شایان و شایستەیە کە پەروەردەکەری ئێوە کە لەناو ببا دوژمنی ئێوەو لە ناویشیان ئەبا بە گرانی و بە خنکان و شتی ترو، ئێوە لە دوای ئەوان بکا بە جێگە نشینی دوژمنەکانی خۆتان لە زەویی میسردا، ئەو داوایە هاتە دی .

﴿ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴾ دوایی پەروەردەکەری ئێوە ئەبینێ چۆن کار ئەکەن لە سوپاس و بێ سوپاسی و لە پەرستن و بێ فەرمانی، دوایی پاداشتان ئەداتەوە بە گوێرەی کردەوەی خۆتان موسا بە گەلەکەی خۆی ووت: گرنگی لەوەدانیە کە دوژمنەکانتان لەناو بچن و ئێوە جێگەیان بگرنەوە لەزەویدا. بەلاّم گرنگی لەوەدایە ئێوە خوا بپەرستن و چاکە بکەن و خراپە بلاّو نەکەنەوە، بە پێچەوانەوە کارو کردەوەی زۆر خراپیان کردوو پێغەمەران و پیاوچاکانی زۆریان کوشت لەو سەردەمەی پێشودا. لەم سەردەمەی ئێمەیشدا ڕژێمێکیان پێکەوە ناوە ناویان ناوە ئیسرائیل جگە لە کوشتن و دەربەدەرکردنی دانیشتوانی فەلەستین خاوەنی هیچ دەستورێ نین، هەروەك زۆربەی ڕژێمەکانی جووەکانی دوای موسا. بۆ نمونە لە ساڵی (١٩٤٨) لە ئیسرائیلدا نامەیەکیان دەرکرد بەناوی (سیاخ لوخامیم) یانێ کارو گفتوگۆکانی سەرباوزەکان، ڕۆژنامەی ئەلئەهرامی میسری هەندێ لەوەی هاتبوو لەو نامەیەدا لە ڕۆژی (١٩٦٨/٨/٢٣) گۆڕی بۆلای عەرەبی، ئەمەیش دەقەکەیەتی کەمن گۆڕیومە بە کوردی :

(هەرکەسێ نەیتوانی پیاوێ بکوژێ یا خانویێ بڕوخێنێ بەسەر ئەو کەسەدا لەناویا دانیشتوە دوایی چاکتر بۆ ئەو ئەوەیە بچێتە ناو خانوەکەی، بەڕاستی بزوتنەوەی زاوێنی لەسەر ئەو بنچینەیە وەستاوە، ئەوکاتە هاتبنە نێو خاکی فەلەستین و گەلێکی تری تێدا دانیشتبوو لەنێویدا و ئەژیان، نابێ ئێمە چاوەڕوانی ئەوە بکەین بە ڕەزامەندی خۆشی خۆیان کێڵگەو خانوەکانیامان بۆبەجێ بهێڵن، دوای ئێمە بیان کوژین و کێڵگەو خانوەکانیان لێ داگیر بکەین، یان بە کوشتن بیان ترسێنین هەتا خۆیان ڕابکەن و واز لە خانوو کێڵگەکان ئەهێنن) .

جگەی ئەوانیش پارتی بەعسی سۆسیالیس وێنەی ئەو کارەی ئەوانی بەکارهێناوە دەربارەی کوردەکان بەبێ جیاوازی، تورکەکانی ئەتاتورکی لەوان کەمتر نین .

لەمەوپاش خوای مەزن بۆمانی ڕون ئەکاتەوە کە دوای ئەوەی کوڕانی ئیسرائیل ئازاریاندرا لەلایەن فیرعەون و دەزگاکانیەوە بە ستەمم کردن ، خوا تاقمێ فیرعەونی گیرۆدە کرد بە زۆر شتی گران و ناهەموار، وەك خوا ئەفەرموێ:

وَلَقَدْ أَخَذْنَا آلَ فِرْعَوْنَ بِالسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ فَإِذَا جَاءَتْهُمُ الْحَسَنَةُ قَالُوا لَنَا هَٰذِهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُ ۗ أَلَا إِنَّمَا طَائِرُهُمْ عِندَ اللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣١﴾ وَقَالُوا مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِ مِنْ آيَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ آيَاتٍ مُّفَصَّلَاتٍ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿١٣٣﴾

﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنا آلَ فِرْعَوْنِ بِالْسِنْينَ وَنَقْصٍ مِنْ الثَمَراتِ لَعَلَهُمْ يَذْكَّرُونَ ﴾ وەئێمە گەلەکی فیرعەونمان تاقی کردەوە بە چەندین ساڵێ لە گرانی و کەم ئاوی و بە کەمبوونەوەی میوەو بەروبومەکانیان و بە نەخۆشی زۆر، ئەوانەیش پاش ئەوەی فیرعەون خۆی هەڵئەکێشا بە هەرزانی و خۆشی زۆرە کەچی نەگبەتی بەسەرهێنا، بۆ ئەوە شایانی

ئەوەبن ئامۆژگاری وەربگرن و لەبێ باوەڕی پەشیمان ببنـەوە \و هەسـت بـە بـەد فـەڕی خۆیان بکەن .

﴿ فإذا جاءَتْهُمُ الْحَسَنَةُ قالُوا لَنا هذهِ ﴾ کاتێ بهاتایە بۆلای ئەوان لـە هـەرزانی ئـەیان ووت: ئەو شتە بۆ سودی ئێمە و خۆمـان شـایانی ئەوانـەین. هیـچ شـتێکیان لـە خـواوە دانەئەنا هەتا سوپاسی بکەن لەگەڵ ئەوەیشدا چاکەی زۆری پێ بەخشیوون.

﴿ وَإنْ تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يُطَيِّرُ بِمُوسى وَمَنْ مَعَهُ ﴾ وەهەرکاتێ خراپەیە توشی ئـەوان ببوایـە باکەمیشبوایە ئەوان نا پیرۆزییەکەیان ئەدایە پاڵ موساو کەسێ لەگەڵ ئەودا بـوو بـاوەڕی هێنا، لە موساو باوەڕدارانیان ئەقڕان. خوا وەڵامی دانەوەو فەرمووی:

﴿ ألا إنّما طائِرُهُمْ عند الله ولكنّ أكثرهم لا يعلمون ﴾ ئاگادار بـن و بزانـن بەڕاسـتی ئەو گرانیەو بەشی دیاری کراوی ئەوان لە چاکەو لە خراپە لەلای خوایەو بـەهۆی هیـچ کەسێکەوە نیە جگەی خواو، زۆرتر لەو قیبتانە نازانن کە هەموو خراپەو نەگبەتی بـەوان ئەگا هۆی کردەوەی خراپی خۆیانە .

﴿ وَقالُوا مَهْما نأتِنا بِهِ مِـنْ أيـةٍ لِتَسْـحَرْنا بِـها فما نَحْـنُ لَـكَ بِمُؤْمِنِـينَ ﴾ تاقمەکـەی فیرعەون بە موسایان ووت: هەرشتێ تۆ ئەی هێنی لە نیشـانەی ئاشـکرا کـە بـە گومـانی خۆت کاری پەك خەرن لەبەر ئەوەیە تۆ جادوو بکەی لە ئێمە بـە هـۆی ئـەو نیشـانەوە، دوایی ئێمە باوەڕ بە تۆ ناهێنین، ئەو ڕستەیە بڕیاردانە بەوەی ئەوان واز لە ڕاستی ئەهێنن و ناتوانن لە دژی ئەو نیشانە بوەستن و دڵ ڕەقی خۆیان دەرئەبڕن. کەواتە خـوا گیرۆدەیـان ئەکا بە پێنج سزای گەورە:

١- ﴿ فأرْسَلْنا عَلَيْهِمْ الطُوفانَ ﴾ دوایی ناردبومانە سەریان لافاوی ئاوی باران، دوایـی ئەو لافاوە هەموو کشت و کاڵی داپۆشین و درختەکانیانی هەڵکێشا لەبن.

٢- ﴿ وَالْجَوادَ ﴾ وەناردبومانە سەریان کولـە، ئەوەی مابوەوەو سەوزبوبو لە پاوەن و سەوزایی خواردیان .

٣- ﴿ وَالْقُمَّلَ ﴾ وەناردبومانە سەریان ئەسپێ بۆ ئازاردانی خۆیـان و گەنـە پیـش بـۆ ئازاردانی ئاژاڵەکانیان و ئەسپێ تریش بۆ خواردن و پوچ کردنەوەی دانەوێڵـەکانیان، بـە هۆی ئەوانە نەخۆشی بلاّو ببێتەوە .

٤- ﴿ وَالضَفَادِعَ ﴾ وەئێمـە ناردبومانـە سـەریان بۆقـەکان کـە ئەکەوتنـە نێـو ئـاو خواردنەوەیان بەجۆرێ ژیانی لێ تێکدابوون و ئەپەڕینە ناو دەمیان .

٥- ﴿ وَالدَمْ ﴾ وەئێمـە ناردبومانـە سـەریان خوێـن، بـەجۆرێ ئـاوی خواردنـەوەیان ئەگەڕا بە خوێن، لوت و پوکیان ئەپژاو خوێنیان بەرئەبوو.

﴿ أياتٍ مُفَصلاتٍ ﴾ ئەو نیشانانە ڕوون کرابوونەوە بۆ هەموو کەسـێ و لـە توانایـان نەبوو بە درۆی بخەنەوە، یەك لەدوای یەك پەیدا ئەبوون و حەفتەیە بەردەوام بوون .

﴿ فأستَكْبَرُوا وَكانُوا قَوْماً مُجْرِمِيْنَ ﴾ دوایی ئەوان داوای گەورەییان ئـەکرد بۆخۆیـان و ستەمیان کرد لـە فەرمان ڕەوایێدا و باوەڕیان نـەهێناو، ئـەوان تـاقمێکی تاوانبـاربوون و باوەڕیان بە خوا نەبوو لـە دوای ئەوانەی باسکران خوا هەواڵمان ئەداتێ بە چۆنیەتی ئـەو بێ باوەڕانەو بەسەرهاتیان و ئەفەرموێ:

وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ ٱلرِّجْزُ قَالُواْ يَـٰمُوسَى ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا ٱلرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٣٤﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلرِّجْزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَـٰلِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿١٣٥﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَـٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا وَكَانُواْ عَنْهَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٣٦﴾

وَأَوْرَثْنَا ٱلْقَوْمَ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلْأَرْضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا ۖ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُوا۟ ۖ وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُۥ وَمَا كَانُوا۟ يَعْرِشُونَ ﴿١٣٧﴾

﴿ وَلَما وَقَعَ عَلَيْهِمْ الرِجْزُ ﴾ وەهەموو كاتێ تووشی ئەوان ببوایە ئەو سزایانەی ڕابورن لە تۆقان و ئەوانی تـرو بکەوتنایـە سـەریان بـەهۆی لادانیـان لـە ڕاستی پـەلاماری لای موسایان ئەدا .

﴿ قالُوا يا موسـا أدْعُ لَنـا رَبَّـكَ بِما عَـهِدَ عِنْـدَكَ ﴾ بـە موسـایان ئـەوت لـە ڕووی پاڕانەوەوە: ئەی موسا تۆ داوا بکە لە پەروەردەکەرت بۆ ئێمە بە هۆی پەیماندانێ بۆتۆ کە وولامی پاڕانەوەی تۆ ئەداتەوە.

﴿ لَئِنْ كَشَفْتَ عَنا الرِجزُ لِمُؤْمِنَنَ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَني إسْرائيل ﴾ بەڕاستی ئەگەر تۆ لابدەی لە ئێمە ئەو سوزایانە ئێمە بێگومان باوەڕ بەتۆ ئەهێنین و بەو شتانەی تۆ هێنـاوتن، بەڕاستی ئێمە ڕەوانە ئەکەین لەگەڵ تۆ بەنی ئیسرائیلی بە خۆیان و بە سـامانیانەوە، بـۆچ جێگەیە ئەتەوێ با بڕۆین .

﴿ فَلَما كَشَفْنا عَنْهُمْ الرِجْزُ إلى أجْلٍ هُمْ بِالفُوهُ إذاهُمْ يَنْكَثُونَ ﴾ دوایی هـەرکاتێ ئێمـە لامان بدا بەلـەسەر ئەوان بەهۆی دواکردنی موساوە بۆلای کاتێکی ئەوتۆ بۆیـان دانرابـوو کە کاتی لـەناو بردنیان بو بە خنکانی ئاوی دەریا، کوتوپـڕ ئـەوان بەڵێنەکـەیان شـکاندو جێ‌بەجێیان نەئەکرد هەر بەلاچوونی ئەو سزایە دەستیان ئەدایەوە خراپەکاری .

هەروەها هەموو کاتێ تووشی سزا بوبونایە دەستیان ئـەکرد بـە پاڕانـەوە هـەتا توشـی سزای پێنج هـەمبوون کـە ئـەویش لـەناوبردنیان بـوو بەیـەك جـاری و خـوا تۆڵـەی لێ کردنەوە، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ فَأنْتَقَمْنا مِنهُمْ فَأغْرَقْناهُمْ في اليَمِ ﴾ دوایی ئێمە تۆڵەمان لەوان کردەوە بە یەکجاری، دوایی ئەوانمان خنکان بە ئاوی دەریای ئاوی سورو ئەوانمان خستە ژێر ئاو هەمویان مردن.

﴿ بِأنَهُمْ كَذَبُوا بِأياتِنا وَكانُوا عَنْها غافِلِيْنَ ﴾ بەهۆی ئەوەوە بەڕاستی ئەوان باوەڕیان بە نیشانە ڕونەکانی ئێمە نەهێنابوو بە درۆیان ئەخستنەوەو خوایان بەیەك دائەنا، وەئەوان بێ ئاگابوون لەو نیشانە ڕونانەی ئێمەو نەیان ئەزانی ڕۆژێ ئەبێ توشی سزای ئێمە ئەبن .

﴿ وَأوْرَثْنا الْقَوْمَ الذيْنَ كانُوا يُسْتَضْعَفُونَ مَشارِقَ الأرْضِ وَمِنا وَمَغارِبِها التي بارَكْنا فِيْها﴾ وە ئێمە ئەو گەلەی ئەوتۆ بەلاواز دائەنراو ئەکران بە بەندەو کوڕەکانیان ئەکوژراوو ژنەکانیان ئەکردن بەکارەکەر دامان نان لە جێگەکانی خۆرهەڵاتی زەوی شام و جێگەکانی ڕۆژئاوای زەوی کە بریتی بوو لە نێوان شام و میسردا ئەو زەویەی ئەوتۆ ئێمە پیت فەرمان دروست کردبوو لەنێویدا، بە هەرزانی و چەندین میوەی هەمەڕەنگ و کانیاو ڕوباری یەکجار زۆر، پتر لەوانە جێگەی ناردنی زوربەی پێغەمەرانە .

﴿ وَتَمْتَ كَلِمَةُ رَبِكَ الْحُسْنى عَلَى بَني إسْرائيلَ بِما صَبَرُوا ﴾ وە فەرمودە شیرینترینی پەروەردەکەری تۆ تەواو بوو بەردەوامبو بەسەر کوڕانی ئیسرائیلدا کە خوا بەڵێنی دابوو سەریان بخا بەسەر دوژمنەکانیاو لە جێگەی ئەواندا دایان نێ بەهۆی ئارام گرتنیان لەسەر ئەو ئازارو ئەشکەنجەیە توشیان بوبو ئەوەبو خوا گەلی فیرعەونی لەناو بردو ئەمانی لە جێگەی ئەوان دانا .

﴿ وَدَمَرْنا ماكانَ يَصْنَعُ فِيرْعَونُ وَقَوْمَهُ وَما كانُوا يَعْرِشُونَ ﴾ وەئێمە تێکمان داو کاولمان کرد شتێ فیرعەون گەلەکی ساختەیان هێنا لە کۆشك و قەڵای بەرزو شوێنی خۆش و، ئێمە کاولمان کرد شتێ ئەوان بەرزیان کردبوەوە لە کۆشك کە چوبو بە ئاسماندا بەرزیەکەیان .

مێژوو نووسان ئەڵێن: دوای خنکانی فیرعەون و ماوەیەکی درێژو لە دوایی کۆچی دوایی موسا و هارون لەنێو بەنی ئیسرائیلی دوو پێغەمەری تریان لێ پەیدابوو بەناوی داودو سولەیمان، ڕژێمێکی داد پەروەرانەیان پێك هێنا بوون بە خاوەنی سنوری خۆیان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا. بەڵام زۆری پێ نەچوو دوای سولەیمان و داوود دەستەڵاتیان لە

کیس چوو. بەختە نەمر نیشتمانەکەیانی داگیرکردو دانیشتوەکانیان کردن بە بەندەو دیلی کردن، پاش ئەو فارسەکان، دووای ئەوان ئەسکەندەر دووای ئەوان ڕۆمانەکان .

مێژوو نووسان ئەڵێن: زۆرتر لە بیست ساڵ موسا کۆششی پێ پایانی کرد لەگەڵ فیرعەون بۆ بلاو کردنەوەی فەرمودەی خواو ڕزگارکردنی بەنی ئیسرائیلی، دووایی فیرعەون و تاقمەکەی خنکان، لەو ماوەیەدا کاری پەکخەری زۆریان لەسەر دەستی موسا چاوپێکەوت، لەکۆتایی هەموویانا بە چاوی خۆیان بینیان چۆن دەریای سووردای بەسەر فیرعون و لەشکرەکەیداو هەموویانی خنکان لەسەر ئەو هەمووە نیشانە ڕونانەدا داوایان لە موسا کرد پەیکەری بتێکیان بۆ پێك بهێنێ لەو کاتەدا کە چاویان کەوت بە کۆمەڵێ بتیان ئەپەرست، ئەگەر خۆیان بەبێ پرسی موساا بتیان دروست بکردایە جێگەی سەرسوڕمان نەبوو، لە هەمووشتێ سەیرتر ئەوەبو داویان لەموسا ئەکرد بۆ دروست کردنی بت بۆیان !! کەچی ئەیانزانی موسا بە درێژی تەمەنی خۆی لە دژی بت پەرستی بووە، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ:

وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٩﴾ قَالَ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِيكُمۡ إِلَٰهٗا وَهُوَ فَضَّلَكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَإِذۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُقَتِّلُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن

رَبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿١٤١﴾

﴿ وَجاوَزْنا بَنِي إسْرائيلَ الْبَحْرِ ﴾ وەئێمە بەنو ئیسرائیلیەکانمان پەڕاندنەوە لە دەریای سور بەبێ ئازار دووای خنکانی فیرعەون تاقمەکەی، ئەگێڕنەوە موسا لە ڕۆژی (١٠)ی مانگی موحەڕەم کە پەڕیوە سوپاسی خوای کردو بە گرتنی ڕۆژ لەو ڕۆژەدا .

﴿ فأتَوْا عَلَى قَوْمٍ يَعْكَفُونَ عَلَى أصْنامٍ لَهُمْ ﴾ دوایی پەڕینەوەیان لە دەریا کە بەنو ئیسرائیلیەکان دایان بەلای تاقمێکا بەردەوامبوون لەسەر پەرستنی چەندین بتێ کەبۆ خۆیانیان دانابوو.

زانایان ئەڵێن: پەیکەری ئەو بتانە لە شێوەی گوێرەکەدا بوون کە کەنعانیەکان دانیشتوی سەرکەناری دەریا ئەیان پەرستن.

﴿ قالوا يا موسى أجعَلَ لَنا إلها كماهم آلهة ﴾ کوڕانی ئیسرائیل ووتیان ئەی موسا: تۆ دروستی بکە بۆ ئێمە خوایە بیپەرستین بە وێنە چەنیدن خوایە ئەم تاقمە ئەیپەرستن و بۆ خۆیانیان داناوە .

﴿ قالَ إنَكُمْ قَوْمٌ تَجْهلُوْنَ ﴾ موسا فەرموی: بەڕاستی ئێوە تاقمێکی نەزان و نافام و نەخوێنەوارن، چۆن ئێوە داوای پەرستنی جگەی خوا ئەکەن و بە بینی ئەو هەموە ڕوداوانەی پێشوو تەمێ خوار نەبوون، چۆن ئێوە داوای ئەو کارە خراپە لە من ئەکەن و خۆتان ئەزانن من دژی بت پەڕستیم و لە ماوەی تەمەنما هەوڵی سەپاندنی یەکێتی خوام داوە .

﴿ إنّ هَؤُلاءِ قَومٌ مُتَبَرٌ ماهُمْ فِيهِ وَباطِلٌ ماكانُوا يَعْلَمُونَ ﴾ بەڕاستی ئەو تاقمە بت پەرستانە کۆمەڵێکن لەناو ئەبرێن و ئەو شتەی ئەوان لەناویدان و، خوا ئایەتەکەیان نایەڵێ و، پوچە شتێ ئەوان ئەیکەن لە بت پەرستی. موسا یەکەم جار وولامی گەلەکەی خۆی دایە بەوەی ئەوان نەزانن دووهەم جار هەواڵی پێدان کە پاشەڕۆژی بت پەرستان لەناو چونەو تووشی زیان ئەبن .

﴿ قالَ أغَيْرَ اللهِ أبْغِكُمْ إلَهاً وَهُوَ فَضَلَكُمْ عَلَى الْعالَمِينَ ﴾ موسا فەرموی: ئایا من جگەی خوا داوا بکەم ئێوە بیپەرستن، هیچ شتێ شایستەی پەرستن نی‌یە لە جگەی خـوا. کـەچی ئێوە بەچاوی خۆتان بینیتان خوا چ شتێکی بەسەر فیرعەون و تاقمەکەیا هێناو، خوا رێـزی ئێوەی داوە بەسەر هەموو بونەوەرانی ئـەم سـەردەمەی خۆتانـا. بەهـەر شـێوەیە بـێ ئـەو رێزانەی ئەوان بەسەر فیرعەون و تاقمەکەیا ئەوە ناگەیەنێ بەرێزو گەورە بژمێرێن بەرانبەر بە هەموو بونەوەرانی پێش و باشی خۆیان.

﴿ وَإذا أنْجَيْناكُمْ مِنْ آلِ فِيْرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذابَ ﴾ وەئێـوە بـیری ئـەوە کاتـە بکەنەوە ئێمە ئێوەمان رزگارکرد لە ئازار\دانی تاقمی فیرعەون بۆ ئێوە، ئەو تاقمە ئـەچێژن بە ئێوە سەخت ترینی سزا. مانای ئەو ئایەتە لە باسی مانـای ئایـەتی (٤٧)ی ئەلبەقـەرەدا کراوە .

﴿ يُقَتِلُونَ أبْناكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِساءَكُمْ ﴾ ئەیان کوشت کورەکانی ئێوە هـەتا ئێـوە بنـە بکەن و، ژنەکانی ئێوەیان بە زیندویی ئەهێشتەوە بۆ خزمەت کردن و کارەکەری .

﴿ وَفِي ذلِكُمْ بَلاءٌ مِنْ رَبِكُمْ عَظِيمٌ ﴾ لەرزگارکردن و سزادان و تاقی‌کردنـەوەی ئێـوە بەو کارانەی پێشوو چاکەو ئـازارێکن لەلایـەن پـەروەردگاری خۆتانـەوە زۆر گـەورەن، لەلایەکەوە چاکەیەو لەلایەترەوە ئازارە. مانای ئەو ئایەتە لە باسی مانای ئایـەتی (٤٩) ی سورەتی ئەلبەقەرەدا کراوە موسـا داوای کـرد لـە خـوای مـەزن نامەیـەکی بـۆ بنێرێتـە خوارەوە رانموویی ئادەمیزادی پێ بکا، پێویستی هەردوو جیـهانیان جێبـەجێ بکـا، خـوای مەزن وولامی دایەوە بەم جۆرەی خوارەوە:

وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗۚ وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ

رَبَّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٤٣﴾ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَكَتَبۡنَا لَهُۥ فِي ٱلۡأَلۡوَاحِ مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡعِظَةٗ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ فَخُذۡهَا بِقُوَّةٖ وَأۡمُرۡ قَوۡمَكَ يَأۡخُذُواْ بِأَحۡسَنِهَاۚ سَأُوْرِيكُمۡ دَارَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿١٤٥﴾

موسا بەڵێنی دا بە کوڕانی ئیسرائیل هەرکاتێ فیرعەون و دوژمنەکانی لەناوچوون نامەیەکیان لەلای خواوە بۆ ئەهێنێ، هەموو کارو کردەوەی ڕۆژانەیان بۆ ڕون ئەکاتەوە لە کردە ڕەواکان و قەدەغە کراوەکان، خوا وەڵامی جێبەجێ داواکەی موسای دایەو فەرموی:

﴿ وَوأعَدْنا مُوسى ثلاثين ليلة واعمناها بعشر ﴾ وە ئێمە بە لێنمان دابوبە موسا نامەیەکی بۆبنێرین لەماوەی (٣٠) شەودا، فەرمانی دا بەموسا ڕۆژی ئەو سی ڕۆژە بەڕۆژوو بێت،هەتا بەو بۆنەوە پاکتر ببێتەوەو خۆی لێمان نزیك بکاتەوە بە بەدەنێکی

پاكترەوەو، ئێمە كۆتاییمان بەو سی شەوە بە (١٠)ە شەوی تر هێنا. زانایـان ئـەڵێن: ئـەو بەڵێنە لەیەكەم شەوی مانگی زیلقەعیدە دەستی پێ كردو ناردنی نامەكەیش كۆتـایی پێ هات لە شەوی دەهەمی مانگی زیل حیجە .

﴿ فَتَمَّ مِقاتُ رَبِهِ أرْبَعينَ لَيلَة ﴾ دوایی تەواو بوو كاتێكی ئەوتۆ پەروەردەكـەری موسـا دیاری كرد بۆ ڕۆژوگرتنی موساو دیاری پەرستی خوا بە چل شەوی تەواو. یانـێ هـەموو ئـەو كاتـەی كـە خـوا دیـاری كردبـوو لـەیەكـەم جـاری بەڵێنـەوە هـەتا تـەواوبوونی هاتنەخوارەوەی نامەكەی خوا گەیشتە چل شەوو ڕۆژ. كەواتە نـاوبردنی شـەو بـە تەنـها لەبەرئەوەیە كات لەشەوەوە دەست ئەكرێ بە هەڵبژاردنی .

﴿ وَقالَ لأخيهِ هارُونَ أخْلُفني في قوبي ﴾ وەموسا بە هارونی برای خۆی كە هارون بوو پێی فەرمو: تۆ جێگە نشینی من بە لەناو تاقمی مندا هەتا من دێمەوە بـۆلای تـۆو ئـەوان، چونكە من ئەچم بۆلای كێویی توری سینا بۆ هێنانی ئەو نامەیە خوا بەڵێنی پێداوم .

﴿ وَأصْلِحْ وَلا تَتبَعْ سَبيلَ الْمُفيدِينَ ﴾ وەتۆ ئەوەی پێویستەو چاكەیـە بۆیـان جێبـەجێ بكە لە فەرمانی خواو لە كاروباری ڕۆژانەیان و، تۆ پەیڕەوی ڕێگەی خراپەكاران مەكـە، ئەگەر یەكێ لەوان كردەوەیەكی ناجوری كرد خۆت و ئەوانـەی لەگـەڵتن ئامۆژگاریـان بكەن، ئاگاداریان بە ئەوانە لەمەوبەر دەرونیان بە پت پەرستی ئاودراوە، هارون بە دڵێكی گەشەوە ئامۆژگاری موسای وەرگرت .

﴿ وَلَما جاءَ مُوسى لِمِقاتِنا وَكَلَمَهُ رَبُهُ ﴾ وەكاتێ موسا هات بـە سـەردەمی ئـەو كاتـە ئێمە دیاریمان كردبوو كە بێت بۆلای ئێمە بۆ پاڕانەوە لـە ئێمـەو، پەروەردەكـەری موسـا گفتوگۆی لەگەڵ كرد. ئـەبێ بزانـرێ ئـەو گفتوگۆكردنـەی خـوا بـەبێ نوێنـەر بـووە، ڕاستەوخۆ فەرمودەی خوای مەزنی ئەبیست لە پشتی پەردەوە، نەك لە تەنها لایەكەوە .

﴿ قالَ رَبي أرني أنْظُرْ إلَيْكَ ﴾ موسا ووتی: ئەی پەروەردەكەری من تۆخۆتم پێ نیشـان بدەو بۆم ساختە بهێنە من تەماشای تۆ بكەم، من زۆر ئارەزۆمەندی بینینـی تـۆم، ئەمـەوێ بەختیاریم زۆرتر ببێ هەروەك فەرمودەت ئەبیسم .

﴿ قالَ لَنْ تَراني ﴾ خوا فەرموی: تۆ من نابینی لە جیهاندا، چونکە زانیاری بێ ژمارەی من بڕیاری نەداوە بگونجێ ئەو داوایەی تۆ بۆ چاوپێکەوتنی من. داواکردنی موسا هیچ خراپەیەکی تێدا نیە، چونکە دەرونی مرۆڤ ئەیەوێ هەموو شتێ بزانێ. بە تایبەتی چاوپێکەوتنی خوا بەو پیرۆزیە .

﴿ وَلكِنِ أنْظُرْ إلى الْجَبَلَ فَأنْ أسْتَقَرَ مَكانَهُ فَسَوْفَ تَراني ﴾ وەبەلاّم تۆ تەماشی ئەو کێوە بکە، دوایی ئەگەر ئەو کێوە لە جێگای خۆیا مایەوە هەروەك ئێستای و ڕزاڵ ڕزاڵ نەبوو، دوای ئەوە من تۆ ئەبینی. موسا ڕووانی بۆلای کێوە هەتا خوا ببینێ کەچی کێوە ڕوچوو نیشانەی نەمایەوە، خوای گەورە بەو کردارە ویستی لە موسا بگەیەنێ چاوپێ کەوتنی خوا لە جیهاندا ناگونجێ.

﴿ فَلَما تَجَلى رَبُهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دكّا ﴾ دوایی کاتێ پەروەردەکەری موسا بۆ کێوەکە دەرکەوت بەجۆرێ شایانی ڕێزی خوابێ. یانێ لە جێگەی دیاری کراوی لای چەپ و لای ڕاست و سەرەوە لای خوارەوە نەبوو. خوا کێوەکەی کرد بە خۆڵ و یەکسان بوو لەگەڵ زەویداو بۆ بەدەشت .

﴿ وَخَرَ مُوسا صَعِقاً ﴾ وەموسا کەوت بەبێ هۆشی و ئاگای لەخۆی نەما، خوای مەزن بە میهرەبانی خۆی موسای هێنایەوە هۆشی خۆی، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ فَلَما أفاقَ قالَ سُبْحانَكَ تُبْتُ إلَيْكَ وَانا أوَلُ الْمُؤمِنينَ ﴾ دوایی کاتێ موسا هۆشی هاتەوە بە خۆیا ووتی: چاك و بێ گەردی بۆتۆ ئەی خوای مەزن من پەشیمانم بۆلای تۆ، لەو داوایەی لەتۆم کرد بۆ چاوپێکەوتنت و، من یەکەمین کەسێکم لەو کەسانە بە نیازی پاکەوە باوەڕیان بەتۆ هێناوە، بڕوام هەیە کەس لە جیهاندا تۆ نابینێ .

﴿ قالَ یا مُوسا إني أصْطَفَيْتُكَ عَلَى النـاسِ بِرِسـالاتي وَبِكَلامـي ﴾ دوای ئەوەی موسا پاڕایەوە لەخوا، خوا فەرموی: موسا بەڕاستی من تۆم هەڵبژارد بۆ پێغەمەرایەتی، ڕێزم داوی بەسەر ئادەمیزادی ئەم سەردەمەی خۆتا بەهۆی پەیامەکانی منەوە بە وێنەی پێغەمەرەکانی ترو، بەهۆی گفتوگۆکردنی من لەگەڵ تۆ بە تایبەتی و بەبێ میانجی گەری

کەسێ تر لەسەر کێوی تور. بەڵام جگە لە پێغەمەری ئیسلام خوا لە سیدرەتولمونتەهادا گفتوگۆی لەگەڵ فەرمو .

﴿ فَخُذْ ماأَتَيْتُكَ وَكُنْ مِنَ الّشاكِرِينَ ﴾ دوای تۆ وەربگرە شتێ من بەتۆم بەخشیوەو ڕێزی تۆم پێ گرتووە لە تەورات و بیکە بە یاسای ڕۆژانەی خۆت و گەلەکەت و، تۆ لەو سانە بە سوپاش گوزاری منن لەسەر ئەو خەڵاتە گەورەیە من بەتۆم بەخشیوە.

﴿ وَكَتَبْنا له فِي الأَلْواحِ مِنْ كُلِ شيءٍ ﴾ وەئێمە نوسیمان بە توانای دەستی بێ وێنەی خۆمان بۆ موسا لەنێو تەختەکانی تەوراتا لەهەموو شتێ لەکاروباری ئاییندا پێویستیان پێی هەبێ. هەندێ لە زانایان ئەڵێن مانای ئەو ڕستەیە بەم جۆرە: وە ئێمە فەرمانماندا بە جبرەئیل لە لەوحەکاندا بۆ موسا بنوسێ لەهەموو شتێ پێویستی پێی هەبێ .

﴿ مَوْعِظَةً وَتَفْصِيلاً لِكُلِ شَيْءٍ ﴾ هەموو شتەکانی بریتی بوون لە ئامۆژگاری کردن و شی کردنەوەو ڕون کردنەوە بۆ هەموو شتێ ، وەك ئەو شتانە پەیوندیان بە فروستادەیەوە هەیە لە باوەڕیان بەخواو بە پێغەمەران و بە ڕۆژی دوایی و فەرمانە دەستوریەکان کە کردەوە ڕەواکان و کارە قەدەغە کراوەکان .

﴿ فَخُذْها بِقُوةٍ وَأمُرْ قَوْمَكَ يـأخُذُوا بأحْسَنِيها ﴾ دوایی تۆ ئەی موسا تەختەکانی تەورات وەربگرە بە هەموو هێزو توانای خۆتەوەو بە نیازی پاك و چاکەو کاریان پێ بکەو، فەرمان بدە بە گەلەکەی خۆت دەست بگرن بە شیرینترین ناوەڕۆکی تەختەکانی تەورات لە ئارام گرتن و لێ بوردن و کارپێ کردنیان. ئەبێ بزانرێ هەموو شتێ خوا بینێرێ هەمویان چاکن. بەڵام هەیانە لەناو خۆیانا شیرینتر لە یەکتری .

﴿ سَأُورِيكُمْ دارَ الغاسِنِين ﴾ لەمەو پاش بەم نزیکانە من پیشانی ئێوەی ئەدەم کاروان سەراو شوێنی حەسانەوەی کەسانی لە سنوری خوا لائەدەن لە جیهاندا بە خنکان و لەناوبردن. لەپاشە ڕۆژدا بە ئاگری دۆزەخ، هەروایشن بۆ نیشتمانی بت پەرستانی شامتان پێ نیشان ئەدەم و ئەیکەم بە نیشتمان بۆ ئێوە .

خوای مەزن ئادەمیزاد ئەترسێنێ لەخۆبایی بوون کەڕایان بکێشێ بۆلای ووردبونەوە لە نیشانەکانی خوا کە نوسراوون لە تەوراتا یا پشت کردنە ئامۆژگاری یاساکانی خواو بیرکردنەوە لەو کەسانە لایانداو لە سنوری خوا .

سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَإِن يَرَوْا۟ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا۟ بِهَا وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلْغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَٰفِلِينَ ﴿١٤٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٤٧﴾ وَٱتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ ۚ أَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا ۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴿١٤٨﴾ وَلَمَّا سُقِطَ فِىٓ أَيْدِيهِمْ وَرَأَوْا۟ أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّوا۟ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ يَرْحَمْنَا رَبُّنَا وَيَغْفِرْ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾

﴿ سَأَصْرِفُ عَنْ أياتي الذيْنَ يَتكَبُرونَ في الأرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِ ﴾ لەمەودواو بەم نزیکانە من لائەدەم کەسانێکی ئەوتۆ خۆیان بە گەورە دائەنێن لە زەویدا بە جۆرێکی ناڕەواو

ناشایستە لەوەرگرتنی نیشانە ڕونـەکانی ئێمـە کـە دانـراون لـەنێوان دەرونـی خۆیـان و لەهەموو گۆشەو کەنارێ .

﴿ وَإِنْ يَرَوْ كُلَّ آيةٍ لايُؤْمِنُوا بِهِ وَإِنْ يَرَوا سَبيلَ الرُسْدِ لا يَتخِذُوهُ سَبيلاً ﴾ وەئەگەر ببین هەموو نیشانەیە لەسەر ڕاستی موحەمەد (د.خ) باوەڕناهێنن بەو هـەمووە نیشـانانە، ئـەبێ ئەو کەسانە بزانن یاساو ناوەڕۆکی قورئان ئەپارێزین لە دەست کاری کردن و گۆڕان و، ئەگەر ڕێگەی ڕاست و شارەزایی کردن ببینن ئەو کەسانە ئـەو ڕێگـە ڕاسـتە وەرنـاگرن بۆخۆیان و بیکەن بە یاسا.

﴿ وَإِنْ يَرَوْا سَبْيلَ الْغي يَتخِذُونَهُ سَبيلاً ذِلكَ بِأَنَهُمْ كَذَبُوا بِآياتِنا وَكانُوا عَنْـها غـافِلينَ ﴾ وەئەگەر ڕێگەی خوارو خیچ و گومڕایی ببینن ئەو کەسانە ئەو ڕێگە خراپە وەرئەگرن بـە ڕێگە بۆ خۆیان و کاری پێ ئەکەن، ئەو لادانەیان لە ڕێگەی ڕاسـت و پـەیڕەوی کردنـی ڕێگەی خراپ بەهۆی ئەوەوەیە باوەڕیـان بـە نیشـانە ڕونـەکانی ئێمـە نـەبوەو بـەدرۆیان خستونەتەوەو، ئەوان بێ ئاگـابوون لـە بیرکردنـەوە بۆیـان و لـەنرخ بـۆ دانانیـان و لـە ئامۆژگاری وەرگرتن .

﴿ وَالذيْنَ كَذَبُوا بِآياتِنا وَلِقاءِ الأخِرَةِ حَبِطَتْ أعْمالُهُمْ ﴾ وەکەسانێکی ئـەوتۆ باوەڕیـان بە نیشانە ڕونەکانی ئێمە نـەهێناوەو بـەدرۆیان زانیبـوون و بـە گەیشـتنی ڕۆژی دووایـی نەبوەوە پاداشت و پرسیاریان بەدرۆ زانیوە بوچ بوەتەوە پاداشتی کردارە چاکەکانیان .

﴿ هَلْ يُجْزَوْنَ إلا ما كانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ ئایا ئەو کەسانە پاداشتیان ئەدرێتەوە بـە جگـەی شتێ ئەیکەن؟ لە جیهاندا چاکبێ یاخراپ بێگومان پاداشتیان ئەدرێتەوە بەشتێ کردویانە . یانێ هەرکەسێ باوەڕی بەخواو بەڕۆژی دوایی نەبێ سوود لەکاری خۆی وەرناگرێ، ئەو شتەیش کۆی کردۆتەوەو خۆی پێوە هەڵکێشا، بـەبێ سـود ئـەڕوا بـەهۆی بـێ بـاوەڕی خۆیەوە، چاکەی جیهانی ئەو کەسە ناگاتە فریای بۆ ڕزگارکردنی لە ئاگری دۆزەخ .

﴿ وَاتَخَذَ قَوْمُ مُوسى مِنْ بَعْدِهِ مِنْ حُلِيهِمْ عِجلاً جَسَداً لَهُ خُـوارٌ ﴾ وەگـەلی موسـا لـە دوای ڕۆیشتنی موسا بۆکێوی تور بە بڕیاری خوا بۆ هاوردنی ئەو نامەیە خوا بەڵێنی پێـدا کە بیکا بە یاسا، وەریان گرت و دروستیان کرد لەو شخڵانەی کە قیبتیەکان دایان نـابوو

لایان گویرەکەیەکی لەش بۆ دانراو بەبێ گیان ئەو گویرەکەیە دەنکێکی هەبوو وێنە دەنگی گاو ئەی بۆڕان .

یانی کوڕانی یەعقوب لە ڕوبارەکە پەڕینەوە چاویان کەوت بە تاقمێ بتیان ئەپەرست، ئەوەبوو داوایان کرد لە موسا بتێکیان بۆ دروست بکات بیپەرستن، موسا سەرزەنشتی کردن. بەڵام لەو کاتەدا موسا بۆ ماوەی چل شەوێ چوبۆ کێویی توورولایان نەما بەهەلیان زانی، بەڕاوێژی موسای سامیری شخلّی ژنانی پێ کۆکردنەوە، ئەو شخلانەی توواندەوەو گوێرەکەیەکی بێ گیانی بێ گۆشتی بۆ دروست کردن دەنگێکی لێوە ئەهات وەك بۆڕەی گوێرەکەو دەستیان کرد بە پەرستنی .

﴿ أَوْ لَمْ يَرَوْا أَنَّهُ لا يُكَلِّمُهُمْ وَلا يَهْدِيْهِمْ سَبِيلاً أَتَّخذُوهُ ﴾ ئایا ئەو تاقمەی موسا نەیان ئەبینی کەبەڕاستی ئەو گوێرەکەیە گفتوگۆیان لەگەڵ ناکاو لە توانایانیە شارەزاییان بکا بە وێنەی یەکێ لە ئادەمیزاد هەتا گومان بێن کە ئەو دروستکەرو خاوەن توانایە، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەوان ئەو گوێرەکەیانە دانابو بە خوا بۆ خۆیان و ئەیان پەرست .

﴿ وَكانُوا ظالِمِينَ ﴾ وەئەوان ستەمیان لە خۆیان کرد بە بۆنەوەی پەرستنی ئەو گوێرەکەوە لە جگەی خوا بەبێ بەڵگەیە. زۆر جێگەی سەرسوڕمانە مرۆڤ بە دەستی خۆی شتێ دروست بکاو بیپەرستێ .

﴿ وَلَما سُقِطْ فِي أَيْدِهِمْ وَرَأَوْ أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّوا ﴾ وەکاتێ نەگبەتی کەوتە نێو دەستیان، پەشیمان بوونەوەو خەفەتی زۆریان خوارد لەسەر پەرستی ئەو گوێرەکەیەو، بینیان کە بە ڕاستی ئەوان لە ڕێگەی ڕاست لایانداوە، پەنایان برد بۆلای خوا .

﴿ قالُوا لَئِنْ لَمْ يَرْحَمْنا رَبُنا وَيَغْفِر لَنا لَنَكُونَنَ مِنَ الْخاسِرِيْنَ ﴾ ووتیان ئەگەر پەروەردەکەری ئێمە بەزەیی بە ئێمەدا نەیەتەوەو میهرەبانی لەگەڵمان نەکاو لە گوناهی ئێمە خۆش نەبێ و پەشیمان بونەوەمان لێ وەرنەگرێ بەڕاستی لە زیانۆمەندانین لەهەردوو جیهاندا.

کاتێ موسا لە کێوی تور لە خوا ئەپاڕایەوە، خوای مەزن هەواڵی دا بە موسا کە گەلەکەی تۆ لە ئایین وەرگەڕانو دەستیان کردوە بە پەرستنی لەشی گوێرەکەیەکی بێ گیان و بێ گۆشت، ڕونی ئەکاتەوە چۆن پەنی کردەوە وە موسا دووای هاتنەدەی لە کێویی تور.

وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًا قَالَ بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِى مِنۢ بَعْدِىٓ ۖ أَعَجِلْتُمْ أَمْرَ رَبِّكُمْ ۖ وَأَلْقَى ٱلْأَلْوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيْهِ ۚ قَالَ ٱبْنَ أُمَّ إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِى وَكَادُوا۟ يَقْتُلُونَنِى فَلَا تُشْمِتْ بِىَ ٱلْأَعْدَآءَ وَلَا تَجْعَلْنِى مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِأَخِى وَأَدْخِلْنَا فِى رَحْمَتِكَ ۖ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُفْتَرِينَ ﴿١٥٢﴾ وَٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِهَا وَءَامَنُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٥٣﴾ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلْغَضَبُ أَخَذَ ٱلْأَلْوَاحَ ۖ وَفِى نُسْخَتِهَا هُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ ﴿١٥٤﴾

﴿ وَلَما رَجَعَ مُوسى إلى قَوْمِهِ غَضْبانَ أسِفاً قالَ بِئْسما خَلَفْتُمُوني مِنْ بَعْـدي ﴾ وەکاتـێ موسا گەڕایەوە لە کێوی تور بۆلای گەلەکەی خۆی بە تورەیی و ڕقـەوە بـە خەفـەتێکی زۆرەو ووتی: ئێوە خراپ جێگەداری من بوون لە دوای من کە دەستان داوەتە گوێرەکـە پەرستن.

﴿ أعَجَلْتُمْ أمْرَ رَبِكُـمْ ﴾ ئایـا ئێـوە بـۆ پەلـەتان کـرد وازتـان لـە فـەرمان و بـەڵێنی پەروەردەکەری خۆتان هێناو ئارامتان نەگرت هەتا من دێمەوە لە کێـوی تـورو دەسـتتان کردوە بە پەرستنی کوێرەکە؟

زانایان بیریان جیاوازە ئایا ئەو گفتوگۆی موسایە لەگـەڵ سـامیری و تاقمـە کوێرەکـە پەرستنەکەیەتی یا لەگەڵ هارون و باوەڕدارانیەتی هەرچۆنێ بێ لە مەست ناگۆڕێ. بەڵام ڕستەی (أخْلِفُوني) وائەگەیەنێ ڕووی بۆلای هارون پێ کردوە.

﴿ وَألْقى الألْواحَ وأخَذَ بِرَأسِ أخِيهِ يَجُـرُهُ إلَيْـهِ ﴾ وەموسـا بـە تورەییـەوە تەختـەکانی تەوراتی فڕێ داو دەستی گرت بەسەری هارونی برای خۆی و موی سەری گـرت و ڕای کێشا بۆلای خۆی.

پرسیار/ فڕێدانی تەورات کە ناو خوای تێدا بوو. ڕاکێشانی موی سەرو ڕیشی هـارونی بێ تاوان لەلایەن موسای خۆپارێز لەبێ فەرمانی خوا لە موساوە زۆر دوورە ؟

وەڵام/ بێ گوناهی مرۆڤ ناگۆڕێ لە سروشتێکەوە بـۆلای سروشـتێکی تـر، شـێوەی ئارام یا تورەیی لانابرێ لە ئادەمیزاد بە تایبەتی ئەگـەر تورەبـوون لەبـەر فـەرمانی خـوای مەزنبێ. لە کاتێکا موسا توشی ئەو کارە زۆر خراپە بوو کە لەوەو پێش تەمـەنێکی زۆری خۆی دانا لەگەڵ خزمەکانیو ڕای هێنابوون لەسەر پەرستنی خواو یـەکێتی خـوا، فـێری کردبوون لەسەر یاسای ئایین ڕاوەستن، وای زانی بـاوەڕ چەسـپاوە لـە دەرونیانـا کـەچی کوتوپڕ وەرگەڕان لە ئایین و هاوبەشیان بۆخوادانا، ئەو ڕوداوە کاری زۆری تێ کردبـوو، ئیتر چۆن تورە نەبێ ؟

﴿ قالَ ابْنَ أم إنَّ الْقَوْمَ اسْتَضْعَفُوني وَكادُوا يَقْتُلُونَني ﴾ هـارون بەموسـای ووت: ئـەی کوڕی دایکی خۆم: من هیچ خراپەیەکم نـەکردووە. بەڕاستی خزمـەکانمان منیـان بـەبێ چارەو لاوازو زەبون، داناوە نزیکبو ئەوان من بکوژن بەهۆی بەرەنگاری کردنـی مـن بـۆ ئەو کارە خراپەو تەقینەوەیە دەمی مندا بۆ قەدەغەکردنی پەرستنی گوێرەکە لـەوان .

﴿ فَلا تُشْمِتْ بِيَ الأعْداءَ وَلا تَجْعَلْني مَعَ الْقَوْمِ الظالِمِيْنَ ﴾ دوایی تۆ دوژمنان دڵخۆش مەکە بەهۆی شتێ توشی من ئەبێ لـە خراپە، ئەو بت پەرستانە منیان بـە دوژمنـی خۆیـان سەیرئەکرد، بۆیە نزیکبوو من بکوژن، ئەگەر تۆ بەو جۆرە لـەگـەڵ مـن بکـەی ئـەوان وا ئەزانن تۆ لـەگەڵ ئەوانی و من بەبێ نرخ دائەنێ، من لـەکارو کردەوەی ئەوان دورم و لـە دژی بووم بە تەنهاو، تۆ من دامەنێ لـەگـەڵ ئـەو تاقمـە ستەمکارە بـت پەرستانە. بـەو هەواڵانەی هارون باسی کردن، موسا دڵ نـەرمی ڕوی تـێ کـردو هەسـتی بـە بـەزەیی و برایەتی کرد، بۆیە.

﴿ قالَ رَبي أغْفِرْلي وَلأخي وَأدْخِلنا في رَحْمَتِكَ وَأنْتَ أرْحَمُ الراحِمِينْ ﴾ موسا فـەرموی ئەی پەروەردەکەری من: تۆ خۆش بە لـەمن لـەسەر ئەو شتەی کە کردم لـەگـەڵ هـارون و، لـە برای من خۆش ببـە کەمتەرخـەمی نـەکردووە لـە ڕانـوی و ئامۆژگـاری کردنـی خزمەکانمان و وازی لێ نەهێناون لـە وەرگەڕانیان لـە گوێرەکە پەرستن و، تۆ ئێمە بخە نێـو بەزەیی و میهرەبانی خۆت و، تۆ بە بەزەی ترینی هەموو خاوەن بەزەییەکان و میـهرەبانیت لـە هەموو کەس زۆرترە، هەموو لێ بوردنێ تۆ ئەی بەخشی بە هەموو کەس، خوای مـەزن پاڕانەوەی موسا وەرگرت، چونکە ئەیزانی موساو هارون دەرون و دڵیان پاکە.

﴿ إنَّ الذيْنَ أتَّخِذوا الْعِجَلَ سَيَنالُهُمْ غَضَبٌ مِنْ رَبهِمْ وَذِلَةٌ فِيْ الْحَياةِ الدُنيا ﴾ بەڕاسـتی کەسانێکی ئەوتۆ ئەو گوێرەکەیانە وەرگرتو بۆ پەرستن لـە جگەی خوا لـە مـەو پـاش بـەم نزیکە ئەگا بەوان خەشم لـەلایەن پەروەردەکەری خۆیانەوەو، ئـەگا بـەوان بـێ نرخـێ و کزۆڵی لـە ژیانی جیهاندا بەهۆی پەرستنی ئەو کوێرەکـەوە، خۆیـان هەسـتی پـێ ئەکـەن توشی سەرشۆڕی بوون، دانیشتوان بەبێ نرخ تەماشایان ئەکەن لـە زیندەگانی جیهاندا.

﴿ كَذٰلِكَ نَجْزِي الْمُفْتَرِيْنَ ﴾ هەر بەو ێنەی ئەوەی ئێمە سزای گوێرەكـە پەرستانماندا ئێمە سزای هەموو كەسێ ئەدەین درۆو بوختان هەڵئەبەستێ و ئەیداتە پاڵ خـواو جگـەی ئەو ئەپەرستن .

پرسیار/ ئەو ئایەتـە وائەگەیـەنێ بـە گوێـرەی ڕواڵـەت ئـەو كەسـانەی گوێرەكـەیان پەرستوە خوا خەشم و سزایان ئەداو بەبێ نرخ دائـەنرێن لـە ژیـانی جیـهاندا هـەتا كـاتی زیندونەوە كەچی ئەوان بەڕاستی پەشیمان بونەتەوە خوا لێیان خۆش بووە وەك لـەمـەوپاش خوا ئەیفەرموێ، كەواتە چۆن خەشم و بێ نرخ و دانان و دوری لـە لێ بوردنی پەیوەسـتە بەوانەوە وە پەشیمان بونەتەوە لـە گوێرەكە پەرستن ؟

وەڵام/ هەندێ لـە زانایان ووڵامی ئەو پرسیارەیان داوەتەوەو فەرمویانە: ئەو كەسـانەی گوێرەكەیان پەرست دوای هاتنـەوەی موسا بـوون بـە دوو تـاقم: تاقمێكیـان بەشـیمان بوونەوە بە ڕاستی و نیازی پاكەوە ئـەو كەسـانە خـوا لێیـان خـۆش بـوو. تاقمـێ تریـان بەردەوام بوون لـەسەر بـت پەرسـتی، وەك موسـای سـامیری و تاقمەكـەی ئـەو كەسـانە خەشمی لێ گرتن و سەرشۆڕی كردن لـە جیهاندا و ئابڕوی بردن .

ووڵامی تر بۆ ئەو پرسیارە: بەڕاستی خوا ئەیزانێ جولـەكـەكان پەشـیمان نەبونەتـەوەو پەشیمانیش نابنـەوە هـەرگیز لـە گومڕایـی و سروشـتی ڕابوردویـان، مێـژووی باپیریـان گەورەترین بەڵگەیە، چونكە ئەوان هـەروەها بەرانبـەر بـە خـواو بـە مرۆڤایـەتی گـۆڕان كارێكیان بەسەردا نەهاتووە، لـە گومڕایی و لـە خراپـە كـردن لـە هیـچ كاتێكـا وازیـان نەهێناوە مەگەر بەهێزو بەچەك.

پرسیار/ جولـەكەكان لـەم سەردەمەدا خاوەنی ڕژێمێكی خۆیانن بـەناوی ئیسـرائیلـەوەو بەڕێزیش تەماشا ئەكرێن. كەواتە بێ نرخ و سەرشۆڕیان نەماوەتەوە، ئەوەیش بە ڕواڵـەت دژی فەرمودەی خوایە ؟

وەڵام/ ئەبێ بزانین هەرگیز ئەو لاوازی و سەرشۆڕیە لـەسەریان لانەچووە ئـەو ڕژێمـە بەناوجووەو ئەو سەربەخۆییە وێنەی ڕژێمەكانی جگەی خۆیـان نیـە. بـەڵكو كۆمـەڵێكی

چەكدارن و بەكرێ گیراون ڕژێمە داگیركەرەكان پەیدایان كردون بۆ پاراستنی سودی خۆیان و لێدانی هێزی نیشتمانی، ناویان هەیەو ناوەڕۆكیان نیە، پەیمان (بلفۆری) بەریتانیای كۆن و دەست گیرۆی تازەی ئەمەریكا چاكترین بەلگەن بۆ ئەو مەبەستە، لەلایە ترەوە هەندێ ڕژێمی كۆن و تازەی بەناو موسلمان دەستێكی بالایان هەبووە لە دروستكردنی ئەو ڕژێمەدا، مێژو بە ڕونی ئەو كارەیانی نوسیوە، بۆ ئەوەی ئەو ڕژێمە داگیركەرانە یارمەتی ئەمانیش بدەن بۆ مانەوەیان لەسەر كورسی .

﴿ وَالذينَ عَمِلُوا السَّيِّئاتِ ثُمَ تابُوا مِنْ بَعْدِها وأمَنُوا إنَ رَبَكَ مِنْ بَعْدِها لَغَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ وەكەسانێكی ئەوتۆ ئەوكارە خراپانەیان كردووەو لە گوناهی گەورەو بچوك و لەبێ باوەڕی، لە پاشا پەشیمان بونەتەوەو باوەڕیان هێناوەتەوە. بەڕاستی پەروەردەكەری تۆ لە دوای پەشیمان بونەوە لەو خراپانە لێی خۆشبوونی زۆرەو زۆریش خاوەنی بەزەیی و میهرەبانیە بۆ وەرگرتنی پەشیمان بونەوە. بێگومان هەركەسێ پەشیمان ببێتەوەو بگەڕێتەوە بۆلای خواو ئایین بە پاكی هۆ نەكاتەوە بۆلای بێ باوەڕی و بە وێنەی جوەكان خوا لێیان خۆش ئەبێ و میرەبانیان لەگەڵ ئەكا جولەكە بێ یا قوڕەیشی یا جگەی ئەوان .

﴿ وَلَما سَكَتَ عَنْ مُوسى الْغَضَبُ أخَذَ الألْواحَ ﴾ وەكاتێ ڕق و توڕەییە كە لە دڵی موسادا وەستایەوە هاتەوە بەسەر خۆیاو ئارامی ڕوی تێ كرد، دوای ئەوە بۆی دەركەوت هارون پاكەو كەمتەرخەمی نەكردوە، دوای پاڕانەوەی بۆخۆی و هارونی برای، موسا تەختەكانی تەوراتی هەڵگرت بە ساغی و بە نەشكاوی كاتێ لە ڕقا فڕێدان، لە تەوراتیشا هیچ شتێ لانەبراو، بە پێچەوانەی ئەوەی هەندێ ووتویانە تەختەكان شكان و هەندێ تەورات وونبووبوو .

﴿ وَفي نُسْخَتِها هُدىً وَرَحْمَةٌ لِلذيـنَ هُمْ لِرَبِهِمْ يَرْهَبُـونَ ﴾ وەلەنێو نوسراوەكانی تەختەكانی تەوراتا هەبوو ڕانموینی كردن لە گومڕایی و لێ بوردن و بەزەیی و میهرەبانی و پاكبونەوەی لە چڵك و چەپەڵی. گوناە، بۆكەسانێكی ئەوتۆ لە سزای پەروەردەكەری خۆیان بترسن. بەڕاستی و بەبێ گومان موسا پارێزراوە لە گوناە، وەك هەموو پێغەمەرانی تر. بەڵام موسا مرۆڤەو خەفەت ئەخواو دڵخۆش ئەبێ ئارام گرەو ڕقیشی ئەجولێ، ئەوەبو

ڕقی هەڵسا کاتێ توشی وەرگەڕانی گەلەکەی لە ئاینی ڕقەکەیشی نەما کاتێ دڵی بۆ هارون نەرمبو، بڕیاریدا تۆڵە لەوەرگەڕاوەکان بسێنێ.

وَٱخۡتَارَ مُوسَىٰ قَوۡمَهُۥ سَبۡعِينَ رَجُلٗا لِّمِيقَٰتِنَاۖ فَلَمَّآ أَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ قَالَ رَبِّ لَوۡ شِئۡتَ أَهۡلَكۡتَهُم مِّن قَبۡلُ وَإِيَّٰيَۖ أَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآۖ إِنۡ هِيَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهۡدِي مَن تَشَآءُۖ أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَاۖ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡغَٰفِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ۞ وَٱكۡتُبۡ لَنَا فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَۚ قَالَ عَذَابِيٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنۡ أَشَآءُۖ وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ

عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُواْ النُّورَ الَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾

﴿ وَأَخْتارَ مُوسى قَوْمَهُ سَبْعِينَ رَجُلاً لِمِيقاتِنا ﴾ وەموسا هەڵیبژارد لە تاقمەکانی خۆی حەفتا پیاو لە دووازدە هۆز لەهەر هۆزێ شەش کەس ئەبوایە حەفتاو دوو کەس بونایە. بەڵام موسا فەرموی: دوو کەستان مەیەن، مایەوە بە حەفتا کەسیان، لەبەر ئەو بەڵێنەی ئێمە دابومان بە موساو، لەبەر بیانو دانان بۆ خوداو بۆ پیتنە کردنی گوناهە هەندێکیان کردبویان بە پەرستنی گوێرەکە .

زانایان درێژەیان داوە دەربارەی ماناو مەبەست لەو ئایەتە: ئایا ئەو کاتە خوا دیاری کردووە کاتی ناردنە خوارەوەی تەورات بوە یا کاتی تر؟ موسا بۆچی ئەو حەفتا کەسەی هەڵبژارد؟ ئابیا لەبەر ئەوە بوە گومانیان بردە موساو ووتیان باوەڕت پێ ناهێنین هەتا فەرمودەی خوا نەبسین وێنەی تۆ ؟

یا لەبەر هۆیە تربووە؟ هۆی سزادانی ئەو پیاوانە چ شتێ بوو؟ ئایا ئەو بومەلەزەیە ئەوانی کوشت یابێ هۆشی کردن و نەمردن ؟

لە وەڵامی ئەو هەموو پرسیارانەدا ئەنوسین: لەو ئایەتەدا شتێ نیە ببێتە هۆ بۆ هەڵبژاردنی ئەو حەفتا پیاوە، ئەوەی بەڵگەبێ لەسەری هەر ئەوەیە موسا حەفتا پیاوی لە خزمەکانی خۆی هەڵبژارد هەتا بیانبا بەسەر وەختی ئەو کاتەی خوا بۆ موسای دیاری کردبوو، ئەبێ بزانین ئەو هەڵبژاردنە بە فەرمانی خوا بوە، چونکە موسا بەبێ فەرمانی خوا هیچ شتێ ناکا، خوا سزای ئەو حەفتا پیاوەی داوە بە جۆرە سزایە شایستەی ئەوان بوبێ، هۆی پرسیارەکانی تریشمان بۆ باس نەکراوە، ئەوەی شایانی باسبێ پێویستە ئێمە بڕوامان وابێ بەو فەرمودانەی خوا کە بەشیکردنەوە بۆ ئێمەی باس کردوە .

﴿ فَلَما أخَذَتْمْ الرَجْفَةُ قالَ رَبِ لَـوْ شِـئْتَ أهْلَكْتُـهُمْ مِـنْ قَبْـلُ وَإيـايَ ﴾ دوایـی کاتـێ بومەلـەرزیەکی زۆر سەخت ئەو حەفتا کەسەی گرت و بێ هۆشبون، موسا فەرموی: ئـەی پەروەردەکەری من . ئەگەر تۆ ئارەزۆت هەبوایـە ئـەو کەسـانەت لـەناو ئـەبرد لـەپێش ئەوەی بێنە دەرەوە بۆ ئێرە لـەنێو خزمانی خۆیاناو بەر لـەوەی گوێرەکـەیان ئەپەرسـت و، منیشت لـەناوئەبرد بەهەر هۆیەکەوە بوایە، ئەوەی ڕاستی بێ موسا لـە چاکترینی گەلـەکەی ئەو حەفتا پیاوەی هەڵبژارد بۆچون بەسەردەمی ئەو بەڵێنەی خـوادا بـوی بـە موسـا کـە گەیشتنە ئەو شوێنە لـەناوچوون موسا بە تەنها مایەوە، ئەو ڕوداوە دڵـی موسـای برینـدار کردنەی ئـەزانی چـی بکـاو چـۆن پیـانو بهێنێتـەوە کـە بەتەنـها بڕواتـەوە بـۆلای بـەنی ئیسرائیلیەکان، چۆن وولامیان بداتەوە؟ هیچ پەنایـە بـۆ موسـا نەمایـەوە جگـەی خـوای مەزن، بۆ بەکزۆلـیەوە لـە خوا پاڕایەوەو فەرموی:

﴿ أتُهْلِكُنا بِما فَعَلَ السُفَهاءُ مِنا ﴾ ئایا تۆ بۆ ئێمە لـەناوئەبەی بەهۆی شتێ بێ خبرەت و گێلـەکانی ئێمە کردویانە، بەڕاستی میهرەبانی و بەزەیی تۆ لـەوە گـەورەترە کـاری وامـان لـەگەڵ بکەی؟

﴿ إنَ هيَ إلاّ فِتْنَتُكَ ﴾ ئەو بەمەلـەرزەیە و چەندین کاری تۆ نیە مەگەر تاقی کردنەوەو سزادانی بەندەکانی خۆتە بۆ ئەوەی تەمێ خـوا بـبن و پـەند وەرگـرن. یانـێ داواکردنـی هەندێ خزمانی من بۆ بینینی تۆو گوێرەکە پەرستنی هەندێکیان وای لێ کردن بەرەو نەمان بیان بەن .

بـۆ زانـین: ووشـەی (فِتْنَـةٌ ) بـۆ چـەند مانایـە هـاتوە: بـە مانـا لـە ڕێگـەی لادان و خراپەکردن، وەك ( لا يَفْتَنِنَكُمْ الشَيْطانُ )، بەمانا جەنگ کردن ( أفْتَتَـنَ القـوم ) بـە مانـا تاقی کردنەوە ( فَتَنا بَعْضَهُمْ ) بە زۆری بە مانای سزادان هاتوە ( وَأتَقُوا فِتْنَةٌ )، ئەم مانایـە مەبەستە لـە ( إنَ هيَ ألاّ فتنتك ) .

﴿ تُضِلُ بِها مَنْ تَشاءُ وَتَهْدِي مَنْ تَشاءُ ﴾ تۆ لـە ڕێگە لائەدەی بە هۆی ئەو سزادانانەوە کەسێ ئارەزۆت هەبێ بە بومەلـەرزە لـە سـزای ئـەدەی و، تـۆ ڕانمویـی ئەکـەی کەسـێ

ئارەزۆت هەبێو هێز ئەدەی بە دڵی بۆ بەردەوامی لەسەر باوەڕهێنان. هەموو کەسێ ئەتوانێ بە بیرکردنەوەی خۆی ڕێگەی ڕاست بدۆزێتەوە. بەڵام شەیتان هەندێکیان لەناو ئەبا.

﴿ أَنْتَ وَلِيُّنا فَاغْفِرْ لَنا وَارْحَمْنا وَأَنْتَ خَيْرُ الْغافِرِيْنَ ﴾ هەرتۆ کاربەدەست و گەورەی ئێمەی، دوایی تۆ خۆش ببە لە ئێمەو بەزیت بێمانا بێتەوەو میهرەبانیمان لەگەڵ بکەو، تۆ چاکترینی کەسانێکی خاوەنی لێی خۆشبوون و لێی بوردنی. هەموو کەسێ لە خراپەی کەسی خۆش ببێ لەبەر ئەوەیە کە باسی بە چاکە بکرێ یا ئازارێ لە خۆی دوربخاتەوە . بەڵام تۆی خاوەن میهرەبان لە گوناهی بەندەکانی خۆت ئەبوری بەبێ مزەو پێویستت بە هیچ شتێ نیە. هەر لەبەر گەورەیی خۆتە.

﴿ وَأَكْتُبْ لَنا فِي هذِهِ الدُّنيا حَسَنَةً وَفِي الأَخِرَةِ ﴾ وەتۆ بنوسە بۆ ئێمەو بۆمانی دابین بکە لەم جیهانەدا ژیانی خۆش و یاری دانمان لەسەر پەرستنی تۆو، بۆمانی بنوسە لە پاشە ڕۆژدا بەهەشت و ڕەزامەندی خۆت .

﴿ إنا هُدْنا إِلَيْكَ ﴾ بەڕاستی ئێمە گەڕاونیەتەوە بۆلای تۆوپەشیمان بوینەتەوە لەو کردارانە تۆ لات چاك نیەو بێ فەرمانی تۆ ناکەین .

﴿ قالَ عَذابي أُحِيبُ بِهِ مِنْ أَشاءُ ﴾ خوا فەرموی: من هەرکەسێ ئارەزۆم هەبێ توشی سزای خۆمی ئەکەم کە شایانی سزابێ و هیچ کەسێ مافی ئەوەی نیە ڕێگە لەمن بگرێ و هەموو کارێکی من دادپەروەریە .

﴿ وَرَحْمِيتي وَسَعَتْ كُلّ شَيءٍ ﴾ وەبەخشندەیی و میهرەبانی و بەزەیی من هەموو شتێ ئەکرێتەوە لە جیهاندا بۆ باوەڕۆداران و بێ باوەڕان بە ڕۆزی دان بەوان و پاراستنیان لە کارەسات بە جۆرێ کە شەیتانیش ئەکرێتەوە بە هۆی بەردەوامی ئەو لە ژیاندا هەتا ڕۆژی دوایی و لە دروست کردنیدا ئەگەرچاو لەیەکدانێ و کەمتریش وازی لێ بهێنێ کەس ناوی نازانێ. بەڵام بەزەیی بۆ شەیتان بەمانا پاداشتی چاکە نیە لە دوارۆژدا، بۆ ئەو کەسانەیە باوەڕیان هێناوەو لە گوناە خۆیانیان پاراستوە، جا بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ فَسَأَكْتُبُها لَلذِيـنَ يَتقُـونَ وَيُؤتُـونَ الزَكـاةَ ﴾ دوایـی مـن ئەینوسـم ئـەو بـەزەی و بەخشندەیەی خۆم بۆ ئەکەسانێکی ئەوتۆ خۆیان ئەپارێزن لە بـێ فـەرمانی خـواو لـە بـێ باوەڕی و ئەو زەکاتەی پێویست کراوە لەسەریان ئـەی بەخشـن بـە هـەژاران و سـامانی خۆیان سەریان لێ تێك ناداو یاخی نابن هەتا واز لە یاساکانی خوا بهێنن .

﴿ والذيْنَ هُمْ بِأياتِنا يُؤْمِنُونَ ﴾ وە بەزەی من بۆ کەسانێکی ئەوتۆ ئەنوسم ئەوان بـاوەڕ بە ئایەتەکانی هەموو نامەکانی ئێمە ئەهێنن و باوەڕ بە خواو بە پێغەمەرو بە ڕۆژی دوایی و بە هەموو ئەو شتانەی قورئان باسی کردون خۆپارێزن و زەکاتەکانیان ئەدەن بە هەژاران .

﴿ الذيْنَ يَتبِعُونَ الرَسُولَ النَبِيَ الأمِي ﴾ ئەوانەی باسکران کەسانێکی ئەوتۆن بە نیـازی پاکەوە دوای فروستادەو پێغەمەرێکی نەخوێنەوار نازانێ بنوسێ ئەکەون. خوای مەزن لەو ئایەتەدا باسی پێغەمەری ئیسلامی کردووە بە پێنج شتی زۆر گرنگ:

١- ﴿ الرَسُولَ النَبِيَ الأمِي ﴾ فروستادەیە پێغەمەرێکی نەخوێندەوارە. کەسێکی ئەوتۆ نەی ئەزانی بنوسێ و بخوێنێتەوە، سروشی بۆهـاتوە لـەلای خـواوە بـەبێ هـەوڵی خـۆی، جیاوازی نێوان ( الرَسُولَ ) وە ( النَبِيَ ) ئەمەیە: ( الرَسُولَ ) فروسـتادەیە کـە کرابـێ بـە پێغەمەرو نامەی بـۆ نێررابـێ. ( النَـبِيَ ) کەسـێکە خـوا کردویـەتی بـە پێغەمـەرو نامـەی بۆنەناردووە. کەواتە هەموو فروستادەیە پێغەمەرە. بەڵام هەمو پێغەمەرێ فروستادە نیە.

نەخوێنەواری شێوەیەکی تایبەتی‌یە تەنها بۆ موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ جگەی پێغەمەرانی تر، بۆ ئەوەی بزانرێ بەو نەخوێندەواریە ئادەمیزاد لـە تـاریکی بـێ بـاوەڕی و نەزانینـەوە دەری هێناون بۆلای ڕوناکی باوەڕو زانیاری و کاری کردوەتە سـەر ژیـانی ئـادەمیزادو هـەموو نەوەکان لە هەموو کات و جێگەیەکا، بۆ ئەوەیش بزانرێ هەر خوای مەزن مامۆسـتایەتی کردوە بە تەنها.

٢- ﴿ الذي يَجِدُنَهُ مَكْتُوباً في التَوْراةِ وَالأنْجِيلِ ﴾ کەسێکی ئەوتۆیە خـاوەن نامـەکان ئەو فروستادەیانە دەست کەوتوە لـە تـەوڕات و لـە ئینجیلـدا ناونیشـان و شـێوازی بـە نوسراوی و بە تەواوی، ئەو باسە لە ئایـەتی (١٤٦)ی سـورەتی ئەلبەقـەرەو لـە ئایـەتی (١٦٣)ی سورەتی نیساو دا بەڕونی باسی کراوە .

٣- ﴿ يَأمُرُهُمْ بِالْمَعْرُفِ وَنَيْهاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ ﴾ ئەو پێغەمەرە فەرمان ئـەدا بـە خـاوەن نامەکان بە چاکەو بە فەرمانبەرداری خواو قەدەغە ئەکا لەوان هەموو کارێکی خراپ بـە تایبەتی هاوبەشدانان بۆخوا.

٤- ﴿ ويُحِلُ الطَّيْباتِ وَيُحَرِمُ عَلَيْهِمُ الخَبائِثَ ﴾ وە فروستادەیە کەڕوای کردوە بۆیان هەموو خواردەمەنی پاك و ڕەواو قەدەغـە کـردووە لـەوان هـەموو خواردەمـەنی پیـس و نارەوا بە تایبەتی گۆشتی بەراز .

٥- ﴿ وَيَضَعَ عَنْهُمْ إصْرَهُمْ والأغْلالَ التي كانَتْ عَلَيْهِمْ ﴾ وەلائـەبا لەسـەریان بـاری گران و ئەو کۆت و زنجیرەی ئەوتۆ لەسەریان دانراوە لەلایەن خۆیانـەوە بـە پێچەوانـەی فەرمانەکانی تەورات. وەك کوشتنی یەکتری لە بریتی پەشیمان بونەوە بە دڵ وبـە نیـازی پاك، بڕینی ئەندامێ گوناهی پێ کرابێ، بڕینی بەرگێ پیسی پێوە دڕابێ، کوشتنی پیاو کـوژ بە دەستیان قەسبێ یا بە هەڵە. پەرستنیان هەر لە کەنیسەو کڵێسادابێ و لە ڕۆژی شەمەو یەك شەمە دا.

﴿ فالذيْنَ أمَنُوا بِهِ وَعَزَرُهُ وَنَصرُوهُ ﴾ دوایی کەسانێ باوەڕیان بـەو پێغەمـەرە هێنابێ و ڕێزیان گرتبێ بـۆ بڵاوکردنـەوەی داواکـەی و یارمـەتیان دابـێ بـۆ سـەرکەوتنی بەسـەر دوژمنیا.

﴿ وَأتَبَعُوا النُورَ الذي أنْزِلَ مَعَهُ أوُلَئِكَ هُـمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ وە دوای ڕوناکیـەکی ئـەوتۆ بکەون هاتوەتە لەگەڵیتا کە قورئانەو کاریان پێ کردبێ ئەو کەسانە ڕزگاریـان ئـەبێ لـە هەردوو جیهاندا .

لە پاشا خوای مەزن فەرمان ئەدا بە پێغەمر (د.خ) کە ڕوبکاتـە هـەموو ئادەمیزاد لـە عەرەب و جگەی عەرەب و ئەفەرموی:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ

فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلْأُمِّيِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَـٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾ وَمِن قَوْمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٩﴾

﴿ قُلْ يا أيها الناسُ إني رَسُولُ اللهِ إلَيْكُمْ جَميعاً ﴾ تۆ بڵێ ئەی ئادەمیزاد مـن بەڕاسـتی نێردراوی خوام بۆلای هەموتان بەبێ جیاوازی و بۆلای هەموو نەتەوەیە لە هەموو جێگەیە هەتا ڕۆژی دووایی. نەك تەنها بۆلای عەرەب. بە گوێرەی گومانی هەندێ لە جوەکـان و هەندێ لە گاورەکان ئەو ئایەتە لە مەکەی پیرۆز هاتوەتە خوارەوە، ئەو کەسـانەی ئـەوتۆ بە درۆ ئەخاتەوە ئەیان ووت: کاتێ موحەممەد بێ هێز بوو ئـەیووت: مـن نـێردراوم بـۆ دانیشتوانی مەکەو گوندەکانی دەروبەری، لەپاش ئەوەی هـێزی پـەیدا کـرد ووتـی: مـن نێرراوم بۆلای هەموو ئادەمیزاد .

﴿ الذي لَهُ مُلْكُ السَماواتِ وَالأَرْضِ لاإلهَ إلاّ هُوَ يُحيِيُ وَيُمِيـتُ ﴾ خوايـەکی ئەوتۆيـە هەربۆ ئەوە خاوەن یەتی و پاشـایەتی ئاسمانـەکان و زەوی و هەڵسـوڕێنەری کاروباریانـە، هیچ پەرستراوێ نیە شایەنی پەرستنێ جگـەی خـوا. زیندوئەکاتـەوە هـەموو مردوەکـان لـەسەر پاش ماوەی لـەشی ڕزیوان هەروەك یەکەم جار زیندویەتی پێ بەخشیون و ئـەمرێنی هەمو گیانداران لـە جیهاندا. ئەو ئایەتەو چەندین ئایەتی تر بۆمان ڕون ئەکەنـەوە نوێنـەرو میانجی گەری لە نێوان خوای مەزن و بەندەکانیدا نیە، خاوەنیـەتی و هەڵسـوڕێنەر بۆیـان هەر خوایـە بەتەنـها. کەواتـە موحەمـەد ﴿ ﷺ﴾ هەرچـەندە ڕەوانـەکراوە بـۆلای هـەمو ئادەمیزادو جنۆکە لە هەموو کات و لـە هەموو جێگەیەکاو بەرێزترینی هەموو بونەوەرانەو دواهاوەری هەموو پێغەمەرانە. بەڵام نەبۆخۆی و نەبۆ هیچ کەسـێ خـاوەنی سـودو زیـان بەخشین نیە.

مەبەست لەو ئایەتە ئەوەیە: شێوەو پیشەی پێغەمەر بەهەموو کەس ڕابگەیەنێ و پیانی بناسێنێ کە موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾ ئادەمیزادێکە وێنەی ئێوە، هەتا ئێوە لە سنوری ئادەمیزاد دەری نەکەن، وێنەی گاورەکان و جوەکان عیساو عوزەیر بە کوڕانی خوا دائەنێن. بەسە بۆ ڕێزی موسڵمانان لەشەو ڕۆژا ئەڵێن: هیچ پەرستراوێ‌نیە جگەی خواو موحەمەد فروستادەی خوایە .

﴿ فَآمِنُوا بِاللهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الأُمِيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللهِ وَكَلِمَاتِهِ ﴾ دوایی ئێوەی ئادەمیزاد باوەڕ بەخواوبە پێغەمەر نەخوێنەوارەکەی بهێنن، ئەو پێغەمەرەی ئەوتۆ باوەڕ بەخواو بە فەرمودەکانی خوا ئەهێنێ لە قورئان و تەورات و ئینجیل .

﴿ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾ و ئێوە دوای ئەو پێغەمەرە بکەون و فەرمانبەرداری ئەوین، ئەو ڕستەیە وامان فێردەکات بەڵگەیە لەسەر ئەوە باوەڕهێنان تەنها بەخوا خاوەنی هیچ سودێ نیە بۆ ڕزگاربوون لە سزای پاشە ڕۆژ ئەگەر لەگەڵ باوەڕ بەخوادا پەیڕەوی نێرراوی خوا نەکرێ و باوەڕ بە فەرمودەکانی پێغەمەر نەهێنرێ، بۆ ئەوەی ئێوە ڕانموییی وەرگرن و پاداشت و بەهەشت وەربگرن و بەردەوامبن لەسەر پەیڕەوی پێغەمەرو لە دەستور لانەدەن .

﴿ وَمِنْ قَوْمِ مُوسَى أُمَّةٌ يَهْتَدُونَ بِالْحَقِ وَبِهِ يَعْدِلُونَ ﴾ وەهەندێ تاقمی موسا کۆمەڵ و تاقمێ ڕانموییی ئادەمیزاد ئەکەن بەڕاستی و بە گفتوگۆی ڕاست و، بەڕاستی فەرمان ئەدەن لەنێو ئادەمیزادا بە دادپەروەرانە .

زانایان بیریان جیاوازە لە دیاری کردنی ئەو تاقمەی خزمی موسا: چ کاتێ ئەوانە پەیدابوون و لە چ کاتێکا بوون؟ ئەوەی ڕاستی بێ ئەو تاقمە لەکاتی مانی موسادا بوون، لە دواییدا زۆربەیان نەماون و هەندێکیان بەردەوامبوون لەسەر ڕاستی و لەسەر دادپەروەری هەتاکاتی هاتنی عیساو موحەمەد، بەڵام ئەبێ ئەو کەسانە عەبدوڵای کوڕی سەلام و چەند کەسێکی تری کەم نەبوبن کە باوەڕیان بە پێغەمەر هێنا، چونکە ئەوانە لەبەر کەمی پێیان ناوترێ (أمة) هەر چۆنێ بێ قورئانی پیرۆز باسی جوەکانی کردوە بە هەموو شێوەیەکی ناشیرین و داویەتیە پاڵیان شورەیی و کاری ناشایستە لە چەندین

ژمارەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، ئەبێ بیشزانین لە دوای موساو کاتی پێغەمەرەکانی تردا لەنێو جولەکەکاندا چەندین مرۆڤی باش و خاوەن باوەڕیان تێدا پەیدابووە.

لە ڕوناکی فەرمودەی قورئانەوە بۆمان ڕون ئەبێتەوە خراپە کردن و لە ڕێگەی ڕاست لادان لە سروشتی جوەکان و مێژویانا زۆر زۆرن، ئایا جوەکان لە خراپەکردن پاکن بێگومان پاك نین؟ بەڵکو مێژویان چاکەی لێ نەوەشاوەتەوە. بۆ نمونە لەم سەردەمەی ئێمەداو لە کێشەی نێوان کوردیچەوساوەو ڕژێمی ئەتا تورك تەنها ڕژێمی زاوێنیەکان بوو بە یارمەتی هەندێ ڕژێمی تر شۆڕش گێرەکانی کوردیان گرت و دایانەوە دەست ڕژێمی تورك بگرە هەندێکیان لێ گوشتن لەو بارەوە. لەنێو هەندێ ڕژێمی بەناو موسڵمان بەکرێ گیراوی ئەوان بۆ کپ کردنەوەی ئایین پەروەران و نیشتمان پەروەران دەستیان هەیە .

پرسیار/ لەوانەیە ببێژرێ جیاوازی لەنێوا زاوێنی و لەنێوان جوەکاندا هەبێ،بەو جۆرە زاوێنی جولانەوەیەکی ڕەگەز پەرستیەو ئاوات و ڕامیاریان خزمەتی داگیرکەران و خوێن مژانەو بلاوبونەوەی بێ ڕەوشتی . بەلام جوەکان خاوەنی ئایین و وەك ئاینەکانی تر.

وەلام/ یەکەم: ئەو سەرچاوەیە ئەو جیاوازییەی لێ قولاوە هەرجوەکانی خۆیانن لەبەر ئەو خراپانە سەپێ نراون بە سەریان لە کۆن و لە تازەدا بیسرنەوە بە شێوەیەکی گشتی،ئەگینا جگە لە ڕژێمە داگیرکەرەکان و خوێن مژو بەکرێ گیراوەکان ئەو جیاوازیە ناسەلمێنن .

دووەم: ئایا جوەکان بە زاوێنی خۆش حاڵ نین و ڕقیان لێیانە؟ ئەیشزانن تاقمێکی چەکدارو جەردەن و نێونراون ئیسرائیل، هیچ ئاواتیان نیە جگەی پاراستنی سودی داگیرکەران و لێدانی موسڵمانان و نیشتمان پەروەران، ئەگەر وانیە بۆچی جوەکان یاریدەی ئەو جەردانە ئەدەن بە دارایی و بە گیان خۆیان؟ بەهەزاران ژن و پیاویان بەخۆڕای و بێ موچە ئەچنە نێویان بۆ جەنگ کردن لەگەڵ موسڵمانان. ئایا خۆیان لەنێو خۆیان نالێن: ئێمە گەلی هەلبژاردەی خواین؟ خوا لایەنمان ئەگرێ بۆ دژی هەموو بونەوەران، خوێن و کوشتنی ئادەمیزاد بۆ ئێمە قەدەغە نەکردووە بۆ ئێمەو ڕەوایە، یاسا و

پەیڕەوی ئـەوان لـەسـەر ئـەو بنچینەیـە دامـەزراوە، پرۆتۆکۆلاتـی زانایـانی زاوێنـی ئـەو باسانەمان بۆ ڕون ئەکاتەوە، زاوێنـی تاقمـە جەرەیـەکن دروسـت کـراون بـۆ سـەپاندنی ناوەڕۆکی ئەو پرۆتۆکۆلاتە.

بۆ زانین: جولـەکاتی وەك ئایینی خوا کە هاتبێتە خـوارەوە بۆسـەر موسـا کۆتـایی پـێ هاتووەو لایەن گـیری نەماوەتـەوە، بـە وێنـەی ئاینـەکانی تـر، کەواتـە جوەکـانی ئێسـتا هەموویان زاوینبن مەگەر کەمێکیان و هەمویان بێ باوەڕن بەو ئایینەی هاتوە بۆلای موسا .

وَقَطَّعْنَٰهُمُ ٱثْنَتَىْ عَشْرَةَ أَسْبَاطًا أُمَمًا ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسْتَسْقَىٰهُ قَوْمُهُۥٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنۢبَجَسَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۚ وَظَلَّلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْغَمَٰمَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ۚ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١٦٠﴾ وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ ٱسْكُنُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ وَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطِيٓـَٰٔتِكُمْ ۚ سَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٦١﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ

فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَظْلِمُونَ ﴿١٦٢﴾

﴿ وَقَطَعْناهُمُ أثنَتَى عَشرَةَ أسْباطاً أمَماً ﴾ وەئێمە بەنو ئیسرائیلیەکانمان کرد بە دوازدە تاقم هەر تاقمێکیان سەر بە هۆزێك بوون لە دوواز هۆزەکانی کورانی یەعقوبی کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کە یەعقوب دووازدە کوڕی هەبووە هەر کوڕێکی چەند نەتەوەیەك و چەند تاقمێکی زۆربوون .

﴿ وَأَوْحَيْنا إلى مُوسى إذا أسْتَسْقاهُ قَوْمَهُ أنِ أضرِبْ بِعَصاكَ الْحَجَرَ ﴾ وە ئێمە نیگامان نارد بۆلای وموسا کاتێ خزمەکانی داوای ئاوی خوردنەوەیان کرد کە تۆ بەداردەستەکەی خۆت بدە لەو بەردەی لای خۆت، موسایش داردەستەکەی دا لەو بەردە دوای دواکەیان .

﴿ فَأَنْبَجَسَتْ مِنْهُ أثنَتا عَشرَةَ عَيْناً قَدْ عَلِمَ كُلُ أناسٍ مَشْرَبَهُمْ ﴾ دوایی هەڵقولاو هاتەدەرەوە لەو بەردە دووازدەکانی بە گوێرەی ژمارەی تاقمەکان بەڕاستی ئایانزانی هەمو تایفەیە جێگە ئاو خواردنەوەیان، هەتا دەست درێژی نەکەنە سەر یەکتری و زۆرداریان ستەم لەبێ دەستەلآتیان نەکەن، هەمویان بتوانن ئاوی خۆیان بەبێ ئاژاوە بەکارهێنن لە ئایەتی (٦٠)ی سورەتی ئەلبەقەرەدا وێنەی ئەو ئایەتە تێپەڕبوە.

﴿ وَظَلَلْنا عَلَيْهُمْ الْغمامَ ﴾ وەئێمە هەورمان کردبو بەسێبەر بەسەریانەوە هەتا گەرما ئازاریان توش نەکا لە دەشتی تەیهدا و بە خۆشی بژین و،

﴿ وَأنْزَلْنا عَلَيْهُمْ الْمَنَ وَالسَلْوى ﴾ ناردبومانە خوارەوە بەسەریانا لە ئاسمانەوە گەزۆ کە شیلەیەکی شیرین و سپیە و ئەکەوێتە سەر درەخت و بەردو ئەوانیش کۆیان ئەکردەوەو ئەیان خواردو، بۆمان ناردە سەریان باڵندەیە پێی ئەوترێ شێلاقەو گۆشتەکەیان ئەخوارد.

﴿ كُلُوا مِنْ طَيِّباتِ مارَزَقْناكُمْ ﴾ وەئێمە پێمان فەرمون: لە چەندین خواردەمەنی پاك و بەتام شتێ ئێمە كردومانە بە ڕۆزی بۆ ئێوە بخۆن، بێ ئومێد مەبن لە میهرەبانی ئێمەو مەیان شانەوە لە خانوەكانتان و هەڵی مەگرن .

﴿ وَما ظَلَمُونا وَلكِنْ كانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾ وەئێوە ستەم لە ئێمە ناكەن بەشتێ ئێمە كەمی بكەینەوە زایانمان لێ نادەن بە شتێ ئێمە لێتان وەرگرینەوە، بەلاّم ئێوە ستەم لە خۆتان كە سوپاسی ئێمە ناكەن و ئازارو سزا توشی خۆتان ئەكەن و خواردەمەنیتان لێ ئەگرینەوە، ئەو ئایەتە وێنەی ئەو ئایەتە باسی ماناكانیان كراوە لە ئایەتی (٥٧)ی سورەتی ئەلبەقەرەدا .

﴿ وَإِذا قِيْلَ لَهُمْ أَسْكُنُوا هذِهِ الْقَرْيَةَ وَكُلُوا مِنْها حَيْثُ شِئْتُمْ ﴾ وەبیری ئەو كاتە بكەنەوە بێژرا بەروان فەرمانیان پێدرا دووای كۆتایی جنگیان لەگەڵ زۆرداران و سەركەوتنیان بەسەریانا لە فەلەستین ئێوە دانیشتن لەو گوندەدا كە بە بەیتولموقەدەسەو، ئێوە بخۆن لە میوەو دانەوێڵە و خواردەمەنی لەو گوندەدا لەهەر جێگەیە ئارەزوتان لێی هەیە و هەر كاتێ ئەتانەوێ بیخۆن .

﴿ وَقُولُوا حِطَّةٌ وَأَدْخُلُوا الْبابَ سُجَداً ﴾ وەئێوە بڵێن: كارو فرمانی ئێمە ئەوەیە داوا لە خوا بەین لابا لەسەرمان گوناهو ناتەواویمان بەهۆی سوپاس نەكردنمان لەسەر چاكەی خواو، ئێوە بچنە نێو شاری ئەریحا لە دەرگای خۆیەوە بە كوڕنوش بردن و سوژدە بردن بۆ خواو .

﴿ نَغْفِرْ لَكُمْ خَطِيئاتِكُمْ سَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينْ ﴾ ئێمە لە گوناهەكانی ئێوە خۆش ئەبین و سزاتان نادەین بەهۆی گوناهەكانتانەوە زۆربن یا كەم كاتێ خۆتان بپارێزن و بپاڕێنەوە لەخوا. ئێمە پاداشتی چاكە كەران زۆر ئەكەین و پلەو پایەیان زۆرتر ئەكەین.

﴿ فَبَدَلَ الذيْنَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ قَوْلاً لا غَيْرَ الذي قِيلَ لَهُمْ ﴾ دوایی كەسانێكی ئەوتۆ ستەمیان لە خۆیان كرد لەوان گۆڕییان فەرمودەی خوا بە جگەی شتێكی ئەوتۆ بێژرابوو بەوان بیكەن، بۆیە پێویست كرا گیرۆوە بكرێن و سزایان بدرێ، درێژەدان و نەرمی

لەگەڵیان سودی نیە، ئامۆژگاری و ڕانموویی کاریان تێ ناکـاو هەڕەشەو ترساندن نایـان ترسێنێ.

﴿ فَأَرْسَلْنا عَلَيْهِمْ رِجْزاً مِـنَ السَـماءِ بِمـا كـانُوا يَظْلِمُـونَ ﴾ دوای ئێمـه سـزامان لـه ئاسمانەوە ناردە سەریان، چونکە شایانی ئەوەبوەن لەناو ببرێن، ئیتر ئەو سزایە بەهەر شـتێ بێ توشی ئەبن. بەهۆی شتێ ستەمیان لە خۆیان کردو بەردەوامبون لەسـەر بـێ فـەرمانی خوا.

لە دووایدا خوای مەزن هەواڵی ترمان ئەداتێ کە ڕەوای کردبو بۆ کوڕانـی ئیسـرائیل لە هەفتەیەکدا شەش ڕۆژ کار بکەن و بۆ ژیانی خۆیان و پەیداکردنی خواردەمەنی و شتی تر.

ڕۆژی حەوتەم پشوو بدەن لەکارکردن خۆیان، تەرخان بکەن بۆ پەرستنی خـواو تـازە کردنەوەی دروشمەکانی ئایین. بەلام ئەوان لەو سنورە دەرچون، وەك خوا ئەفەرموێ:

وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾ وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا قَالُوا مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾ فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ

وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُوا بِعَذَابٍ بَئِيسٍ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾ فَلَمَّا عَتَوْا عَن مَّا نُهُوا عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ ﴿١٦٦﴾

﴿ وَأسْألْهُمْ عَنِ القَريَةِ التي كانَتْ حاضِرَةَ الْبَحْرِ ﴾ موحەمەد تۆ پرسیا بکە لە جوەکان لە دانیشتوانی گوندێکی ئەوتۆ لەسەر کەناری دەریای سوربون. خوای مەزن ناوی ئەو گوندەو ئەو دەریایەی ڕون نەکردۆتەوە زانایان ئەفەرمون: ئەو گوندە ئەیلەیا مەدیەن بوە دەریاکەیش دەریای سوربوە. بەهەر جۆرێ بێ ئەو گوندەو ئەو دەریایە جوەکان خۆیان ئەیانزانین، بۆیە پێغەمەر بە فەرمانی خوا پرسیاری لێ کردن، هۆی پرسیارەکەیش ئەمانەی خوارەوەیە:

١- پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ڕوبەڕوی جوەکان ئەوەستێ کە باوەڕ بە پێغەمەرایەتی ئەو ناکەن و بەباشی ئەزانن پێغەمەری خوایە، چونکە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ هەواڵی زۆری دابونێ لەبارەی مێژوی پێشوەکانیانەوە کەیەکێ لەو هەواڵانە ڕوداوی دانیشتوای ئەو گوندەیە لەسەر کەناری ئەو دەریایە کەچی هیچ نامەیەکی نەخوێندبوە وەلەکەسیشی نەبیستبو. بەڵکو بەهۆی پەیامەوە خوای مەزن بۆی باسکردبو.

٢- لەبەر ئەوەیە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ جوەکان ئاگادار بکاتەوە لە خۆیان بایی نەبن و بڕیاری ڕاستی فەرمودەی خوا بدەن. ئەو خووڕەوشتە بێگانە نیە لە جوەکانەوە لە مێژوی ئەوانەوە. بەڵکو ئەو شتانە و بوختان و درۆ و ڕەوشتی ئەوانە هەر لەکۆنەوە بەسەرهاتی ئەو گوندەیە.

﴿ إذْ يَعْدُونَ في السَّبْتِ ﴾ کاتێ لە سنورو فەرمانی خوا دەرچون و ڕێزی شەمەی پیرۆزیان شکاندو دژی فەرمودەی خوا وەستان کەلەجگەی پەرستن هیچ شتێ لەو ڕۆژەدا نەکەن کەچی ئەوان دەستیان کرد بە ڕاوە ماسی کردن لە شەمەدا.

﴿ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعاً ﴾ لەو کاتەدا ماسیەکانیان ئـەهاتن بۆلایـان لـە ڕۆژی شەمە کەی ئەوانا بەدەرکەوتوی و بە ئاشکرایی ئەیان بینین.

﴿ يَوْمَ لا يَسْبِتُونَ لاتَأْتِيهِمْ ﴾ وە ماسیەکان نەئـەهاتن بۆلایـان و دەرنەکەئـەوتن ڕۆژێ ئەوان لـە شەمەدا نەبونایەو خەریکی کارکردن بونایە .

﴿ كَذَلِكَ نَبْلُوهُمْ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴾ بـە وێنـەی ئـەو تـاقی کردنـەوە سـەختە ئێمـە تاقیمان کردنەوە ئێمە زاناتربوین بە کردەوەی ئەوان بەهۆی ئەوەوە لە سنور لایـانداو بـێ فەرمانی خوایان کرد.

بە کورتی خوای مەزن قەدەغەی کرد لەسەر جوەکان کـارکردنی جیـهانی لـە ڕۆژی شەمەدا. بە تابەتی ڕاوەماسی کردن، بەو بۆنەوە وەك کەسێ تاقی بکرێتـەوە خـوا ئـەوانی تاقی کردەوەتەوە، بۆ ئەوەی لە هەموو کەسێ بگەیەنێ کە کەماسی زۆریان بـۆ دەرئـەخا بەسەر ئاوی دەریاکەوە لە ڕۆژی شەمەدا، لە ڕۆژەکانی تردا وونی ئەکردن لەژێر ئـاودا. لە پاشا کۆمەڵێك لـە جوەکان فێڵێکیان ساختە هێنا بۆ ئەوە ئـەو شـتەی خـوا قەدەغـەی کردووە لەوان بیکەن و بەڕەوایان دائەنا بە دژی فەرمودەی خوای مـەزن. ئـەوەبو هـاتن چاڵێکیان دروست کردو ئاویان بۆ ئەو چاڵە ڕاکێشا بە جۆرێ ماسی‌یەکان لەشەمەدا کـە ئەهاتنە دەرەوە بچن بۆ ناو ئەو چاڵە، نەیان ئەتوانی لێی دەرچن و بیگەڕێنەوە لـە دوایـدا لـە ڕۆژی یـەك شـەمەدا ماسـیەکانیان ڕاوئـەکردن و ئـەیان گرتـن، ئـەیان ووت: ئێمـە ڕاوەماسی لە ڕۆژی یەك شەمەدا ئاکەین نەك لە ڕۆژی شەمەدا. بەڵام تاقمێ تریان دژیـان وەستان و لۆمەیان کردن و ووتیان: ئەو کارە گاڵتەکردنە بە ئایین و بە فـەرمودەی خـوا، لە سزای خوا بترسن، ئەوان ئامۆژگاریان وەرنەگرت.

زانایان ئەڵێن: جوەکان لە بارەی ڕوداوی ڕاوەماسیەوە، بوون بەسێ بەش: بەشـێکیان بێ فەرمانی خوایان کردووە ستیان کرد بە ڕاوەماسی کردن. بەشێ تریان بێ دەنگ بوون. بەشێ تریان ئامۆژگاری کەری چاکەبوون بۆ نەگرتنی ماسی. خوا ئەو باسەمان بـۆ ئـەکاو ئەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ قالَتْ أُمَّةٌ مِنْهُمْ لِمَ تَعْظِفُونْ قَوْماً اللهُ مُهْلِكُمْ أو مُعَذِبُهُمْ عَذاباً شَـدِيداً ﴾ وەکاتـێ کۆمەڵێ لە جوەکان لە پیاو چاکانی دانیشتوی ئەو گوندەو بێ دەنگبوون بە ئامۆژگـاری کەرەکانیان ووت: ئێوە لەبەر چ شتێ ئامۆژگاری تاقمـێ ئەکـەن خـوا لـەناویان ئـەبا یـا سزایان ئەدا بە سزایەکی زۆر سەخت.

ئەوەی شیان ووت نەك لەبەر ئەوەی ئامۆژگاری کردنیـان پـێ ناخۆشبێ. بـەڵام بـێ ئومێدبوون لەوەی ئامۆژگاری وەرگرن، فەرمان بە چاکە کاتێ پێویسـتە بـە بـێ ئومێـدی ڕونەوا.

﴿ قالُوا مَعْذِرَةً إلى رَبِكُمْ وَلَعَلَكُمْ يَتقُونَ ﴾ تاقمە ئامۆژگاری کەرەکان ووتیـان: لـەبـەر ئەوە ئێمە بیانو بهێنینەوە لای پەروەردەکەری ئێوە کە ئێمـە بـێ دەنـگ نـەبووین لەسـەر ئەوکارە خراپەی ئەو تاقمە ئەیکەن لە گرتنی ماسیەکان و، لەبەر ئەوەی ئـەوان لـە خـوا بترسن و خۆیان بپارێزن لە ڕاوە ماسی و ئومێدمان وابوو ئامۆژگاری وەرنەگرن .

﴿ فَلَما نَسُوا ما ذُكِروا بِهِ أنْجيْنا الذيْـنَ يَنْهُونَ عِـنِ السُوءِ ﴾ دوای کاتـێ لـە بـیری خۆیانیان بردەوە شتێ ئامۆژگاری ئەوانی پێ کرابـوو لەلایـەن پیـاو چاکەکانیانـەوە ئێمـە ڕزگارمان کرد کەسانێکی ئەوتۆ قەدەغەیان کردبـوو لـەکاری خـراپ و لـە ڕاوە ماسـی کردن .

﴿ وَأَخَذْنا الذيْنَ ظَلَمُوا بِعَذابٍ بِئيسٍ بِما كانُوا يَفْسِقُونَ ﴾ سزای کەسانێکی ئـەوتۆمان داو گرتنمان بە سزایەکی زۆر سەخت بەهۆی ئەو شتەی ئەوان لە سنور دەرچووبوون لە ڕاوە ماسی کردن کە قەدەغە کرابو لەسەریان لە ڕۆژی شەمەدا.

﴿ فَلَما عَتَوا عَنْ مانُهُوا عَنْهُ قُلْنا لَهُمْ كُونُوا قِرِدَةً خاسِئِينَ ﴾ دوایی کاتێ ئەو ڕاوە ماسی کەرانە بێ فەرمانی خوایان کرد وازیان هێنابو لەشتێ قەدەغەیان لێ کرابوو لە کردنی ئەو شتەی‌و ئامۆژگاریان وەرنەگرت و بێ فەرمانی خوایان کرد ئێمە ووتمان بەوان ئێوە ببن بـە چەندین مەیمونی بێ نرخ و خاوەن زیـان و بـەد ڕەوشـت بـە لـەشـەوە، گـەوج و تـوڕەو لاسایی کەرەوەیە، بە جۆرێ چاکەو خراپە جوێ نەکەنەوە. ئەگێڕنـەوە ئـەو تاقمـە دوای

بونیان به مەیمون سێ ڕۆژمانەوە، دوایی لەناوچون، چونکە ئەو شتەی شێوەکەی بگۆڕێ لە سێ ڕۆژ زیاتر ناژی و منالّی لە ڕەگەزی خۆی نابێ .

پرسیار/ بەڕاستی دەستوری خوا واپەیدا بووە سزای گوناهبار بەهۆی گوناهەکەیەوە نادا لە جیهاندا بە ئاگاداری بوون و بە بینینی چاوو بە گوێرەی فەرمودەی خوا ( وَلَوْ يُؤخَذُ اللهُ الناسَ بِما كَسَبُوا ما تَرَكَ عَلَى ظَهْرِها مِنْ دابَةٍ ) وەئەگەر خوا سزای ئادەمیزاد بدا بەهۆی شتێ ئەیکەن نای هێڵێ بەسەر زەویدا هیچ شتێ بڕوا بەسەریا. دوای چۆن خوا سزای کەسانێکی ئەوتۆ ئەدا لە فەرمانی خوا دەرچن بەهۆی گرتنی ماسییەوەو واز لەو کەسانە ئەهێنێ ڕوباری خوێن دروست ئەکەن لە ڤێتنام و لە فەلەستین و کۆنگۆ و یابان بە تایبەتی لەهەر چوار پارچەی کوردستان و جگەی ئەوانیش؟ .

وەلام/ بەڵێ زۆر ڕاستە خوای مەزن گوناهباران توشی سزا ناکا لە جیهاندا بەهۆی گوناهەوە هەرچەندە زۆریشبێ و گەورەبێ، ئەگەر توشیان بکا پاك و پیس وەك یەك لەناو ئەبا بەڵێ بەبێ جیاوازی، ئەبێ بزانین ئەو کەسەی واز لە خراپە بهێنێ بەهۆی ترسی کارەساتەوە ڕێزی بۆ دانانرێ. بەلاّم ئەبێ هەر لەبەر ترسی خواو خۆشەویستی چاکەوەبێ نابێ لەبیرمان بچێتەوە کەکاری لە جێگەی شیاوی خوا دانراوی خوا، دامەزراوە بە پاڕانەوەی پێغەمەران بۆ لەناوبردنی تاوانباران وەری ئەگرێ و ئەیکا بە کاری پەك خەر بۆیان هەتا دانیشتوانی داهاتوو تەمێ خواربن، ڕێزی پێغەمەران لایان ڕون بێتەوە بۆ چەسپاندنی پێغەمەرایەتیەکەیان. ئەبێ ئاگادر بین لەم سەردەمەی ئێمەدا پێغەمەران نین هەتا داوا بکەن لە خوابۆ توش کردن و بنبڕکردنی خوێن ڕێژان و تالاّن کەرانی گیانی گەلانی بێ تاوان.

ئادەمیزاد بە کردەوەی خۆیان پاداشتیان ئەدرێتەوە با کاتەکەیشی درێژە بکێشێ، کەسێ پەلە ئەکا بۆ تۆڵە سەندن کە لە نەمانی خۆی بترسێ، خوایش لەکەس ناترسێ.

قورئانی پیرۆز بە درێژی باسی کوڕانی ئیسرائیلی فەرموە لەگەڵ بێ باوەڕی و خراپە بلاّوکردنەوەیان لە زەویدا، وێنەی زۆرمان لە ڕەوشتی پیسیان باس کردوە کە ئەوان شایستەی هەموو سزایەکن خوا لەگەڵیان بکاو ئابڕویان باوبێ نرخیان بکا لە جیهاندا.

بەلام هەندێ کەس لەوانەیە بکەوێتە نێو سەرگەردانیەوەو گومانی ناشایان بـا دەربـارەی ئەم ئایەتە پیرۆزەی دوایی کە ئەفەرموێ:

وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوءَ الْعَذَابِ ۗ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ الْعِقَابِ ۖ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٦٧﴾

﴿ وَإِذْ تَأذَنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَ عَلَيْهِمْ إلى يَوْمَ الْقِيامَةِ ﴾ وەتـۆ بـیری ئـەو کاتـە بکـەرەوە پەروەردەکـەری تـۆ ڕای گـەیاندوەو پێویسـتی کـراوە کـە بـە ڕاسـتی ڕەوانـە بکـا بـۆ سـەرچوەکان و زاڵ بکـا بەسـەریان هـەتا ڕۆژی دووایـی هەڵسـانەوەی مـردووان لـــە گۆڕەکانیان:

﴿ مَنْ يَسُومُهُمْ سُوءَ الْعَذابِ ﴾ کەسێ بچەژێنێ بە جوەکان سزای سەخت و گران لـە کوشتن و لـە دەربەدەری کـردن و پەرتـەوازە کردنیـان بـە جیـهاندا، دیـل کردنـی ژن و منداڵەکانیان و سەرانە لێ سەندنیان و ئازاردانیان .

﴿ إنَ رَبَّكَ لَسَرِيعُ الْعِقابِ ﴾ بە ڕاستی پەروەرکەری تۆ سزای زۆر سەختە بـۆ کەسـێ باوەڕ نەهێنێ و سزای دوواناخا، بە تایبەتی بۆ کەسێ بەردەوامبێ لەسەر بێ باوەڕی. لـەو ئایەتە بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی خوا کۆ ئەکاتەوە بۆیان لـەگەڵ ئـازاری جیـهاندا سـزای پاشە ڕۆژ. کەواتە ئەو سزایە بەردەوامە لەسەریان لەهەردوو جیهاندا.

﴿ وَإِنَهُ لَغَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ وەبەڕاسـتی پەروەردەکـەری تـۆ لێ خۆشـبوونی زۆرە بـۆ ئـەو کەسانەی پەشیمان ئەبنەوەو داوای لێ خۆشبون ئەکەن، میهرەبانە بۆ باوەڕداران.

ئێستا بە کورتی وولامی سەرگەردانی و گومانی ژەهراوی ئەو کەسانە ئەدەینـەوە بـەر لەماناکردنی ئایەتەکە باسمان کردو ئەڵێین: ناوەڕۆکی ئەو ئایەتە زۆرە ڕاست و بێگومانـە، ئەوەبو لە ئایەتی(٥٣)ی ئەم سورەتەدا خوا گەورە زاڵی کردبو بەسەر جوەکاندا فیرعەون

و بابولیەکان و فارسەکان و جێگەنشین و باش ماوەی ئەسکەندەرو لە دوایشدا گاورەکان.

لە تەفسیری بەحرو لموصیتا فەرمودەیەکی زۆر جوان و بە نرخ لە مێژوی ئەواندا هەیە (بەڕاستی کۆمەڵی لە گاورەکان توشی هەژاری و بێ دارایی بوون و هیچ شتێکیان بۆ نمایەوە بۆیان نەلوا، بەو بۆنەوەجوەکانی نیشتمانی خۆیانیان کرد بە کۆیلە و فرۆشتنیان بە دراوسێکانیان، لە ئەنجامی ئەو کارەدا جوەکان هەڵهاتن لەبەر ئازارو کزۆڵی و ئەشکەنجە دانیان، پەنایان بردە لای جێگەکانی تر. بە تایبیەتی نێو دورگەی عەرەب لەوێدا زۆر بە ئاسایش ژیان و ڕایان بووارد بە خۆشی هەتا کاتی هاتنی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾، ئەو پەیمانەی لە نێوان ئەوان و پێغەمەردا بەسترابوو شکانیان، بۆیە هەندێکیان کوژران، جێگەنشینی دووهەمی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ عومەری کوڕی خەتاب ئەو کەسانەیان مابوونەوە دەری کردن، لە پاشا بە ڕۆژئاواو بە ڕۆژهەڵاتا بڵاوبونەوە بە کەمی و بەبێ سەربەخۆیی و بە دوواکەوتووی، فەرمانبەرداری جگەی خۆیان بوون بەبێ نرخی).

دوایی جوەکان کە بۆیان دەرکەوت بێ نرخن و ناویان نابرێ و باسیان ناکرێ مەگەر بێن بە خزمەت کاوو دەست کەلای پوختەی ڕژێمە داگیرکەرەکان و خوێن مژان، چۆن و خۆیانیان فرۆشت بە هەموو داگیرکەرێکی زۆردار، هەموناموس و پارەی خۆیانیان بۆ تەرخان کردن، ئەوانیش باوەشیان پێداکردن و فەرمانیان دا بە جوەکان هەموو نەخشەو خوێن ڕژانیان بۆ جێبەجێ بکەن، ئەوانیش بە فراوانی دڵەوە وەریان گرت، زۆر ڕووداوی خراپیان بۆ جێبەجێ کردن. دوایی لە هاوینی ساڵی (١٩٦٨)ڕوون بویەوە بۆ دانیشتوانی سەرزەوی کە هەندێ لە ڕژێمە داگیرکەرەکان فەرمانیان داوە بە جوەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا هەڵسن بە هەوڵدانێکی بێ ئەندازە کە ڕژێمەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا بخەنە نێو بازنەی داگیرکەرانی ڕۆژئاوای ئەوروپا بەبێ بیروڕای دانیشتوانی ئەو نیشتمانە، ئەوانیش زۆر بەبێ شەرمانانە دەستیان پێ کرد. بەڵام بیروڕایان دەرکەوت ئابڕۆیان چوو بەر لەوەی نەخشەکەیان سەربگرێ، بەو بۆنەوە نزیك بوو جەنگی سێهەم

پەیدا ببێ، بۆیە لە دووایدا و لەوەو بەریش بۆ خزمەت کردنی ڕژێمە داگیرکەرەکان تاقمێ چەکدارو جەردەیان دروست کردبوو لە جوەکان لە زەوی موسڵمانان ناویان برد بە ڕژێمی ئیسرائیل بۆ کپ کردنەوەی موسڵمانانی نیشتمان پەروەر.

پرسیارێ ئەکرێ لە هەموو مرۆڤێکی ژیرو بەویژدان: ئایا دروستە ئیسرائیل ناوبرێ بە دەوڵەت بە ڕاستی کەچی ئەگەر داگیرکەرانی خوێن مژان یەك ڕۆژ وازیان لێ بهێنن لەناو ئەچن ناویان نامێنێ؟ ئەوا نە لەلایەکەوە، لە لایەترەوە ئەگەر ڕژێمە دراوسێکانیان، وێنەی میسرو ئوردن بە ئاشکرایی و ڕژێمەکانی تری بەناو موسڵمان بە نهێنی بڕیان نەدایە بە خاوەن ڕژێمێتی بۆیان لەبەرمانەوەی کورسیەکانی خۆیان و دڵخۆش کردنی ڕژێمە داگیرکەرەکان ئەو ڕژێمە نەئەمایەوە .

بەڕاستی ئەو ڕژێمەی جولەکە دروست بووە بە ناڕەوایی و بە چەکداری و جەردەی، هەموو ڕژێمێکی ڕاست و ڕەوا ئەبێ لەسەر بنچینەی ڕاستی و ئاشتی دروست ببێ و دوربێ لە ڕەگەزپەرستی، دروستبوونی ئیسرائیل ڕژێمێکی سەربازیەو بۆ چەك دروست کراوە، ڕژێمێکە لە دەست درێژی و ڕەگەز پەرستی ناوەستێ، هەموو نرخێکی زاوێنیەتی و ڕەگەز پەرستی و دڵ پیسی و فێڵ و دەست درێژی و تاوانە. نوسەری ئینگلیزی (کریستوفر مارلو) لەشانۆگەری جوەکانی ماڵتیدا ئەڵێ: (پەیدابوونی ژیان لەگەڵ جودا لەهەر کەسێکەوە بێ جۆرێکە لە شێتی. دەرمان بۆ دەرونیان نیە جگەی چەك و دەست درێژی) ئایا پاش ئەوانە هەموو موسڵمانان چۆن ئەژین لەگەڵ جودا بە ئاشتی؟ ئایا شتی وائەبێ و ڕاستە ببێژرێ: جولەکە پیاوی بەڕێزن لە کاتێکا جەردەو پیاوکوژن کەچی ناویان ببرێ بە دەوڵەت. بە سەدان موسڵمانانیان کوشتووەو ئاوارەیان کردوون بە یارمەتی داگیرکەرانی خوێن مژ. بە داخەوە دۆستی زۆریان هەیە لەنێو ڕژێمە بەناو موسڵمانەکاندا و نەخشەیان بۆ ئەکێشن ئەبن بە ستونی پێنجەم بۆیان لە دژی خزم و هاو ئایین و هاو نیشتمان خۆیان. بەڵێ: ئەگەر جەردەو ڕێگەگرو پیاو کوژو ئاوارەکەری دانیشتوان چاکبێ و بەڕێز بژمێرن جولەکەو هاو سوێندەکایان و بەکرێ گیراوەکانیان و ئەوپەڕی گەورەو بەهێزن ئەویش لای چ کەسێ؟.

وَقَطَّعْنَاهُمْ فِي الْأَرْضِ أُمَمًا مِّنْهُمُ الصَّالِحُونَ وَمِنْهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ وَبَلَوْنَاهُم بِالْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٦٨﴾ فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا الْكِتَابَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا الْأَدْنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِن يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُ يَأْخُذُوهُ ۚ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَاقُ الْكِتَابِ أَن لَّا يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ وَدَرَسُوا مَا فِيهِ ۗ وَالدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦٩﴾ وَالَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِالْكِتَابِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُصْلِحِينَ ﴿١٧٠﴾ ۞ وَإِذْ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّوا أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ خُذُوا مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُوا مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾

﴿ وَقَطَّعْنَاهُمْ فِي الأَرْضِ ﴾ وە ئێمە جوەکانمان پارچە پارچە کردو پەڕاکەندەمان کردن لە زەویدا بە چەندین کۆمەڵ هەر یەکەیان لە جێگەیە، نە نیشتمانێکیان ما کۆیان بکاتەوە نە دەوڵەتێ هەبوو بیانپارێزێ.

زاوێنیەکان هەوڵیاندا ڕژێمیان بۆ دروست بکەن لە ڕوباری نیلەوە هەتا ڕوباری فورات بەهۆی جەردەی و کوشتنی دانیشتوانەوە بە نهێنی و بە ئاشکرا بە یارمەتی ڕژێمە خوێن مژە داگیرکەرەکان وێنەی ئەمەریکا بە تازەیی. زاوێنیەکان وایان داوە لە مێشکی

خۆیان ئەو دەست درێژی و کوشتن و برینە ئـەوەی ئـەوان ئەیانـەوێ دێتـەجێ ، ئاگایـان لەوە نیە کە جوەکان لـەسەر بۆنبا دانیشتوون لـەوانەیە بتەقێتەوە لـەژێریانا، زۆر کارەسات و ڕوداوی وا پەیدا ئەبێ کەس نایزانێ جگـەی خـوای مـەزن، هەڵـسوڕانی بونـەوەران و بوژانەوەو لـەناوبردنیان بەدەستی خوایە بە تەنها نەك بە دەستی زاوێنەکان و داگیرکەران .

﴿ مِنهُمْ الصالِحُونَ ﴾ هەندێ لـەو بەنی ئیسرائیلیانە خوا باسی کردون پیـاو چـاکن و ئایینی موسایان وەرگرتوو نەیان گۆڕی، باوەڕیان بە عیسا و بە موحەمەد هێنا، ئەو بـاس و شێوازانە لـە تەوراتا خوێندبویانەوە نەیان گۆڕین، بە پاکی ئاینی دەست لێ نەدراوی موسـا بویە کە پێغەمەری ئیسلام هات باوەڕیان پێ هێنا.

﴿ وَمِنْهُمْ دُونَ ذلِكَ ﴾ وەجوەکان هەیان بوو جگەی پیـاو چاکـان بـوون و باوەڕیـان نەهێناو لـە سنور دەرچوون، پێغەمەرەکانی خۆیانیان کوشت و بوختان هەڵئەبەستن بۆیان و سودیان ئەخوارد .

﴿ وَبَلَوْناهُمْ بِالْحَسَناتِ وَالسَيئاتِ لَعَلَـهُمْ يَرْجَعُـونَ ﴾ وە ئێمـە هـەموویانمان لـە پیـاو چاکان و جگەی ئەوان گیرۆدەمـان کـردن و تاقیمـان کردنـەوە بـە چـەندین چاکـە لـە هەرزانی لـەش ساغی و گوزەرانی خۆشی و بە چـەندین خراپـە لـە گرانـی و هـەژاری و ناتەواوی و ئازارو نەخۆشی دڵ و لـەشیان بۆ ئەوەی ئـەوان بگەڕێنـەوە بـۆلای پەرستنی خوداو واز لـەبێ فەرمانی خوا بهێنن سوپاسی چاکەکانی ئێمە بکەن کـەچی هـەتا ئـەهات خراپتر ئەبوون و ئەیان ووت: خوا هەژارەو دەسـت قوچـراوە، ئێمـە سـامانداروو دەسـت کراوەین .

﴿ فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا الكِتابَ ﴾ دوایی پێشوەکانیان ڕۆیشتن تاقمـێ تریـان لـە جێگەی ئەوان دانیشتن نەوە لـە دوای نەوەو، وەریان گرت ئەو نامیە کـە تەوراتـە لـە ڕابوردەکانیانەوە خوێندویانەوەو زانیان چ شتێکی تێدایە هەتا کاتی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ .

بۆزانین: جیاوازی نێوان ( خَلْفَ ) بەلامی زەنەدارو نێـوان ( خَلَـفٌ ) بـەلامی سـەردار یەکەمیان تاقمە پیاوێکی خراپن و دێن بـە دوای تاقمـێ تـردا . دوەمیـان بریتـین لـە پیـاو چاکان.

﴿ يَأخُذُونَ عَرَضَ هذا الأدْني ﴾ ئەو تاقمــە هاتوانــە وەرئــەگرن شــتێکی نــەماوەو بــێ بەردەوام لـەم جیهانەدا ، بەدەست کــاری کردنــی تــەورات و گۆڕینــی شــێوەی پێغەمــەر بەرتیل و سودو دارایی خراپ تێر ناخۆن و چاو چنۆك و بوختان چین .

﴿ وَيَقُولُونَ سَيُغْفِرُ لَنا ﴾ وەئــەڵێن ئــەو تاقمــە: لـەمــەو دوا لێ بــوردن بــۆ ئێمــە هەیــە لـەلایەن خــواوە ئێمــە لـەســەر هیــچ شــتێ سـزامان نـادرێ، چونکـە ئێمـە کــوڕی خــوا خۆشەویستی خواو گەلی خوایین .

﴿ وَإن يَأتِهِمْ عَرَضٌ مِثْلُهُ يَأخُذُوهُ ﴾ وەئەگەر بێت بۆلای ئــەوان ئــەمڕۆو دوای ئــەمڕۆ شتی نەماوەو بێ دەوام لـە کالای جیهان وێنەی ئــەوەی لـەمــە وەریــان گرتــووە ئەمانــەی دواییش وەرئەگرن، لـە هیچ شتێك ناگەڕێنەوە قەدەغــە بــێ یــان نــا، کــەم بــێ یــان زۆر. بەمرجێ پارەو پولی تێدابێ بەداخەوە ئێمەی دانیشتوانی ئەم سەردەمەی ئێمە هەمانە خــوی ئەوانیان گرتووە .

پرسیار/ ئەو ڕستەیە و ڕستەی پێشــوو بــە ڕواڵــەت ماناکانیــا یــەکن بۆچــی دووپــات کراوەتەوە ؟

وەلام: مەبەست ئەمەیە: خوای مەزن بە درۆیــان ئەخاتــەوە کــە ئــەوان هــەموو کاتــێ بەردەوامن لـەسەر کردنی گوناهو خراپە بە تایبەتی بەرتیل وەرگرتن و هۆ ناکەنەوە بــۆلای چاکە جار لـەدوای جار نرخ بـــە چاکــەو بــە فــەرمانی خــوا نــادەن، بــەردەوامن لـەســەر پەیداکردنی سامان و مەبەستی تریان نیە کەچی ئەڵێن: لێ خۆش بوون بۆ ئێمەیە .

﴿ اَلَمْ يُأخَذْ عَلَيْهِمْ مِثاقُ الْكِتابِ أنْ لا يَقُولُوا عَلَى الـــهِ إلا الْحَقَ ﴾ ئایــا وەرنــەگیراوە لـەسەر ئەو بەرتیل خۆرانە پەیمانی نامەی تــەورات کــە نــەیڵێن و نــەیدەن بەســەر خــوادا مەگەر ڕاستی، زۆر ڕونە کە ئەوان درۆیان ئەدایە پاڵ خوا، وەك ئەوەی ئەیان ووت: خوا خۆش ئەبێ لـەهەر گوناهێ ئێمە بیکەین، خۆیشیان ئــەیان زانــی درۆ ئەکــەن و تــەوراتیان لابوو، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَدَرَسُوا مَا فِيهِ ﴾ وەخوێندبویانەوە شتێ لەنێو ئەو نامەیەدا بوو، کارە قەدەغەکراوەکان و ڕەواکانیان زانیبوو، هەموو شتێ کە لە تەوراتا نوسرابوو ئەیانزانی کە خوا لەو کەسانە خۆش ئەبێ پەشیمان ببنەوەو واز لە گوناە بهێنن. بەلآم ئەو کەسانە بەردەوام بوون لەسەر گوناە کردن و لەوانە ئەژمێررێن لەناو بچن، هەروەها ئەزانن کە تەورات پەیمانی لێ وەرگرتوون لەسەر هەموو کەسێ بەخواو بەناوەڕۆکی تەورات باوەڕبهێنن و پێویستە بوختان و درۆنەدەنە پاڵ خوا، گوناهباران خۆیان بەو پەیمانە ئەزانن کەچی بەردەوامن لەسەر گوناهە گەورەکان و ئەڵێن: خوا لێمان خۆش ئەبێ، ئەو شتانە ئەوان کردیان لە شکاندنی پەیمان بەدرۆدان و بوختان بەسەر خوادا هۆی سزادانیانە نەك لێ خۆشبوون، بێ بەشن لە لێ بوردن ئەو بوختان کەرانە .

﴿ وَالدارُ الأخِرَةُ خَيْرٌ للذيْنَ يَتقُونَ أفَلا تَعْقِلُونَ ﴾ وەشتێ لە خانوی دواییدایە لەوەی خوای مەزن ئامادەی کردووە بۆ دۆستانی خۆی و خاوەن پەرستەکان و کار کەران بە فەرمودەی خواو نامەی خوایان نەگۆڕابێ و بەرتیلیان وەرنەگرتبێ چاکترە بۆ کەسانێکی ئەوتۆ خۆیان ئەپارێزن لە خراپەو لە سزای خوا ئەترسن. ئایا ئێوە بۆ نافامن و ئەقڵ وەرناگرن و ئەو شتانە بزانن و بیر بکەنەوە؟ پاداشتی لەناو نەچونی پاشە ڕۆژ نەگۆڕنەوە بەکالآی بێ نرخ و براوەی جیهان. ئەو کەسانە هەواو هەوەسیان ئەقڵیانی داپۆشیە و دەرونیا توشی نەخۆشی کردووە، ئیتر چۆن ئەی خەنە کارەوە بۆ خوا ناسین و چاکەکردن.

﴿ وَالذيْنَ يُمَسِكُونَ بِالْكِتابِ وَأقامُوا الصَلاوَ إنا لا نُضيْعُ أجْرَ الُمحْسِنِينَ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ دەستیان گرتووە بە نامەی خوا کە تەوراتە بە توندی کار بە ناوەڕۆکی ئەکەن و دەست کاری ناکەن و سنورەکانی ئەپارێزن و نوێژەکانیان ئەکەن و پیادەی ئەکەن و ئەیکەن لە کاتی خۆیا و ئەزانن کۆڵەکەی ئاینە. بەڕاستی ئێمە بە زایە نادەین پاداشت و مزەی چاکەکەران، بە پاکی دەرونیانەوە شایستەی وەرگرتنی پاداشتی کردەوەی خۆیانن.

ئەو ئایەتە تانە تەشەرەیە لە جوەکان کە بە زمان باوەڕیان بە تەوراتەو کاری پێ ناکەن دوبارە تانەو تەشەرو تاوانجە بۆ هەموو کەسێ خۆی بدا بەلای ئایینەوە سستی بکا لە

فەرمانەکانیدا. بە تایبەتی کردنی نوێژ کە کۆڵەکەی ئایینە. بەڵام دانیشتوانی ئەم سەردەمەو لاوان و خوێنەواران نوێژیان لە کەنارەوە داناوە بەشتێکی سەرکی نازانن. ئایین بە گوێرەی هەوەسی خۆیان تەماشای ئەکەن،خۆ نازانن نوێژ نەکردن گوناهی زۆر گەورەیە، بگرە لە داوێن پیسی و کوشتن گەورەترە، خوای مەزن بۆ جارێ تر ڕوی فەرمودەی خۆی ئەگێڕێنێتەوە بۆلای جوەکان و گەلی موساو ئەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ نَتَقْنا الجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَهُ ظُلَةٌ ﴾ وەتۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوەو بە بیری ئەو جووانەی بخەرەوە ئێمە ئەو کێوەمان هەڵکەندو بەرزمان کردەوە لەژورسەریانەوە بە وێنەی چەترێ سێبەری کردبوو بەسەریانەوە. زانایان ئەڵێن: ئەو کێوە کێوی توربوە.

﴿ وَظَنُوا أَنَهُ واقِعٌ بِهِمْ ﴾ وەوایان ئەزانی کە بە ڕاستی ئەکەوێ بەسەریانا، ترسیان لێ پەیدا بوبو ترسێکی زۆر گەورە، ئەو کارە پەك خەرەبۆ ئەوەبوە بترسن و فەرمانەکانی تەورات وەربگرن، هەرشتێ خوا لە تەواراتا هەواڵی پێداوە بلاوی بکەنەوە بە باوەڕی بێ گومانەوە.

﴿ خُذُوا ما أَتَيْناكُمْ بِقُوةٍ ﴾ وەئێمە بەوانمان ووت: ئێوە وەربگرن شتێ ئێمە بەخشیومانە بە ئێوە لە یاساکانی تەورات بە هەموو هێزی خۆتانەوە، ئارام بگرن لەسەر وەرگرتنیان .

﴿ وَأذْكُرُوا ما فِيهِ لَعَلَكُمْ تَتَقُونَ ﴾ وەئێوە بیر بکەنەوەو خۆتان ببەستن بەو شتە لە تەوراتایەو کاری پێ بکەن و وازی لێ مەهێنن و لەبیری خۆتانی مەبەنەوە، ئەو پەیمانەی نامەی تەورات بیری خۆتانی بخەنەوە، بۆ ئەوەی ئێوە لە خوابترسن و خۆتان بپارێزن لە گوناه کردن و بێ فەرمانی خواو کاری ناشرین و ڕەوشتی بێز لێ کراوە نەکەن.

لە دواییدا خوای مەزن باسی ئەکا وەری گرتووە لە کوڕانی ئادەم لە پەیمان بەهۆی ئەقڵ و بیرکردنەوەیان لە دروست کردنی بونەوەران، وەك چۆن پەیمانی وەرگرت لە کوڕانی ئیسرائیل لەنێو نامەکانیانا. هەتا گوێچکەو عەقڵیان لە وەرگرتنی پەیمانەکەدا کۆببنەوەو بیانویان نەمێنێ. دوای ئەوەی باسی جوەکان و پەیمان وەرگرتن لەوان لە نامەکەیان کردوکۆتایی پێ هات، باسی هەموو ئادەمیزادو پەیمان وەرگرتن لەوان ئەکا

بەهۆی بەڵگەو نیشانەی ڕونی ببینراو ئەوەی کە بەهۆی ئەقڵ و گییانی پاکیانە ئەی دۆزنەوەو ئەفەرموێ:

وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوْ تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ ۖ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿١٧٣﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَـٰتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٧٤﴾

﴿ وَإذ أخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي أدَمْ مِنْ ظُهُورهِمْ ذُريَتَهُمْ ﴾ وەتۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوەو بیری هەموو ئادەمیزادی بخەرەوە: پەروەردگاری تۆ لە ئادەمیزاد لە پشتی ئەوان دەری هێناوە منالەکانیان لەژن و لە پیاو زاوزێ بکەن خولەك لە دوای خولەك و نەوە لە دووای نەوە کە بدۆزنەوە بە هۆی ئەو شتە بە نرخەوە ئێمە بۆمان دروست کردوون و پێمان بەخشیون لە ئەقلّی ساغ و لە توانا، هەتا بتوانن بیربکەنەوە لە هەموو ئەو شتانەی خوا دروستی کردوون لەم گەردونەدا هەتا خوای پێ بدۆزنەوە ئادەمیزاد پشت لە دووای پشت و نەوە لە دووای نەوە، دانیشتوان کات لە دوای کات بەو سروشت و دروست کردنە پاکە دروست کراون لەیەکەم جاری بونیانەوە کە توشی گوناه نەبوون لەو ئایینە پاکە لانەدەن و وەری بگرن و وەرنەگەڕێن بەهۆی بیرکردنەوەیان، هەتا توشی لاسایی کردنەوەی پێشوەکانیان نەبن و ڕێگەی ڕاستیان لێ وون ببێ.

﴿ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسَهُمْ ﴾ وە پەروەردەکەری تۆ نەوەکانی ئادەمی کردوە بە شایەت لەسەر کردەوەی خۆیان، هەموو کەسێ لەوانی کردووە بە شایەت لەسەر خۆیان کە خوا تەنهایە و پەرستراو پەروەردەکەری ئەوانە، جگەی ئەو شایانی ئەو شتانە نیە. بە جۆرە شایەت دان و ئاگاداری کردنێ بچێتە ئەقڵەوە لە پاش بیرکردنەوە، ئەو ئاگاداری دانەیش، بەهۆی سروشتی پاکیانەوە بوو، بڕیاری ڕاستی لەسەر تەنهایی پەروەردەکەری خۆیان ئەدەن کە لەم جیهانەدا شتی سەرسوڕهێنەری زۆری دروست کردوە. ئەگەر ئادەمیزاد ئەقڵیان بخەنە کارەوە چاریان نامێنێ بڕیاری خوایەتی خۆیان ئەدەن بۆ خۆیان، پەروەردەکەری تۆ بەهۆی ئەو نیشانە ڕونانەوە بۆی داناون لە هەڵسوڕاندنی کاروباری بونەوەران ڕوئەکاتە ئادەمزادو پرسیارمان لێ ئەکا بەهۆی خستنەگەڕی ئەقڵیانەوەو ئەفەرموێ: ﴿ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قالُوا بَلى ﴾ ئایا من پەروەردەکەری ئێوەی ئادەمیزادنیم؟ ئادەمیزاد ووتیان: بەڵێ: تۆ پەروەردەکەری ئێمەی. ئەو وولامە ئەو شتەی بۆ دەرخستنی بەڵگەو نیشانەی ئاشکرایە پاڵیان پێوە ئەنێ و چارەیان نامێنێ کە بڵێن: تۆ پەروەردگاری ئێمەی، لەو کاتەدا خوا ئەفەرموێ بە فریشتەکان: ئێوە بە شایەت بن لەسەر ئەو بڕیارەی ئادەمیزاد .

خاوەنی تەفسیری توربتی ئەفەرموێ: ئەم ئایەتە ماناکەی نادیارو گرانە. زانایان لە ماناکردنیاو لە فەرماندان لەوا فەرمودەیان کردوە، ئێمە ئەوەی ئەوان ووتویانە لەو بارەوە باسی ئەکەین، بەجۆرێ خویار مەداوم هەندێکیان ئەڵێن: خوا لە پشتی هەندێ ئادەمیزاد هەندێکیانی دەرهێنا، فەرمویانە مانای (أشهدتم علی أنفسهم الست بربکم) شارەزایی ئادەمیزاد ئەکا لەسەر یەکێتی خۆی بەهۆی دروست کراوانی خۆیەوە.

﴿ شَهِدْنا أنْ تَقُولُوا يَوْمَ القِيامَةِ إنا كَنا عَنْ هذا غافِلِيْنْ ﴾ فریشتەکان ئەڵێن ئادەمیزاد ئێمە شایەتی ئەدەین لەسەر ئەو بڕیارەی ئێوە لەبەر ئەوەی کە ئێوە لە ڕۆژی دووایدا نەڵێن کاتێ ئێوە بەرەو سزا ئەڕۆن: ئێمە ئاگامان لە خۆمان نەبووەو لەو شایەتی دانەمانا چونکە ئەقڵمان تەواو نەبووە هەتا بیربکەینەوە لەو شایەتی دانەدا.

﴿ أوْ تَقُولُوا إنَما أشْرَكَ أباؤُنا مِن قَبْلُ وَكُنا ذريةً مِنْ بَعْدِهِمْ ﴾ یا ئێوە نەڵێن بەڕاستی باوکەکانی ئێمە لەمەبەر هاوبەشیان داناوە بۆخواو ئێمەش لاسایی ئەوانمان کردوەتەوە، ئێمە هیچ گوناهێکمان نەکردووە ئێمە ئەو کاتە منداڵ بووین لە دوای ئەوان لاسایی ئەوانمان کردوەتەوە لە بت پەرستیدا .

﴿ أفَتُهْلِكْنا بِما فَعَلَ الْمُبْطِلُونَ ﴾ ئایا دوایی بۆ تۆ ئێمە لەناو ئەبەی سزامان ئەدەی بەهۆی شتێ باو کە پوچ خوازەکانی ئێمە کردویانەو بنچینەیان داناوە، ئێمە دەستەڵاتمان نەبوە تەفسیری بەیزاویدا هاتوە لە عومەری کوڕی خەتابەوە کە کاتێ خوا ئادەمی دروست کرد لە پشتی ئادەم هەموو منداڵەکانی وەك مێرولەی وورد هێنایە دەرەوەو زیندوی کردنەوەو ئەقڵ و گفتوگۆو ئەقڵی پێ بەخشین. کەواتە لەو ئایەتەوە بۆمان ڕون ئەبێتەوە هیچ کەسێ ناتوانێ خۆی ڕزگار بکا بە بیانوی لاسایی کردنەوەی باوو باپیرانی لە خراپەکردندا پاش ئەوە خوا ئەقڵی داونەتێ و ئەتوانێ بیر بکاتەوەو چاك و خراپ لەیەك جوێ بکاتەوە. بە تایبەتی پێغەمەران ڕێگەی ڕاست و بەڵگەی ڕونیانی فێرکردوون، هەروەها هەموو تاقمێ بیانوی لێ وەرناگیرێ پاش ئەقڵ و ئامۆژگاری زانایان بۆیان .

مەبەست لە هێنانی ئەو گفتوگۆیانە سەرشۆڕکردنی جوەکانە بە گوێرەی پەیمانی گشتی بۆ هەموو ئادەمیزادو داوی بۆڕدانیان بە پەیمانی تایبەتی بۆ خۆیان و بەڵگەی ئەقڵی و نەئەقڵی و قەدەغەکردنی لاسایی لەوان و فەرمان پێدانیان بە بیرکردنەوە .

بۆ زانین: مرۆڤ ماوەیەکی زۆری ئەوێ و مامۆستای کارامەی پێویستە هەتا فێری ئەندازیاری یا پزیشکی و شتی تر ببێ. بەڵام پاکی دەرون و سروشتی ئادەمیزاد کە خوای مەزن پێی بەخشیوە ماندوبونی زۆری ناوێ بۆ دۆزینەوەی پەروەردگار جگە لە ووریایی و بیرکردنەوەیەکی کەم زۆر بە زوی تاك و تەنهایی خوای بۆ دەرئەکەوێ، خوا ژیری و جەربەزەیی وئامادەیی داونەتێ بۆ ئەوە شتی پێ بزانن بە ئاسانی، بیانوو لە هیچ کەسێ وەرناگیرێ کە بڵێ من دوای پیاو خراپەیان کەوتوم و ئەوان منیان فێری هاوبەشدانان و

شکاندنی پەیمان کردووە، ئیتر جیاوازی نیە لەنێوان ئەو کەسە خۆی سەربەخۆو دەستیان قەس خراپە بکەن و لەنێوان ئەو کەسەی دووای پیاو خراپان بکەوێ بە نەزانین و بەبێ مەبەست، بەو مەرجەی ژیریی و توانای هەبێ بیری خۆی بخاتە کار بۆ دۆزینەوەی چاك و خراپ و کردەوەی ڕاست و کردەوەی خراپ.

﴿ كَلِكَ نُفَصِّلُ الأيَاتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ وەهەر بەو جۆرەی ڕونمان کردەو درێژەمان پێ دا بە وەرگرتنی پەیمان، هەروایش ڕونی ئەکەینەوە بۆ ئادەمیزادو بەڵگەیان بۆ دائەنێین بۆئەوەی بیری خۆیان بخەنە کار بۆ دۆزینەوەی پەروەردەکەری خۆیان و، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە لە لاسایی کردنەوەو نەزانین و بگەڕێنەوە بۆلای ئەقڵی خۆیان کە بیربکەنەوە بە جۆرێ ڕایان بکێشێ بۆلای خوا پەرستی بە هۆی بەڵگەو نیشانەی ئاشکراوە.

بۆ زانین: تاقمێ لە زانایان ئەڵێن لە ماناکردنی ئەو سێ ئایەتانەدا وەك لەمەوبەر باسی کرا: خوای مەزن لە پشتی ئادەم هەموو نێرومێیەکی لە نەوەکانی ئەو کە لەمەو پاش ئەبن هەتا کۆتایی و بڕانەوەی جیهان، هەموویانی کۆکردەوە لە شێوەی مێرولەی ووردا، لە دوایدا پێی ووتن: ئایا من پەروەردەکەری ئێوە نیم؟ ئەوانیش ووتیان: بەڵێ تۆ پەروەردەکەری ئێمەی لە پاش ئەو پرسیارو وەڵام و بڕیارە خوا گەڕاندویەتیەوە بۆلای پشتی ئادەم، ئێمە بڕوامان هەیە خوای مەزن توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە. بەڵام ئێمە ئەم پرسیارانە ئەکەین لەو زانایانە:

لە چ جێگەیە خوای مەزن ئەو خێزانانەی ئادەمی کۆکردەوە؟ ئایا لەسەر ئەم زەوی‌یە کۆی کردنەوە یا لەجێگەیەتر ؟ ئایا ئەو زەویە ئەوانە هەموی ئەگرێ وجێگەی ئەوانی هەمو تێدا ئەبێتەوە؟ ئەگەر دابنێین جێگەی هەمویانی تێدا ئەبێتەوە، چونکە لەسەرشێوەی مێرولەی وردن، ئایا ئەگونجێ ئادەم ئەوەندە گەورەبێ جێگەی ئەوانەی هەمو تێدا بێتەوە بالەشێوەی مێرولەدا بن لەیەکەم کاتی بوونی ئادەم هەتا ڕۆژی دوایی؟ ئایا یەکێ لەوکۆمەڵە زۆرەی نەوەی‌ئادەم بیری ئەو ڕوداوەی کردوەتەوە؟ یەکێکیان بیری بکەوێتەوە خوا پرسیاری لێکردون و ئەوانیش وەڵامیان دابێتەوە و بەڵێنیشی لێ‌وەرگرتون؟ ئەگەر ئەو ڕوداوەیان بیرچوەتەوە چۆن خوای مەزن سزایان ئەدا لەسەر شتێ بیریان

نەکەوێتەوە؟ ئەوانە هەمو لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە ئەوئایەتانە نابن بەبەڵگە لەسەر ئەوشتانەی ئەوزانایانە ئەیڵێن، چوونکە خوای گەورە نافەرموی: پەروەردەکەری ئێوە لەپشتی ئادەم دەری هێناون هەتا فەرمودەی ئەوان بچێتە سەرەوە بۆیان. بەڵکو فەرموی: دەری هێنان لەپشتی کوڕانی ئادەم، زۆر ڕاستە ئەگونجێ بەکوڕانی ئادەم بێژێ ئادەم لەهەندێ جێگەدا، بەلاَم نابێ و ناگونجێ بەئادەم ببێژێ کوڕانی ئادەم ،ئایەتی دووەمیش وامان پیشان ئەدا خوای مەزن ئەوپەیمانەی وەرگرتوە لەیەکەیەکەی ئادەمیزاد لەپاش بونیان ودوای تەواوبونی ئەقڵیانەوە لەدوای ئەوە بەهۆی ئەوسروشتەوە بۆیان ئامادەکراوە.کەواتە وەرگرتنی ئەو پەیمانە لەئادەمیزادەوە بووە بەهۆی پاکی دەرونیانەوە لەیەکەم جاری پەیدابونیان، بەهۆی پاکی ئەو دەرونەوە ئەگەر بیر بکەنەوە ڕاغویی و گومڕایی جوێ ئەکەنەوە. ڕاست و پوچیان لا ڕوون ئەبێتەوە. کەواتە مانای ڕاستی ئەمەیە: پێویستە لەسەر هەر ئادەمیزادێ کەبیر بکاتەوە لەسەر نیشانەو بەڵگەی ڕون لەسەر یەکێتی خوا ولاسایی کردنەوە ژێر پێ بکا بۆ کردنی کاری خراپ. بۆ سەپاندنی ئەو باسانەی پێشو ئەم فەرمودانەی پێغەمەر باس ئەکەین وئەیان نوسین:

١- هەمو منالێ لەسەر پاکی لەدایك ئەبێ، لەدوواییدا دایك وباوك ئەیان کەن بە جو یا گاور یا بەئاگر پەرست .

٢- پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەفەرموێ: خوا ئەفەرموێ: ئێمە دروستمان کردوە بەندەکانی خۆم بەپاکی وبەخاوێنی، دوایی شەیتان ئەچێ بۆ لایان و لەناویان ئەبا و لەباوەڕیان وەئەگێڕێ لەئایین دووریان ئەخاتەوە.

لەپاشا خوای مەزن فەرمان ئەدا بەپێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بخوێنێتەوە بەسەر جوەکاندا ڕوداوو بەسەرهاتی ئیسرائیل و ئەفەرموێ:

وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ

كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ سَآءَ مَثَلًا ٱلۡقَوۡمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَأَنفُسَهُمۡ كَانُواْ يَظۡلِمُونَ ﴿١٧٧﴾

﴿ وَاْتلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذي آتَيْناهُ آيَاتِنا فَانْسَلَخْ مِنْـها ﴾ وەتۆ بخوێنـە بەسـەر جوەكـاندا هەواڵی كەسێكی ئەوتۆ بەخشیومانە بەوكەسە چـەندین بەڵگـەو نیشـانەی ڕوون لـەسـەر یـەكێتی و خوایـەتی ئێمـەو نامـەی پێغەمـەرە پێشـوەكانی ئـەزانی، دوایـی بـیٚ بـاوەڕبو، لـەوبەڵگانە هاتە دەرەوە بەوێنەی ماریٚ لـەپێستی خۆی بێتە دەریٚ وكارژ فڕیٚبـدا، تـەمیٚ خوار نەبو .

﴿ فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطانُ فَكانَ مِنِ الْفادِينَ ﴾ دوایی شەیتان دوای ئەوكەسـە كـەوت كـردی بەپەیڕەوی خۆی لـەگوناه كردندا وبەهەڵی زانی كـردی بـەهاوڕێی خـۆی، دوایـی چـووە ڕیزی لـەناوچووان و لـەڕێگەی خوا لادەرۆان، كەسانی تـری لـەڕێگـە لاداو بـیٚ بـاوەڕی كردن .

ئەوكەسەی خوا ئەو نیشانانەی پیٚ بەخشی و لـەو نیشانانە چووە دەریٚ ئێمە نازانین چ كەسێكەو ناوی چی بوە، هەرشتیٚ قورئان و فەرمودەی ڕاست وبێگومان باسـی نـەكردبیٚ لـەتوانای ئێمەدا نیە دەست نیشانی بكەین، زۆرتر لـەچیرۆك وێـژان و زۆر كەسـی تریـش ووتویانە ناوی ( بەلعامی كوڕی باعورە ) لـەسەر ئایینی موسا بوەو زاناو شـارەزایی ئـایینی ئەوبوە، لـەپاشا لــەئایین وەرگـەڕا، ئێمـە بەترسـەوە تەماشـای ئـەوبیرو بۆچونـەی ئـەوان ئەیكەین وبەجگەی قورئان وفەرمودەی پێغەمەر﴿ ﷺ﴾ دڵمان ئاو نـاخواو ئـارام نـاگریٚ، بەڵام دەقی ئەو ئایەتە پێمان نیشان ئەدا كەخوا فەرمانی دا بەپێغەمەر هەواڵبدا بـەجوەكان

بەو ڕوداوەی ئەوکەسەی ئەوتۆ زانابو بە ئایین ونیشانەکانی ئایین. ئـەوەی شـایانی باسـبێ جوەکان ئەیانزانی ئەو کێیە؟ لەپاشا شەیتان وەری‌گێڕا لەئایین وازی پـێ هێنـا لـەزانیاری خۆیی و ئایینی ڕاست . .

﴿ وَلَوْ نَشَآ لَرَفَعْنَاهُ بِها ﴾ وەئەگەر ئێمە ئارەزومان ببوایە بەڕاستی ئێمە ئـەو کەسـەمان بەرزئەکردەوە بەپلە و پایـەی وا شایسـتەی پیاوچاکـانبێ بـەهۆی ئەونیشـانە ڕونانـەوەو بەهۆی ئەو زانیاریەیەو ئێمە پێمان بەخشیبوو لای نەئـەدا لـەخوا پەرستی. بـەلاّم خـوای مەزن نایەوێ بەزۆر و بـەتۆپزی کەسـێ والێ بکـا کـار بەفـەرمودەی خـوا بکـا و ئـایین پەرستبێ، خوای مەزن ئەقلّی بەخشیوە بەئادەمیزاد و ئامۆژگاری و شـارەزاییان بـەئایین و بەفەرمودەکانی خۆی بەهۆی ئەقلّەوە، هەر لەبەر ئەوەیشە خوا وازی لەو کەسە هێنـاوە، چونکە ئەو وازی لەونیشانە ڕونانەی خوا هێناو پێی بەخشـیبو بەسـەر بەسـتی و ویسـتی خۆی، ئەوکەسەیش جیهانی بۆ خۆی هەڵبژارد بەسەر پاشەڕۆژدا، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَلَكِنَهُ أَخْلَدَ إِلَي االآرْضِ وَ أَتَّبَعَ هَوَاهُ ﴾ وە بەلاّم ئەو کەسە ڕوی کرد بۆلای جیهان و بۆلای شتێ لـەزەویدایە و، ژیانی ئەمڕۆی براوەو ڕابواردنی کاتی و خۆی خەریك کـرد بەکاری پوچەوەو، دوای ئارەزو هەوەسی خۆی کـەوت بـەوەرگرتنی بـەرتیل کەشـەیتان بـۆی ڕازاندبـوەوە. ئـەو ئایەتـە گـەورەترین هەڕەشـەیە بـۆ زانایـانی ئـایینی هەتاهەتایـە. پێغەمەریش ﴿ ﷺ ﴾ ئەفـەرموێ: (( ئەوکەسـە زانـابێ و ڕاغویـی زۆرتـر نـەبێ، دوربونـی لەخواوە زۆرترە )) .

﴿ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الكَلْبِ إِن تَحْمِلَ عَلَيْهِ يَلْهَثْ ﴾ دوایی وێنەی ئەوکەسەی دوای زانستی خۆی نەکەوێ بەوێنەی سەگێکە بەوێنەی سروشت و پیسی ئەگەر تۆ چفـەی لێبکـەیی و دەری کەی و ڕاوی بنێی زمانی دەرئەهێنێ لە تینوێتی و ماندبوناو هەناسەیەکی درێژ ئەدا.

﴿ وَإِن تَتْرُكْهُ يَلْهَثْ ﴾ وەئەگەر واز لـەو سەگە بـهێنیو دەریشـی نەکـەی و مـاندوی نەکەی ئەو هەر زمان دەرئەهێنێ و هەناسەی درێژ هەڵئەکێشێ. سەگ لەوشێوەدا جگەی گیاندارانی جگەی خۆیەتی، هەروەها ئەو کەسەیش دوای ئارەزو هەوەسی خـۆی کـەوت

بە وێنەی ئەو سەگەیە لەکاتی خۆشی و ناخۆشی و ساماندارى و هەژاریدا بەردەوامە لەسەر گومڕایی و ئارەزوی کاری جیهان، ئیتر تۆ ئامۆژگاری بکەی یا وازی لێ بهێنی ئەو هەر گومڕایەو بەهەموجۆرێ. لەوئایەتە پیرۆزەوە بۆمان ڕوون ئەبێتەوە ئەوکەسە زانینی پێ بەخشراوە بەلاّم بێباوەڕبوو زانینی خۆی بەکارهێنا بۆ کۆکردنەوەی لەوەڕی جیهان و وەرگرتنی دارایی بەڕێگەی نارەوا. بەڕاستی ئەوکەسە توشی نەزانین و پلەی پەست بوە ، ئەوشێوە پەستییەی لێ جوێ نابێتەوە .

لەم سەردەمەی ئێمەدا زۆر زانایان ئەبینرێن خوا سامانی زۆری پێداون و ناوەستن لە زۆر کردنی سامان نەك بۆ دۆستایەتی خواو پاداشتی خوا. بەڵکو لەبەر زۆرکردنی سامان کەئەوەندە زۆرە پێویستی پێ‌ی نیە. ئەوکەسە بەناوزانا بەزمانی لوسی خۆی زانیاری بەکارئەهێنێ بۆ پەیداکردنی دارایی، پڕوپاگەندەی زۆر ئەکەن بۆ پارت و کۆمەڵێ بۆ هەندێ‌کەس بەناوی ئایین پەروەری و نیشتمان پەروەرییەوە. ئەوزانایە وێنەی سەگە .

﴿ ذَلِكَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِيْنَ كَذَّبُوْا بِآيَاتِنَا ﴾ ئەو کارو شێوەیە بەشێوەو وێنەی تاقمێکی ئەوتۆن باوەڕیان بەنیشانە ڕونەکانی ئێمە نەهێناوە وجۆرێ کەسن بەردەوامن لەسەر بێ فەرمانی خواو سوود لەنیشانەی ڕون وەرناگرن و گوێ لەئامۆژگاری ناگرن بەتایبەتی لەباوەڕهێنان بەموحەممەد و قورئانی پیرۆز، چونکە ئەوگەلەیش وێنەی سەگن .

﴿ فَاقْصُصِ الْقِصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُوْنَ ﴾ دوایی تۆ موحەممەد هەواڵ بدە بەجوەکان کاروباری بێباوەڕی پێشوەکانیان و بەدرۆخستنەوەی نیشانە ڕونەکانی ئێمە لەتەوراتا، هەواڵیان بدەرێ بەوکارەساتانەی بوون، وێنەی کارەساتی ئەوگوندەی لەسەر کەناری ڕوبارەکەبوو کارەساتی ئەوکەسەی باوەڕی لەخۆی دارنی کاری نەکرد بە نیشانەکانی ئێمە، بۆئەوەی تەمێ‌خواربن و پەند وەربگرن بەگەڕانەوەی بەسەرهاتی پێشوەکان و بیر بکەنەوەو ووردبینەوە و وازلەبەدرۆخستنەوەی پێغەمەران بهێنن، هەتا بۆیان دەربکەوێ زانینی ئەوهەواڵانە بەسروش بۆتۆهاتوە وباوەڕت پێ‌بهێنن .

﴿ ساءَ مَثَلاً الْقَوْمُ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ﴾ خـراپ وێنەیـە کەلـەبارەی وێنـەوە ،وێنـەی تاقمێکی ئەوتۆ بەوسروشتەوە هەیانە، نیشـانەڕونەکانی ئێمـە بەدرۆئەخەنـەوە ، بەتایبـەتی باوەڕیان بەموحەمەد و بەقورئان نەهێناوە ، چونکە وێنەی ئەوگەلە وێنەی سەگن .

﴿ وَأَنْفُسَهُمْ كَانُوا يَظْلِمُونَ ﴾ وەئەوتاقمە ستەمیان لەخۆیان کردوە بەبەدرۆخستنەوەی نیشانە ڕونەکانی ئێمە. جیاوازی لەنێوان درۆکردن و بەدرۆخستنەوە نیە: درۆکردن پەیدا کردنی شتێکە پەیوەندی بەئایینەوە نەبێ. بەدرۆخستنەوە لابردنی شتێکە بەشێ بێ لەئایین.

پرسیار/ ئایا ئەگەر کەسێ ڕاستی بگۆڕێ لەترسی گیانی خۆی لەستەمکارێ ئەوکەسە بەلادەر لەئایین ئەژمێررێ و شتێکی پەیداکردوە دژی یاسای ئایینە یانە؟

وەلام / بەڵێ ئەوکەسە بەلادەر دائەنرێ و شایسـتەی خراپـەو سـزادانە بـەبێگومان، چونکە پێویستە لەسەری لەخوا بترسێ بەگۆڕانی ئەو ڕاسـتیە و لەوسـتەمکارە نەترسـێ. بەلام مرۆڤ بۆی هەیە وازلە کاری ڕاست بهێنێ بۆ لادانی ئازار لـەخۆی. نـەك گۆڕینـی یاسای ئایینی خوا بەدرۆدان بەسەر خوادا ئەمەیان هەرگیز دروست نیەو بێ بەڵگەیە .

خوای مەزن ناوەڕۆکی چیرۆکەکەی پێشوو پتەوتر ئەکا بەم ئایەتـەی دوایـی ،فـەرمان ئەدا بەپێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بیخوێنێتەوەە بەسەر ئەوکەسـانەی لـە ڕێگـەی ڕاسـت لایـانداوە لەهەواڵی برا پێشوەکانیان ، بۆئەوەی بیر بکەنەوەو واز لە وشتە خراپانە بهێنن لـەسەرینی و ئەفەرموێ :

مَن يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِي ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴿١٧٨﴾ ... بِهَا ۚ أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴿١٧٩﴾ وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي

أَسْمَٰٓئِهِۦ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾ وَمِمَّنْ خَلَقْنَآ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴿١٨١﴾

﴿ مَنْ يَهْدِيْ الله فَهُوَ الْمُهْتَدى ﴾ هەرکەسێ خوا بەهۆی گەورەیی خۆیەوە ڕاغوبی بکا بۆلای ئایینی خۆی ، دوایی ئەو کەسە ڕاغوبی وەرگرتووە. یانی ئەو کەسەی ڕانومایی بۆ خۆی هەڵبژێری، لەخزمەت خوادا بەڕانومایی وەرگر ئەژمێرری، ئیتر بالای ئادەمیزاد بەگومڕا دابنری، بێگومان هەرکەسێ ڕانومایی بۆ خۆی هەڵبژێری لای خوا خاوەن باوەڕە کاری چاکی کردوە .

﴿ وَمَنْ يُّضَلِل فَأُلئِكَ هُمُ الْخاسِرُونَ ﴾ وەهەر کەسێ خوا لای بدا لەڕێگەی ڕاست، دوایی ئەوکەسانە زیانۆمەندن لەڕۆژی دواییدا. یانێ ئەوکەسانە بەویست و بەئارەزوی خۆیان گومڕایان وەرگرتوە. کەواتە ئەوکەسانە بەڕێگە لادەر لەخزمەت خوادا سەیر دەکرێن. ئیتر بائادەمیزاد وابزانن پیاوی چاکن .

مەبەست لەناوەڕۆکی ئەوئایەتە ئەوەنیە هەرکەسێ خوا ڕانمویی تێدا دروست بکا ئەو کەسە ڕانومایی وەرئەگرێ، هەرکەسێ خوا گومڕایی تێدا دروست کرد ئەبێ هەر گومڕابێ. ئادەمیزاد هیچ دەستەڵاتێکی نیە. بەڵکو خوای مەزن ستەم لەکەس ناکا، خوای مەزن ئەقڵی پێبەخشیون بەو بۆنەوە چاك و خراپی جوێ ئەکەنەوە، هەرکامیان بۆ خۆیان هەڵبژارد خوا بەوجۆرەپاداشت و تۆڵەیان ئەداتێ .

﴿ وَلَقَدْ ذَرَأنا لِجَهَنَمَ كَثِيراً مِنَ الجِنِ وَ الانْسِ ﴾ وەبەڕاستی ئێمە دروستمان کردوە بۆ دۆزەخ زۆرکەس لەجنۆکەو لەئادەمیزاد .

بۆ زانین: خوای مەزن دروستی نەکردوە و دروستیشی ناکا هیچ کەسێ بۆ مەبەستی ئەوەی سزای بدا چۆن ئەچێتە ئەقڵەوە خوا لای خۆشبێ بەو هەمو بەزەیی و میهرەبانیەوە

هەیەتی سزای کەسانێ بدا توانای هیچ شتێکیان نەبێ ؟ بەڵکو خـوای مـەزن ئـادەمیزادی دروست کردوە بۆ زانین و زانیاری و پەرستن و کردنی کاری چاك، هـەمو پێویستی پـێ بەخشیون بۆ ئەو مەبەستانە، ئەقڵی وای پێداون ڕانومایی و گومڕایی لەیەك جوێبکەنەوە، چاك و خراپ بدۆزنەوە، پێغەمەرانیشی بۆ نـاردوون هـەتا ئاگاداریـان بکـا، هـەڵبژاردنی چاکەیا خراپەی داوەتـە دەسـت خۆیـان و سەربەسـتی پێـداون لـەهـەمو شـتێکا، ئەگـەر ئەوشتانە لێی بسێنێتەوە ئادەمیزاد و بیێگیان وێنەی یەك ئەبن، دوای ئــەقڵ خسـتننەکار و ڕێگەی ڕانومایان هەڵبژارد و خۆیانیان دایە پاڵ میهرەبانی خوا پاداشت وەرئەگرن، ئەگـەر ڕانومایان هەڵنەبژارد ئەنجامەکەیان چونی نێو دۆزەخە .

پرسیار/ خوا ئادەمیزادی دروست کردوە بۆ پەرستنی خۆی، نەك بۆ زانین و کردەوەی چاك و سودبەخش ؟

وەلاّم / بەڕاستی زانینی سودبەخش و کردەوەی چاك گەورەترین پەرستنە بۆ خوا، بۆیە پێغەمەر ئەفەرموێ: یەك زانا گەورەترە لەهەزار پەرستکەر .

﴿ لَهُمْ قُلُوبٌ لاَيَفْقَهُونَ بِها وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَيُبصِرُونَ وَلَهُمْ آذانٌ لاَيَسمَعُونَ بِـها﴾ بـۆ ئـەو زۆرکەسانە هەیە دلأنێ هیچ شتێ بەودڵەنازانێ و بیری پیێناکاتەوە و نایان خاتــە کـار بـۆ زانینی شتی چاك و، بۆ ئەوان هەیە چاوانێ ڕوی ڕاستی بەوان نابینین، بـەوچاوە تەماشـای دروست کراوانی خوا ناکەن هەتا ببیان کەن بەبەڵگە لـەسەر توانای خوا و، بۆیـان هەیـە گوێچکەکان و گفتوگۆی ڕاستی پیێنابیسن، لـەئاستی ئامۆژگاری و نیشانەکانا کەڕن. یانی هەموشتێ بۆ هەرشتێ دروست کرابـن و بەهـەمو پێویسـتیەکەی پـێ وەرنـەگیرێ بـون و نـەبونیان وەك یـەك وان لـەو ڕوەوە. کەواتـە ئەوکەسـانە وەك ئــەوەوان دڵ و چــاوو گوێچکەیان نەبێ، گرنگترین شت لـەدروســت کردنـی دڵـدا ئەمەیـە بـیری پیێبکرێتـەوە لـەبەڵگە ڕونەکان، چاویش بۆ ئەوەیـە بەڵگـەکانی پـێ بیـنرێ، گوێچکـەیش بـۆ ئەوەیـە بەڵگەکان بیستێ، هەرکاتێ وازیان لـەو سێ شتانە هێنا و سـودیان لـەوبەڵگانەوەرنـەگرت بون ونەبونیان یەکسانن و بەوشێوە نەبوون و بۆی دروست کراون .

﴿ أولَئِكَ كَالآنعامِ بَلْ هُم أضَلُ ﴾ ئەو کەسانە کەدڵ و چاوو گوێچکەو هەست وویستی خۆیان لەڕابواردنو خۆشی جیهاندا بەکارئەهێنن وەك چوارپێ وان کە ئاواتیان هەر خواردن و خواردنەوەو خەوتنە، نافامن ئاوڕێ بدەنەوە بۆلای خۆشی و ژیانی پاشەڕۆژی بەردەوام. بەڵکو ئەوکەسانە گومڕاترن لەچوارپێ کە داوای هیچیان لێناکرێ لەلایەن خواوە بەگوێرەی یاسا، بەپێچەوانەوە ئەوکەسانە داوای پەرستنیان لێئەکرێ و هەمو سروشتێکی چاکەیان لێئەوەشێتەوە، وەك چوارپێ دڵ و چاووگوێچکەیان هەیە، بەڵام بەڕاستی نازانن و بەڵگەنابینن و نای بیستن، پێویستی دروست کراوی خۆیان جێبەجێ ئەکەن بەبێسەرپێچی، وەك باربردن و جوت پێکردن و سواربون، ناتوانرێ پلەی پەرستن پەیدا بکەن و پرسیاریان لێناکرێ و سزایان نادرێ، خوایش ئەناسن بەگوێرەی ئەوسروشتەی بەوان بەخشراوە لەلایەن خوای مەزنەوە. بەڵام ئادەمیزاد و جنۆکە بێباوەڕەکان ئەگەر کاری خۆیان بەسەر نەگرتەوەو توانایان هەبێ و ئەقڵیان هەبێ و باوەڕ بەڕاستی نەکەن پرسیاریان لێئەکرێ و سزایشیان ئەدرێ. کەواتە لەچوارپێ خراپترن و گومڕاترن .

﴿ أولَئِكَ هُمُ الْغافِلُونَ ﴾ ئەوکەسانە بێ ئاگان لەو بەڵگانەی لەخۆیانا و لەبونەوەراندا دانراون، بێ ئاگان لە پاشەڕۆژی خۆیان و لە شتێ توشی ئەوان ئەبێ لە پاشەڕۆژدا لەبێ ئابڕوی و لە سزا .

﴿ وَلله الآسْماءُ الْحُسنی فَأدعُوهُ بِها ﴾ وەبۆ خوا هەیە چەند ناوێکی شیرین و چاکتر، دوایی ئێوە بانگی خوابکەن و لەخوا بپاڕێنەوە بەهۆی ئەو ناوانەوە. هەمو ناوەکانی خواچاکن، چونکە ماناکانیان لەشیرینترین مانا پێك هاتوون و کەمو کوڕییان تێدانیە، لەچاکی ولەشیرینیدا هەمو وەك یەك وان، چونکە بۆ خوا نابێ وێنەی چەند شتێ شێوەیان جیاواز بێ و مانایان دژی یەکتربن. دروست کردنی باڵە مێشولەیەك و دروست کردنی هەمو بونەوەران لای خوا وەك یەك وان ئاسانن لای خوا، کەواتە ئێوە ناوی خوا ببەن و بانگی بکەن بەهەرناوێ خۆتان بتانەوێ لەوناوانە، هەمو ناوەکانی خوا لەپاکی ولەخاوێنیدا وێنەی یەکن، بۆ خوا نیە ناوێ گەورەتر بێ و ناوێتر نزمبێ هەمویان

گەورەن. لەبەرئەوە ئێمە لەگەڵ ئەو کەسەدانین ئەڵێ: خـوا نـاوێکی تایبـەتی هەیـە پێـی ئەوترێ ناوی گەورەی خوا، کەبیزانێ هەمو چاکەی بەسەردا ئـەڕژێ و کـاری پەکخـەر لەسەردەستی ئاشکرا ئەبێ، بێژراوە خوا (٩٩) ناوی هەیە هەرکەسـی بیـانژمێرێ ئەچێتـە بەهەشت، بەلای ئەوکەسەوە وایە بەهەشتێ بۆ ئەوکەسـانە دروسـت کـردوە فەرهـەنگی زمان دابنێن، نەك بۆ ئەو کەسانە خۆیان بپارێزن لەبێ فەرمانی خوا !.

﴿ وَذَرُوا الَّذِيْنَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمائِهِ ﴾ وەئێوە واز بـهێنن لەکەسـانێ ئـەوتۆ ناوەکـانی خوالائەدەن لەڕاستی دوایی ناوی بتەکانیانی خۆیان ئەبەن بەوناوە، ئەڵێن: ( اَلـلاّت ) لـە ( الله - العزّی ) لە ( ألعزيز ) و ( منات ) لە ( المنان ) دروست کراون، یاناوێ ببرێ بـە هاوڕێ، بەسەخی، هەروەها قەدەغەیە بەناوی جگەی خـوا بـبرێ بەشـتێ بۆنـی خوایـەتی لێبێنێ، ئیتر ئەوناوە بۆ پێغەمەر بێ یاجگەی پێغەمەربێ لـەبت و لەئەسـتێرە. وەك ئـەوەی ناوی کەسێ ببرێ بە ( بەندەی موحەمەد، یا بەندەی عوزا، یا بەندەی زوهـرە ) هـەروەها دروست نیە ناوی خوا ببرێ بە ( باوك یاناوی کەسێ ببرێ بەکوڕی خوا هەرچەندە بۆنـی خوایەتیان لێنایە ). وێنەی ئەوناوانە زۆرن و چاك نین وەك عـەبدول موحەمـەد . عـەبدول حوسەین، عەبدول مەناف و شتی تریش .

بۆ زانین: ئایا ناوەکانی خوا ( توفيقيه ) یانی لـەقورئان و فـەرمودەی پێغەمـەرا باسـیان کرابێ و بەڕەوایان دانابێ. بەجۆرێ دروست نەبێ ناوی خوابرێ بەبێ فەرمانی قورئـان و پێغەمەر ؟ یاناوەکانی خوا ( قياسية ) یانی هەرناوێ ناکومی وناتەواوی تێدا نـەبێ دروسـتە ناوی خوا ببرێ. ئیتر لەنامەی خوادا و لەفەرمودەی پێغەمەرا هاتبن یانە ؟ زۆرترینی زانایان لایان وایە ناوەکانی ( توقيفيه ) بەلاّم هەندێ لەزانایان ڕونیان کردەوەتەوە پاڕانەوە لەخوا بەهەرناوێ بێ و بەهەر شتێ بێ کەپاك وخاوێن و بێگەرد بێ ونزمـی تێدانـەبێ و بـالأیی وبەرزی خوا بگەیەنێ دروستەو ڕەوایە، ئیتر لەنامەی خواو فـەرمودەی پێغەمـەردا باسـی لێکرابێ یانە، هەرشتێ خوا قەدەغەی نەکردبێ بەگوێرەی یاسا و بنچینەی ئایین ڕەوایـە و قەدەغە نیە.

زانیان لەکۆن و تازەدا بڕیانداوە بەهەمویانەوە لەهەمو کات و لەهەموجێگەیەکدا بەجگەی ناوی عەرەبی دروستەناوی بیرێ لەگەڵ شێوەکانیدا، دروستە هەمو نەتەوەیە بەزمانی خۆیان ناوی خوابەن و بپارێنەوەو مانای قورئانی پێبدەنەوە .

﴿ سَيُجْزَنَ ماكانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ لەمەودوا ئەوکەسانە پاداشتیان ئەدرێتە بەشتێ ئەوان بیکەن کەبۆ دۆزەخ دروست کراون، ناوی جگەی خوا ئەبەن بەناوێ شایستەی ئەوان نیەو شایستەی خوایە، ناوی خوا ئەبەن بەناوێ شایانی گەورەیی خوانیە، سزاکەیشیان لەپاشەڕۆژدا ئەبێ.

﴿ وَمِمَنْ خَلَقْنا أُمَةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِ وَبِهِ يَعْدِلُونَ ﴾ وەتاقمێ هەن لەوکەسانەی دروستمان کردون ڕێگەنیشان ئەدەن بەئادەمیزاد و فەرمان ئەدەن بەچاکە بەوێنەی زانایان وئەوکەسانەی دانیشتوان بانگ ئەکەن بۆلای ئایین، وەبەڕاستی فەرمان ئەدەن وکار ئەکەن بەدادپەروەری لەنێوخۆیان و لەنێو جگەی خۆیان لەباوەڕداران و بێباوەڕان بەگوێرەی یاسای قورئان .

ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کۆبونەوە زانایان لەسەر فەرمانی شتێ ئەبێ بەڵگەبێ بۆ کارێ لەکاران بەوێنەی قورئان و فەرمودەی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ .

پرسیار/ هەمو ئادەمیزادێ ئەزانن لەخۆیانا هەیە باوەڕدارو بێ باوەڕ، هەیانە پاکن و هەیانە پیسن و کەسێ نیە ئەو ڕاستیە نەزانێ، ئیتر ئەبێ مەبەست لەباس کردنی ئەوانە چ شتێ بێ ؟

وەڵام/ خوای مەزن لە ئایەتی پێشودا فەرموی: زۆرکەسم لە جنۆکەو لە ئادەمیزاد دروست کردوە کە پاشەڕۆژیان بۆلای دۆزەخە، شیاوو ڕێکە لەم ئایەتەیشدا بفەرموێ تاقمێ ترم دروست کردوە پاشەڕۆژیان و جێگەیان بۆلای بەهەشتە ،هۆی چونیان بۆ بەهەشت وەرگرتنی ڕاغوییە و دادپەروەریە .

کاتێ خوای مەزن باسی باوەڕدارانی کرد بەموحەممەد ﴿ ﷺ ﴾ کە ڕانومابیان وەرگرتوە بۆ لای ڕاستی، لەمەودوا یش باسی ئەوکەسانە ئەکا نیشانە ڕونەکان بەدرۆ ئەخەنەوە:

وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٢﴾ وَأُمْلِى لَهُمْ ۚ إِنَّ كَيْدِى مَتِينٌ ﴿١٨٣﴾ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ ۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿١٨٤﴾ أَوَلَمْ يَنظُرُوا۟ فِى مَلَكُوتِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ وَأَنْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ ۖ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٥﴾ مَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِىَ لَهُۥ ۚ وَيَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٨٦﴾

﴿ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ﴾ وەكەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان بەنیشان ڕونەکانی ئێمە نەهێناوە و بەدرۆیان خستوەتەوە لەبێ باوەڕەکانی مەکە کەگاڵتەیان بە موحەمەد و هاتنە خوارەوەی سزا ئەکرد .

﴿ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِنْ حَيْثُ لا يَعْمَلُونَ ﴾ ئێمە ئەوکەسانە نزیك ئەکەینەوە و پاڵیان پێوەئەنێین بۆلای لەناوچون وورده وورده وەك کەسانێ سەرکەون پلە بەپلە بەپەیژەدا و بەرزیان ئەکەینەوە دووایی دایان ئەنەوێنین لەجێگەیەکەوە خۆیان پێ‌ی نەزانن .

بەڕاستی خۆش گوزەرانی و ڕابواردن ئەڕژێنێ بەسەر ئادەمیزدا، دوایی درێژەئەدەن بەیاخی بوون و لەخۆبایی بوون بە هۆی زۆری سامان و پلەو پایەی بەرزیانەوەو بێ ئاگان لەو شتانە پەنهاندراون لەلای خواوە کە کوتوپڕ تووشیان ئەبێ، هەرکاتێ بێژرا بەوان نۆشی گیانتان بێ سامانی زۆر و پلەو پایەی بەرز و ڕابواردنی زۆرتان هەیە کوتوپڕ دووای ئەوانە خراپەو نەگبەتی یەخە چەسپیان ئەبێ و بەخۆیان نازانن .

﴿ وَأملي لَهُم إنَّ كَيْدي متِينٌ ﴾ وەمن مۆڵەتی لەو کەسانە لەدەم و وبۆ ماوەیە سزادانیان دوور ئەخەم وتەمەنیان ئەخەیٚ درێژلەکەم . بەڕاستی گرتن و سزادانی من بۆ ئەو کەسانە سەخت وگرانە. یانیٚ من وازیان لیٚ دێنم هەتا بەسامانی خۆیان بایی ئەبن و بەوسامانە خۆش حاڵ ئەبن دوایی خوای مەزن بەجۆریٚ لەیان گریٚ و سزایان ئەدا خۆیان بە خۆیان نەزانن چەندەگرانە.

﴿ أوَلَم يَتَفَكَّرُوا مابصاحِبِهِم مِنْ جِنَّةٍ ﴾ ئایا بت پەرستان بۆ وورد نابنەوە لەڕابووردوی موحەمەد هەتا بۆیان دەربکەویٚ بەهاوڕێکەی ئەوانەوە کە موحەمەد هیچ جۆرە شێتیە نیە، ئەوبەڕی ژیرەو داوای پێغەمەری ئەکا، لێرە ناوتان ناوە بەڕاست گۆو دەست پاك و ئاشتی خواز و داوێن پاك .

بۆ زانین: جەردەو خوێن ڕێژانی ئێستاو لەمەوبەر بڕوپاگەندەو درۆو بوختان بلاوئەکەنەوە لەدژی هەمو کەسێکی پاك وچاك لەهەمو کاتێکا کە موحەمەد درۆزن و جادوگەر و هەوەس باز بوە، هەر لەبەرئەوەی درۆکردن وڕێگەی خرابی قەدەغەکردوە، بەتایبەتی ئەوکەسانە لەترسان پلەو پایە و سامانیان کەم ببێتەوە کەلەگەڵیان بەبەردەوامی ئەجەنگا لەناوبردن و بنەبڕکردنی خوێن مژی، وێەی ئەوانەبون کە بوختانیان ئەدا بەسەر پێغەمەردا ﴿ ﷺ ﴾ کەچی ئەیانزانی و ئایانناسی کە موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾ لەکاتی پەیدا بوینەوە هەتا تەمەنی گەیشتە چل ساڵانە بەڕاست وێژ و دەست پاك و ژیریان دائەنا، بەلاٚم لەدواییدا کەپێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ داوای پێغەمەرایەتی کرد دەستبیان دایە دژایەتی کردن لەگەڵیدا، چونکە ئەیانزانی ئەو داوایە مەترسی زۆر گەورەیە لەسەر پلەو پایەو سامانیان، هەر لەبەر ئەوەیش بو ئەیان ووت: موحەمەد شێتە. بەڵکو بەو بۆنەوە دانیشتوان لیٚی دووربکەونەوە، دوایی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ داوای لیٚکردن بەهۆی قورئانی پیرۆزەوە، بیرو ڕاوێژی خۆیان بخەنەکارەوە بۆ فەرمانی خوا، بەزەیی بەخزم و هاوڕێکانی هاتەوە، هەتا بت پەرستان بەهۆی ئەوبیرکردنەوەیانەوە ڕێگەی ڕاست بدۆزنەوە، یائاشتی پەیدا بکەن لەئەقڵی خۆیانا و سودی لیٚ وەربگرن، بۆیە خوا فەرمانی پێدان و فەرموی: موحەمەد شێت نیە .

﴿ إنَ هُوَ إلا نَذِيْرٌ مُبْيِنٌ ﴾ موحەمەد هیـچ شـتێ نیـە مەگـەر ترسـێنەرێکی ئاشـکرایە، ڕاگەیەنەری پەیامی خوایە، ئەوەیش بەلای بێ باوەڕانەوە خراپە ئەو مرۆڤـە بـەڕێزە داوای ئەکا. کاتێ بێ‌باوەڕان دایانە پاڵ موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ شێتیەتی خوای مەزن ئەم ئایەتەی نـاردە خوارەوە فەرموی:

﴿ أوَلَمْ يَنْظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السّماواتِ وَالأَرْضِ وَمـاخَلَقَ اللهُ مِـنْ شَـيءٍ ﴾ ئایـا بـۆ بـێ باوەڕان تەماشا ناکەن لـە خاونیەتی و پاشایەتی و خاوەداری ئاسمانەکان و زەوی و ئـەوەی لەناویاندایە لـەخۆرو مانگ وئەستێرەو درەخت و کێوو باو کانزاکانی نەوت و زێڕو زیوو ئەڵماس وشتێ خوا دروستی کردوە لـەهەمو شتێ لـەبونەوەرانی تـر بـەچاوێکی ڕاسـت و بێ‌لایان و دادپەروەری و فراوانەوە یانێ ئاسمانەکان و زەوی ئەو شتانەی لـەنێو ئـەوانادان هەمویان فەرمانبەرداری تواناى خوان و بەڵگەی یەکێتی خوان. بەڕاستی هەرژێرێ بنوارێ بۆلای هەرشتێ لـەو بونەوەرانە کەهەریەکەیان ئەوکارەی پێیـان سـپێردراوە بـەبێ کـەم و گۆڕان بەجێی ئەهێنێ .

ئـەو ڕوانینـەش دوربـێ لـەمەبەسـتی تایبـەتی، چـاری نـامێنێ باوەڕبـەخواو نامـەکانی پێغەمەرەکانی ئەهێنێ. بەڵام کەسێ تەماشای سودی خۆی بکا ڕاغوبی وەرنـاگرێ بـۆلای خواو بۆلای هیچ شتێ لـەچاکەو هەربۆلای سودی خۆی ئەڕوانێ، بۆلای دەستەلاّتی خـوا لەئاسمانەکان وزەوی و بونەوەرانی نانوارێ .

﴿ وَأن عَسى أنْ يَكُونَ قَدْ إقْتَرَبَتْ أجَلَهُمْ ﴾ وەبۆ نانوارن بـۆلای ئـەوەی کەبەڕاسـتی نزیکە ماوەی نەمانیان و بمرن، بۆ چاوەڕوانی مردن ناکەن هەتا پەلـەبکـەن بـۆلای ڕاسـتی کەنزیکە مردنیان و ڕوبکەن بۆلای شتێ ڕزگاریـان بکـا لـەسـزا، بەرلـەمردنیان و هاتنـە خوارەوەی سزای گەورە یۆ سەریان، دوایی پەشیمان بونەوەیان لێ وەرناگیرێ. یـانی خـوا داوای بیرکردنەوەی لـە بونـەوەران لێ کـردن ئاگاداریشـیان ئەکاتـەوە بـەهۆی مردنـەوە کەلـەناوبەری خۆشیەکانە وپەرت وبلاّو کەرەوەی کۆمەلاّنە و لـەوانەیە کوتوپڕتوشـیانبێ و ئەوان لـەگومڕاییدا بن هەتا پەشیمان ببنەوە بۆلای‌خوا .

﴿ فَبِأَيِّ حَدِيْثٍ بَعْدَهُ يُؤمِنُونَ ﴾ دوایی ئەوان بە چ گفتوگۆیەو بەچ نامەیە باوەڕئەهێنن دوای قورئان، لەقورئان بەولاوە هیچ بەڵگەو نیشانەی ڕونیان دەست ناکەوێ، هەرکەسێ بەڵگەی قورئان کاری تێنەکا بەڵگەی تر کاری تێ ناکا.

﴿ مَنْ يُضَلِلِ اللهُ فَلا هادِيَ لَهُ فَذَرْهُمْ فِي طُغْيانِهِمْ يَعْمَلُونَ ﴾ هەرکەسێ خوا لەڕێگەی لابدا بەهۆی باوەڕنەبونی بەقورئان، دوایی ڕاغوبی کەرێتر بۆ ئەوکەسانە نابی، لەباسی مانای ئایەتی ( ١٧٨ ) ی ئەم سورەتە بەڕونتر مانای ئەو ڕستەیەکراوە، دوایی تۆ واز لەو بێ باوەڕانە بهێنە لەسەرکێشی و لەنێو درێژدانی خۆیان لەبێباوەڕیدا سەرگەردانن. بێن و بڕۆن و ڕێگە دەرنەکەن. واتە خوا وازی لێ هێناون سەرگەردان بن و مۆڵەتیشی داون هەتا کاتێ مردنیان لەپاشا پاداشتیان ئەداتەوە بەوشتانەی کردویانە و پێشی خۆیانیان خستوە، ئەبێ بزانرێ ئەو مۆڵەتەو واز لێ هێنانە ستەمێ نیە خوا لێی کردبن، چونکە ئەو مۆڵەتە دوای ڕون کردنەوەی بەڵگەو ترساندنیان هاتوەو دوای ئەوەیش ئومێدی گەڕانەوەیان بۆلای خوانەما .

يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِىَ ٱلسُّوٓءُ ۚ إِنْ

أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٨﴾

﴿ يَسْأَلُونَكَ عَنْ السّاعَةِ أيّانَ مُرْساهَا ﴾ موحەمەد پرسیار لەتۆ ئەکەن لەوکاتەی ئەوتۆ بونەوەرانی تێدا لەناوئەچێ و زیندەوەران هەمویانی تێدا ئەمرێ، ئەو پرسیارکەرانە دانیشتوانی مەکە بن یا جوەکان گرنگ نیە. ووشەی (السّاعَةِ ) بەسێ مانا هاتوە: (١) بەشێکی کەمی لەنادیار لەئەندازەی کات. ( ٢) بەبەشێك لە ٢٤ بەش لەشەوورۆژێکا. (٣) بەوکاتە ئەڵێن هەمو بونەوەران لەناوئەچن و هەمو گیانداران ئەمرن، لێرەدا مەبەست مانای سێیەمە چ کاتێ پەیدا ئەبێ لەلایەن خوای مەزنەوە.

﴿ قُلْ إنَما عِلْمُها عِنْدَرَبّي لايُجلِيها لِوَقْتِها إلاهُوَ ﴾ تۆ بڵێ زانین و ڕاستی ئەو کاتە لەخزمەت پەروەردەکەری مندایە ،ئەوزانینە تایبەتیە خوا بۆخۆی داناوە. فریشتەکان و فروستادەو نێرراوەکانی خوا نایزانن، پەروەردگار ئەو کاتە ئاشکرا ناکا مەگەر هەرخۆی ئاشکرای بکا. هەر ئەو زانایە بەهەمو نهێنی و شاراوەیە، ناسینی و دەرخستنی لەتوانای کەسی تردا نیە .

﴿ ثَقُلَتْ فِي السّماواتِ وَالآرضِ لاتأتيكُمْ إلا بَغْتَةً ﴾ گران و گەورەیە پەیدابونی لەسەردانیشتوانی ئاسمانەکان و زەوی لەفریشتەکان و ئادەمیزاد و جنۆکە، لەبەرئەو گرانیە یە خوا پەنهانی کردوە زانینی لەلای ئەوان، ئەوکاتەی نەمانی بونەوەرانە نایە بۆلای ئێوە مەگەر بێت بۆلاتان بەبێ ئاگاداری ئێوە .

﴿ يَسْألُونَكَ كَأَنَكَ حَفِيٌّ عَنْهَا ﴾ پرسیار لەتۆئەکەن لەکاتی پەیدابونی کاتی دوایی، وائەزانن تۆ گرنگی بەزانینی کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەدەی، ئەتەوێ بزانی بۆ پرسیار ئەکەن، وەك ئەوان گرنگی پێ ئەدەن، پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ گرنگی بەزانینی ئەوکاتەو پەیدابونی نادا. بەڵکو گرنگی بەکارکردن ئەدا بۆی و بەترسان لەوکاتەدا. ئەوکەسەی ژیر بێ کەتوشی نەخۆشی بو نابێ پرسیار بکا چ کاتێ ئەمرێ، بەڵکو ئەبێ پرسیار لەشتێ بکا ڕزگاری بکا لەونەخۆشیە .

﴿ قُلْ إِنَمْا عِلْمُهَا عِنْدَ اللهِ ﴾ تۆبڵێ بەڕاستی زانینی کاتی ڕۆژی دوایی لای کەس نیە مەگەر لەلای خوایە بەتەنها. خوای مەزن دووجار ئەوڕستەیەی دووپات کردوەتەوە لەبەرئەوەی زانینی هاتنی ئەوکاتە هەر لەخواوە ئەزانرێ هەتا ببێ بە پێشەکی بۆ ئەم ڕستەیەی دوایی کە خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَلكِنْ أَكْثَرِ الناسِ لايَعْلَمُونَ ﴾ وەبەڵام زۆرتری ئادەمیزاد نازانن کەبەڕاستی زانینی ئەو کاتە لای هیچ کەسێ نیە لەبونەوەران بزانێ، هەردروست کەری بەنەوەران ئەیزانێ و کەسی تر ئاگاداری هاتنی ئەوکاتە نیە .

﴿ قُلْ لاأَمْلُكُ لِنَفْسيْ نَفْعاً وَلاخَيْراً إلا ماشاءَ اللهِ ﴾ موحەمەد تۆ بڵێ: من خاوەنی هیچ سودو زیانێ نیم بۆخۆم مەگەر شتێ خوا ئارەزووی کردبێ ئەوشتە بۆ منبکا، ناوەڕۆکی ئەو ئایەتە پوختەی بیروباوەڕی موسڵمانانە دەربارەی پێغەمەری خۆیان کەموحەمەدە، زۆر ڕونیشە بەرێزترین و پیرۆزترینی دروستکراوانی خوایە، بەگشتی بیروباوەڕمان وایە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ دەستەڵاتی هیچ شتێکی نیە نەبۆ خۆی وەنەبۆ جگەی خۆی بەچاکتر، ئەوجۆرە باوەڕیان بە موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ ئامانج و بەرهەمێکی پێویستە بۆ یەکێتی خوا.

﴿ وَلَوْ كُنْتُ أعلَمُ الغَيْبَ لآستَكْثَرْتُ مِنْ الخَيْرِ ﴾ وەئەگەر من کارە نهێنیەکانم بزانیبایە بەڕاستی من زۆرم ئەکرد لەچاکە بۆ خۆم لەکاتی هەرزانیدا و سامانی زۆرم پەیدائەکرد. زانینی هەمو نهێنیەکان هەربۆ خوایە .

بۆ زانین: بڕیاردان و سەپاندنی ناوەڕۆکی ئەو ئایەتە بەسەر خۆیا لەلایەن پێغەمەرەوە کەنزیکترینی هەمو ئادەمیزادە لەخواوەکەپڕبەدەمی خۆی هاوار ئەکاو ڕای ئەگەیەنێ بەهەموود انیشتوانی ڕوی زەوی کەلەبەردەم نهێنیەکانی لای ئادەمیزاد وجیاوازی لەنێوان من و ئەواندا نیە، بەوەیش وازناهێنێ . بەڵکو بەڵگەیش ئەهێنێتەوە، بەشێکی دیاری و هەست پێکراو ویژدانی کەئەفەرموێ: ئەگەر من پاشەڕۆژی فەرمانەکانم بزانیبایە پەلاماری ئەوشتانەم ئەدا بۆخۆم چاکبونایە، وخۆم ئەگێڕایەوە لەپاشەڕۆژی شتێ بۆخۆم خراپ بوایە لەژیانی ئەم جیهانەدا توشی هیچ شتێ نەئەبوم زیانی بەمن بدایە و پێم ناخۆشبوایە، وەك ئەفەرموێ :

﴿ وَمامَسَّنيَ السُّوَ ﴾ وەنەئەگەیشت بەمن هیچ خراپەیە لەهەژاری و برسیێتی و هەمو شتێ ئازاری پێ گەیانمایە ،لەبەرئەوەی کەس نەڵێ: پێغەمەر چۆن ئەبێ نهێنیەکان نەزانێ بەو نزکیەی لە خواوە هەیەتی، خوا ئەفەرموێ تۆ ڕای بگەیەنەو بڵێ:

﴿ إن أنا إلانَذِيرٌ وَبَشيرٌ ﴾ من نیم مەگەر مـن فروستادەیەکم خـوا ڕەوانـەی کـردوم بۆلای ئێوە بۆ ترساندنتان لەسزای خوا ئەگەر ئێوە باوەڕنەهێنن و بەموژدەدان پێتان ئەگەر باوەڕبهێنن بەخواو پاداشتی پاشەڕۆژ و پێغەمەرایەتی من .

ئەبێ ئێمە لێمـان تێـك نـەچێ کـارو پیشـەی فروستادەیی پێغەمـەرانی خـوا کـورت هەڵهێنراوە لـەسەر گەیاندنی پەیامی پەروەردەکەرە ئادەمیزاد و ترساندنیانو مـوژدەدان بـە ئادەمیزاد بەسزادانی خراپەکەران و پاداشتی پیـاو چاکـان. بـەلاّم زانـین و ئاگـاداری لـە نهێنیەکان و سود گەیاندن و لادانی ئازار و زیانبەدەستی خوایە بەتەنها. لەوئایەتـەدا ڕوی پێغەمەر کراوە بۆلای باوەڕداران بەموژدەدان و ترساندنیان، وەك ئەفەرموێ:

﴿ لِقَومٍ يُؤمِنُونَ ﴾ بۆ تاقمێ باوەڕبهێنن بەبەهەشت و هەمو نهێنیەکان، بۆئەوەی هـەمو ئادەمیزادێ بزانێ ئەوکەسانە سود وەرئەگرن بەترساندنو بەموژدەدان کـەخاوەنی بـاوەڕی ڕاستی و بێگومانین. بەلاّم ئەوکەسـانە بـێ بـاوەڕ و لـەخۆبایین هیـچ شـتێ سـودیان پـێ نابەخشێ .

پرسیار/ لـەمێژووی پێغەمەرداو لەنامـەکانیدا هـاتوون پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ هـەواڵی داوە بەزۆرتر لەنهێنیـەکان ، لەوهەوالاّنەیـە پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ فـەرموی: پـاش مـن ڕۆمـەکان سەرئەکەون بەسەر فارسەکاندا، فـەرموی: سـەلمانی فارسـی تـاجی کیسـرا لەسـەرخۆی دائەنێ، فەرموی: نەجاشی کۆچی دوایی کـردوە، هـەواڵیدا بەکوشـتنی زەیـدی کـوڕی حاریسەو جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب و عەبدولاّی کوڕی ڕەواحـە و حوسـەینی کـوڕی عەلیو چەندین هەواڵی تری نهێنی، ئەوانە چۆن بەرانبەر ئەکرێن لەگـەڵ ڕستەی ﴿ وَلَـوْ كُنْتُ أعْلَمُ الْغَيْبَ ﴾ هەتا کۆتایی پێهاتنی ئایەتەکە ؟

وەلاّم / نهێنیەکان کۆتاییان نایەو نایەنە ژمـارە. بـەلاّم ئـەبێ بزانـین نهێنیـەکان سـێ بەشن:

١- نهێنیەکان هەیانە خوا خۆی پەنهانی داوە لەبەندەکانی خۆی و هیچ کەسێ لەسەریان ئاگادار ناکا لەهەرپلەیەکدا بێ، ئەبێ خوا هەر خۆی بیزانێ، وەك پەیدابونی رۆژی داویی، ئەوبەشەیان پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ نایزانێ.

٢- نهێنی واهەن خوای مەزن هەندێ کەس لەبەندەکانی خۆی کەخۆشی ئەویچن و بەرێزن لای ئاگاداریان ئەکا لەسەریان، وەك ئەوەی خوای مەزن باسی فەرموە لەئایەتی (٢٦) لەسورەتی ( جیندا ) کەئەفەرموێ: (فَلا يُظْهِرُ عَلى غَيْبِهِ إلاّ مَنْ ارْتَضى مِنْ رَسُولٍ) یانی ( دوایی خوا ئاشکرا ناکا لەنهێنی خۆی هیچ کەسێ مەگەر کەسێ پەسەندبێ‌لای لە فروستادەکان. لەئایەتی ( ١٧٩ ) لەسورەی‌ت ئالی عمراندا ئەفەرموێ: ( بەم مانایە خوا کەس ئاگادار ناکا لەسەر نهێنی، بەلاّم هەلّئەبژێرێ لەفروستادەکانی خۆی بۆ ئەو ئاگاداری کردنە )، بەوێنەی ئەو هەولاّنەی پێشوی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ لەبڕگەی یەکەمدا .

٣- نهێنی واهەن هەمو کەسێ لەئادەمیزاد و لە جنۆکە خوا ئاگاداری کردوون لەسەریان وەك بونی بەهەشت و دۆزەخ وفریشتە و جنۆکەو چەندین شتی تر کەواتە مەبەست لەو نهێنیە هەر بۆ خوابێ و لای خوابێ و ڕێگە نەبێ بۆلای ناسینیان نەبەتاقی کردنەوە نەبەئەقلّ و نەبەشتێ تر مەگەر بە سروش لەلایەن خواوە، خوایش سروش ئەنێرێ بۆلای کەسێ خۆشی ئەوێ بەزانینی. نهێنیەکانی خۆی بەجۆرێ زانینی خۆی داوای بکاو ئادەمیزاد پێویستیمان پیّ‌ی هەبێ، دوایی ئەوفروستاوەیە لەلایەن خۆیەوە هەوالّ ئەدا بە ئادەمیزاد بەو نهێنیە بەو جۆرەی لەخواوە وەر گرتوە. کەواتە هەوالّدانی پێغەمەر بەوشتە زانینی نهێنی نیە بەلّکو گەڕانەوەیە لەکەسێکەوە نهێنی ئەزانێ. جیاوازی نێوان سەرچاوەی زانین و نێوان گەڕانەوەی زانین زۆر دورن لەیەکتری .

ئەوئایەتانەی بەلّگەی بێگومانن لەسەر پوچایەتی شتێ هەندێ لەخاوەن ڕێکەکان ئەلّێن : کەدلّی ئادەمیزاد بەجۆرە ڕیازەیە وەك ئاوێنە نهێنیەکانی تێدا ئەبینرێ ، ئەوجۆرە وەرگرتنەیان ناوناوە بەزانینی ( لەدونی ) و ئەتوانرێ هەوالّ بدەن بەنهێنیەکان لەجیهاندا .

زۆر جێگەی سەرسوڕهێنەرە ئیبنولعەرەبی لەجزمی سێهەمی فتوحاتی مەکیداو لەبابی (٣١١) ئەلّێ: هەرکەسێ بەپاکیو پوختەیی خوای خۆشبوێ ئەوکەسە ئەتوانێ خۆی

بگۆڕێ بەهەمو شتێ ئارەزۆی هەبێ لە گیانداران و لە درەخت و ئاوو بەرد. ئەڵێ شتی وایش ڕوی داوە. چونکە هەندێ لەخۆشەویستان و خاوەن ڕێگەکان چوە لای پیرێکی خۆی، لەبەردەم ئەودا خۆی گێڕا بە ئاو، کاتێ بەپیرەکە بێژرا: فلاّن کەس هات بۆلای تۆو نەچوەتە دەرەوە ووتی: بەڵێ ئەوکەسە ئەم ئاوەیە.

خوای مەزن لەم ئایەتەی دواییدا فەرمودەی خۆی ئەگێڕێتەوە بۆ دابین کردنی یەکێتی خۆی و پوچ کردنەوەی هاوبەشدانان بۆخۆی بەهۆی شتێکەوە کاربکاتە سەر ئادەمیزاد کەبریتیە لەنیشانەی دروست کردنی ئەم بونەوەرانە هەرلەلایەن خۆیەوە کەکارێکی زۆرپەکخەرە بۆ بێباوەڕان و ئەفەرموێ :

هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ۖ فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتْ حَمْلًا خَفِيفًا فَمَرَّتْ بِهِۦ ۖ فَلَمَّآ أَثْقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا صَٰلِحًا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا ۚ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٩٠﴾

﴿ هُوَ الَّذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدَةً ﴾ خوا کەسێکی ئەوتۆیە ئێوەی دروست کردوە لەکەسێکی تەنها کەئادەمە، لەتۆوێکی تاکە کەسێ و لەڕەگەز و سروشتێکی تەنها، بەبێجیاوازی لەنێوان ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتی و لەعەرەب وکورد و جگەی ئەوانیش و لەڕەش و لەسپی و جگەی ئەوانیش ولەنێرو لەمێ .

﴿ وَجَعَلَ مِنْها زَوْجَها لِيَسكُنَ إلَيْها ﴾ وەخوا دروستی کردوە لەوتەنـها کەسـەیە ژن و هاوسەرەکەی خۆی کە حەوایە، بۆ مەبەستی فراوانی و پـەرەپێدان و مانـەوەی ئێـوە، بـۆ ئەوەی ئەو کەسە دابنیشێ‌و ئارام بگرێ وبحەسێتەوە لەلای ئەوژنەو هاوسەری خۆی، خوا پەیداکردوە لەنێوانیانا دۆسـتی و خۆشەویستی و بـەزەیی و رێـز بـۆ یـەکتری، هەربـەو جۆرەیش دروستی کردوە بۆ هەموزیندەوەرێ نێرو مێینەیەك بۆ یەکتری .

﴿ فَلَمّا تَغَشّاها حَمَلَتْ حَمْلاً خَفيْفاً فَمَرّتْ بِهِ ﴾ دوایی کاتێ ئەو کەسە نزیکی ژنەکەی بویەوە چوەلای، ژنەکە هەڵئەگرێ لەمناڵدانی خۆیا بـارێکی سـوك کەبریتیـە لـە تـووی پیاوەکە یەکەم جار سوکە دوایی بەوەی لەمناڵدانیایە ئەڕواو دائەنیشێ هەتاکاتی مناڵبونی و سوکە لەلای .

﴿ فَلَما أثْقَلَتْ دَعَوا اللهَ رَبهمّا ﴾ دوایـی کـاتێ ژنەکـە بارەکـەی قورسـی لـێـی کـرد لەمناڵدانیدا و کاتی ئەوەهات مناڵەکەی ببێ ژنو پیاوەکـە هـەردوکیان زۆر بەپەرۆشـەوە لەخوا ئەپاڕێنەوە و داوالەپەروەردەکەری خۆیان ئەکـەن، لەوکاتـەدا ئـەوباوك و دایکـە ڕوئەکەن بۆلای خوا .

﴿ لَئِنْ آتَيْنا صالِحاً لَّنَكُونَنَ مِنَ الشاكرِيْنَ ﴾ بەڕاستی ئەگە تۆ پەروەردەکەر بە ئێمـەت بەخشی مناڵێکی چاك و پاك و لەش و رەوشـتی تـەواو بـو بەڕاسـتی ئێمـە سوپاسـی تـۆ ئەکەین، خوای مـەزن پارانەوەکـەیان لێ وەرئـەگرێ دوایـی ئـادەمیزاد ئـەبن بەدووبـەش هەندێکیان سوپاسی خوا ئەکەن وەك پیاوچاکان، هەندێ تریان سوپاسـی خواناکـەن، وەك ئەفەرموێ:

﴿ فَلَمّا آتاهُمّا صالِحاً جَعَـلا لَـهُ شُرَكاءَ فيْما آتاهُمـا ﴾ دوایـی کـاتێ خـوا بەخشـی بەهەندێ لەنەوەی ئادەم مناڵێکی چاك و پاك و بێ‌شورەیی و شیرین ئەو پیاوو ژنە دائەنێن بۆ خوا چەندین هاوبەش لەوشتەی خوادای بەوان یانی کاتێ خـوا بـەگوێرەی پاڕانـەوەی خۆیان مناڵی پێدان ئەڵێن: ئەوکارە چاکە بەهۆی بتەکانەوە وپـیرۆزی ئەوانەوەیـە، خـواو پەیمانەکەی خۆیانیان لەبیر ئەچێتـەوە، چونکـە سروشـتی ئـادەمیزاد بەوجۆرەیـە لـەکاتی تەنگانەدا خوا ئەناسن لەدواییدا پەشیمان ئەبنەوەو گەورەی خوایان لەبیر ئەچێتەوە .

بۆ زانین: ئەو ئایەتە هەرچەندە دەربارەی ئادەم و حەوا هاتوەتە خوارەوە .بەلاّم بێگومان ئادەم و حەوا هاوبەشیانِ بۆ خوا دانەناوە.کەواتە مەبەست لەناوەڕۆکی ئەو ئایەتە هەندێ لەنەوەکانی ئادەمە، ئەوەتە خاوەنی تەفسیری بەیزاوی مانای ڕستەی ( جَعَلا لَهُ شُرکاءَ فِیما آتاهُما ) بەم جۆرە ئەکاو وئەفەرموێ: موزاف مەحزوفە، واتە ( جَعَلَ أولادُهُما ). یانی داویی کاتێ خوا منالّی چاکیانی دایە منالّەکانیان لەناوناندا ئەکەن بەهاوبەش بۆ خوا لەجیاتی ئەوەی منالّەکانیان ناوبنێن عەبدولاّ یا عەبدورەحیم ناویان ئەنێن عەبدولعوزاو عوبدول مەناف .

﴿ فَتَعالَى اللهُ عَمّا یُشرِكُونَ ﴾ دوایی خوا بەرزتر ەپاكترە لەشتێ بێ باوەڕان ئەیکەن بەهاوبەش بۆ خوا. یانی زۆربەی ئادەمیزادی بێباوەڕهاوبەش بۆ خوادائەنێن. ناوەڕۆکی ئەو دووئایەتەی پێشوو بۆ روداوێکی تایبەتی نیە لەنێوان ژن و مێردێکا. بەڵکو هەوڵدانە بەکرداری ئادەمیزاد کاتێ کەتوشی گیروگرفتی نالەباربون یا داوای چاکەیەکیان کرد پەلاماری ئەدەن بۆلای خوا بەکزییەوەو پێویستی ئەکەن لەسەر خۆیان و پەیمان ئەدەن ئەگەر ئاوات و داواکانمان هاتەدی سوپاسی خوا ئەکەین کەچی کەخوا ئاواتەکانی ئەوانی هێنایەدی پشت ئەکەنە خواو بەڵێنەکانیان وازلێ ئەهێنن. وەك خوای مەزن لەوبارەوە ئەفەرموێ:

أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَا أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى الْهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمْ سَوَاءٌ عَلَيْكُمْ أَدَعَوْتُمُوهُمْ أَمْ أَنتُمْ صَامِتُونَ ﴿١٩٣﴾ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ فَادْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُوا لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٩٤﴾ أَلَهُمْ أَرْجُلٌ يَمْشُونَ بِهَا أَمْ لَهُمْ أَيْدٍ

يَبْطِشُونَ بِهَآ أَمْ لَهُمْ أَعْيُنٌ يُبْصِرُونَ بِهَآ أَمْ لَهُمْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا قُلِ ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾ إِنَّ وَلِـِّۧىَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ ۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٩٦﴾ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَكُمْ وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٧﴾ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَسْمَعُوا۟ ۖ وَتَرَىٰهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿١٩٨﴾

﴿ أَيُشْرِكُونَ مالا يَخْلُقُ سَيْئاً وَهُمْ يَخْلَقُونَ ﴾ ئایا بۆ بێ باوەڕان شتێ ئەکە نبەهاوبەش بۆ خوا دروست ناکەن هیچ شتێ کەبریتیەلە بتەکان و، ئەوان دروست کراون، یانی دروست کردن هەربۆخوایە بەتەنهاو ئەفەرموێ بەهەرشتێ بیەوێ دروستی بکا: ببە ئەوشتە کوتوپڕە ئەبێ، هەموشتێ بەبتەکانی ئێوەیشە هەژاری دەرگای خوان لەبون ولەنەمانیان و بەردەوامیانا ولەبەخێوکردن و پاراستنیان. بەتایبەتی ئەو بتانە بێ گیانن و دروستکراوی دەستی خۆتانن .

﴿ لايَسْتَطِعُونَ لَهُمْ نَصْراً وَلا أنْفُسَهُم يَنْصُرُونَ ﴾ ئەوبتانە توانای یاریدانیان بۆ بت پەرستنا نیە توانایان نیە یاریدەی خۆیان بدەن .ناتوانن سوود بەخۆیانو بەبت پەرستان بگەیەنن. زیان و ئازار لەخۆیسان و لەبت پەرستان دوورناخەنەوە، ئیتر ئەوبتانە ئادەمیزادبن یادارو بەردو گۆڕستان، یاریدان و زاڵبون و گەورەیی و بەخشین و سەرشۆڕی هەمو کەسێ لەبونەوەران بەدەستی خوان، ئەوبتانە دارو بەردن وێنەی درەخت و بەردەکانی تر چۆن ئێوە ئەیانپەرستن و کەچی بەچاوی خۆتان ئەبینن سەگ و پشیلە میزیان پێدائەکەن .

﴿ وَإِنْ تَدْعُوهُمْ الى الهُدى لايَتْبَعُونَكُمْ ﴾ وەئەگەر ئێوەی بێ باوەڕدارو هەمو ئـادەمیزاد بـانگی ئـەوبت پەرستانەو ناوبـانگی ئـەو بتانـە بکـەن بۆلای ڕاغویـی و ئـایین دوای ئێوەناکەون، بێ باوەڕی ئەوان لەبەرئەوەیە دڵیان ووشك وڕەقە و دوای شەیتان کەوتون، بەتایبەتی بتەکان لەبەرئەوەیە کەڕو کوێرو بێ توانان و توانای وەڵامدانەوەی کەسیان نیـە کەچی بت پەرستان لەگەڵ ئەو هەمو عەیبەدا هەیانە ئەیانپەرستن و بەپیرۆزیان دائەنێن .

﴿ سَواءٌ عَلَيْكُم أَدَعَوْتُمُوهم أَمْ أَنْتُم صامِتُونَ ﴾ یەکسانە لەسەر ئێـوەی بـت پەرسـت بانگی ئەوبتانە بکەن بۆ لابردنی ئازارو ڕاغویی وشـارەزایی، یـابۆلای ئـەوەی سـودێکیان پێبگەیـەنرێ یازیانێکیـان لێـی لادرێ، یـا ئێـوە بێدەنــگ بــن و بانگیــان نەکــەن لەهەردووکاتەکەدا ئەوان وەڵامتان نادەنەوە چونکە نازانن هیچ شتێ نابینن .

﴿ إِنَّ الَّذِيْنَ تَدْعُـونَ مِـنْ دُونِـاللهِ عِبـادٌ أَمثـالُكُمْ ﴾ بەڕاسـتی کەسـانێکی ئـەوتۆ ئێـوە ئەیانپەرستن و بانگیان ئەکەن و ناوتان ناون خوابـەندەو دروسـت کـراوی خـوان وێنـەی ئێوە، ئیتر ئێوە چۆنیان ئەپەرستن وئەیان کەن بەخوای خۆتان؟ کەوێنەی ئێوەبن دروسـت نیە داوای کۆمـەکیان لێ بکـرێ لـەکارو فرمـانی هەردووجیـهانتانا، ئەوکەسـەی داوای کۆمەکی لێ بکرێ هەرخوایە . ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکـەن لـەو شـتانە ئێـوە ئەیاندەنـەپاڵ ئەوان .

﴿ فَـأَدْعُوهُمْ فَلْيَسْـتَجِيْبُوا لَكُـمْ ﴾ دوایـی ئێوەبـانگی ئەوبتانـە بکـەن ئێوەئەیانپەرسـتن لەجگەی خوا دوایی بائەوان وەڵامی ئێوەبدەنەوە؟ بۆئەوەی ئێوەبزانن ئەوانە وێنەی ئێـوەن و زۆرتر لەپلەی ئێوە نزمترن و شایانی پەرستن نین .

﴿ إِنْ كُنْتُمْ صادِقِيْنَ ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکـەن ئەوبتانـە خوانـو بـەگومانی خۆتـان هەموو شتێکیان بەدەستە. خوای ڕاستی ئەوەیە کەداوای پاڕانەوەو داخـوازی ئەوکەسـانە بداتەوە ئەیپەرستن و وەڵامیان بداتەوە، خـوای مـەزن بۆئـەوەی باشـتر سەرشـۆڕیان بکـا هەموکەسێ لەخۆیان وجگەی خۆیان بۆیان دەرکەوێ گێل و نەزان وبێ ئەقڵن لەپەرستنی ئەو بتانەدا و ڕوئەکاتە بت پەرستەکانو ئەفەرموێ:

﴿ أَلَهُمْ أرجُلٌ يَمْشُونَ بِها أمْ لَهُمْ أيْدٍ يَبْطَشُونَ بِها ﴾ ئایا بۆ ئەو بتانە هەیە دووپێ کە بەو پێیانە برۆن بەرێگەدا بۆ پەیداکردنی چاکەدان بەئێوەو بەخۆیان، ئایا بۆ ئەوان هەیە چەند دەستێ بەودەستانە شتی پێ ببەخشن بەئێوەو بەخۆیان و شتی پێبگرن و بگەنە فریاتان لەجیهاندا؟.

﴿ أمْ لَهُمْ أعْيُنٌ يُبْصِرُونَ بِهْا أمْ لَهُمْ آذانٌ يَسْمَعُونَ بِها ﴾ ئایا ئەو بتانە چاویان هەیە بەوچاوانە ببینن کە ئێوە ئەیان پەرستن هەتا بگەن بە هاوارتانەوە لەسزا بتان پارێزن، ئایا ئەو بتانە گوێچکەکانیان هەیە بەو گوێچکانە شتێ ببیستن و لەپارانەوەتان بگەنو وەلامتان بدەنەوە، زۆر رون و ئاشکرایە ئەوبتانە پێ و دەست و چاوو گوێچکەیان نیە، ئیتر مرۆڤ نەختێ ئەقڵی تێدا بێ چۆن ئەوەبتانە بەوجۆرانەبن ئەیکەن بەپەرستراوی خۆیان، خوای مەزن بەناوەرۆکی ئەو ئایەتە هاوبەش دانەران ووریا ئەکاتەوە کەئێوە خۆتان لەوبتانە چاکترن و بەرێزترن، چونکە ئێوە خاوەنی ئەقڵن و شتیپێ ئەزانن و پێ ودەست وچاو وگوێچکەتانە هەیە و زمانتان هەیە. بەلام بتەکانتان ئەوانەیان نیە ،چۆن ئەبێ خوابن و ئێوەئەوان بپەرستن ؟

پرسیار / راناوەکانیوێنەی ووشەی ( يَخْلِقُونَ وَيَبصِرُونَ وَ لَهُمْ ) بۆ خاوەن ئەقڵ بەکاردێن، ئەبێ قورئانی پیرۆز بۆ بێئەقڵەکان چۆنی بەکار ئەهێنێ ؟

وەلام / ئەوراناوانە بۆ جگەی خاوەن ئەقڵیش بەکاردێن ،وەك خوا ئەفەرموێ: (كُلٌّ في فَلَكٍ يَسْبَحُوْنَ يا أيُها النَمْلُ ادخُلُوا في مَساكِنُكُمْ ) بەلام زۆرتر بۆ خاوەن ئەقڵ بەکاردێت .

﴿ قُلِ أدْعُوا شُرَكائَكُمْ ثُم كَيْدوني فَلا تَنْظرُونَ ﴾ تۆ بلێ: ئێوە بانگی ئەوبتانە بکەن هاوبەشی خۆتانن و کردونتان بەهاوبەش بۆ خواو ئەلێن: ئەوانە خوای ئێمەن کەدوژمنی هەرەگەورەی منن و دۆستی ئێوەن و گومان وایە ئەبن بەیاریدەری ئێوە، لەپاشا ئێوە وبتەکانتان بە ئەوپەری تواناوە تێبکۆشن وکاربکەن بۆ لەناوبردنی من و بۆئازاردانم، دوایی داوایان لێبکەن مۆلەتی من نەدەن و چ شتێکیان ئەوێ بیکەن بەمن بەگورجی دلتان

خۆشببێ. خوای مەزن بەورِستانە فەرمان ئەدا بەپێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بڵێ بەوبێباوەرِانە ئەگەر بتەکانتان شتیان بەدەستە بەگوێرەی گومانی خۆتان من بەبێ هێز ئەزانن بەرانبەر بەوبتانـە. ئادەی پەنایان بۆ ببەن باتۆڵە لـەمن بسێنن و وازم لێ‌نەیەرن، لایشتان رونە من زۆردوژمنـی ئەو بتانەم، ئەم کاتە کاتی هەق سەندنە، من بروام بەخوای خۆم هەیە کەدۆستی منەو ئـەم پارێزی، من لە هەرِەشەو گورِەشەی ئێوە ناترسم و لاتان رِونبێ:

﴿ إنَ وَلِييّ اللهُ الّذي نَزّلَ الكِتابَ وَهُوَ يَتولى الصالْحِيْنَ ﴾ بەراستی کەسێ سەرپەرشـتی پاراستنی من بکا و یاریدەری من بێ خوایێکی ئەوتۆیە ناردویە نامەی خـۆی کـە قورئانـەو پارێزەری بەندەکانی خۆیەتی، هەرخوا سەردارو دۆست و هەڵسـورێنەری پیـاو چاکانـەو ئەیانپارێزێ و داواکانیان جێ‌بەجێ ئەکا کە بەندەی بیرو بـاوەرِ پـاکن، بێگومـان پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ یەکێکە لـەو پیاو چاکانە. دوایی ئایا ئێوەی بت پەرست نامەتان هەیـە و بتـەکانتان ئەتوانن بتانپارێزن؟ لـەئەنجامدا بۆ هەمو کـەس دەرکـەوت پەسـتی و سەرشـۆرِ بونـی بـت پەرستان دەریش کەوت بەرزکردنەوەی ئایینی ئیسلام و موسڵمانان .

﴿ وَالّذِيـنَ تَدْعُـونَ مِـنً دُونِ اللهِ لايَسـتَطيْعُونَ نَصْرِكَـمْ وَلا أنْفُسَـهُمْ يَنصَـرَونَ ﴾ و کەسانێکی ئەوتۆ ئێوە ئەیان پەرستن و هاوریان لێ ئەکەن لە جگەی خـواو لـە بتـەکانتان توانای یاریدەی ئێوەیان نیەو توانای یاریدەی خۆیانیـان نیـە. لـەئایـەتی (١٩٣ )ی ئـەم سورەتە باسی ئەم مەبەستە کراوەو خـوا دوپـاتی کردوەتـەوە، چونکـە پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ روبەرِوی بت پەرستان ئەوەستێ کەبتەکانیان هیـچ ئـازارێ توشـی ئـەو ناکـەن. کەواتـە شایستەیە ئاماژەبکا بۆلای ئەوە کەبتەکانیان بێ‌هێزتریشن لـەوەی یارمەتی دەربن خۆشیان سەربکەون .

﴿ وَإن تَدْعُوَهُـمْ الى الهُـدى لايَسْـمَعُوا ﴾ وەئەگـەر ئێـوەی موسـڵمان داوابکـەن لـەبێ‌باوەرِان بۆلای راستی و راغوبی کردنی پێغەمەر و دۆستانی خـوا ئـەوان ئـەو داوایـە نابیسن بەجۆرێ شایستەیە وەلامدانەوەی ئێوەبێ، چونکە زیندوی دڵ مردوون، ئەورِستەیە جارێ تر ماناکەی باسکراوە، لێرەدا دووپات کراوەتەوە لـەبەرمەبەستی رِستەی پێشوو .

﴿ وَتَراهُم يَنظِرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لايُبْصِرُونَ ﴾ وەتۆ بیّ باوەڕان ئەبینی تەماشای تۆئەکەن و بۆلای‌تۆ ئەڕوانن بەڕووالّەت و، ئەوان بەچاوی دلّ و ڕاستی تۆ نابینن هەتا سود لەتۆ وەرگرن و باوەڕت پیّ بهیّنن بەهۆی بەلّگەی ڕوونەوە لەسەر پێغەمەرایەتی تۆ، لەبەرئەوەی چونەتە خوارەوە لەدژی تۆو گەڕاون بەکوێر لەئاستی بەلّگەڕونەکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾. ئەوڕستەیە بەدەقەکەی خۆی پیّمان ئەسەلمیّنیّ کەبتەکانیان وێنەی شێوەو پەیکەرن لەکلێساکان هەلّواسراون و بیّ‌گیان و بیّ‌هۆشن و بیّ‌هەستن. عەرەبەکان دەستیّکی بالاّیان هەبوە لەتاشین و نەخشەکێشانی بتەکان بەجۆریّ یەکەمجار وائەکەوتنە گومانی بینەران کەخاوەنی هۆش و بیستن و بینین و هەستین .

پرسیار/ بۆچی خوای مەزن دووپاتی کردەوە کەبتەکان ناتوانن یاریدەی خۆیان و یاریدەی‌کەسی تر بدەنو خاوەنی سوود و زیان گەیاندن نین، ئەش فەرمویّ قاچ ودەست و چاوو گوێچکەیان نیە بەجۆریّ لە (٩) ئایەتە باسی فەرموە کەچی ئەگەر بیفەرمویایە: ئەوبتانە بەردن بەس ئەبو بۆسەپاندنی ئەو مەبەستە ؟

وەلاّم/ بەڕاستی بت پەرستی زۆری سەندبوبەسەر بیروباوەڕی عەرەبەکانو بەسەر ئەقلّیاندا و خۆشەویستی بتەکان تێکەلاّوی خوێن وگۆشت و گیانیان بوبو لاسایی کەلەپوری باووباپیری خۆیانیان ئەکردەوە، باوەڕیان بەو بتانە بەهێزتر بوو لەباوەڕیان بەخوا گۆڕانی ئەوشتانەو دەرکردنیان لەبیروباوەڕو دەرونیانا ئاسان نەبو، خۆیانیان ئەکرد بەفیداکاری بۆ بتەکانیانو دارایی خۆیانیان بۆ دائەنان، هەرکاتیّ باسیان بکرایە بەخراپە هەلّئەچون و توڕەئەبون، جابۆیە پێویستە لەبەرئەوشتانە ئەو ڕستەیە چەند جاریّ دووپات بکرێتەوە بۆ بەزاندنیان بەتەواوی .

لێرەدا چەند نمونەیە باس ئەکەین: ئەگەر یەکیّ لەکەشیشەکان هەولّبدا کەئەو پەیکەرە بیّ‌گیان وبیّ‌هۆشانە لاببا لەکلێسادا، بۆ ئەوە بلّیّ: ئەو هەلّواسراوانە کاغەزو بەردن وخاوەنی پیت و پیرۆزی نین ، نامەی زۆریان بۆ بخوێننەوە، یابەیەکیّ لەپەیڕەوانی پیرانی تەریقەت بیێژریّ: وێنەی کاکەی پیرتان و درەخت و بەردی سەرگۆڕی پیرەکنتان سود و زیانیان نیە، ئایا هەلّوێستی پەیڕەوانی ئەو وێنەودرەخت و بەردانە چۆن ئەبیّ،

بەهەموو نەفامییەکەوە توانای خۆیان ئەخەنە کارەوە لـەدژی ڕەخنەگرەکانیانـەوە، بگـرە گییانی ئەو ئامۆژگـاری کەرانـە ئەکەوێتـە مەترسـیەوە، یـاهیچ نـەبێ دانیشـتوانیان لـێـی ئەهوروژێنن هەتا بێزیان لـێی بکەنەوە، بەهەزاران بوختان و درۆیان بۆ دروست ئەکەن .

کاتێ خوای مەزن فەرمانی دا بە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بانگی دانیشتوان بکـا بـۆلای ئـایینی خوا، بەئادەمیزاد ڕابگەیـەنێ فـەرمودەکانی خـوا، فـێری کـردەوەی شـیرین و کـرداری ڕەوشتی بەرزیان بکا ئەفەرموێ :

خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُوا۟ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِى ٱلْغَىِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ ﴿٢٠٢﴾ وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِـَٔايَةٍ قَالُوا۟ لَوْلَا ٱجْتَبَيْتَهَا ۚ قُلْ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ مِن رَّبِّى ۚ هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠٣﴾

﴿ خُذْ العَفْوَ وَاَمُرْنا بِالمَعْرُوفَ ﴾ موحەمەد تۆ ئاسانی و بێ ئازاری وەربگرە بۆ ئادەمیزاد و توندو تیژی مەکە لەگەڵیان و خراپەیان لـەگەڵ کـردی لـەوان ببـورە ، فـەرمان بـدە بەچاکە و بەڕەوشتی پاك، ئەوشتانەی یاساو دەستور بڕیاری پێداون لـەمامەڵەو شـتی تـردا فێریان بکە بەگوێرەی یاسا و هەمو شتێکیان پێ بناسێنە .

تەفسیری زمناکۆیی

﴿ وَأَعْرِضْ عَنْ الجْاهِلِيْنَ ﴾ وەتۆ ڕوی خۆت وەرگێڕە لەنەزان و گێل و نەفامەکان و توندو تیژی مەنوێنە لەگەڵیان، بەڕاستی ئەو ئایەتە هەمو ڕەوشتی بەرزی لەنێودایە و باسی کردون. لەیاساو دەستوری ئیسلامدا سێ شتی سەرەکی هەن لەکۆمەڵایەتیداو زۆر گرنگن لەوئایەتەدا باسکراون:

١- ( العَفُو ) یانی ئاسانی و سوکی و بێ‌ئازاری و بێ تورەیی لەهەموو کردەوەو ڕەوشتەکاناو لەبەخشینی داراییدا بەشتێ زۆرتربێ بۆ پێویستی ژیانی مرۆڤ، تۆڵەکردنەوە لەئادەمیزاد بۆخۆی .

٢- ( الآمْرُ بِالْمَعْرُوف ) یانی فەرماندان بەچاکەو ناسراو بێ لەلای ئادمیزاد و ڕونبێ بەبێ ماندوبون. ئادەمیزاد بزانن کەچاکە لەڕەوشتو لەمامەڵەداو هەمو دەستورێ خوا بڕیاری لەسەر داوە

٣- ( وَأَعْرُضْ عَنْ الجْاهِلِيْنَ ) ڕوووەرچەرخان لەوکەسانە بەڵگەی ڕون کاریان تێ‌نەکا بۆلای ڕاغویی وەرگرتن و سود لەئامۆژگاری کردن و شارەزایی کردن وەرنەگرن، زۆر کەس هەن گێل و گەوج و ئازاری ئەو کەسانە ئەدەن فەرمانیان پێ ئەدەن بەچاکەکردن و قەدەغە ئەکەن لەوان کردنی خراپە، وێنەی ئەو پیاو خراپانە پێویستە ئێمە دەمە دەمەیان لەگەڵدا نەکەین وبەحەوسەڵە بین لەگەڵیانا، ڕویان لێ وەرگێڕین ئارام گر بین لەسەر ڕەوشتی خراپیان لەبەر پاراستن و ڕێزی خۆمان. بەڵکو بیر بکەنەوەو واز لەڕەوشتی خراپی خۆیان بهێنن .

﴿ وَ إما يَنْزَغَنْكَ مِنَ الشَيْطانِ نُزُعَ ﴾ وەئەگەر شەیتان هانی تۆی داو توشی تۆی کرد گومان و خراپە کردن و دوودڵی، وای لەتۆ کرد پێچەوانەی ئەوشتانە فەرمانت پێدراوە بییان کەی لەتوڕەبون و فەرمان بەچاکەنەدان و ڕو وەرنەگەڕان لەنەزان و نەفامەکان. لەوکاتەدا :

﴿ فَاْسْتَعِذْ بِاللهِ إِنَهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ دوایی تۆ پەنا بگرە بەیاریدەی خواو ڕوی خۆت وەرگێڕە بۆلای خوا، بۆئەوەی خوا پەنات بداو بتپارێزێ لەگومان ودوودڵی. بەڕاستی

خوا شاراوەی تۆو گومانی شەیتان ئەبینیَ، ئەو شتەی لەدڵی تۆدایە و هاتوچۆ ئەکا لەگومان و دڵی تۆ ئەیزانیَ .

ئەو سیَ بیرو باوەڕە لەوئایەتانەی پیَشو باسیان کرا، ئەگەر ئادەمیزاد دەستیان پیَبگرن، لەنیَوانیاندا دڵپیسی ڕق و بیَزاری نابیَ و پەیدانابن و یەکتریان خۆش ئەویَ، ئاشتی باڵئەکیَشیَبەسەریانا، هاوریَیەتی و دۆستایەتی فراوان ئەبیَ، پیَغەمەی ﴿ ﷺ ﴾ ئامۆژگاری هاواڵەکانی بەو بیرو باوەڕەوە ئەکرد .

پیَغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ توڕەئەبیَ هەرلەبەرخوا، توڕەبونیشی لەبەرخۆی هەر لەبەر خوایە، زۆرجاری وائەبیَ پیَغەمەر توڕەبوە لەسەر نەزانینی کەسانیَکی ئەوتۆ خوا فەرمانی داوە ڕویان لیَ وەرگیَڕیَ، ئەوکارە خراپەی ئەوان دڵی پیَغەمەری ﴿ ﷺ ﴾ ئەجولیَنیَ گفتوگۆیە بەشایستە پلەی ئەو نەبیَ بەو بیَ باوەڕانەی بفەرمویَ. بۆیە خوای ئامۆژگاری کەری پیَغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەوە ئەفەرمویَ: ئەگەر بەڕیَکەوت ئەو شیَوانەت توش بوو توڕەمەبە و ئارام بگرە و پەنابە بۆلای خوا، خوا ئەوشتانەی توشی تۆ ئەبیَ ئەیان بیسیَ و ئەیانزانیَ و پاداشتت ئەداتەوە ئیتر خەفەتت چیە ؟ لەپاشا خوای مەزن ڕیَگە نیشان ئەدا بەو کەسانە خۆیان ئەپاریَزن لە خراپە لەکاتیَ توشیان ئەبیَ دوودڵی و گومان لەشەیتانەوە وئەفەرمویَ:

﴿ إنَ الَّذيْنَ إتَقَوا إذا مَسَّهُمْ طائِفٌ مِنّ الشَيْطانِ تَذَكَروا ﴾ بەڕاستی کەسانیَکی ئەوتۆ خۆیان پاراستوە لەخراپەکانی توشیان بوە دوودڵی و گومان لەشەیتانەوە، ئەوکاتە گەیشتبیَ بەوان دوودڵی و خراپە ئەسوڕایەوە بەدەوُونیانا و ئەهات بۆ لایان لەلایەکەوە بیری ئەو شتە ئەکەنەوە خوا فەرمانی پیَداون و قەدەغەی کردوە لەوان وخۆیان دورئەخەنەوە لەوانەو ئەگەڕیَتەوە بۆلای ڕاستی و شارەزایی وخۆیان دوورئەخەنەوە لەکردەوەی پیسی شەیتان .

﴿ فَإذا هُمْ مُبَصِرونَ ﴾ دوایی ئەوکەسانە خۆپاریَزن لەبیَفەرمانی خوا ئەبینن ڕیَگەی ڕاست و خراپ، لەگومانی شەیتان خۆیان ئەپاریَزن بەهۆی ڕیَگەی ڕاستەوە، خیَڵی شەیتان دوودڵی پەیدا کردن کاریان لیَیَ ناکا، ئایین زاڵ ئەبیَ بەسەر هەواو هەوەسی خراپدا .

بۆ زانین: ئەوەی ئێمە تاقیمان کردبێتەوە لەزۆربەی ئادەمیزادەوە سێ شت پاڵیان پێوە ئەنێ بۆ تورەبون و رق هەڵسان:

١- پاڵ پێوەنانی خۆشەویستی و خواستی خزمایەتی و نیشتمان پەروەری بۆ رق هەڵسانیان .

٢- پاڵ پێوەنانی ئەقڵ بۆ رق هەڵسان و ئەقڵیش زۆرجاران شوێنی لاسایی ئەکەوێ ، هەر شتێ‌نەبینێ یانەبیسێ یا بۆنی نکا یاتامی نەکا یا ئەندامی لێی نەکەوێ ئەقڵ بەشێوەیەکی ڕاست نایزانێ. کەواتە زۆرجار توشی هەڵە ئەبێ و ناوەڕۆکی هەموشتێ نازانێ، نمونە هەندێ کەس خاوەنی ئەقڵن، کەچی گاو شتی تر بەخوا دائەنێن، هەندێ دیش عیسا بەکوڕی ئەزانن هەتادێ .

٣- پاڵ پێوەنانی ئایین بۆ ڕقهەڵسان، ئایین پەروەران زۆرجاران ڕقیان هەڵئەسێ لەکاتی گاڵتەکردن بەئایین. لەبەرئەوەی زۆربەی ئادەمیزاد ئایینیان لاوازە و ئەقڵیشیان ناتەواوە واز لەئایین ئەهێنن و ئایین ئەڕوخێنن لەبۆ پاراستنی خزمایەتی و پاراستنی نیشتمان بگرە ئەقڵیش ئەڕوشێنن، چونکە ئادەمیزاد خۆشەویستی‌و خواستی خزمایەتیەکەی پێش ئایین کەوتوون و بوون بەبەشێ لەلەشی لەکاتی لەدایك بونیەوە و ماوەیەکی زۆریش خاوەنی ئەقڵ نەبوە بەهۆی منالیەوە. لەپاشا خوای مەزن ئایینی ناردوەتەخوارەوە بۆ گرتنەوەی ئادەمیزاد لەسەرکێشی و خواستی خراپی خۆیان وخزمایەتی و گەڕانەوەیان بۆلای ئەقڵی تەواو بیربکەنەوە لەبونەوەران بۆ چەسپاندنی ئایین و باوەڕبەخوای بێ‌وێنە، هەتا ئادەمیزاد وای لێ‌بێ بڕوا پەیدا بکا. هەر ئایینە هۆی ئاسایش و خۆشەویستی لەنێوان ئادەمیزادو بەختیاری خۆیان لەئاییندا بزانن و ئایین زاڵبکەن بەسەر خواستی خزمایەتی و ڕەگەز پەرستی و ئەقڵی لاوازدا، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ :

﴿ وَإِخوانَهُمْ عَدُوُّنهم فِيْ الغَيِّ ﴾ وەبراشەیتانەکانی بت پەرستان کۆمەکی و یاریدەی ئەوبرایانەیان ئەدەن بۆ بێ‌باوەڕی و نەترسان بەهێزیان ئەکەن و ڕایان ئەکێشن بۆلای بێ‌باوەڕی و گوناه کردن، خراپەیان فێر ئەکەن، بت پەرستانیش لەبەر لاوازی ئەقڵیان

وخواستی خزمایەتی ورەگەزپەرستی دووایان ئەکـەون و لاسـایی‌یان ئەکەنـەوە لـەوکارە خراپانەدا .

﴿ ثُمَّ لايُقصِرُونَ ﴾ لەپاشا شەیتانەکان کۆتایی ناکەن لەلادانیان لەئایین و راستی هەتا نەگەڕێنەوە لەگومڕایی بۆلای باوەڕهێنان و خۆیان ئەبەستنەوە بەگوناهەوە ئەوانیش ئـەبن بە دۆستی شەیتانەکان و لاساییان ئەکەنەوە لەبەر خواستی خزمایەتی و مانەوەی پلەو پایە وسامانیان، هۆشیّ بەخۆیانا بەرنەوە هەتا بگەڕێنەوە بۆلای ڕێگەی ڕاسـت و شـارەزایی و دووربکەونەوە لەبرا شەیتانەکانیان .

﴿ إذا لَمْ يَأتِيَهُمْ بِآيَةٍ قالُوا لَولاأجتَبَيتها ﴾ وەهەر کاتیّ تۆ نەتهێنابایە بۆئەو بـیّ باوەڕانـە ئایەتیّ‌لەقورئان و لەوەی ئەوان پێش نیاویان ئـەکرد، بیّ‌بـاوەڕان ئـەیانووت بەتەشـەرەوە بەپێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەوە بۆ ئایەتیّ هەڵنابژێری لەخۆتەوە دروستی ناکـەی ئایـا تـۆ پێغەمـەر نیت، ئەوبیّ‌باوەڕانە گومانیان وابو کـە پێغەمـەر خـۆی ئایەتـەکان سـاختە ئـەهێنیّ. بـت پەرستان هەرکاتیّ‌داوایان ئەکرد لەپێغەمەر: چـەند ئایـەتیّ لـەکارە پەکخـەرەکان بـهێنیّ بۆئەوەبو گاڵتەی پیّ‌بکەن، ئەگەر نەختیّ‌دوابکەوتایە هاتنە خوارەوەی ئەوئایەتە ئەیانووت: بۆلەخۆتەوە دروستی ناکەی، ئایا تۆ پێغەمەر نیـت؟ بۆیـە خـوا فـەرمانی پێـداو فـەرموی بەپێغەمەر ﴿ ﷺ﴾:

﴿ قُلْ إنّما أتبُع ما يُوحى اليَّ مِنْ رَبّي ﴾ تۆ بڵیّ بەو بیّ‌باوەڕانە: بەڕاستی من دوای هیچ شتیّ ناکەوم لەخۆمەوە دروستی ناکەم مەگەر من دوای شتیّ ئەکەوم بەسـروش ئـەهێنریّ بۆلای من لەلایەن پەروەردگاری خۆمەوە، زۆر بەچاکی بزانـریّ مـن فروسـتادەم. بـەڵام فروسـتاوە کـاری پەکخـەر لەخۆیـەوە دروسـت ناکـا ونـاتوانیّ هەڵبسـیّ بـەهیچ شـتیّ لەئایەتەکانی قورئان، داوا لەخوایش ناکا بۆی بنێریّ، چونکە خوا هـەموو شـتیّ ئـەزانیّ. پێغەمەر چاوەڕوانی خوایە پەیامی بۆ بنێریّ بەگوێرەی ویسـتی خـۆی، ئـەویش بیگەیـەنیّ بەبەندەکانی خوا لەبەر فەرماندانی خوا.

﴿ هذا بَصائِرُ مِنْ رَبِكُمْ وَهدًى وَرَحْمَةٌ لِقَوْمٍ يُؤمِنُونَ ﴾ ئەم قورئانە چەندین بەڵگەیەکی ڕوون ئەکەنەوە بۆ ئێوە و ڕێگەی ڕاستتان نیشان ئەدەن لەکاروباری هەردوو جیهان، ڕانومایيتان ئەکاو شارەزای ڕاستیتان ئەکا، میهرەبانی و خۆشیە بۆتاقمێ باوەڕئەهێنن هەر لەبەر ئەوەی ڕاستە وبێ گرێیە، ئەگەر ئێوە داوای ڕاستی ئەکەن بەگوێرەی گومانی خۆتان پێویستە لەسەرتان واز لە هاوبەشدانان بهێنن و موسڵمان بن، ئەگەر وانەکەن دەرئەکەوێ ئێوە هەر سودی تایبەتی خۆتانتان ئەوێ، ئەوەی ڕاستی بێ هەر باوەڕداران سوودی لێوەرئەگرن بەهۆی ئەو بەڵگانەی پێشەوە .

لەپاشا خوای مەزن فەرمان ئەدا بەپێغەمەر و هەمو ئادەمیزاد بەگوێگرتن لەقورئان لەکاتی خوێندنەوەیدا و بیر بکەنەوە لەڕانومایی کردنی قورئان و بەڵگە ڕونەکان، بەبێ گومان هەرکەسێ ووردبێتەوە لەقورئان و لەئامۆژگاری کردنی قورئان و بەڵگە ڕونەکانی شایستەی میهرەبانیو پەسەندیو بەختیاری لای خوایەو ئەفەرموێ :

وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢٠٦﴾

﴿ وَإِذا قُرِيءِ الْقُرآنُ فَأَسْتَمِعُوا لَـهُ وَأَنْصِتُوا لَعَلَكُمْ تُرحَمُونَ ﴾ وەهەرکاتێ قورئان خوێنرایەوە بەسەر ئێوەی باوەڕداراندا، دوایی ئێوە بەمەبەستەوە گوێبگرن لەخوێندنەوەی ئەو قورئانە هەتا لەماناکەی تێبگەن و بیر لەئامۆژگاریەکانی بکەنەوەو، ئێوە بێدەنگیش

بن بۆ بیستنی ئەو قورئانە، بۆ ئەوەی ئێوە میهرەبانیتان لەگەڵ بکرێ و شایشتەی بەزەیی خوابن و سزاتان نەدرێ .

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەوئایەتە بەتایبەتی بۆ نوێژکەران نیە لەکاتی نوێژکردندا گفتوگۆیان ئەکرد، بەڵکو بۆ هەمو کەسانێکە قورئان بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، هەندێ لەنوێژکەران گفتوگۆیان ئەکرد لەکاتی نوێژکردنیانا بەهاتنەخوارەوەی ئەو ئایەتە قەدەغەکرا گفتوگۆکردن لەنوێژدا هەتا هەتایە،کەواتە گوێ گرتن و بێ دەنگبون لەکاتی خوێدنی قورئاندا پێویستن لەنوێژدا و لەجگەی نوێژدا ، بەلاٖم هەندێ لەهاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ وێنەی ئەبو هورەیرە. عەبدولاٖی کوڕی مەسعود، پێویستە بێدەنگبون لەهەموکاتێکا. بەلاٖی پێشەوا کولەییەوە پێویستە بێدەنگ بون لەوکاتەدا پێشەوای نوێژ بەدەنگی بەرز قورئان بخوێنێ، نوێژکەرانی پشتی ئەو پێویستە لەسەریان بێ دەنگبن. بەلاٖی پێشەوایان سەعید کوڕی جوبەیرو موجاهید و عەتا پێویستە بێ دەنگبون لەکاتی خوتبەی هەینیدا و نوێژدا .

تێبینی: ئایا پێویستە بۆ نوێژکەران لەکاتی نوێژی کۆمەڵدا دووای پێشەوای نوێژەوە قورئان خوێندن، زانایان لەوبارەوە ئەم فەرمودانەی خوارەویان هەیە:

١- بەلاٖی پێشەوایان: عومەر، عوسمان، عەلی، ئیبنو مەسعود، مەعازو، ئەوزاعی، شافیعی، پێویستە لەسەر نوێژکەران خوێندنی قورئان لەنوێژکردندا بەکۆمەڵیی یا بەتەنها، ئیتر پێشەوای نوێژ بەدەنگی بەرزەوە قورئان بخوێنێ یابەنزمی، ئەبێ قورئانەکەیش سورەتی فاتحابێ .

٢- لای پێشەوایان جابیرو زاهیریەکان پێویستە قورئان نەخوێنرێ لەکاتی نوێژی کۆمەڵدا و لەدوای پێشەوای نوێژەوە، ئیتر پێشەوا بەدەنگی بەرز بیخوێنێ یابەنزمی ئەو بیرو بۆچونەی ئەوان هەڵبژاردەی پێشەوا حەنەفیە .

٣- لای پێشەوایان: ئیبنو عومەر، قاسم، زهری، مالیك، ئیبنو موبارەك، ئەحمەد، ئیسحاق. نوێژکەران پێویستە لەسەریان خوێندنی قورئان لەنوێژی کۆمەڵداو نزمی دەنگی

پێشەوا بۆ خوێندنی قورئان. پێویستە نەخوێندنی قورئـان لـەکاتی دەنـگ بەرزکردنـەوەی پێشەوای نوێژ بۆ خوێندنی قورئان .

بۆ زانین: ئەو بێدەنگیە بۆ خوێندنی قورئانی پیرۆز زۆر گرانە لەگەڵ گـوێ گرتـن بـۆ خوێنەرێ بەتایبەتی لەم سـەردەمەی ئێمـەدا کـە قورئـان بـەزۆری بولـند وێـژو ڕادیـۆو تەلەفزیۆندا بەشێوەی گۆرانی وياری کردن بە دەنگی بەرز ئەخوێنرێ بەبێ ئـەوەی هۆیـە بێ بۆ خوێندنی قورئان .

ئەو ئایەتانە بەو هەمووە مانا زۆرانەوە پێشەکێن بۆ ئەو شتانە دڵ ولەش و زمان و ڕوی ئادەمیزاد پاك بکەنەوە، ڕێزیان بەرزبکەنەوەو تەماشای بونەوەرانی بـاڵاو نـزم بکـەن، بـۆ ئەوەی باوەڕبە خوا بکەن و ڕزگاریان ببێ لەپیس و پۆخڵـی و چڵـك لەهـەمو ڕوێکـەوە بەهۆی بیرکردنەوانەوە، بۆیە خوای مەزن پێمان ئەفەرموێ :

﴿ وَأذْكُرْ رَبّكَ تَضرُعاً وَخيْفَةً وَدُونَ الجَـهْرِ مِـنَ القَـولِ ﴾ وەتـۆ بـیری پـەروەردگاری خۆت بکەرەوە و ناوی ببە لەدڵ ودەروونی خۆتا بەکزۆڵی و بەترسەوە، باسی بکەلەکاتی خوێندنی قورئان و پاڕانەوەداو لەهەمو کاتانی تریشداو تۆ گفتەگۆ بکە بەگفتوگۆیـە مـام ناوەندی بێ لەژوری نهێنی و جگەی دەنگی بەرزبێ، چونکە باشتر ترس ونیازی پاك پەیدا ئەبێ. بەنزمی بپاڕێرەوە، لەنزمیدا بچوکی بـۆ خـوای زۆرتـر تێدایـە، نزیکـترە لەشـیرینی گفتوگۆوە، لەبەرچاوی دانیشتواندا هەرخوابیزانێ بۆتۆ چاکترە .

﴿ بـالغَدِ والآصـالِ وَلاتَكُـن مِـنَ الغَـافِلينَ ﴾ لـەکاتی بـەیانی وئێـوارەدا. یانـێ لـە هەمووکاتێکا بچوکی خۆت دەربخە بۆ خواو بێ ئاگا و بێ هۆش مەبە لەشەوو لەڕۆژدا و، تۆ بێ ئاگا مەبە لەیادو لەناوبردن و پاڕانەوە لەخواو خـەریکی جیـهان و گاڵتەوگـەپ و ڕابواردن مەبە، لەوکەسانە مەبە یادی خوا بەزمان ودڵیانانایـە، بـە گفتوگـۆی پوچـەوەو بێماناوە دڵیان بەستراوە، لەپێویستی دانیشتوان ناکۆڵنەوە .

بۆ زانین: ئەو ئایەتە بەڵگەی ئاشکرایە لەسەرئەوەی خوێندن بەدەنگی بـەرز وازهێنانـە لە کاری چاك بەتایبەتی ئەگەر بەبوڵند گوێی، بەتایبەتی ئەگەر ئـازاری دانیشـتوان بـدەن

ولـەخەودا ڕایان پەڕێنن، ناوبردن وبیر لـەخوا پێویستە بەم جۆرەبێ، ئەبێ وابزانـێ کـەخوا دروستی کردووەو بەتەنها ئەودروست کەری بونەوەرانە و بەخێوکەریانــە، بەتەنـها خـوا بونەوەران ئەمرێنیێو زیندویـان ئەکاتـەوەو هەرخوایەکـەمجار ئـەوانی هاوردوەتـە بەنـەوە، هەرئەویشە ئەیان گێرێتەوە بۆلای خۆی .گەورەترین بارو نـاوبردنی خـوا پارانەوەیـە بـەم جۆرە ئادەمیزاد خراپە لـەگەڵ براکانی خۆیانا نەکەن لـەبەر ترسی خوا، گەورەتریش لـەوە ئەمەیە خراپەیان لـەگەڵ نەکا بەئومێدی پاداشتی خوای پەروەردگاری تۆ ، ئیتر ئەوکەسـان ەفریشتەکانن یاهەموو کەسێکی تری خاوەن ڕێزو پلـــەی بـەرز لای خـوا لـەئادەمیزاد و جنۆکە . هەندێ لەزانایان لایان وایە مەبەست لـەو کەسان فریشتەکانن .

﴿ لايَسْتَكبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَيُسَبِّحُونَهُ ﴾ ئەوکەسـانە لـەئاستی پەرسـتنی پـەروەردگارا خۆیان بەگەورە نارگرن و سەرکەشی ناکەن و هەاوبەش بـۆ خوادانـانێن و، پـەروەردگار لـەهەموو کارێکی ناسایشتە دوورئەخەنەوە کوڕوکچ و هاوسەر وهاوبەش یۆئـەو دانـانێن، بەتەنهاو بێوێنەی دائەنێن .

﴿ وَلَهُ يَسْجِدُونَ ﴾ وەهەر بۆ پەروەردگاری تۆ سەرشۆڕئەکەن و سوژدەی بـۆ ئەبـەن لـەنوێژداو لـەجگەی نوێژداو پەرستن بۆ جگەی خواناکەن .

زانیان بیری جیاوازیـان هەیـە دەربـارەی سـوژدەبردن بـۆ خـوا لــەکاتی ئایەتـەکانی سوژدەدا ئایا پێویستە یان نا ؟ لای پێشەوا حەنەفی پێویستە سـوژدە بـردن لـەوجێگانـەدا. لای پێشەوا شافیعی و پێشەواکانی تر پێویست نیـە، بـەڵکو سـوژدەبردن چاکـەی زۆری تێدایە .

*************************

*******************

*************

# ﴿ سورەتی ئەلئەنفال ﴾

ژمارەی ئایەتەکانی (٧٥)ئایەتن. هەموو ئایەتەکانی لە مەدینە هاتونەتە خوارەوە، جگە لە ئایەتی (٣٠) هەتا کۆتایی ئایەتی (٣٦) لەمەکە هاتونەتە خوارەوە.

پێشەکی: موسڵمانان بوبەئاژاوەیان لەنێو خۆیانا لەبارەی دەست کەوت و تالآنی رۆژی ( بەردەوە ) چۆن بەش بکرێ؟ چ کەسێ ئەو دەست کەوتەی بدرێتێ ؟ بە کۆچ کەرانی مەککە بدرێ یا بەیاریدەرانی مەدینە، بەلاوانی جەنگ بدرێ یا بەپیرو پاسەوانەکان. ئەگێڕنەوەلاوەکانیان بەپەلە وبەچالاکی چونە نێو جەنگەوە (٧٠) کەسیان لەبێ باوەڕانی قورەیش کوشت و (٧٠) کەسیان لێ بەدیل کردن؟ لەپاشا داوای تالآنەکەیان کرد ئەوتالآنەیش زۆر کەم بو، پیرەکان و پیاوە بەڕێزەکان ئەوانەی کەلەلای پەیداخەکە بون ووتیان: ئێمە پشتیوان و پارێزەری ئێوەبووین. کۆمەڵێ‌تریش لەپیاوماقوڵان لایەنی پیرەکانیان گرت. بۆ ئەو مەبەستە ئەم ئایەتانەی دوایی هاتنە خوارەوە. پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەیەکسانی تالآنەکەی بەش کرد بەسەریانا. بەبێ جیاوازی نێوان پیرو لاوو جەنگ کەر، بەبێ‌جیاوازی نێوان کۆچ کەران و یاریدوران، هەربەوشێوەیە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ دەست کەوتی بەش ئەکرد بەسەریانا هەتا ئایەتی (٤١) ی ئەم سورەتە هاتە خوارەوە، دوایی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەگوێرەی فەرمانی ئەوئایەتە تالآنی بەش کرد، ڕون کردنەوەی مانای ئەو ئایەتەو چۆنیەتی بەش کردنی دەست کەوت بەڕوونی و بەشی کراوەیی لەو کاتەدا باس ئەکرێ .

لەبەرئەوەی بەش کردنی تالآن و دەست کەوت پەیوەندی بەجیهانەوە هەیە، دارایی جیهانیش ئادەمیزاد ڕائەکێشێ بۆلای کردەوەی نالەبار و ڕەوشتی پەست و ڕەوشتی بەرزیان کەم ئەکاتەوە، هەر دارایی و لەوەڕی جیهانە خزمانی نزیك لەیەك ئەکەن و کۆمەڵانی دۆستی یەکتری پەرتەوازە ئەکەن و ڕق و کینە لەدەرونیانا ئەڕوێنێ و پەیدای ئەکا، بۆیە خوا فەرموی:

﴿ بِسْمِ اللهِ الْرَحِمنِ الرَحْيْمْ ﴾

**بەناوی خوای گەورەو میهرەبان**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾

﴿ يَسْأَلُونَكَ عَنْ الآنْفالِ ﴾ هاوڕێکانت لـەبارەی بـەش کردنـی ئـەو تـالأن و دەسـت کەوتانەی لـەبێباوەڕانی ئەگرن پرسیار لـەتۆ ئەکەن بەچ کەسێ ئەدرێ ؟

ووشەی (النَفَلُ) بەلای شافیعیەکانەوە بەو دارایيە ئـەوترێ جگـەی دەسـت کـەوت و تالأنبێ پێشەوای جەنگ بڕیاری ئەدا بۆ کەسێ بەگوێرەی بیرو بۆچونی خـۆی لـەجـەنگدا ئازاوکارامە بێ و خۆی بنوێنێ، یابڕیاری ئەدا بۆ کەسێ هێزی دوژمن لاوازبکا لـەگەرمەی جەنگدا ئەڵێ، ئەم ئەندازە داراییەتان ئەدەمێ ئەگەر ئەوکارانەتان کرد، ئیتر ئەوئەندازەیـە لـەتالأنی لـەوەوبەربێ یا لـەمەوپاش بگیرێ. لای مالیکیـەکان ئـەنفال بریتیـە لـەشـتێ بـەبێ

جەنگ بگیرێ. لای حەنەفیەکان بریتیە لەوەی هەرکەسێ بێ باوەڕێ بکوژێ کەل و پەلەکەی بۆ خۆیەتی یاشتێ بەدەست بهێنێ هی خۆیەتی .

﴿ قُلْ الانفالُ للهِ وَالرّسُولِ ﴾ تۆ لەوەلاّمیاندا بلّێ:کاروباری بەشکردنی تالاّن و دەست کەوتەکان ئەگەڕێتەوە بۆ خواو بۆ فروستادەی خوا لەجۆری بەشکردنیانا و بەهەرکەسی بدەن .

﴿ فَاتّقُوا اللهَ وَأصْلِحُوا ذاتَ بَيْنَكُمْ ﴾ دوایی ئێوە لەخوابترسن و خۆتان بپارێزن لەئاژاوەو دووبەرەکی و، ئێوە چاکە بسازێنن لەنێوان خۆتانا بەدادپەروەری و یارمەتی دانی یەکتری و سەرشۆری فەرمانی خواو پێغەمەربن و بۆ تالاّنی ئاژاوە مەڕەخسێنن .

﴿ إن كُنْتُمْ مُّؤمِنينَ ﴾ ئەگەر ئێوە باوەڕداری تەواون و لەهەڕەشەی خوا بترسن و بەتەمای پاداشتی خوابن و دۆستی یەکتری‌بن و ئاژاوە مەسازێنن بۆ بەش کردنی دەست کەوت، لەپاشا خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە کە موسلّمانی ڕاست ئەو کەسانەن کە خۆیان برازێننەوە بەم شێوانەی خوارەوە:

١- ﴿ إنَما الْمُؤمِنُونَ الّذيّنَ إذا ذُكِرَ اللهُ وَجِلَتْ قُلُوبِهِمْ ﴾ بەڕاستی باوەڕدارانی تەواو کەسانێکی ئەوتۆن کاتێ ناوی خوا برابێ لایانا دلّیان خورپەی پێ کەوتوە و ترساون لەبەرێز وگەورەیی خواو دەستەلاّتی بێ پایانی. کەواتە ترساندن لەخوا هەرگیز جوێ نابێتەوە لەباوەڕداران لەکاتی ناوبردنی خوادا و لەترسی گەیشتن بەخواو بەپرسیار و سزای خوا ، بەئاواتی بەزەیی و میهرەبانی خوا دلّیان پەیوەستە .

٢- ﴿ وَ إذاتُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آياتِهِ زادَتْهُمْ إيْماناً ﴾ وەهەرکاتێ خوێنرابێتەوە بەسەربانا ئایەتەکانی قورئان ،ئەو ئایەتانە باوەڕهێنانەکانیانی زۆرتر و پتەوتر ئەکردو ئارام گرتر ئەبون، گومان ودووبەرەکی ڕوویانی تێ‌نەئەکردن .

٣- ﴿ وَعَلى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ وەلەسەر پەروەردگاری خۆیان پشت بەستن و بەیاخ هەر بەخوا ئەدەن، هەمو کاری خۆیان هەوالّەی لای پەروەردگاری خۆیانی ئەکەن و هەر لەخوا ئەترسن وپشت بەدەست کەوت و تالاّن نابەستن .

بۆ زانین: پشت بەستن بەخوا تەنها هەر بەزمان نیە کەئادەمیزاد بڵێن: ئێمە بڕوامان بەپەروەردگاری ڕۆزی دەری خۆمان هەیە بەتوندی. بەڵکو پێویستە لەسەریان کۆشش بکەن و خۆیان ماند وبکەن بەگوێرەی فەرمودەی خوا لەسنور دەرنەچن کۆششیان بۆ پاداشتی پاشەڕۆژ زۆرتربێ و بۆپەیداکردنی دارایی و سامانی جیهان بەگوێرەی پێویستبێ، ئەو کردەوانە بەوجۆرەبێ ئەو پەڕی پەرستنی خوایە. ئەبێ‌بزانین باوەڕبون بەخوا تەنها بۆ ئەوە نیە کەگەنم و برنج و شتی ترمان بۆ ببارێنێ و ڕزگاریشمان بکا لەنەخۆشی، ئەوباوەڕە بەوجۆرەبێ ڕاست نیە، خوا نایبارێنێ، خوای مەزن بۆیە دەست و قاچ وئەقڵی پێداوین کاربکەین و گەنم و جۆو برنج و دەرمان پەیدابکەین. بەڵام ئەوەندە هەیە ئایینی توند و ڕاست خۆشەویستی ڕێك و پێك ئەڕوێنێ لەدڵی ئادەمیزادا بۆ یەکتری، نەك گەنم و برنج و دەرمان کەبەزۆری ئاژاوەیان بۆ ئەسازێنێ، هەروەها زانین و زانیاری ڕۆزی و دەرمانمان بۆ سەوزناکا. بەڵام ئەوەمان بۆ ئەکەن چۆن دانەوێڵە بچێنین و دەرمان دروست بکەین، ئایینی ڕاستەقینەو ڕاست هانمان ئەدا بۆ زانین و زانیاری وفێرنەبونیان تاوانی گەورەیە. خوای مەزن سزای ئەو کەسانە ئەدا زانین بەکاربهێنن بۆ تاڵان و دوژمنایەتی بۆ دانیشتوان، پوختە ئایین فێرمان ئەکا هەروەك ئادەمیزاد بەبێ‌نوێژ و ڕۆژ و ناژین بەبێ پەیدا کردنی گەنم وجۆو دەرمانیش ناژین، نابێ بەتەمەڵی دابنیشین و پێویستە هەوڵی پەیداکردن و بەجێ هێنانی هەمویان بدەین .

٤- ﴿ الَّذِيْنَ يُقِيمُونَ الصَّلاةَ ﴾ باوەڕداری تەواو کەسانێکی ئەوتۆن نوێژەکانیان ڕائەوەستێنن بەوجۆرەی فەرمانی پێدراوە بەسنورێکی دیاری کراو لەمەرج و پایەکانی بێ‌کەم و کوڕی .

٥- ﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ وەبەهەندێ لەوشتەی ئێمە پێمان بەخشیوون کردومانە بەڕۆزی بۆیان ئەیدەن بەهەژاران بەزەکات کەپێویستمان کردووە لەسەریانلەپەرستنی خوا، دڵیان بەدەست کەوت و تاڵان وسامانەوە نەبەستراوە .

بۆ زانین: پشت بەستن بەخواو باوەڕهێنان وترسانی دڵ شێوازی دڵن، نوێژو زەکاتیش کردەوەی لەشن، نوێژو زەکات بەرهەمی باوەڕهێنانن بەخواو ترساندن لەخواو پشت

بەستن بەو. کەواتە نوێژ ورۆژ و لەباوەڕەوە پەیدائەبن. بەتەنها ئادەمیزاد ناگیڕن بەباوەڕداری ڕاستەقینە .

﴿ أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ﴾ ئەو کەسانەی ئەوتۆ ئەو پێنج شتانەی تێدابن هەر ئەوانەن باوەڕیان هێناوە بەباوەڕهێنانی ڕاست و بێگومان، باوەڕهێنان بەکارو بەکردەوە دەرئەکەوێ نەك بەگفتوگۆو زمان و وێژە .

﴿ لَهُمْ دَرَجَاتٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ بۆ ئەو باوەڕدارانە هەیە لەلای پەروەردگاری خۆیان چەندین پلەوپایەو لێی خۆشبون لەخراپەکانیان و ڕۆزی وسامانی پاك وبێگەردو ڕەوا بەبێترس و ببم. پلەو پایەدانی خوا بەباوەڕداران زۆربن یاکەم بەهۆی خۆبەخت کردن و بەکوشت دانی خۆیانە لەرێگەی خوادا، لەوپلەیە بەرزتر دادپەروەری سازکردنی هەرزانیە و سود گەیاند نەبەئادەمیزاد و خۆماندوکردنە هەتا ئادەمیزاد بەخۆشی کامەرانی و بەختیاری و سەربەستی بژین لەژێر سێبەری ئاسایش و دادپەروەریدا و ڕەخساندنی هەرزانی بۆیان، بەوانە هەمو ڕۆزی پاکتریان دەست ئەکەوێ کەبریتیە لە بەهەشت.کاروانێکی قورەیش لەشامەوە گەڕایەوە بۆ مەکە باروبارخانەی زۆری شارو بەرەیان پێ بوبەسەرۆکایەتی ئەبو سوفیان بەهاورێتی چل سواری تر، لەوکاتەدا جبرەئیل پێغەمەری ئاگادارکرد بەوڕوادوە، پێغەمەریش ﴿ ﷺ ﴾ هەواڵی دا بەموسڵمانان و فەرمانی پێدان دەرچن ورێگەیان لێبگرن، فەرموی: هیوام وایە خوای مەزن دارایی وسامانی ئەوکاروانەتان پێ ببەخشێ، هەندێ لەموسڵمانان زۆریان پێخۆشبوودەرچون و ڕێگەیان پێبگرن. هەندێ تریان لایان گرانبوو سستیان ئەکرد بۆ دەرچون، پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ چوە دەرەوە گوێی نەدایە بیانو هێنانەوەیان، لەگەڵ (٣١٣) کەس لەهاوەڵەکانی، بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو مەبەستە خوا فەرموی:

كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ﴿٥﴾

يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ﴿٦﴾ وَإِذۡ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحۡدَى ٱلطَّآئِفَتَيۡنِ أَنَّهَا لَكُمۡ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيۡرَ ذَاتِ ٱلشَّوۡكَةِ تَكُونُ لَكُمۡ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقۡطَعَ دَابِرَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧﴾ لِيُحِقَّ ٱلۡحَقَّ وَيُبۡطِلَ ٱلۡبَٰطِلَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٨﴾

﴿ كَما أخرَجَكَ رَبّكَ مِنْ بَيْتِكَ بِالَحقِ ﴾ مژدەدانی خوا بەباوەڕداران کەچەندین پلەو پایەیان ئەداتێ ڕاست وبێگومانە، بەوێنەی ئەوەی پەروەردگاری تۆ تۆی لەخانەی خۆت کەمەدینەیە دەری‌کردی بۆ جەنگ کردن و ڕێگەگرتن لەکاروانی قورەیش هەرچەندە هەندێ لەباوەڕداران لایان ناخۆش بوە، هەندێ لەزانایان بەم جۆرە مانای ئەوڕستانەیان کردوە :

جەنگ کردن ڕاستە ، بەوێنەی دەرکردنی پەروەردگاری تۆ لەمەدینە بەڕاستی هەرچەندە تاقمێ لایان ناخۆشە چونە دەرەوەی تۆ بۆ ڕێگەگرتن لەکاروانی قورەیشەکان. زانایان لەماناکردنی ئەوڕستانەدا سەرگەردانن، بەجۆرێ خاوەنی تەفسیری (البحر المحيط) پازدەمانای بۆ کردوە، ئەوەی ڕاستی بێ مانای زۆری بۆ کراوە، بەلاّم ئەو دوومانایە زۆرچاکن .

﴿ وَإنَ فَرِيْقاً مِنَ الُمؤمنْينَ لَكارهِينَ ﴾ وەبەڕاستی کۆمەڵێ لەباوەڕداران دەرچوونی تۆیان پێ ناخۆش بوو، هەر جەنگ کردنیان پێ‌ناخۆش بوو، بۆیە شاراوەی دەرونی خۆیان دەربڕی. بەلاّم چونە دەرەوەیش بۆ ئەوان سوودی زۆرتربوو .

یانی کاتێ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ویستی لەمەدینە دەربچێ بۆ گرتنی کاروانی قورەیش تاقمێ لەباوەڕداران لایان قورس وگران بو، ووتیان: ئێمە توانای جەنگی قورەیشمان نیــە، دوای چونەدەرەوە لەگەڵ پێ ناخۆشبونیشــیان چونــە دەرەوە لەگــەڵ تاقمەکــەی تــردا کــەپێیان نــاخۆش نــەبو چونــەدەرەوە، لەناوەڕاســتی ڕێگــەدا پێغەمــــەر ﴿ ﷺ ﴾ هــەواڵی زانــی کەقورەیشیەکان هاتونەتە دەرەوە بۆ کۆمەکی کردن بــەو کاروانــە، پرســی بــەهاوڕێکانی کرد بچین بەسەرکاتی جەنگەوە یابچینەوە بۆ مەدینە هەندێکیان جەنگ کردنیان لاناخۆش بو، ووتیان دەرچونی ئێمە بۆ ڕێگەگرتن بوو بەوکاروانە، زۆربــەیان ووتیــان ئێمــە ئــەچین بەسەر کاتی جەنگەوە بەپەنای پیرۆزکردنی خوای مەزنین . لەپاشا هەمویان چوون بــەلای جەنگەوە. ئەو ئایەتە دەری خست کە هاوڕێکــانی پێغەمــەر ﴿ ﷺ ﴾ لــەوباوەڕەوە بــوون بەدووبەشەوە، هەریەکەیان بەهەڵوێستێکەوە .

﴿ يُجادِلُونَكَ فِيْ الْحَقِ بَعْدَما تَبَيَنَ ﴾ ئەو تاقمە گفتوگۆی بەرزو کێشــەیان لەگــەڵ تــۆ ئەکرد لەڕاستی هــەڵبژاردنی جــەنگ لەلایــەن تــۆوە کەســودی زۆری تێدابــوو، ئــەوان کاروانەکەیان هەڵبژارد لەبەر دارایی زۆرو کەمی پیاوان لەگەڵ ئەوکاروانە لەپاش ئەوەی ڕوون بویەوە ڕاستیو هەرشتێ تۆ فەرمانی پێبدەی ڕاستە و خــوا لەمــەوپاش بــاوەڕداران سەرئەخا .

﴿ كَأَنَما يَساقُونَ إِلى المَوتِ وَهُمْ يَنْظُرونَ ﴾ جەنگیان ئــەوەندە لاگرانبــوو وەك ئــەوەی بینێرن بۆلای مردن و ڕاپێچ بکرێن بۆلای مردن و، ئــەو تاقمــە تەماشــای مــردن و هــۆی هاتنی مردنیان ئەکرد لەبەرکەمی خۆیان و زۆری ژمارەی بێباوەڕان .

پرسیار/ موسڵمانان بەگشتی پیاوانی جەنگاوەری بەدریان نرخاندوە و ڕێزی زۆریان بۆ داناون و پلەی بەرزیان داونەتێ کەچی ئەبینرێ قورئان بەئاشکرایی سەر زەنشتیان ئــەکاو باسی نائازاییان ئەکا بەوبۆنەوە گفتوگۆی بەرزیان لەگەڵ پێغەمەر ئەکرد وەك باسمان کرد، لەگەڵ ئەوەیشدا ڕاستیان بۆ ڕوون بوبوەوە بــەهاتنی ســروش و هــەواڵدانی پێغەمــەر بــەو ڕاستیە ؟

وەلاّم/ ئەو ڕوداوە بەوجۆرە لەپلەی ئەوان کەم ناکاتەوە، خراپە یەبەباوەڕیان ناگەیەنیّ، چونکە ئەوان ئادەمیزادن و دەرونیان ئەکەوێتە لەرزەوەکە. نیشانەو هۆی مردن ببینن بائەوپەڕی باوەڕیان هەبیّ، ئەوەبو تەم و دووکەڵ لەدڵیانا نەماو ئازایی ڕوی تیّکردن، زۆر بەخۆشیەوە بەرەومردن چون و جەنگیان کرد .

﴿ وَإذْ يَعُدُكُم الله إحدى الطائِفَتَيْنَ انَّهالَكُمْ ﴾ وەئێوەی باوەڕدار بیری ئەوکاتە بکەنەوە کەخوا بەڵێن و موژدەی دابەئێوەیەکیّ لەو دووتاقمە بەڕاستی بۆ ئێوە ئەبیّ یاسەرکەوتن بەسەر قورەیشیەکاندا بەبیّ کاروانەکە یا کاروانەکە بەبیّ سەرکەوتن بەسەریانا .

﴿ وَتَوَدُونَ أنَّ غَيْرَ ذاتِ الشَوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ ﴾ وەئێوە پێتان خۆشە کەجگەی هێزو شکۆ بۆ ئێوەبیّ کەبریتیە لەکاروانەکە، چونکە چل سواریان لەگەڵ بو، کەل وپەلی بازرگانی ئەبو بەدەسکەوت بۆیان. بەلاّم تاقمی ئەبوجەهل لەمەکەوە هاتبون بەهێزبوون، هەزار سواربون بەسەرۆکایەتی ئەبوجەهل، بۆیە پێیان ناخۆشبوو ڕوبەڕویان برۆن .

﴿ وَيُريرِيْدُ الله أنْ يَحِقُ الْحَقَ بِكَلِماتِهِ وَيَقْطَعَ دابرَالْكافِرِيْنَ ﴾ وەخوا ئەیەویّ دەری بخاو پایەداری بکا ڕاستی بەهۆی فەرمودەکانی خۆیەوە کەفەرموی: بەڕاستی یەکیّ لەودوو تاقمە بۆ ئێوە ئەبیّ و ئایینی پیرۆز ئیسلام سەربکەویّ و، خوا بنەبڕی بکا دواهەمین کەسی بیّباوەڕان. یانیّ ئەی موسڵمانان: ئێوە ئەتانویست کالاّو لەوەڕی جیهان، خوائەیەویّ ئێوە سەربخا بەسەر سەرۆکایەتی قورەیشدا کەدوژمنی خواو ئێوەن، ئێوە ئەوان لەناوبەن و کەسیان نەمێنیّ بەهۆی هێزو بازوی خۆتانەوە، بەوموژدە یە سەرکەوتنی ئێوەبێتەدی، دوایی کامیان چاکبو ؟ سەرکەوتن یاژێرکەوتن؟

﴿ لِيُحِقَ الْحَقَ وَيَبْطُلَ الْباطِلَ وَلَوْ كَرَهَ الْمُحْرِمُونَ ﴾ خوا بنەبڕئەکا بیّ باوەڕان لەبەرئەوەی خوا پایەداربکا ڕاستی وئاشکرای بکا ئەو ڕاستیە کەئایینی ئیسلامەبەکوشتنی بیّباوەڕان و، خوا پوچی بکاتەوە بیّباوەڕی و نەی هێڵی و، بالایان ناخۆشبیّ سەرکەوتنی ڕاستی و ئایینی ئیسلام تاوانبارانی قورەیش و لایان خۆش نەبیّ نەمانی بیّباوەڕی. کورتە ژیانی پێغەمەر و ڕوداوی جەنگی (بەدر ): پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ کرابەپێغەمەر لەتەمەنی چل

ساڵیدا. لەمەکە مایەوە دوای بونی پێغەمەر (١٣) ساڵ لەپاشا کۆچی کرد بۆ مەدینە ڕۆژی دووشەممە (١٢) ڕەبیعی یەکەم چوە نێومەدینەوە، (١٠) ساڵ مایەوەو کۆچی دوایی کرد لەتەمەنی (٦٣) ساڵیدا ڕۆژی دووشەممە (١٢) ی مانگی ڕەبیعی یەکەم، کاتێ لەمەدینە جێگیربو تاقم تاقم هاوڕێکانی ئەنارد ڕێگە بگرن لەکاروانی بت پەرستان، بۆ ئاگاداربوون لەهەواڵیان و تێك دانی ئاسودەیی ئەوان، پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ سەرۆکایەتی (٢٦) جەنگی کردوە و لە (٩) جەنگدا خۆی جەنگی کردوە. لێرەدا ئێمە ئاماژە دەکەین بۆ دەرچوونی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بۆ جەنگی بەدر، لەوجەنگەدا بۆ یەکەمین جار هێزی موسڵمانان دەرکەوت، بەرپێچی هێزی بت پەرستانی دایەوە کەلەماوەی (١٣)ساڵدا ئازاری زۆری مەسڵمانیان ئەدا، وەك باسمان کرد ئەبو سوفیان لەشامەوەگەڕایەوە بەکاروانێکی گەورەوە داراییەکی زۆری قورەیشیەکانی پێبوو ، هەندێ لەوسامانەی موسڵمانەکانی تێدابوو قورەیشیەکان دەستیان بەسەرداگرتبو، دوایی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ هاوڕێکانی خۆی کۆکردەوە و هانی دان ڕێگەبگرن لەوکاروانە، لە(١٧)ی مانگی ڕەمەزانداو ساڵی دووهەمی‌کۆچی چونە دەرەوە، بەدڵی موسڵماناندا نەئەهات توشی جەنگێکی گەورەی وابن کاریگەربێ لەژیانی ئیسلام و موسڵماناندا، جوەکانی مەدینە کەسێکیان نارد ئاگاداری ئەبوسوفیان بکا، دوایی ئەبوسوفیان داوای کۆمەکی کرد لەقورەیشیەکان، ئەوەی توانای چەك هەڵگرتنی بو لەمەکە هاتنە دەرەوە، موسڵمانان بەرەو بەدر ئەڕۆین، بەڵام ئەبوسوفیان ڕێگەی گۆڕی بۆلای کەناری دەریای سور، موسڵمانان بە (٣١٣) کەسەوە بەرانبەر زۆرتر لە (١٠٠٠) کەس لەبت پەرستان دەستیان دایە جەنگ (٧٠) کەسیان لەبت پەرستان کوشت و (٧٠) کەسیان لێبەدیل گرتن و ئەوانی تریان هەڵهاتن، (١٤) کەس لەموسڵمانان کوژران و کەسیان بەدیل نەگیرا، دوای ئەوجەنگە کاری موسڵمانان گۆڕا لە بێ هێزیەوە بۆلای هێزو شکۆی بەرزوبالاٌتربو.

إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ

مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُرۡدِفِينَ ﴿٩﴾ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ
وَلِتَطۡمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمۡۚ وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ
عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ إِذۡ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةٗ مِّنۡهُ وَيُنَزِّلُ
عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذۡهِبَ عَنكُمۡ رِجۡزَ
ٱلشَّيۡطَٰنِ وَلِيَرۡبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمۡ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلۡأَقۡدَامَ ﴿١١﴾
إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمۡ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ
سَأُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ
ٱلۡأَعۡنَاقِ وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ ﴿١٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ
شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ ٱللَّهَ
شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿١٣﴾ ذَٰلِكُمۡ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلۡكَٰفِرِينَ
عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٤﴾

﴿ إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ ﴾ ئێوەی باوەڕدار بیری ئەوکاتە بکەنەوە ئێوە داوای فریاکەوتن و سەرکەوتن ئەکەن لەپەروەردگاری خۆتان، لەوکاتەدا کەچارەتان نەماو زانیتان ئەبێ هەربچن بۆ جەنگ کردن لەگەڵ قورەیشیەکاندا. کاتێ خوای گەورە زانیبوی کەباوەڕداران ڕاست ئەکەن و نیازیان پاکە هەواڵی پێدان لەسەرزمانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ کەپارانەوە کەم لێ وەرگرتن، ئەوەتە ئەفەرموێ:

﴿ فَأَسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِي مُمِدُكُمْ بألفٍ مِنَ المَلائِكةِ مُرْدِفِيْنَ ﴾ دوایی خوا وەڵامی ئێوەی دایەوە و پارانەوەکەی لێ وەرگرتن کەبەراستی من یاریدەی ئێوە ئەدەم بەهەزار کەس لەفریشتەکان دێن هەندێکیان لەدوای هەندێکتریانەوە، ئەوەستن لەبەردەمتانەوەو لەپشتانەوە جەنگ ئەکەن لەگەڵتان و تواناتان بەهێز دەکەن و هانتان ئەدەن بۆ جەنگ کردن، خوای مەزن لەم ئایەتەدا ئەفەرموێ: من یاریدەی ئێوە ئەدەم بەهەزار کەس لەفریشتەکان لەئایەتی (١٣٤) ی ئالی عیمراندا ئەفەرموێ: بەسێ هەزارکەس. لەئایەتی (١٣٥) سورەتی ئالی عیمراندا ئەفەرموێ: بەپێنج هەزار کەس. بە چ جۆرێ ئەو سێ ئایەتە ناوەڕۆکیان یەك ئەگرن و ماناکانیان دژی یەکتری نابن ؟

لەوەڵامدا ئەبێژرێ: لەباسی ماناکردنی ئەودووئایەتەی ئالی عیمراندا وەڵامی ئەوپرسیارە دراوەتەوە ، بڕۆن و سەیر بکەن وتێبگەن .

﴿ وَما جَعَلَهُ اللهُ إلا بُشرى وَلِتَطْمَئِنَ بِهِ قُلوبَكُمْ ﴾ وەخوا ئەویاریدان و هاتنی فریشتانەی نەگێڕاوە مەگەر مەژدەدانە بەسەرکەوتنی ئێوەو، بۆئەوەیش ئێوە دڵتان ئارام بگرێ و ئاسودەبێ بەهۆی کۆمەکییەوەو خۆتان ڕابگرن لەجەنگدا، پێویستە ئێوە پشت بەستن بەخۆتانەوە نەك تەنها بەوفریشتانە، هەمو کۆششی خۆتان بخەنەگەڕ بۆ سەرکەوتنی خۆتان بەهۆی باوەڕی بەهێزو بازوی خۆتانەوە .

﴿ وَما النَصْرُ إلا مِنْ عِنْدِاللهِ إنَّ اللهَ عَزِيزٌ حَكِيْمٌ ﴾ وەسەرکەوتن نابێ بەهۆی فریشتەکان بۆئێوە مەگەر لەلایەن خواوە ،نەك بەهۆی ماندوی خۆتان و بەیاریدانی فریشتەکان. بەڕاستی خوا زۆر بەدەسەڵاتە و دۆستی خۆی سەرئەخا، هەمو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆی دائەنێ، ژێرکەوتن ئەسازێنێ بۆ لەناوبردنی دوژمنانی خۆی وموسڵمانان و بۆ سەرکەوتنی موسڵمانان و دۆستانی خۆی .

لەپاشا خوای مەزن باسی شەش جۆرە چاکەی خۆی ئەکا بەسەر موسڵمانانەوە بەم شێوانەی خوارەوە:

١- ﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ النعاسَ أَمِنَةً مِنهُ ﴾ ئێوەی هاوڕێکانی پێغەمەر بیری ئەوکاتە بکەنەوە خوا ڕژاندی بەسەرئێوەدا و وەنەوزو خـەوێکی سـوك لەبەرئاسـایش.نـەمانی ترسـی ئێـوە لەلایەن خۆیەوە، موسڵمانان ترسان لەزۆری نەفەرەکانی بێباوەڕان، خوائەوترسەی لابرد لەسەریان بەهۆی ئەو وەنەوزەوە، کاتێ بێداربونەوە ئـارامی دای پۆشـین و خۆشییان بـۆ پەیدابو، بەڕاستی خەو ئازارو ترس نایەڵێ .

٢- ﴿ وَيَنَزِّلَ عَلَيْكُمْ مِنَ السَماءِ ماءً لِيُطَهِرَكُمْ بِهِ ﴾ وەخوا ڕژاندی بەسەرئێوەدا ئـاوێ لەئاسمانەوە لەبەرئەوەی خوا ئێوە پاك بكاتەوە بەهۆی ئەو ئاوەوە لەبێ دەسـت نوێـژی و لەلـەش پیسی و لەچڵکی لەشتان. یانێ پاش ئەوەی بەشێ لەئاسایشیان وەرگرت بـەهۆی ئەو وەنەوزەوە دەرونیان ئارەزووی ئاویان کرد، چونکە باوەڕداران لـەبیرەکانی بـەدرەوە دووربون، خوای مەزن ئەو بارانـەی بۆنـاردن بـۆ خواردنـەوەیان و بـۆ پـاك کردنـەوەی لەشیان .

٣- ﴿ وَيُذهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَيْطانِ ﴾ وەخوا لای برد لەئێوە بێز لێ کراوەی لـەش و دەرونتان لەبێ دەست نوێژی و لـەش پیسـی و دوودڵـی و گومـان و ترسـێ لەشـەیتان پەیدایان ئەکا، خوا بەهۆی ئەو وەنەوزو یاریدانەی خۆی گومانی شەیتانی لابرد .

٤- ﴿ وَلِيَرْبطَ عَلى قُلُوبِكُمْ ﴾ وەبۆ ئەوە خوابەستێ بەسەر دڵی ئێـوەوە ئومێـدەواری وسەرکەوتن و بڕوای بێگومـان بەنەهێشـتنی تـرس و دڵـەخورپێتان بـەهۆی میـهرەبانی و گەورەیی خواوە .

٥- ﴿ وَيُثَبِّتَ بِهِ الاقْدامَ ﴾ وەهەتا خوا ڕای بووەستێنێ بەهۆی ئـەو بارانـەوە پـێ و قاچی ئێوەو ڕۆنەچی لەنێو لەمدا ئەو ڕستەیە لەوەوە هاتوە ئەو جێگەیە موسڵمانانی تێـدا بوو لم و خۆڵی وردبو، قاچیان ئەچوە خوارەوە کاتێ ئەو بارانە بـاری ئـەو لمـەی پێکـەوە نوساندو قاچیان دا نەئەچوو .

٦- ﴿ إِذْ يُوصِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلائِكَةِ إِنِّي مَعَكُمْ ﴾ موحەمەد تۆ بـیری ئەوكاتـە بكـەرەوە پەروەردەگاری تۆ سروشی نارد بۆلای فریشتەكان كەبەڕاستی من لـەگەڵ ئێوەی فریشتە م بۆ كۆمەكی یاریدانتان بۆ چەسپاندنی هێز لـەدەرونی موسـڵمان و هاندانیان .

﴿ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ دووایی ئێوەی فریشتە بەهێزبكەن كەسانێكی وئـەتۆ باوەڕیـان هێناوە، دڵیان بدەنەوە بەموژدەدان بـەوان بـەوەی سـەرئەكەون بەسـەر بـت پەرسـتاندا وفریشتەكان لـەپێشەوەی باوەڕدارانـەوە لـەوێنـەی ئـادەمیزادا ئەڕۆیشـتن و ئـەیان ووت: موژدەبێ ئێوە سەرئەكەون، بەوبۆنەوە باوەڕداران هورەیان بەرزبویەوە، دوژمنانیان ترسیان لێپـەیدابوو لـەبـەرچاویاندا ژمـارەی بـاوەڕداران زۆربـوون، هـەندێ لـەزانایان ئـەڵێن: فریشتەكانیش جەنگیان لـەگەڵ موسـڵماناندا كردوە .

﴿ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ ﴾ من ئەخەمە دڵی كەسانێكی ئەوتۆ باوەڕیـان نەهێناوە ترس و بیم لـەموحەمەد وموسـڵمانان و هورەیان ئەبەم.

﴿ فَاضْرِبُوا فَوقَ الاعناقِ ﴾ دوایی ئێوەی باوەڕدار بەشمشێر بدەن لـەسەرەوەی ملیان و لـەجێگـەی كوشـندەیان. هـەندێ لـەزانایان ئـەڵێن: ئەوڕسـتەیە ڕوی پێـئـەكرێ بـۆلای فریشتەكان .

پرسیار/ بەچ جۆرێ فریشتەكان هاوبەشی موسـڵمانانیان كـرد لـەجـەنگدا و یارمـەتی ئەوانیاندا لـەجەنگی بەدردا بەكوشتنی بێباوەڕان بو یابەلێدان یاموسـڵمانیان هـان ئـەدا و هورەیان بەرز ئەكردنەوە بەبێ كوشتن و بـەبێ لێـدان وئـەیان ووت: موسـڵمانان ئـازابن بێگومان سەرئەكەون .

وەڵام/ لـەوئایەتەدا خوای مەزن هەواڵێ داوە كەفەرمانی داوە بەفریشتەكان باوەڕداران بەهێزبكەن و هورەیان بەرزبكەنەوە. بەبێگومان ئەوانیش فەرمانەكەی خوایان بەجێ هێنا، موسڵمانانیش هێزیان پەیدا ئەكرد و هورەیان بەرزبویەوە، فریشتەكان لـەشێوەی ئـادەمیزاد ئەهاتن وئەڕۆیشـتن بەبـەردەمی جـەنگاوەرانی باوەڕدارانـا و هانیـان ئـەدان بـۆ جـەنگ. دوژمنانیشیان ترسی زۆركەوتە دڵیان، چونكە خوا موژدەی دا بەسـەركەوتنیان و بـەڵێنی

خوایش هاتەدی و موسڵمانان سەرکەوتن، ڕوواڵەتی دەرکەوتوی دەقی مانای ئایەتەکان بەوشێوەیە نیشانی ئێمەی داوە . بەڵام درێژەو شی کردنەوەی چۆنیەتی ئەو ڕوداوە لەکارە نهێنیەکانی خوایە، سروش بەجگەی باسکردنی بەوجۆرە ی پێشوو هیچ شتیتری ڕون نەکردوەتەوە. کەواتە چاك وایە ئێمەیش باوەڕمان بەو ڕوادوە هەبێ و بێ دەنگین لەدرێژەپێدانی. بێ دەنگبونی سروش بەڵگەی توندو تیژە لەسەر ئەوەی بڕوابون بە درێژەدانە پەیوەندی بەباوەڕەوە نیە، ئەگینا پێویستبو خوای مەزن بۆمانی ڕون بکردایەوە .

﴿ وَأضرِبوا كُل بَنانٍ ﴾ وەئێوەی باوەڕداران، یائێوەی فریشتە بدەن لەهەمو جومگەکانی دەست و قاچی بێباوەڕان و لەیەکیان بترازێنن .یانی هیچ هەلێ لەکیسی خۆتان مەدەن و چونتان بوجوتبو لێیان بدەن و پرش وبلاویان بکەن .

ڕستەی ( فأضْرِبُوا ) لەهەردوو جێگەکەدا فەرمان دانە بەموسڵمانان نەك بەفریشتەکان چونکە موسڵمانان مەبەستن لەجەنگدا، هەرچەندە هەندێ لەزانایان لایان وایە فەرماندانە بەفریشتەکان. بەڵام پێویستی سەرشانی ئێمە ئەوەیە بڕوامان بەو فەرماندانە هەبێ، ئیتر بۆ ئادەمیزاد بێ یا بۆ فریشتە گرنگ نیە .

﴿ ذلِكَ بِأَنَهُمْ شاقّوا اللهَ وَ رَسُولَهُ ﴾ ئەولێدان و ترساندن و سزادانە گرانەی بێ باوەڕان بەو سەختیە بەهۆی ئەوەوە بوو بێ فەرمانی و دژایەتی خواو پێغەمەریان کرد .

﴿ وَمَنْ يُشاقِقِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَأنَ اللّٰهَ شَديْدُ العِقابِ ﴾ وەهەرکەسێ بێ فەرمانی و دژایەتی و خواو پێغەمەری خوا بکا لەئاییندا بەهەر شێوەیە بێ، دوایی بەڕاستی زۆر سەخت و گرانە سزای خوا لەجیهاندا بەگروفتارکردن و بەلێدان وکوشتن و دیل کردن، لەپاشەڕۆژیشدا زۆر گرانترە ئەگەر پەشیمان نەبنەوەو باوەڕنەهێنن .

﴿ ذلِكُمْ فَذُقُوهُ وَأنَ لِلكافِرينَ عَذابَ النار ﴾ ئەو سزا گرانە ئامادەکراوە بۆتان، دوایی ئێوە بچێژن بەگورجی لەجیهاندا لەگەڵ ئەوەیشدا بەڕاستی بۆ بێ باوەڕان هەیە سزای ئاگری دۆزەخ لەپاشەڕۆژدا سەرباری ئەو سزای جیهانە ئەگەر باوەڕنەهێنن .

کاتێ خوای مەزن یاریدەی موسڵمانانی دا بەفریشتە، مـوژدەی دانـێ بەسـەرکەوتن و زاڵبونیان بەسەر بـت پەرستانا، لەمـەودوایش قەدەغەئـەکا لێیـان هەڵـهاتن و ڕاکـردن لەجەنگی بێ باوەڕانداو ئەفەرموێ :

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحۡفٗا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفٗا لِّقِتَالٍ أَوۡ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٖ فَقَدۡ بَآءَ بِغَضَبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأۡوَىٰهُ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٦﴾ فَلَمۡ تَقۡتُلُوهُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمۡۚ وَمَا رَمَيۡتَ إِذۡ رَمَيۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ وَلِيُبۡلِيَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡهُ بَلَآءً حَسَنًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿١٧﴾ ذَٰلِكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيۡدِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٨﴾ إِن تَسۡتَفۡتِحُواْ فَقَدۡ جَآءَكُمُ ٱلۡفَتۡحُۖ وَإِن تَنتَهُواْ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَإِن تَعُودُواْ نَعُدۡ وَلَن تُغۡنِيَ عَنكُمۡ فِئَتُكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَوۡ كَثُرَتۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٩﴾

﴿ ياأَيُها الَذينَ آمَنُوا إذا لَقيتُم الَذيْنَ كَفَرُوا زَحفاً ﴾ ئـەی کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕتـان هێناوە هەر کاتێ ئێوە توشتان بو بەتوشی کەسانێکی ئـەوتۆ باوەڕیـان نـەهێناوە ڕوبـەڕوی ئەوان بونەوەو لەئێوەی باوەڕدار نزیك بونـەوە لێـان و پـەلاماری ئێوەیـاندا ئـیتر زۆربـن یاکەم.

﴿ فَلا تُوَلُّوهُمُ الأدبارَ ﴾ دوایـی ئێـوە ڕووو وەرمـەگێڕن لـەوان و پشـتیان تێمەکـەن بەشکاوی و ڕوخـاوی هەڵمەیـەن، هەڵـهاتن هـۆی کزبوونـی ئـایینی خوایـە و خـواری موسڵمانان .

﴿ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ ﴾ وەهەرکەسـێ ڕوولـەبێ بـاوەڕان وەرگـێڕێ و هـەڵ بێ بەشکاوی و پشتیان تێ بکاو لەو ڕۆژەدا کەجەنگی بەدرە .

﴿ إلاّ مُتَحَرِّفاً لِقتالٍ ﴾ مەگەر ئەو وەرگەڕانە بۆ ئەوەبێ بگەڕێتەوە بـۆ جـەنگ کـردن دوای هەڵهاتن و مەبەستی سەرلێشێوانی دوژمن بێ و وابزانن موسڵمانان شـکاون، بـەو بۆنەوە بێ باوەڕان لەخۆیان بایی بن و کەمتەرخەمی ڕوویان تێ بکا .

﴿ أو مُتَحَيِّزاً الى فِئَةٍ ﴾ یامەگەر ئەوهەڵهاتنە بۆ ئەوەبێ خۆی بداتە لای کۆمـەڵێ لـە موسڵمانان بۆ یارمەتی دانیان لەکاتێکا ئەبینێ دوژمنـان هەڵمـەتیان بـۆ دێنـن و لـەوانەیـە ئەوتاقمە بشکێنن. بۆئەو دومەبەستە نەبێ هەڵهاتن قەدەغەیە .

﴿ فَقَد باءَ بِغَضَبٍ مِنَ اللهِ ﴾ دوایی بەڕاستی ئەوکەسـەی کـە هەڵـهاتووە ئەگەڕێتـەوە بەخەشمێکی زۆر گەورە لەلایەن خواوەو شایستەی خەشمی خوایە .

﴿ وَمَأْواهُ جَهَنَّمُ وَبِئسَ المَصيرُ ﴾ وەجێگـەی ئەوکەسـە دۆزەخـەو، خـراپ گەڕانەوەیەکە دۆزەخ بۆ جێگەی ئەوکەسە.

بەکورتی پێویستە خۆڕاگرتن بەرامبەر بەدوژمنانی ئایین لەجەنگداو هەڵنەیەن ،مەگـەر بـۆ ئـەوە خۆیـان بگەیـەنن بەجێگەیـەکی تـری چـاك بـۆ زالبـوون بەسـەر دوژمنـدا، یانەخشەیەکی باشتر دابنرێ بۆ ئەوەی بچـێ بـۆ لای تـاقمێ تـر لـەخۆیان کەلـەوانـە بـن دوژمن گەمارۆیان بدەن ئەگەر ئەوکەسە نەچێ بەدەمیانەوە، هەرکەسێ هەڵبێ بەبێ یەکێ لەو دوو هۆیانە شایستەی خەشمی خوایە .

بەڕاستی زانایـان بڕیاریـانداوە بـەگوێرەی ئـەو فـەرموودەی خوایـە بەقەدەغـەکردنی هەڵهاتن لەنیو سەربازەکاندا مەگەر ژمارەی لەشکریدوژمن زۆرتر بێ لەو دووچەنانـەی لەشکری موسڵمانان . بەڵام لەگەڵ فەرموودەی ئەو زانایانەیش پێویسـتە هـەموو کارێکی

جەنگ لەڕاکردن لە گەرمەی جەنگداو پاڵدان بەکۆمەڵێ ترەوە نابێ سەربەخۆ سەربازەکان بەو کارانە هەڵسن. ئەوانە هەواڵەی نەخشەی پێشەواو لێ پرسراوی جەنگە، نەوەك ببێتە هۆی بەرەڵلایی، ئەو لێ پرسراوەیش ئەبێ نەترس و ئازاو ئایین پەروەرو داد پەروەر بێ و خاوەن تەجروبەو تاقی کردنەوە بێ لەجەنگدا، پێویستە موسڵمانان با ژمارەیشیان کەمبێ یازۆر هەڵنەیەن ئەگەر لێ پرسراوی جەنگ ئەیزانی جێگە گۆڕکێ نەکەن و هەڵنەیەن بۆ جێگەیەتر بنەبڕ ئەبن و تاقیان نامێنێ لەوکاتەدا چونکە ڕاکردن و هەڵهاتن سوودی هەیە بۆ موسڵمانان هەڵهاتن دروستە وبگرە پێویستە، بەتایبەتی لەم سەردەمەی ئێمە کەدوژمن چەکی ئامادەکراوی زۆر نالەبارورِوخێنەرو کۆمەڵ کوژی ناهەمواریان هەیە بۆ لەناوبردن وبنەبڕ کردنی زینەوەران. بەتایبەتی ترلای هەندێ لەزانایان ناوەڕۆکی یاسای ئەو ئایەتە دەربارەی جەنگی بەدر بوە بەتەنها .

﴿ فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَكِنَّ اللهَ قَتَلَهُمْ ﴾ دوایی ئێوەی موسڵمان ئەو بێ باوەڕانەتان نەکوشتوە بەڵام خوا ئەوانی کوشتوە. هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەمەیە: موسڵمانان لەجەنگی بەدردا ئەوەبو سەرگەوتن بەسەر بێ باوەڕاندا، هەندێ لەبێ باوەڕانیان کوشت و هەندێکیان لێ بەدیل کردن، دوایی موسڵمانان نزیکبون لەخۆیان بایی بن، کەوتنە ئەوەی باسی خۆیان بکەن، هەندێکیان ئەیان ووت من فلانم کوشت، یەکێ تریان ئەیوت منیش فلانم کوشت، بۆیە خوای مەزن ئەوئایەتەی نارده خوارەوە هەتا بۆیان دەربکەوێ ئەو سەرکەوتنە ئەوان هەرخوا کردویەتی و دڵی ئەوانی بەهێز کرد، هەرخوا وای لێ کردن قاچیان زەوی بگرێ بەهۆی ئەو باوەڕانەوە، هەرخوا بو یاریدەی ئەوانی دا بەناردنی فریشتە، هەرخوا بو ترس و بیمی خستە دڵی بێ باوەڕان، ئەگەر خوای مەزن ئەوکارانەی نەکردایە بێ باوەڕان زاڵ ئەبوون بەسەریانان. کەواتە هەرخوایە ئەوان بکوژێ هەتا موسڵمانان سەربکەون .

خوای مەزن بۆ موسڵمانانی ڕونکردەوە: پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لەڕۆژی بەدردا مشتێ خۆڵی هەڵگرت و فڕەیدا بۆلای بێ باوەڕان هیچ کەسێ لەوان نەمایەوە ئەو خۆڵ و زیخەی بەرنەکەوێ و نەچێتە ناودەم و چاوولوتیانەوە، بەو بۆنەوە بێ باوەڕان سەریان لێ

شیواو موسڵمانان پەلاماریاندان، خوا بۆ هەمووکەسـێ دەرئـەخا ئـەوکارەی پێغەمـەریش هەرخوا کردویەتی و ئەفەرموێ:

﴿ وَما رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَكِنَ اللهَ رَمى ﴾ وەتۆ فڕێت نەدا ئـەو مشـتە زیـخ و خۆڵـەی بەڕوی بێ باوەڕاندا فڕێتدا کاتێ فڕێت داوە ،بەلاَم خوا فەڕەیدا. بۆیە چاوو دەمـو لـووتـی بێ باوەڕانی گرتەوە، بەتوانای خۆت نەبو، کاری پەك خەربو خوا بەتۆی بەخشـی بـەڵێ: زۆر ڕاستە خوا فڕەیدا، بەلاَم خوا پێغەمەری هەڵبژارد بۆ ئەو فڕێدانە، هەتا بـۆ ئـادەمیزاد دەربکەوێ موحەمەد زۆر گەورەیـە و ڕێـزی داوە بەسـەر هـەمو بونـەوەراندا، یەتایبـەتی ڕەوانەی کردوە بۆ سەر هەمو بونەوەران .

﴿ وَلِيُبلِي الْمُؤمِنِينَ مِنْهُ بَلاءً حَسَناً ﴾ وەبەلاَم خوا چاکەی زۆر گەورە و شیرینی خـۆی بەخشێ بەباوەڕداران و تاقیـان بکاتـەوە لـەلایـەن خۆیـەوە، وەك سـەرکەوتن و دەسـت کەوت و کوشتن و دیل کردن و شکاندنی بێ باوەڕان، بۆ ئەوەی سوپاسی خـوا بکـەن و جارێ تر سەربەخۆ کارنەکەن و نەترسن لـەجگەی خوا، لـەهەموو کاتێکـا وابزانـن هـەمو شتێ خوا ئەیکا .

﴿ إِنَّ اللهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ بەڕاستی خوا هەمو شتێ ئەبیسێ لـە سوپاس کردن وپارانەوەی باوەڕداران، ئەزانێ بەمەبەست و نیازی ئەوان بێگومان لـەوانی وەرگرت و وەلاَمی دانەوە و نیازی خۆیانی پێ بەخشین .

﴿ ذَلِكُمْ وَأَنَّ اللهَ مُوهِنِ كَيْدِ الكافِرِينَ ﴾ ئەوکارانەی ئێـوە چاوتـان پـێ کـەوت لـەو بەخششە گەورەو شیرینەی دای بەئێوە لـەکوشتنی بێ باوەڕان و فڕێدانی ئەو مشتە خۆڵ و زیخەو، بەڕاستی مەبەست لـەو چاکە گەورە ئەوەبو خوا لاوازیکا فێڵی بێ بـاوەڕان و بـێ هێزیان بکاو پوچ بکاتەوە فێڵەکانیان بەخستنی ترس لـەدڵیانا و پەرت و بلاَو کردنی بـیرو ڕایان بەهۆی ناکۆکی نێوان خۆیانەوە .

ئەگێرنەوە بێ باوەڕان کاتێ دەرچون لـەمەکە بۆ لای جەنگی بەدر چون بۆلای خانەی خوا و داوای یارمەتیان کرد و ووتیان: ئەی خوایە: تۆ سـەربخە و زاڵ بکـە ئـەو تاقمـەی بەرزو بەڕێزن لای خۆت. خوای مەزن پارانەوەکەی لێ وەرگرتن و فەرمووی:

﴿ إنْ تَستَفِحُوا فَقَدْجاءَكُمُ الفَتحُ ﴾ ئەگەر ئێوەی بێ باوەڕ داوای سەرکەوتن بکەن بۆ کەسانێ بالاّ ترو ڕانمویی ترو بەڕێزترن لای خوا، دوایی بەڕاستی خوا سەری خستوە کەسانێ بالاّترو ڕاغویی ترن و سەرکەوتنیان بۆلای ئێوە هاتوە کەئایینی پیرۆزی ئیسلامە و سەرکەوتنی تێدایە بۆ ئەوکەسانە ئەو ئایینەیان وەرگرت، ئەو تاقمە بەڕێز و بالاّتر موحەمەد و موسلمانانن و سەرکەوتن و پاڕانەوەکەی لەئێوەی بێ باوەڕان وەرگرت .

﴿ وَ إنْ تَنْتَهُوا فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ ﴾ وەئەگەر ئێوەی بێ باوەڕ کۆتایی بهێنن لەبێ باوەری و جەنگ کردن و دژایەتی فروستادەی خواو باوەڕداران، دوایی چاکترە بۆ ئێوە دوای ئەوەی چێشتیان کوشتن و دیل کردن وشکاندنیان .

﴿ وَإنْ تَعُودُوا﴾ وەئەگەر ئێوەی بێباوەڕ بگەڕێنەوە بۆ لای جەنگ و دوژمنایەتی موسلّمانان و فروستادەی خوا ئێمە ئەگەڕێینە بۆ لای یارمەتیدانی ئەو کەسانەی سەرکەوتن و زالّبون بەسەر ئێوەی بت پەرستانا .

﴿ وَلَنْ تُغْنِي عَنْكُم فِئَتُكمْ شيْئاً وَلَو كَثُرَتْ ﴾ وەهیچ سودێ بەئێوەی بێ باوەڕ ناگەیەنێ تاقمەکەی خۆتان و، باوەکو ئەو تاقمە زۆریشن و کۆبونەوەکانیان بەردەوامێتی و ژمارە و چەکتان زۆربن. بە چاوی خۆتان بینیتان ئەو کۆمەڵە زۆرەتان کە خۆتانتان پێوە هەڵئەکێشا چۆن کوژران و دیل کران و نەگەیشتە فریاتان .

﴿ إنَّ اللهَ مَعَ الْمُؤمِنِينَ ﴾ بەڕاستی خوا لەگەل ٚ ئەو کەسانەیە باوەڕدارن بەسەر خستن و پەرەپێدانیان، ئەگەر ئێوەی بێ باوەڕیش بتانەوێ سەربکەون باوەڕبهێنن بەخواو بە پێغەمەر و بچنە نێو ریزی باوەڕدارانەوە .

لەپاشا خوای مەزن فەرمان ئەدا بەپەرستنی خۆی کە ئەبێتە هۆی سەرکەوتن و ئەفەرموێ :

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوْاْ عَنْهُ وَأَنتُمْ تَسْمَعُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ قَالُواْ سَمِعْنَا وَهُمْ

لَايَسْمَعُونَ ﴿٢١﴾ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾

﴿ ياأَيُّها الْذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللهَ وَرَسُولَهُ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە : ئێوە فەرمانبەرداری خواو فروستاوەی خوابن، مەبەستی خوا بۆ باوەڕداران ئەمەیە: کەخوای مەزن ڕونی کردوەتەوە باوەڕداران ئەو کەسانەن کەیاریدەی پێغەمەر بدەن، فەرمانبەرداری خواو پێغەمەر بن لەهەموکاتێکا، هەر فەرمانێکیان پێدرا بەجێگەی خۆی بگەیەنن، فەرمان بەچاکە بدەن و قەدەغەی خراپە بکەن ، هەرکەسێ ئەوانەی تێدابو باوەڕداری ڕاستەقینەیە .

﴿ وَلاتَوَلُّوا عَنهُ وَأَنتُمْ تَسْمَعُونَ ﴾ وەئێوە ڕوو وەرمەگێڕن لە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾. دژی مەوەستن و، لەکاتێکا ئێوە ئەبیسن فەرموودەکانی خواو ئایەتەکانی قورئان، بیستن و داواوکردنی پێغەمەر لەئێوە ئەمەیە فەرمانبەرداربن، ئێوە موسڵمانن، پێویستە ببیسن و بەدڵ و بەزمان باوەڕبهێنن .

﴿ وَلاتَكُونُوا كالْذِينَ قالُوا سَمِعْنا وَهُمْ لايَسْمَعُونَ ﴾ وەئێوە وێنەی کەسانێکی ئەوتۆ مەبن ئەیان ووت: ئێمە بیستومانە ئەو قورئانەو، ئەوان بەجۆرێ سودی لێ وەربگرن نای بیستن، یانێ ئێوە بەوشێوەیە مەی بیسن وەك ئەو کەسانە ئەی بیسن. یانێ خوا قەدەغە ئەکا لەوباوەڕداران وێنەی دوو ڕوەکان نەبن دەرئەبڕن وەرگرتنی فەرمانی خواو پێغەمەر، لەدڵیانا پەنهانیانداوە دژایەتی و گوناهکردن .

﴿ إنَّ شَرَّ الدَواب عِنْدَ اللهَ الصُّمُ الْبُكْمُ الذِيْنَ لايَعْقِلُونَ ﴾ بەڕاستی خراپترینی ئەوشتانە ئەڕۆن و ئەجوڵێن لەزەویدا لای خوا کەڕو لاڵێکی ئەوتۆن ڕاستی نابیسن و نایڵێن و نایزانن بەجۆرێ سوودی لێ وەربگرن: ئەو کەڕولاڵانە کەسانێکی ئەوتۆن بیر لەهیچ شتێ

ناکەنەوە هەتا لـەڕاستی بگەن، یانیٚ باوەڕداران سوود لـەڕاستی وەرئەگرن و بـێ بـاوەڕان سوود لـە ڕاستی وەرناگرن، وەك کەڕو لاڵ وان لـەسوود وەرنەگرتن و بڕوا پیٚ نەکردن و بڕیارپیٚدان، خراپتریشن لـەهەموو زینەوەران، چونکە ئەو زینەوەرانە هەرچەندە گوێچکـەو زمانیان هەیە ناتوانن مانای هیچ شتیٚ بزانن و نابیسن و نـاتوانن گفتوگۆبکـەن .بـەلاّم بـیٚ باوەڕان ئەبیسن و زمانیان هەیە و ئەتوانن لـەمانای شت تیٚ بگەن و گفتوگۆبکـەن کـەچی خۆیان لـەڕاستی کەڕئەکەن و ڕاســتی بـەزمانیان نایـە. کەواتـە خراپـترن لـەئاژاڵ . ئـەو کەڕولالاّنە کەسانێکی ئەوتۆن فەرمانی خوا نازانن وەری ناگرن .

﴿ وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْراً لَّأَسْمَعَهُمْ ﴾ وەئەگەر خوا بیزانیبایە ئەو کەڕولالاّنە ڕاسـتیان تیٚدایە و ئەیانەویٚ باوەڕبهێنن، بەڕاستی خوا ڕاســتی بـەوان ئەبیسـان و باوەڕیـان ئـەهێنا. بیٚگومان خودای مەزن هەمو شتیٚ ئەزانیٚ و ئاگادارە ئەوان باوەڕنایەرن

﴿ وَلَوا أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا﴾ وەئەگەر خوا نەرمی لـەگەڵ بکردنایە و بەوانی ببیســنایە ئـەو قورئـان و ڕاسـتیانە بەڕاسـتی ئـەو بـیٚ باوەڕانـە پشـتیان ئـەکردە باوەڕهێنـان و ڕویــان وەرئەچەرخان لـەفەرمانبەرداری. بەلاّم خوا چاکە لـەو کەسانەدا نابینیٚ، چونکە دەرونێکی پیسیان هەبوە، دەرونیان ئامادەنەبوە بۆ وەرگرتنــی بـاوەڕ. کەواتـە بۆیـە چاکـەی بـەوان نەبیسان لـەبەرئەوە بەجۆریٚ وەری ناگرن سوودیان پیٚ ببەخشیٚ .

﴿ وَهُمْ مُّعْرِضُونَ ﴾ وەئەو کەسانە ڕوی خۆیان وەرئەگێڕن لـەوەرگرتنی ڕاستی و بەدڵ باوەڕی پیٚ ناکەن. بیٚــژراوە: ووتیـان بەپێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾: تـۆ قوسـەی بـۆ ئێمـە زینـدوو بکەرەوە چونکە ئەو پیاوێکی بەفەڕەو شایەتی بدا پێغەمەری هەتا ئێمە بڕوات پـیٚ بکـەین، خوا ئەو ئایەتەی نـاردە خــوارەوە، فـەرمووی: ئەگـەر زینـدووی بکەینـەوەو گفتوگـۆی ئەویش ببیسن پشت ئەکەنە ئەو گفتوگۆیەی ئەو، ئەوان ڕوی لیٚ وەرئەگێڕن .

بۆ زانین: ئادەمیزاد ئەکرێن بەدووبەشەوە:

١- هەبانە داوای ڕاستی ئەکەن و ئەیانەویٚ ڕاستی وەربگـرن ، ڕوتیشـن لـەمەبەسـتی تایبەتی خۆیان .بەلاّم باوەڕبەهیچ شتیٚ نایەرن و هیچ شــتیٚ بـۆ خۆیـان هـەلنابژێرن بـەبیٚ

بەڵگەو نیشانە، دوای ووردبوونەوە لەوبەڵگانە و دۆزینەوەی ڕاستی بیری خۆیان لەسەر ئەو ڕاستیە دائەنێن و باوەڕی پێ ئەهێنن .

٢- بەشێ تریان بەشوێن بەڵگەدا ناگەڕێن، چاویان هەر لەنێچیری خۆیانە. باوەڕیش بەهیچ بەڵگەیە ناکەن، جگەی سوودی خۆیان باوەڕیان بەهیچ شتێ نی‌یە، هەرشتێ سودی تایبەتی خۆیانی تێدانەبێ بەدەمیەوە ناچن و باوەش ئەکەن بەسوودی خۆیانا باپوچ و خراپیش بێ بەگوێرەی ئایین ،هەرشتێ سوودی تایبەتی خۆیانی تێدانەبێ نایانەوەێ باڕاست و پاکیش بێ .

خوای مەزن بەبێ جیاوازی بانگی هەردوو بەشەکان ئەکا بۆلای ڕاستی. بەڵگەیشیان پێ ئەبەخشێ بەیەکسانی لەدوای ڕون کردنەوەی بەڵگەکانیش بۆیان، لەدواییدا ئەوکەسانەیان وەڵامی خوایان دایەوەو سوودیان لەفەرموذەکانی خوا و ەرگرت، خوای مەزنیش ئامۆژکارییان بۆ پتر ئەکا. چونکە خوا زانیویەتی ڕاستییان وەرگرتوە. بەڵام ئەوکەسانەیان جگە لەسوودی تایبەتی خۆیان هیچ شتێ تریان ناوێ، وولاّمی خوانادەنەوە چونکە سوودی تایبەتی خۆیان بەدی ناکەن، خوا وازیان لێ دێنێ و ئەزانێ ئامۆژگاری هیچ سودێ بەوان ناگەیەنێ، بۆیە ئەفەرموێ ئەگەر خوا بیزانیبایە لەوانا چاکە هەیە بەوانی ئەبیسان ئەو چاکەیە و ئامۆژگاری ئەکردن، ئەگەر بیشیان بیستایە ڕویان لەوچاکەو ڕاستیە وەرئەگەڕان. چونکە بەگوێرەی هەوەسی ئەوان نەبو .

لەپاشا خوای مەزن فەرمان ئەدا بەباوەڕداران کە وەڵامی پێغەمەر بدەنەوەو فەرمان بەرداری ئەوبن و ئەفەرموێ :

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ۖ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾

﴿ يأيُّها الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَجِيبُوا للهِ وَلِلرَّسُولِ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێنــاوە: ئێوە وەڵامی خواو فروستادەی خوا بدەنەوە بە فــەرمانداری ئــەوان و سەرشــۆڕ کردن بــۆ فەرمانەکانیان. بــە وەڵامدانەوەیە هیچ جۆرە کەم و کوڕی تێــدا نــەبێ . وەڵامدانــەوە بـۆ زۆر شتە: جەنگ کردنە بۆ خوا و شتی تریش .

﴿ إذا دَعاكُمْ لِما يُحْيِيكُمْ ﴾ هەرکاتێ فروستادەی خوا بانگی ئێوەی کرد بۆ لای شتێ ئێوە زیندو ئەکاتەوە لەزانیارییە ئایینیەکان و دەستوری ژیان لـەجیهاندا، ئەو شتەی ئەبێتــە هۆی ڕێزی ئێوە لــە جیــهانداو بــەختیاری ئێــوە لەپاشــەڕۆژدا. بێگومــان هــەمو زانیاریــە پزیشکبێ یا ئەندازیار بێ و جگەی ئەوانیش هۆی زیندوو کردنەوەی ئێوەن .

بۆ زانین: هەرکەسێ بەڕاستی وردبێتەوە لەزانستیە ئایینیەکان ئیسلام دەستی ئەکــەوێ کەهــەموو بنچینــەی بیروبــاوەڕ و هــەمو لقــەکانی دەســتورو یاســای ئیســلام چــەقیون و ڕاوەستاون لـەسەر ئەوەی بانگی هەمو ئادەمیزاد بکا بەئاشکرایی بۆ لای کارکردن لـەبــەر ژیانی جیهان و بۆ مانەوەیان، بەتەمەڵی و تەوەزلی دانەنیشن بــۆ کــارکردن بـۆ بــەختیاری هەردوو جیهان، کەواتە باوەڕهێنان بــەخوا پــاڵ ئــەنێ بــە ئــادەمیزادەوە و پێویســتی ئــەکا لـەسەریان کە خۆیان ماندوو بکەن و هەوڵ بدەن بۆ چەسپاندنی سەربەســتی و ڕزگــاربون لە کۆتی بەندایەتی و بنەبڕکردنی کۆیلـەیی، بۆ جگەی خوا سەر دانەنوێنن و نەیــەڵن بــێ بــاوەڕی و ســتەم و داگــیر کــردن بڵاوبێتــەوە بــەگوێرەی توانــای خۆیــان، ڕاســتەوخۆ کاربەدەستان لێی پرسراون لەلای خواو هاونیشتمان، مێژوو ڕونیشی ئەکاتــەوە ســامان و دارایی و پلە وپایە و ڕەگەز هیچ نرخێکی بۆ دانەنراوە لای ئایینی خوا، جگەی ڕاســتی و دادپەروەری نرخی نیە، ناگونجێ ژیان و بوژانــەوەی چــاك و بــەتین بەجگــەی ســەپاندن و پایەداری یاساو دەستوری قورئانی پیرۆز، ئەمەیشمان لــەبیر نــەچێ باوەڕهێنــان بەپــەیام و فروستاوەیی موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ بڕوا هێنانە بە دەستوری برایەتی و یەکسانی و سەربەستی و پاراستنی ڕەوشت و مرۆڤایەتی و دادپــەروەری لــەنێو ئــادەمیزادا، باوەڕهێنانیشــە بــەوەی پێویستە هــەمو شــتێ بگەڕێتــەوە بــۆ لای ئەوانــەو ئاســتی دۆســتایەتی لــەنێو ئــادەمیزادا بەگوێرەی یاسای دیاری کراو بۆیان، چونکە ڕەوانەکردنی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بــۆلای هــەمو

بونەوەران ئاوات و مەبەستەکەی ڕاغویی وبەختیار کردنی ئەوانە، باوەڕهێنانیشە بە ڕۆژی دووایی، ئادەمیزاد نابێ دەستی لێی بەردا چونکە بەبێ سوود دروست نەکراون لێی پرسراون لەهەموو کردەوەیانا گەورەبن یا بچوك، پاداشتی چاکەو خراپەی خۆیان وەرئەگرن، ئەوانە هەتا ئێستا باسکران بیرو باوەڕی بنچینەیی ئایینی ئیسلامن و بەبێ ئەوانە مرۆڤ بەئیسلام دانانرێ .

لقەکانی ئیسلامیش دوای ئەوانەی پێشوو لەپلەی دووهەمدان و بریتین لە هەرشتێ سوودی تایبەتی یا سوودی گشتی تێدابێ بۆ ئادەمیزاد لەهەموو ڕویێکەوە ڕەواو دروستە و پێویستە جێ بەجێ بکرێن، هەرشتێ ئازاری تایبەتی گشتی تێدابێ دروست و ڕەوانین و قەدەغەن .

بەکورتی بانگ کردنی خوا و پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ بریتیە لەوەی ئەو ئایەتەی پێشوو فەرمانی پێداوە بەبێ پەردەکە ئەوشتە زیندوکەرەوەی ئادەمیزادە بەبێ جیاوازی، کەواتە بۆمان دەرکەوت ئیسلام لەگەڵ ئادەمیزادایە دەربارەی ژیان و بوژانەوەیان و دوورخستنەوەیان لەئازار ،هەرکەسێ بانگی ئادەمیزاد بکا بۆ لای شتێ ببێتە هۆی مردنیان و ئازاردانیان و ڕوتانەوەیان و ستەم کردن لەوان و گیروگرفت پەیداکردن لەناویانا و نەیەڵن بەرەوپێش بڕۆن دوژمنی خواو پێغەمەر و مرۆڤایەتین . هەمو کەسێکیش بەگوێرەی نیازی دەرونی خۆی پاداشت وەرئەگرێ .

﴿ وَاَعْلَمُوا اَنَ اللّٰهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرءِ وَقَلْبِهِ ﴾ وەئیوەی باوەڕدار بزانن بەڕاستی خوا ئەکەوێتە نێو مرۆڤ و دڵی مرۆڤەوە، یانێ خوا ئەخاتە دڵی مرۆڤەوە شتێ دڵی مرۆڤ لابدا لەمەبەست و نیازی خۆی لەبەر شتێ خوا ئەوشتەی ئەوێ، ئەو ڕستەیە وێنە هێنانەوە بۆ نزیکی خوا لەبەندەی خۆی، ئاگادارکردنەوەیە لەسەر ئەوەی خوا ئاگادارە لەسەر شاراوەکانی دڵ کەخاوەن دڵ بێ ئاگایە لەوشاراوانە، هەروەها هاندانە لەسەر پەلەکردن بۆ پاك کردنەوەی نیازی دڵەکانیان، زۆر ڕاستە خوا لەهەموو شتێ نزیکترە لە مرۆڤەوە بەبێ جێگەی دیاری کراو بۆ خوا لە دڵی مرۆڤ و جگەی دڵی مرۆڤ، خوا

ئەزانیٚ چ شتیٚ مرۆڤ کوێر ئەکا لـەبینینی ڕاغویی بون و گومڕایی و ئەزانیٚ مرۆڤ کامیان هەڵئەبژێریٚ، دڵـی بـاوەڕداران ئـەپارێزیٚ بەبـەردەوامبونی لـەسـەر بـاوەڕ، بیٚبـاوەڕانیش ئەپارێزیٚ بەبەردەوامبونی لـەسـەر بـیٚ بـاوەڕی هەریەکـەیان بـەگوێرەی نیـازی خۆیـان و هەڵبژاردەی خۆیان .

بۆ زانین: دڵی مرۆڤ جێگەی بـاوەڕ و جێگـەی بـیٚ باوەڕی‌یـە، شـوێنی نیـازی پـاك دووڕویی‌یە، جێگەی خۆشەویستی و کینەیە، هەرلـەدڵـەوە هـەموو کردەوەیـەکی چـاك. خراپ دەرئەچیٚ، ئەگەر دڵ نەبوایە مرۆڤ نەئەبو بەمرۆڤ و خاوەن ئەقڵ نەئەبو، لـەدڵی ئادەمیزادەوە پەرستن و نافەرمانی دانراوە بەو دانانە هەلیان لـەکیس چوە، خوایش ئاگادارە چ شتیٚکیان لـەدڵی خۆیانا داناوە لـەچاکەو خراپە .

﴿ وَإِلَيهِ تُحْشَرُونَ ﴾ وەئێوە بیشزانن بەڕاستی ئێوە بۆ لای خوا کۆ ئەکرێنـەوە لـەپاش مردنتان و زیندوبونەوەتان ، هەتا هەموو ئادەمیزادیٚ پاداشتی بدرێتەوە بەوشتەی کردویانە ولـەدڵیانا پەنهانداوە .

مەبەست لـەناردنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەمەیە: خوای مەزن هانی ئـادەمیزاد ئـەدا بـۆ پەرستن و فەرمانبەرداری بەر لـەوەی نیشانەی مردن بێتە خـوارەوە بۆلایـان کەلـەوکاتـەدا هەلیان لـەدەست دەرئەچیٚ، خوا لـەدڵیانابوە ئاوات و نیازیان چی بـوە، بـەمردنیان هـەمو ئاواتیان لـە کیس چوە، جاری تر نایەنەوە بۆ جیهان. هەندیٚ لـەزانایان مانای (يَحـولُ بَـين المرءِ وقلبهُ ) بەم جۆرە کردوە: یانیٚ بەڕاستی دڵی مرۆڤ لـەژێردەستەڵاتی خوادایە ئەم دیو ودیوی پیٚ ئەکا بەهەرجۆریٚ ئارەزووی هەبیٚ .

وَٱتَّقُواْ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٥﴾
وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِى ٱلْأَرْضِ تَخَافُونَ

أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِۦ وَرَزَقَكُم
مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
لَا تَخُونُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓا۟ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ
﴿٢٧﴾ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ
عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تَتَّقُوا۟
ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيَغْفِرْ
ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيَغْفِرْ
لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾

﴿ وَ أتقوُا فِتْنَةَ ﴾ وەئێوە خۆتان بپارێزن لەسزای گوناهێ زیانەکەی بۆ گشت کەسییێ، وەك بڕیاردان بۆ کاری خراپ لەکەسانیکەوە لەنێو ئێوەدان. تێکدانـی کۆمەڵێ دۆستی یەك بن. بلاو کردنەوەی شتێ بەدرۆ نەبوبێ، بـۆ ئـەوەی دانیشـتوانی بـێ تـاوان تووشی ئازاربن .

﴿ لا تُصِيبَنَ الْذِيْنَ ظَلمُوا مِنكُم ﴾ ئەو سزایە توشی کەسانێکی ئەوتۆ نابێ ستەمەکەیان کردوە بەتایبەتی، بەڵکو ئەوسزایە هەموو دانیشتوانی ئەوجێگەیە ئەگرێتەوە تاوانبارن یا بێ تاوان، چاك و خراپیان وەك یەك ئەگرێتەوە .

﴿ وَأعْلَمُـوا أنَ اللّهَ شَـديدُ العِقـاب ﴾ وەئێـوە بزانـن کەبەڕاسـتی خـوا سـزاکەی زۆر سەخت و گرانە بۆ کەسانێ ستەمەکەیان سەربکێشێ بۆ لای دانیشتوانی بێ تاوان .

﴿ وَ اْذكُرُوا إذْ أنْتُم قَليلٌ مُسْتَضْعَفُونَ فِي الآرضِ ﴾ وەئێوەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بیری ئەوكاتە بكەنەوە ئێوە ژمارەتان كەمبو بێچارەو چەوسێنراوە بون لەزەویدا بەرلەوەی ئێوە كۆچ بكەن .

﴿ تَخافُونَ أنْ يَتَخطَفَكُم الناسُ ﴾ ئێوە ئەترسان لەبەر لاوازیتان كەئادەمیزادی دانیشتوانی مەكە ئێوە بدزن و لەمەكەیش دەرتان بكەن و ئەوپەڕی سزاتان بدەن، چونكە ئەوان خاوەنی هێزبوو ن وئێوە بێ دەستەلاَت .

﴿ فَآواكُمْ وَأيَّدَكُمْ بِنَصْرِهِ ﴾ دووایی خوا جێگەیەكی خاوەن ئاسایشی دا بەئێوەو مەدینەی كرد بەنیشتمان بۆتان و خوا ئێوەی بەهێزكرد بەهۆی یارمەتیدانی خۆی و بەدانیشتوانی مەدینە .

﴿ وَرَزَقَكُم مِنَ الطَّيْباتِ ﴾ وەخوا بەخشی بەئێوە ڕۆزیە پاكەكان لەدەست كەوتوو دارایی بی باوەڕان كەلەبەر ئێوە بۆ هیچ كەسێ لەباوەڕدارانی پێشوو ڕەوانەكرابو بۆیان ئەو دەست كەوتوە بخۆن .

﴿ لَعَلَكُم تَشكُرُونَ ﴾ بۆ ئەوەی ئێوە سوپاسی خوا بكەن لەسەر ئەو هەمو چاكانە خوا بەخشی بەئێوە و ئێوەی حەسانەوە لەمەدینە بەبێ ترس

﴿ ياأيُها الْذِيْنَ آمَنُوا لا تَخُونُوا اللهَ وَ الْرسُولَ ﴾ ئەی كەسانێكی باوەڕتان هێناوە: ئێوە ناپاكی مەكەن لەگەڵ خوا و فروستادەی خوا لەهەمو ڕویەكەوە، ئەبێ بزانن ناپاكی تەنها بەوە نابێ ئێوە واز لە نوێژ و ڕۆژو بهێنن. بەڵكو ناپاكی زۆر گەورە ئەوەیە كاری ناشایستە بكرێ لەگەڵ موسڵمانان و لەگەڵ نیشتمانا. سیخوڕی مەكەن، بۆ ئەوەی تاوانباران و خوا نەناسان و سیخوڕەكان ببنە كاربەدەست و پێشەوایی بگرنە دەست و فەرمان ڕەوایی بەدەستیانبێ، دانیشتوان بێ دەنگ دانیشن و یارمەتیان بدەن و جەنگیان لەگەڵ نەكەن بەگوێرەی توانای خۆیان، سەرباری ئەوەیش واز لەنوێژ و ڕۆژو وپێویست كراوەكانی تر بهێنن و دڵیشیان پیسبێ .

﴿ وَتَخُونُوا أماناتِكُمْ ﴾ وەناپاكیش مەكەن لەگەڵ ئەوشتانەی لای ئێوە دانراون و بەئێوە سپێرراون. وەك دارایی و نوێژو ناموس وپەیمان و بەڵێن، ئێویستە ئەوشتانە لاتان

دانراون بیدەنەوە بەخاوەنەکانیان بەبێ دەستکاری کردنیـان، بـەلاّم لەوانـەیش گـەورەتر ناپاکی کردنە لـەگەڵ هەژاران و یارمەتیان نەدرێ بۆ وەرگرتنی مافەکانیان بەگوێرەی تواناو ڕێگە بەستەمکاران نەگیرێ .

﴿ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ وەئێوە بزانن بەوشتانە ناپاکن و بەنیاز و مەبەستەوە بیـان کـەن، چ کەسێ بێ ناپاك تر لـەوە پەلاماری گوناه و ستەمکردن بدا بەدەستیان قەس .

﴿ وَأعْلَمُوا أنما أموالَكُم فِتْنَةٌ ﴾ وەئێوە بزانن کەبەڕاستی دارایی و منالّەکانتان ئاشـوب و دەردو ناخۆشین، خۆشەویست و دڵ پێوە بەسـتراوی ئێوەن و هـۆی تـاقی کردنـەوەی ئێوەن .

کەواتە پێویستە لـەسەرتان دارایی‌و منالّی خۆتان قەدەغەنەکەن لـەهەلّسـان بەپێویسـتی ئایین و نیشتمان، بەشێوەیە ئەوانتان خۆش نـەوێ کەڕێگـە بگـرن لـەڕاسـتی و لـەچاکـە، دارایی بەرهەمی دەستەو منالّەکانتان بەسـتراون بەدلّتانـەوە، بەرچاوتـەنگ و ترسـنۆکتان نەکەن بەرانبەر ڕاستی ئایین .

﴿ وَأنّ اللهَ عِنْدَهُ أجْرٌ عَظِيْمٌ ﴾ وەئێوە بزانن بەڕاستی لـەخزمەت خوادا هەیە پاداشـت و مزەی زۆر و گەورە، مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە هەموو ئاواتی ئەوە بێ ئە وپاداشتە گەورەیە لـەکیس خۆی نەدا، ڕێزی منالّەکانی‌و دارایی خۆی نەدا بەسەر ئەوپاداشتە گەورەیەدا .

﴿ ياأَيُها الَّذِيْنَ آمَنُوا إنْ تَتَقُوا اللهَ يَجْعَل لَكُمْ فُرقاناً ﴾ ئەی کەسانێکی ئـەوتۆ باوەڕتـان هێناوە :ئەگەر ئێـوە لـەخوا بترسـن، هەرشـتێ خـوا فـەرمانی پێداوە بیکـەن و هـەرچی قەدەغەکردوە نەیکەن، ئاگاداریان بکەن بەنهێنی وبەئاشکرا خوا پەیدا ئەکا و ئەسازێنێ بۆ ئێوە ڕاغویایی و ڕوناکیە، ڕاست و پوچ و چاك و خراپ جوێ ئەکەنەوە بۆ ئێوە .

﴿ وَيَكفَر عَنكُم سَيِّئاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ﴾ وەخوا دا ئەپۆشێ خراپەکانی ئێوە کەلـەوەوبەر کردوتانە لـەجگەی گوناهــە گـەورەکان و، خـوا خـۆش ئـەبێ لـەگوناهـە گـەورەکانتان لـەڕۆژی دووایيدا، ئابڕوتان نابا بەدەرخستنی گوناهەکانتان .

﴿ وَاللهُ ذُوا الفَضْلَ العَظْيمَ ﴾ وەخوا خاوەنی گەورەیی و بەخششی گەورەیە بەسەر هەموو بونەوەرانەوە، بەتایبەتی بۆ ئەوکەسانە بە تەمای خۆشەویستی خواو لێ بوردنن، خوا بەخششی خۆی قەدەغە ناکا لەتاوانباران، چاکتر لەباوەڕداران قەدەغەی ناکا لەهەردوو جیهاندا .

لەئایەتی ( ٢٦ ) ی ئەم سورەتەدا خوای مەزن باسی چاکەی خۆی کرد بەسەرموسڵمانانەوە بەگشتی، لەم ئایەتەی دواییدا خوا باسی چاکەی خۆی ئەکا بەسەر پێغەمەرەوە ئەوە لەلایەکەوە، لەلایێ ترەوە زانایانی مێژوو ناس ئەفەرموون: بێ باوەڕانی قورەیش لە ( دارو ندوە ) کۆبونەوە لەبارەی پێغەمەرەوە ﴿ ﷺ ﴾ پێك هاتن و بڕیاندا بەهەر جۆرێ بێ خۆیان ڕزگاربکەن لە موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾ هەرکەسێ لەودانیشتوانە بەجۆرە ڕەنگێ بیرو باوەڕی خۆی دەربڕی، هەندێکیان ووتیان: بەندی ئەکەین و پێ ونی ئەکەین، هەندێ تریان ووتیان لەمەکە دەریئەکەین، هەتا دێی، ئەبوجەهل ووتی: لەهەمو بنەماڵەیەکی قورەیش لاوێکی ئازا و نەترس هەڵبژێرن وخۆیان بکەن بەخانوی موحەمەدا لەناکاو ولەکاتی خەوتندا هەموویان بەیەکجار شمشێرەکەی خۆیان بکێشن بەموحەمەدا بیکوژن، بەوشێوەەی خوێنەکەی بلاو ئەبێتەوە بەسەر هەمو بنەماڵەکانی قورەیشدا، ئەوکاتە بنەماڵەی هاشم توانای جەنگی هەمو هۆزەکانیان نابێ لەدواییدا ڕازی ئەبن بەوەرگرتنی خوێن، دانیشتوانی ئەو کۆڕە بەو بیرو بۆچونە ڕازی بوون بەگشتی ، دوایی خوای مەزن ئەو هەواڵەی دا بەپێغەمەر و فەرمانیشی پێدا لەمەکە بچێتە دەرەوە، پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرمانی دا بەعەلی کوڕی ئەبو تالیب لەجێگەکە یا بخەوێ، عەلی بەرگی پێغەمەری کردە بەری خۆی ولەوێ ڕاکشا، پێغەمەر فەرمانی دا بەعەلی ئەو شتانەی دانیشتوانی مەکە لایاندابوو بیداتەوە بەخاوەنەکانیان، لەپاشا پێغەمەر ئەبوبەکری لەگەڵ خۆی برد و

چونە دەرەوە، سێ شەو لەئەشکەوتی سەوردا خۆیان پەنهاندا کەڕۆژ بویەوە بێ باوەڕان پێغەمەریان لەجێگەی خۆیا نەبینی، لەعەلیان پرسی هاوڕێکەت لەکوێیە، ووتی: نازانم، ئەوان چون بەدوای پێغەمەردا ﴿ﷺ﴾ بەهۆی هێلانەی کۆترو چێنراوەی جۆلایی کەرە بەدەرگای ئەشکەوتەکەوە سەریان لێ تێکچو، بەنائومێدی و شەرمەزاری گەڕانەوە، دەربارەی ئەوچاکەیە بەسەر پێغەمەرەوە خوا ئەفەرموێ:

وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا قَالُوا قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَاءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَا إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَٰذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٢﴾ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ

وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَمَا كَانُوٓا۟ أَوْلِيَآءَهُۥٓ ۚ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ۚ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٥﴾

﴿ وَإذْ يمكُر بِكَ الْذِيْنَ كَفَـرُوا لِيُثْبِتُـوكَ أو يَقْتُلُـوكَ أوْ يَخرِجُـوكَ ﴾ تـۆ بـیری ئەوکاتـە بکەرەوە داویان دانا بۆ تۆ و بۆ نەهێشتنی تۆ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنابو بـۆ ئـەوە تۆ بەندبکەن و پێونت بکەن یا بت کوژن یاد ەرت بکەن لـەمەکە .

﴿ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ واللهُ خَيْرُ الْماكِرِيْنَ ﴾ وەبێ باوەڕان فێڵـو داویـان پـەنهـاندا بـۆ تۆو، خوا فێڵی ئەوان پوچ ئەکاتەوە کـە فـەرمانیدا بـەتۆ لـەمەکـە بچیتـە دەرەوە لـەژێر چاودێری خۆیا وەچاکترین کەسانێکە و بەهێزترین کەسە فێڵی بێ باوەڕان پوچ بکاتـەوە، ئەوەبو خوا تۆی ڕزگار کرد لـەفێڵی بێ باوەڕان بەبێ ئەوەی بتوانن ئازار بەتۆ بگەیەنن .

کاتێ قورەیشیەکان بۆیان نەلوا بەچەك و بەجەنگ وفێڵ سـازاندنپێغەمەر لـەناوبـەن و ئابرویان نەما پەنایان برد بۆ لای بوختان و درۆدان بەسەر پێغەمەر و قورئانی خواو، لـەبەر ئەو ئابرو چون و بێ دەسـەلاتییەی خۆیـان بشـارنەوە، ووتیـان: ئەوقورئانـە تـۆ هێناوتـە چیرۆکی پێشینانە، ئێمەیش ئەتوانین وێنەی ئەو دابنێین، زۆر ڕون و ئاشـکرایە هەرکەسـێ نەیتوانی بەچەك و فێڵ زاڵ ببێ بەسەر بێتاوانا دەست ئەبا بۆ بوختان هەڵبەستن ووێنەی بێ ئابروانی ئەم سەردەمەی ئێمەیش ;بۆیە خوای مەزن هەواڵ ئـەدا بـەوکردەوە پیسـەی بـێ باوەڕانا وئەفەرموێ :

﴿ وَإذا تُتلى عَلَيْهِمْ آياتُنا قالُوا قَدْ سَمِعْنا ﴾ وەهەرکاتێ بخوێنرێتەوە بەسەر بێ باوەڕاندا و بت پەرستاندا ئایەتەکانی قورئانی ئێمە فەرمان بدا بە باوەڕهێنان بەقورئان و هەواڵ بدا بەسەر هاتی گەلانی ڕابوردودا بێ باوەڕان ئەڵێن: بەڕاستی ئێمە بەگوێچکەی خۆمان ئەو شتەی موحەمەد هێناویێتی بیستومانە لەجگەی ئەویشەوە .

﴿ لَوْ نَشاءُ لَقُلْنا مِثْلَ هذا إنْ هذا إلا أساطِيرُ الآوَّلِينَ ﴾ ئەگەر ئێمە ئارەزوومان هەبێ ئەمان ووت: وێنەی ئەونامەیە ئەو ئەیخوێنێتەوە بەسەر ئێمەدا نیە ئەونامەیە وئەو باسانە ئەو ئەیخوێنێتەوە بەسەر ئێمەدا مەگەر چیرۆك و نوسراوی پێشینەكانن .

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەمەیە: نەزری كوڕی حاریسەی كوڕی كەلدەكە لە هەرە دوژمنە گەورەكانی پێغەمەر بوو لەجەنگی بەدردا بەدیل گیراچوو بۆ كاروان لەووڵاتی فارس و حیرە بۆ بازرگانی كەهاتەوە هەندێ چیرۆكی لەقەشەو زاناكانی فارسەوە بیستبو .

نوسراوێكی لەهەواڵی ڕۆستەم و زاڵ وئەسفەندیارەوە هێنابوو، قورەیشیەكانی كۆكردەوە بۆ لای خۆی و بۆی ئەخوێندنەوە، كاتێ كەنەزر ئەوەی ئەخوێندەوە پێغەمەر فەرمووی: شین و هاور بۆ تۆ ئەمەی من هیناومە نامەی خوایە، قورەیشەشكان بەگشتی ئەیانزانی كەئەوقورئانە لەتوانای ئادەمیزادا نیە و لەلایەن خواوە هاتوە، ئەو قورئانە بە ئاشكرا ئەیفەرموو :هەموو ئادەمیزاد كۆببنەوە ناتوانن سورەتێكی وێنەی ئەونامەیە دابنێن یاسورەتێكی بچووك .

﴿ وَإذا قالُوا اللهُم إنْ كانَ هذا هُو الحَقُ مِنْ عِندِكَ فَأمْطِرْ عَلَيْنا حِجارَةً مِنَ السماءِ أو ائْتِنا بِعَذابٍ ألِيمٍ ﴾ وەتۆ بیری ئەوكاتە بكەرەوە بێ باوەڕان ووتیان بەگاڵتەوە بەتایبەتی نەزرو هاوڕێكانی : ئەی خوایە ئەگەر ئەو نامەیەی موحەمەد هێناویێتی ئەگەر ڕاست و دروستە لەلای تۆۆ بۆی هاتوە ، دوایی تۆ ببارێنە بەرسەر ئێمەدا بەرد بەوێنەی باران لەئاسمانەوە وەك گەلی لوت یا بەوێنەی لەشكرەكەی ئەبەرهەمان لێی بكە ، یاتۆ بیهێنە بۆ ئێمە سزاییێكی ئازار دەرو سەخت لەجگەی بەرد و لەبەرد خراپتر .

هەندێ لەبێ باوەڕان خۆبان بەڕێز و گەورە دائەنا، ڕەگەز پەرستی لەخۆیانیان بایی ئەکا، وێنەی ئەو کەسانە خاوەنی ئایینی ڕاستن، بگرە بێ باوەڕان زۆرتر لەئایین پەرستان لایەنی ئایینی پوچی خۆیان ئەگرن بەشێوەیە کوشتن و نەمانی خۆیان هەڵئەبژێرن بەسەر ئەوەدا سەر شۆڕبکەن بۆ دوژمنی خۆیان، ئەوبێ باوەڕانەی قورەیشیش مردن و لەناوچون و کوشتنی خۆیانیان بەبەردو سزای گەورەبەلاوە چاکتربوو لەوەی دووای موحەمەد بکەون کەپێغەمەرە ئەیشیانزانی کەپێغەمەرەو لەلایەن خواوە نێراوە. بەڵام جیهان پەرستان پلەو پایە گرتبوونی و بەڕەگەزپەرستی لەخۆیان بایی بون و ئەیشیانزانی دوژمنەکەیان لەسەر ڕاستی تیە، بەوبۆنەوە خۆیان ئەدەن بەدەم نەمان و سزادانەوەو دانابەزن لەوانەو لەلاسایی کردنەوەی پێشوە کانی خۆیان، مێژوو زۆرکەسی لەوکەسانە باس کردوە وەك فیرعەون و گەلی نوح و جگەی ئەوان، قورەیشیەکان کاتێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بانگی کردن بۆ لای ئایینی ئیسلام پاڕانەوە لەخوا ئەگەر موحەمەد ڕاستە ئەو سزایانەی سەرەوەیان بۆ بنێرێ، خوای مەزن وەڵامی دانەوە بەوسزایە لەپێشیانەوەیە، دەرگای پەشیمان بونەوە هێشتا دانەخراوە، خوا سزای ئێوەی دوواخستوە لەبەر ئەمانەی خوارەوە:

١ . ﴿ وَما كانَ اللهُ بِعَذابَهُمْ وَأنْتَ مِنهُم ْ ﴾ وەخوا بەڕاستی سزای بت پەرستان ناداو، تۆ لەناوئەواندابی، چونکە تۆ میهرەبانی و دیاریت لەلایەن خواوە بۆ هەمو ئادەمیزاد کەلەناوی ئەواندا بی سزایان نادا، بەڵام کاتێ تۆ لەناویانا نەمای هەواڵەی ویستی خوایە هەر شتێکیان لێ بکا، یانی خوا سزای دانیشتوانی مەکە نادا هەتا تۆلەمەکەدابی لەبەر ڕێزیتۆ .

٢. ﴿ وَماكانَ اللهُ مَعَذِبَهُم وهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴾ وەخوا سزای ئەوان ناداو لەکاتێکا ئەوان داوای لێ بوردن لەخوا بکەن لەبی باوەڕی و گوناهەکانیان و وازیان لێ بهێنن، ئیتر باتۆیش لەناویانا نەبی .

﴿ وَما لَهُم أنْ لاَيُعَذِبُهَمْ اللهُ وَهُمْ يَصْبِدّونَ عَنْ المَسجِدِ الحَرام ﴾ وەچ شتێ هەیە بۆ بت پەرستانی قورەیش کەخوا سزای ئەوان نەدا، ببێتە هۆی ئەوەی سزانەدرێن، یانێ ئەوان

ڕەوشتی پاکی وایان نەبێ قەدەغەی سزایان لێ بکا و لەکاتێکا ئەوان ڕێگە ئەگرن لەو مزگەوتە ڕێزدارەو نایەڵن موسڵمانان پەرستنی خوای تێدا بکەن بسوڕێنەوە بەم لاولایدا. یانێ بت پەرستان سەرباری بت پەرستیەکەیان نەیان هێشت موسڵمانان نوێژ و خوا پەرستی تێدا بکەن. نە موسڵمانان و نەپێغەمەر هەتا لەمەکەدا بوون نەیان ئەتوانی بچن بۆ نوێژ بەبی ئازارو بگرەو بەردە. بەڕاستی پێك هاتبوون لەسەر ریگەگرتن بەپێغەمەر و موسڵمانان لەساڵی حودەیبیەدا بۆ عەمرە کردن هەموو توانایانەوە.

﴿ وَماكانُوا أوْلِياءَهُ ﴾ وەئەو بت پەرستانە دۆستی خواو هەڵسوڕێنەری کاروباری ئەو مزگەوتەڕێزدارو پیرۆزەنین و شایستەی ئەوکارە پیرۆزەنین. بەڵکو ئەوان دوژمنی ئەو مزگەوتە ڕێزدارو پیرۆزەن وشایستەی ئەوکارە پیرۆزەنین. بەڵکو ئەوان دوژمنی ئەو مزگەوتەن کەواتە پێویستە دەربکرێن لەوێدا و نەهێڵرێن بچنە نێویی ئەو مزگەوتە، چونکە ئەوان پیسن .

﴿ إنَ أوْلِياءُ هُ إلاّ الْمُتَّقُونَ ﴾ خاوەن هەڵسوڕێنەری ئەو مزگەوتە هیچ کەسێ نیە مەگەر ئەو کەسانە خۆیانیان پاك کردوەتەوە لەچڵك و چەپەڵی بت پەرستی .

ئەو ئایەتە هەرچەند لەبارەی ئەو مزگەوتە بەرێزەوە هاتوەتە خوارەوە. بەلام هەمو مزگەوتێ ئەگرێتەوە پێویستە کەسێ سەر پەرشتیان بکا خاوەنی خۆپاراستنبن لەگوناه کردن. بەڵام بەداخەوە لەم سەردەمەی ئێمەدا زۆربەی ئەوکەسانەی کاروباری مزگەوتیان دراوەتە دەست نوێژ نەکەر و مەی خۆرن بەهەمو جۆرێ خەریکن ڕێز بۆ مزگەوت نەیەڵن. بەڵکو زۆریان بڕوایان بەئایینی پیرۆز وبەپێویستیەکانی مزگەوتیان نیە، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ :

﴿ وَلكِنَّ أكْثَرَهُمْ لايَعْلَمُونَ ﴾ وەبەلاّم زۆرتر کەس لەوبێ باوەڕانە نازانن کەسەرپەرشتی کردن و هەڵسوڕێنەری کاری ئەو مزگەوتە ڕێزدارە شایانی ئەوان نیە، چونکە ئەوان بێ باوەڕن، پێویستە خاوەن و سەرپەرشتیکەری هەمو مزگەوتێ پاك و خاوێن و بێگەرد بن، نەك ئەو کەسانە لەسنوری خوا دەرچون .

پرسیار/ مانای ئەو ئایەتە وامان پیشان ئەدا کەخوای مەزن سزای قورەیشەکانی داوە کەچی ئێمە ئەزانین ئەوشتانەی خوا سزای گەلانی پێشوی پێداون، وەك عاد و سەمود و گولی نوح و لوت و جگەی ئەوانیش سزای قورەیشیە بت پەرستەکانی پیێ نەدراوە .

وەلاّم/ بەڕاستی ئەو بت پەرستانە کەسزای پێغەمەر و موسلّمانانیان ئەدا هەموویان لەجەنگی بەدردا کوژران هەربەدەستی موسلّمانان، لەوکوژراوانەدا بون: ئەبو جەهل، نەزی کوری حاریس، ئومەیەی کوڕی خەلّەف. جگەی ئەوانیش لەگەورەکانی قورەیش، ئەوەبوو بیلالی حەبەشی کە ئومەیەی بینی بەشمشێر دای پاچی و کوشتیوسەری بڕی .

﴿ وَماكانَ صَلاتُهُمْ عِنْدَ البَيْتِ إل مُكاءً وَ تَصْدِيَةً ﴾ وەنوێژ کردنی بیێ باوەڕان وبت پەرستان کەڕێگەیان لەپەرستنی موسلّمانان ئەگرت لای ئەو خانەی خوادا هیچ شتێکی شایستە نەبوو مەگەر فیکەیە وێنەی زیکەو چەپلّەلیّدان .

پرسیار/ قورەیشیەکان و هاوبەشدانەران نوێژیان ئەکرد لای ئەو مزگەوتەی خانەی خوادا ئیتر بۆ ئەبیێ شایانی ئەوسزایە بن؟

وەلاّم/ خوا وەلاّمی داوەتەوەو فەرمووی ، نوێژی ئەوان هەلّقونکی و قیڕەو فیکەبو نەك کزۆلّی و ترسان و بیێ دەنگی.

﴿ فَذُقُوا الْعَذابَ بِماكُنْتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾ دوایی بچێژن ئەو سزایە کەبریتیە لە کوشتن و دیل کردنیان وجگەی ئەوانیش، لەپاشەڕۆژدا سزای گرانتری ئاگری دۆزەخ، بەهۆی باوەڕنەهێنانتانەوە و بت پەرستیتانەوە، ئەبیێ بزانریێ ئەگەر ئێوەی موسلّمانان وێنەی ئەوان بونایە توشی سزا ئەبون لەهەردوو جیهاندا لەدواییدا خوای مەزن باسی ئەوەمان بۆ ئەکا بیێ باوەڕان دارایی خۆیان دا ئەنێن لەکارو کردەوەی گوناە و لەدژی باوەڕداران و ئەفەرمویێ :

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنفِقُونَ
أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ

عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَالَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ لِيَمِيزَ اللَّهُ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ الْخَبِيثَ بَعْضَهُ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُ فِي جَهَنَّمَ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴿٣٧﴾ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا إِن يَنتَهُوا يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِن يَعُودُوا فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ الْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ انتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾ وَإِن تَوَلَّوْا فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَوْلَاكُمْ ۚ نِعْمَ الْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ النَّصِيرُ ﴿٤٠﴾

﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يَنفِقُونَ أَموالَهُمْ لِيُصعِدُوا عَنْ سَبيلِ اللهِ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە لەناو ئەبەن دارایی خۆیان لەجەنگی پێغەمەر و موسڵمانان‌دا و لەشتی خراپ و نالەباردا بۆئەوەی ڕێگە بگرن لەئادەمیزاد و لایان بدەن لەئایینی خوا لەوکەسانەی ئەیانەوێ بچن بۆ لای باوەڕهێنان بەئایینی خواو ڕێگەی ڕاستی خوا هەر لەبەر دوژمنایەتی کردن لەگەڵ موحەمەد .

﴿ فَسَيُنْفِقُونها ثُمَ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَ يُغْلَبُونَ ﴾ دوایی دائەنێن وئەبەخشن ئەودارایییەی خۆیان کەکۆیان کردوەتەوە و کۆتایی پێ ئەهێنن، لەپاش کۆتایی پێ هاتنی ئەو دارایییە ئەبێ بەخەفەت و پەشیمانی بەسەریانەوە. چونکە سودی لێ وەرناگرن

نەلـەبەدردا و نەلـەجیهان و نەلـەپاشەڕۆژدا لـەپاش تریش ژێر ئەکەون و ئەشکێن لـەجەنگی بەدرداو مەسڵمانان زاڵ ئەبن بەسەریانادا، ڕون و ئاشـکرایە سـەرکەوتن هـەر بـۆ ئـایینی ئیسلامە بەسەر بت پەرستاندا .

﴿ وَالَّذِيْنَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴾ وەکەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕیـان نـەهێناوە کـۆ ئەکرێنەوە بۆ لای دۆزەخ دوای ئەو خەفەتەی توشـیان بـووە لـەجیـهاندا، زۆر ئاشـکرایە هەندێ لـەو بت پەرستانە باوەڕیان هێنا بەئاینی پاکی خوا، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

﴿ لِيَمِيزَ اللهُ الخَبِيْثَ مِنَ الطَّيِّبَ ﴾ بۆئەوەی خوا جوێی بکاتەوە تاقمی پیسی بێباوەڕان لـە تاقمی پاکی باوەڕداران، ڕون و ئاشکرایە لـەدادپەروەری خوای مەزنە پاك و پیس وەك یەك و باوەڕدارو بێ باوەڕ وەکیەك تەماشـانەکرێن، هـەمو کەسـێ بـەگوێرەی کـردەوەی خۆیان مامەڵـەیان لـەگـەڵ بکـرێ هـەر لـەبەرئەوانەیشـە پاکـەکان پاداشـتیان ئەدرێتـەوە لـەهەردوو جیهاندا، تاوانبارانیش سزایان ئەدرێ لـەهەردوو جیهاندا .

﴿ وَيَجْعَلَ الخَبِيْثَ بَعْضَهُ على بَعْـضٍ فَيَرْكُمَـهُ جَمِيْعـاً ﴾ وەلـەبەرئـەوەیش خـوا دائـەنێ تاقمی پیسی بێ باوەڕان هەندێکیان لـەسەر هەندێ تریان و سـواری یـەکیان ئـەکا لـەبـەر زۆری ژمارەیان لـەدواییدا خوا کۆیان ئەکاتەوە هەموویان لـەڕۆژی دواییدا.

﴿ فَيَجْعَلَهُ فِي جَهَنَّمَ أُوْلَئِكَ هُمُ الخاسِرُونَ ﴾ دوایی ئەو تاقمە بێ باوەڕانـە خـوا فڕەیـان ئەداتە نێو دۆزەخ .وێنەیان وەك شتێ وان بەگوریس شەتەك بدرێن بەیەکەوە، دوایـی بـبن بەسوتەمەنی بۆ ئاگر، ئەو بێ باوەڕانە هەر ئەوانن خاوەن زیانی تەواون، چونکـە خوێـن و لـەشیان ئەکرێن بەسوتەمەنی ئاگری دۆزەخ، چ شتێ لـەوسزایە گەورەتر .

لـەپاشا خوای مەزن داوا ئـەکا لـەو کەسـانەی پێشـوو واز لـەبت پەرستی بـهێنن و ئەفەرموێ:

﴿ قُلْ لِلَّذِيْنَ كَفَرُوا إِنْ يَنْتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ ماقَدْ سَـلَفَ ﴾ تـۆ بڵـێ بەوکەسـانە باوەڕیـان نەهێناوەو بت پەرستن بەوێنەی ئەبو سوفیان و هاوڕێکانی: ئەگـەر ئـەوان کۆتـایی بـهێنن لـەبت پەرستی و بێ باوەڕی و پەشیمان ببنەوە لـەدوژمنایەتی پێغەمـەر و موسـڵمانان لێـی

خۆشبون بۆ ئەو کەسانە ئەبێ لەگوناهێ بەڕاستی ڕۆیشتوە لەمەوبەر کردویانە ، ئیتر هەرگوناهێ بێ، بێگومان خوا لەو گوناهانە ئەبوری، دەرگای پەشیمان بونەوە کراوەتەوە هەمو کاتێ و بۆ هەموکەسێ، هەلیان لەکیس نەچوە بەو مەرجەی واز لەبێ باوەڕی و دوژمانیەتی خواو پێغەمەر بهێنن .

﴿ وَإِنْ يَعُودوا ﴾ وەئەگەر ئەو بێ باوەڕانە بگەڕێنەوەو هۆبکەنەوە بۆ لای بێ باوەڕی و جەنگ کردن و دوژمنایەتی پێغەمەر و کۆبونەوە بکەن لەدژی پێغەمەر بەپەنهانی و بۆ سازکردنی هۆی جەنگ لەگەڵ موسڵمانان، دارایيەکانیان بەکاربهێنن بۆ ڕێگە گرتن لە ئایینی خواو پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ .

﴿ فَقَدْ مَضَتْ سُنَّةُ الْأَوَّلِينَ ﴾ دوایی بەڕاستی ڕابووردوە مێژووی گەلانی پێشو بەلەناو بردنی دوژمنانی پێغەمەران و زاڵبونی دۆستانی خوا بەسەر دوژمنانی ئایینداو لەناوبردنی ئەوبێ باوەڕانە پەلاماری موسڵمانانیاندا لەجەنگی بەدردا، ئەگەر ئەو کەسانەیش هۆبکەنەوە بۆلای دژایەتی پێغەمەر وێنەی پێشوەکانی خۆیان لەناوئەچن. بەگوێرەی مانای ئەو ئایەتە ئەگەر کەسێ موسڵمان ببێ پێویست نیە لەسەری گەڕانەوەی پەرستنە لەشیەکان و پەرستنە دارایەکان. بەلام ئەگەر لەئایین وەرگەڕا و موسڵمان ببێتەوە پێویستە لەسەرێ نوێژو ڕۆژوی کاتی بێ باوەڕیەکەیی و زەکاتی دارايیەکان بەسەربگرێتەوەو جگەی ئەوانیش. بەلای پێشەوا ئەبوحەنیفە وە وەرگەراویش لەئایین پێویست نیە لەسەری بەسەریان بگرێتەوە .

﴿ وَقاتِلُوهُمْ حَتّى لاتَكُونَ فِتْنَةٌ ﴾ وەئێوەی باوەڕدار جەنگ بکەن لەگەڵ بێ باوەڕان هەتا نەمێنێ بێباوەڕی و هاوبەشدانان و جەنگ کردن لەگەڵ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ هەتا هەتایە لە زەویدا، پەرستن تەنها بۆ خوا بکرێ بەگوێرەی توانا. نەك بۆ بت و کاربەدەستانی ستەمکار .

﴿ وَيَكُونَ الْدينُ كُلَهُ لِلّهِ ﴾ وەهەتا ئایینی پاك و بێ هاوبەشی هەموی بۆ خوا بێ و نەمێنێ هەمو ئایینێکی پوچ و ئایینی ئیسلام لەنێویانا پایەدار بێ و پەرستن لەمزگەوتی ڕێزدار بکرێ .

﴿ فَإِنِ انْتَهَوْا فَإِنَّ اللهَ بِما يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ دوایی ئەگەر ئەوان کۆتایی بکەن لەهاوبەش دانان وئاشوب سازان و ئازاردانی موسڵمانان و کۆتایی بکەن لەرێگەگرتن لەپەرستنی خواو بتیش نەپەرستن، دوایی بەڕاستی خوا ئەوشتە ئەبینێ ئەوان ئەیکەن و نهێنی ئەوان ئەزانێ، پاداستنی هەمو شتێ ئەداتەوە .

﴿ وَإِنْ تَوَلَّوا فَاعْلَمُوا أَنَّ اللهَ مَوْلاكُمْ نِعْمَ المَوْلَى وَنِعْمَ النَصِيرُ ﴾ وەئەگەر ئەوبت پەرستانە وەر چەرخێن وپشت بکەنە ئاییني خوا، پەرستن و ڕاستی وەرنەگرن، بگەڕێتەوە بۆ لای جەنگ کردن لەگەڵ موسڵماناندا، دوایی ئێوەی موسڵمانان بزانن بەڕاستی خوا پاریدەدەرو گەورەی ئێوەیە. خۆتان بگرن و مەترسن لەکاتی جەنگدا، خوا چاك گەورەیە کە، واز لەدۆستانی خۆی نایەرێ، وەچاك یاریدەرێکە و باوەڕداران زال ئەکا بەسەر بێ یاوەڕاندا.

کۆتایی بەم نوسراوە هات ڕۆژی یەك شەممە ١٩/ ١٩٩٩/٨ - زایینی

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سوپاس بۆ خوای هەموو بونەوەران، درودی بێ پایان لەسەر گیبانی پێغەمەری نازدار وهاوڕێ ویارو یاوانی بێ هەتا کۆتایی جیهان .

لەدوای مانای ئایەتە پێشوەکانی خوای مەزن بۆمانی ڕوون ئەکاتەوە دەستوری دیاری کراو بۆ دەست کەوتی دارایی لەبێ باوەڕان، ڕوئەکاتە موسڵمانان و ئەفەرموێ :

وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤١﴾

﴿ وَاعلَمُوا أنما غَنِمْتُم مِنْ شَيءٍ ﴾ وەئێوەی باوەڕدار بزانن بەڕاستی شتێ ئێوە ئەی گرن و دەستان ئەکەوێ لەدارایی بێ باوەڕان بەزۆر لەهەرشتێ کەمبێ یازۆر یا ئەو شتە دەرزی و دەزوش بێ .

﴿ فإنَ للهِ خُمسَهُ لِلرّسُولِ وَلِذي القُربى و اليَتامى وَالمَساكِينِ وَإبَنَ السَبيلْ ﴾ دوایی بەڕاستی پێنج یەکی ئەو دەست کەوتە بۆ خوایە وبۆ نێراوی خوایە بۆ خزمەنزیکەکانی پێغەمەرە کەبریتیتن لە بەرەی هاشم وعەبدولموتەلیب بەگشتی ئەوانەیان موسڵمانن بۆهەتیوانی بێباوك دایك و بێ دەرامەتن و بۆ هەژارانی موسڵمانانە بۆ کەسانێکن لەکارواندان و دوورن لەنیشتمانی خۆیان .

پوختەو درێژەی مانای ئەو ڕستانەی پێشوو بەگوێرەی یاسای ئیسلام بەم جۆرەی خوارەوەیە :

١- ئەودەست کەوتەی موسڵمانان ئەیگرن لەبێ باوەڕان بە زۆرو بازووی خۆیان لەجەنگدا ،لەپێش هەموو شتێکا ئەومۆسڵمانەی بێ باوەڕێ بکوژێ یا وای لێ بکا بەجۆرێ دوایی بەکاری جەنگ کردن نەیە ، وەك کوێری بکا یاهەردوودەستی یاهەردووقاچی ببڕێ لەوکاتەدا هەرشتێ لەگەڵ ئەوپیاوەبێ باوەڕە بێ ئەدرێ بەو موسڵمانە کەئەوکارەی کردووە .

٢- لەپاشا ئەوەی مایەوە لەو دەست کەوتە ئەکرێ بەپێنج بەشەوە بەم جۆرەی خوارەوە :

أ- پێنج یەکێکی بۆ خوایە و بۆ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ڕونە بەشی خوایش هەربۆ پێغەمەرە ﴿ﷺ﴾ ئەو بەشەی پێغەمەر دائەنرێ بۆ پێویستە گرنگیەکانی موسڵمانان بەگشتی ، وەك دروست کردنی ڕێگەوبان و کڕینی چەك و تفاق بۆ جەنگ و بۆ موچەی قازیەکان جگەی سەربازەکان ، بۆ موچەی زانا ئایینیەکان باساماندارش بن .بۆ دروست کردنی مزگەوت و خەستەخانە هەتادێ .

ب- پێنج یەکێ تری ئەدرێ بەبنەماڵەی هاشم و بنەماڵەی موتەلیب باساماندارش بن لەژن ولەپیاو ،بەڵام پیاوان دووئەوەندەی ژنانیان ئەدرێتێ هەروەك میرات بەومەرجەی موسڵمان بن .

جـ- پێنج یەکی تری ئەدرێ بەهەتیوانی بێ باوك و موسڵمان و بێ دەرامەت ،ئیتر بازۆڵ و دۆزراوە بن .

د- پێنج یەکی تری ئەدرێ بەهەژاران بەو مەرجەی موسڵمانبن ، ئیتر با هەردارابیان نەبێ یا ببیانبێ و بەشیان نەکا .

هـ- پێنج یەکی تری ئەدرێ بەو کەسانە کاروانی بن و هەژاربن و دەستیان نەگاتە نیشتمانی خۆیان ، ئیتر ژنبن یا پیاو .

٣- ئەو چوار پێنج یەکەی تری دەست کەوت و تالانی بێ باوەڕان ئەدرێ بەسەربازەکان کەدانراون بۆ جەنگ کردن لەگەڵ بێ باوەڕاندا بە گوێرەی پێویستی ژیانی خۆیان و خێزانیان لەگەڵ براورد کردنی کاتی هەرزانی وگرانی و شوێن و کاتیان ،

لـەدوای مردنی ئەو سەربازانە موچەکەی ئەدریٚ بە باوك و باپیرو نەنکی باوکی و بـەکورٍ و کچەکانیان هەتا وایان لیٚ دیٚ خۆیان بژێنن بەو مەرجەی موسلّمانبن .

﴿إِنْ كُنتُمْ آمَنتُمْ بِاللهِ وَماأنزَلْنا على عَبْدنا يَوْمَ الْفُرقانِ يَـوْمَ الْتَقى الجمعانِ ﴾ ئەگـەر ئێوە باوەڕتان هێناوە بەخوا. یانیٚ پێویستە ئەو پێنـج یەکـە بـدریٚ بـەو کەسـانەی پێشـوو ئەگەر باوەڕیان بەخوا هەیە، بەتەمای ئەو بەشە بن فنیات بکەن بە تەمای ئەو چـوار پێنـج یەکەی تری تالاّنی بیٚبـاوەڕان مـەبن و، ئەگـەر بڕواتـان هیـە بەشـتیٚ ئێمـە ناردومانەتـە خوارەوە بەسەر بەندەی ئێمەدا کە موحەممەدە لـە ڕۆژیٚ کەڕاست و پوچی جویٚ کـردەوە کە ڕۆژی بەدرە ڕۆژی بەیـەك گەیشـتنی ئـەو دوو کۆمەڵـە لـەباوەڕداران و بیٚبـاوەڕان هەڵتەقان بەیەکا لـەو ڕۆژەدا .

﴿ وَاللهُ عَلى كُلِ شَيءٍ قَديْرٌ ﴾ وەخوا دەستەلاّتی بەسەر هەمو شـتێکا هەیـە، خـاوەنی توانایەئەوەبو موسلّمانانی زالّکرد بەسەر بیٚ باوەڕاندا .

لـەپاشا خوای مــەزن ڕونـی ئەکاتـەوە بـۆ موسـلّمانان چۆنیـەتی یـاریدانی خـۆی بـۆ موسلّمانان لـەڕۆژی بەدردا و ئەفەرمویٚ:

إِذْ أَنتُم بِٱلْعُدْوَةِ ٱلدُّنْيَا وَهُم بِٱلْعُدْوَةِ ٱلْقُصْوَىٰ وَٱلرَّكْبُ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ لَٱخْتَلَفْتُمْ فِى ٱلْمِيعَٰدِ وَلَٰكِن لِّيَقْضِىَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَىَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ إِذْ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِى مَنَامِكَ قَلِيلًا

وَلَوْ أَرَىٰكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَ ۗ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤٣﴾ وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ ٱلْتَقَيْتُمْ فِىٓ أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِىٓ أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِىَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٤٤﴾

﴿ إِذْ أَنْتُمْ بِـالْعِدْوَةِ الْدُنْيـا وَهُـمْ بِـالعَدوَةِ القُصـوى ﴾ بـيری ئەوکاتـه بکەنـەوە ئێوەی‌موسلمانان لەکەناری‌ئەو شیوەبون نزیکبو لەمەدینەوە، قاچتان دائەچوو بەنێو لمدا و ئاویشتان دەست نەئەکەوت و، بێ باوەڕان لەکەناری ئەو شیوەبوون دوربون لەمەدینەوە، جێگەیان خۆش و ئاودار بوو .

﴿ وَالْرَكـبُ أَسْفَلُ مِنْكُـمْ ﴾ وەسـوارانی کاروانەکـه بەسـەرۆکایەتی ئەوبوسـوفیان لەجێگەیەکی دورتر و خوارتر لەئێوە بەنزیکەی سێ‌کات ژمێر، ڕێگەی خۆیانیـان گـۆڕی بۆلای کەناری دەریای سوور. مەبەست لەبیر خستنەوەی ئەو شتانە ئـەوەبو کەئەوشـتانە لەسودی موسڵماناندا تەواوبوون، وەك لەمەوپاش بۆمان ڕون ئەبێتەوە .

﴿ وَلَو تَواعَدْتُم لَآختَلَفْتُمْ في المِيعْادِ﴾ وەئەگەر ئێوەی موسڵمان و ئەوانەی بت پەرست بەڵێنیان بدایە بەیەکتری یەکەم کات بۆ جـەنگ کـردن نـەك ڕێگـەگرتن لەکاروانەکـە، لەدواییدا بۆ ئێوەی موسڵمان دەرکەوتایەوە بت پەرستان ژمارەیان زۆرترن لەئێوەو چەك و تفاقیشیان زۆرترە، ئێوەیش ژمارەتان کەمە و چەك و تفاقیشیان کەمترە، بەڕاستی ئەوکاتـە ئێوە ئەبو بەئاژاوەتان لەو جێگەیە بەڵێنتان پێدرا بۆ ڕێگـەگرتن لەوکاروانـە لەمەدینـەدا، لەترسانا دووا ئەکەوتن لەجەنگ یانێ کـاتێ موسـڵمانان چونـه دەرەوە لـەگـەڵ پێغەمـەر

لەمەدینە بۆ گرتنی کاروانەکە بو، بەنیازی جەنگ کردن نەچونە دەرەوە، بەلاّم خوای مەزن ڕۆیشتنەکەی گۆڕی لەبۆ بەدەست هێنانی دارایی کاروانەکە بۆلای جەنگ کردن لەرێگەی خوادا، گۆڕینەکەیش چاکەی زۆری تێدابوو بۆ موسڵمانان، ئەگەر یەکەم جار بۆ جەنگ کردن بچونایە تە دەرەوە، ئەگەر بەڵێن بدرایە بۆ جەنگ لەگەڵ بت پەرستانائەچنە دەرەوە بۆیان دەرکەوتایە ئەوان زۆرن وئەمان کەمن هەندێ موسڵمانان ئەترسان و وازیان ئەهێنالەجەنگ، ئەبو بەئاژاوەیان لەگەڵ ئەوکەسانەدا ئەیان ویست جەنگ بکەن لەوکاتەدا دۆستانی خوا زاڵ نەئەبون بەسەر دوژمنانی خوادا.

﴿ وَلَكِنْ لِيَقْضِيَ اللهُ أمراً كانَ مَفْعُولاً ﴾ وەبەلاّم خوا ئێوەی کۆکردەوە لەگەڵ بت پەرستانبەبێ وادەو بەڵێن لەنێوان ئێوەو ئەواندا هەتا خوا بسازێنێ کارێ ئەبوایە بکرایە بەگوێرەی زانیاری خۆی کەسەرکەوتنی دۆستانی خواو بەژێرکەوتنی دوژمنانی خۆی .

﴿ لِيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنْ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَى مَنْ حتى عَنْ بَيِّنَةٍ﴾ لەبەرئەوەی لەناو بچێ و بمرێ کەسێ ئەمرێ، بێ بەپەند بەڕوونی و بەئاشکرایی. یانێ خوا یاریدەی دۆستانی خۆی دا بەسەرکەوتن، دوژمنانی خۆی لەناوبرد لەرۆژی بەدردا، بۆ ئەوەی ئەوکارانە ببنە بەلگەی ئاشکرا و بێگومان و تەمێ کردن لەسەر بێ باوەڕان، هەروایش ببێ بەبەڵگەی ئاشکرا بۆ قازانجی ئەوکەسانە باوەڕیان هێناوە .

﴿ وَانَّ اللهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ وەبەڕاستی خوا ئەبیسێ گفتوگۆی موسڵمانان و بت پەرستان، ئەزانێ کاروکردەوەی هەمویان، هیچ شتێ لەخوا پەنهان نیە لەگفتوگۆو کردار و لێدانی دڵ .

پرسیار/ ڕوواڵەتی مانای دەرکەوتوی ئەوئایەتە وادەرئەخا هەرکەسێ زۆران بگرێ لەگەڵ ڕاستیدا ئەبێ بدرێ بەزەویدا کەچی بەچاوی خۆمان ئەبینین زۆر خراپەکەر سەرکەوتوە بەسەر ئەو کەسانەدا چاکە خواز و چاکە کەرن ؟

وەلاّم/ خوای مەزن باوەڕداران ئاگادارئەکا لەسەر زمانی پیغەمەر ﴿ ﷺ﴾ پێش جەنگی بەدر کە موسڵمانان سەرئەکەون لەگەڵ ئەوەیشدا ژمارەیان کەمن و لاوازن و

چەکیان کەمبوو، ئەوەبو لـەئایەتی ( ٧٥) ی ئەم سـورەتەدا فـەرموی: خـوا بـەڵێن ئـەدا بەئێوە بەیەکێ لـەو دووتاقمانەی بێ باوەڕان، لـەئایەتی (٩) ی ئەم سـورەتەدا ئەفـەرموێ: من یاریدەی ئێوە ئـەدەم بەهـەزار کـەس لـەفریشـتە، لـەئایـەتی (١٩) ی ئـەم سـورەتە دا ئەفەرموێ: پێغەمەر مشـتێ خـۆڵ و وزیخـی هـەڵگرت فڕەیـدا بـۆ بـت پەرسـتان، ئـەو فەرمودانە هـەمویان کـاری پـەك خـەرن ودەرکـەوتن لـەسەردەسـتی پێغەمـەر ﴿ ﷺ ﴾، مەبەست لـەدەرکەوتنی بەڵگەیش لـەوئایەتەدا سەرکەوتنیموسـڵمانانە بەتەنـها لـەجـەنگی بەدردا، هـەواڵدانی پیغەمـەرە بەوسـەرکەوتنە بەرلـەپـەیدابوونی، مەبەسـت سـەرکەوتنی موسڵمانان نیە بەتەنها لـەهەموو کاتیکا .

﴿ إِذْ يُرِيكَهُمُ اللهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلاً ﴾ تۆ بیری ئەوکاتە بکەرەوە خوا بێ باوەڕانی نیشـاندا بەتۆ لـەخەوی تۆدا بەژمارەیەکی کەم، خەوبنینی تۆیش سروشە لـەلایـەن خـوای مەزنـەوە هەتا ئێوە نەترسن و ئـازاو دلـێربن، بـەو بـەڵێن دانـەی خـوا سـەرکەوتنی خۆتانتـان بـۆ دەرکەوت .

﴿ وَلَوْ أَرَاكَهُمْ كَثِيراً لَفَشِلْتُمْ وَلَتَنَازَعْتُمْ فِي الأَمْرِ ﴾ وەئەگەر خـوا بێباوەڕانی نیشـان بدایە بەتۆ بەژمارەی زۆر بەڕاستی ئاژاوەتان ئەکرد لـەفەرمانی جەنگدا خۆتانتان نەئـەگرت وەهەڵهاتن و دووبەرەکیتان لێ پەیدا ئەبوو، ئەو خەوبینینـەی پیغەمـەر ﴿ ﷺ ﴾ کـارێکی پەك خەرەکە ژمارەی بـێ باوەڕانیبەکـەم نیشـاندا بـەهاوڕێکانی بـەهۆی ئـەو خـەوەوە، ئەوانیش موژدەیان دا بەیەکتری، دلێری و ئازاییان بۆ گەڕایـەوە، ئەگـەر بـەژمارەی زۆر بێباوەڕانی نیشان بدایە هورەیـان ئـەچوو سسـتی ڕوی تێئـەکردن لـەجـەنگداو دووایـی ئەترسان و هێزیان نەئەما .

﴿ وَلَكِنَّ اللهَ سَلَّمَ إِنَّـهُ عَلِيـمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴾ وەبـەڵام خـوا موسـڵمانانی پاراسـت لـەدووبەرەکی وئاژاوەی نێوان خۆیان و لـەگیروگرفت ڕزگاری کردن، خـوا بـێ وەیـی و تەندروستی پێ بەخشین، بەڕاستی خوا ئەزانێ بەشتێ لـەدڵی موسڵماناندا هەسـتی ئەکـەن

بەترس کەلایان ڕونبیٚ بت پەرستان ژمارە وچەکیان زۆرە، بۆیە خوا ئەوهەستەی لیٚ دوورخستنەوە بەوشتە پێغەمەری گەورەمان پیشانی درا لەخەویا بەکەمی ژمارەی دوژمنان و لاوازیان .

﴿ وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذا لَتَقَيتُمْ فِي أَعْيُنِكُمْ قَلِيلاً ﴾ وەئێوەی هاوەڕێکانی موحەمەد ﴿ﷺ﴾ بیری ئەوکەتاە بکەنەوە خوا پیشانی دا بەئێوە بیٚباوەڕان بەژمارەی کەم لەبەرچاوی ئێوەدا کاتیٚ ئێوە گەیشتن بەیەك و بەیسەکا هەلّتەقان لەرۆژی بەدردا هەتا هورەتان بەرز بێتەوەو جەنگ بکەن لەگەلّ دوژمنانی خۆتانا بەدلێری‌و ئازایەتی و خۆڕاگرتن .

﴿ وَيُقَلِّلُكُمْ فِي أَعْيُنِهِمْ ﴾ وەخوا ئێوەی بەژماری کەمدانا لەبەرچاوی بت پەرستاندا، هەتا ئەوان کەمتەرخەم بن لەخۆ ئامادەکردنیانا بۆ جەنگ، هەروایش بوو بەجۆریٚ ئەبو جەهل ووتی: بەڕاستی هاورێکانی موحەمەد ﴿ﷺ﴾ بەشی تاکە خواردنێکی هوشترێکن، پاشەڕۆژ ئەوگالّتە ولەخۆبایی بوونە بوبەهۆی نەگبەتی و لەناوچونیان .

ڕوداوی کارو کردەوەی جیهان دەری خستوە و دەرکەوتوە کەبەڕاستی بەهێزترین چەکیٚ بەدەست دوژمنەوە ئەوەیە ئەو دوژمنەبەبیٚ نرخ دانرێن و خۆیانیان بۆ خۆمادەنەکریٚ .

﴿ لِيَقْضِيَ اللهُ أَمراً كانَ مَفْعُولاً ﴾ هەتا خوا فەرمان بدا بەکاریٚ ئەبوایە بکرایە، لەسەرکەوتنی موحەمەد و گرتنی ئەو دەست کەوت و تالاّن و کوشتن و دیل کردن و تێشکانی بیٚ باوەڕان. زانایان فەرمویانە: هۆی دووپات کردنەوەی ئەمەیە: لەئایەتی یەکەمدا بۆ کۆبونەوەی موسلّمانان و بت پەرستانە لەجەنگدا بەجگەی وادەو بەلّێن دانان بۆ جەنگ، لەئایەتی دووهەمدا بۆ ئەوەیە هەریەکیٚ لەو دوو تاقمە تاقمەکەی تر بەکەم بزانیٚ لەبارەی ژمارەیانەوە .

﴿ وَإِلَى اللهِ تَرجَعُ الأُمُورَ ﴾ وەبۆ لای خوا ئەگەڕێتەوە هەمو کارەکان ، بەڕاستی لەخزمەت خواوە دەرئەچیٚ و بۆ لای ئەگەڕێتەوە هەمو کاریٚ ، هەرخوایش هەلّیان

ئەسوڕێنێ بەدادپەروەری و دانانی هەموو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا لە پاداشتی چاکەو تۆڵەی خراپە.

لەدواییدا خوای مەزن فەرمان ئەدا بەجەنگ و خۆڕاگرتن و نەجولاّن لەجێگەی دیاری کراوی خۆیاناو ئەفەرموێ :

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةٗ
فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٤٥﴾
وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ
وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ
خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرٗا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ
عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿٤٧﴾ وَإِذۡ زَيَّنَ لَهُمُ
ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ مِنَ
ٱلنَّاسِ وَإِنِّي جَارٞ لَّكُمۡۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلۡفِئَتَانِ نَكَصَ
ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ مِنَ
ٱلنَّاسِ وَإِنِّي جَارٞ لَّكُمۡۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلۡفِئَتَانِ نَكَصَ
عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكُمۡ إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوۡنَ
إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٤٨﴾ إِذۡ يَقُولُ

إِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰؤُلَاءِ دِينُهُمْ ۗ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٩﴾

﴿ يا أيها الَّذِيْنَ آمَنُوا إِذا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا ﴾ ئەی کەسانێکی باوەڕتان هێناوە هەرکاتێ ئیوە گەیشتن بەکۆمەڵی بێ باوەڕان کەنیازیان جەنگکردن بوو لەگەڵ ئێوە، دوایی ئێوە خۆتان ڕاگرن و هەڵ مەیەن و پشتیان تێ مەکەن، ئەبێ ئەو تاقمە خراپە بلاو ببنەوە بەزەویدا بنەبڕببن .

﴿ وَاذْكُرُ اللهَ لَعَلَكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ وەئێوە بیری خوا بکەنەوە بەزۆری و بەزمان و بەدڵ داوابکەن لەخوا زاڵتان بکا بەسەر دوژمانانتانا و دڵتان بەهێزبکات لەکاتی ناخۆشیو جەنگدا نەترسن، هەموو کاتێ گوێ ڕایەڵی پێشەوای خۆتان بن، بۆ ئەوەی ئێوە سەربکەون بەسەر ئەو تاقمەدا و بەئاواتی خۆتان بگەن بەبێ ناکۆکی وبەبێ ئاژاوەی نێوانتان .

خوای مەزن باسی دووشتی کرد لەوئایەتەدا کە زۆر گرنگن کەهۆی سەرکەوتنن بەسەر ئەو سەرکێش و یاخیانە:

١- خۆڕاگرتن و نەبزوان لەجیگەی دیاری کراوی جەنگدا لەگەڵ پێغەمەری خۆیانا و هەڵ نەهاتن لەبەردەم دوژمناندا.

٢- بیرکردنەوە لەخوا زۆری لەشوێنەکانی جەنگدا ، بپاڕێنەوە کەزاڵیان بکا بەسەر دوژمنانی خۆیاندا بەزۆر پارانەوە ، ئەبێ بزانین بیرکردنەوە تەنها بەوەنابێ بێژوی (الله اکبر لاإله إلا الله ) بەدەم . بەڵکو مەبەست لەجەنگ وخۆڕاگرتن ئەوەیە بەپاکی هەرلەبەر خوابێ نەك بۆ ئەوەی ناویان بەئازا ببرێ ، جەنگ خواز و جەنگ هەڵگیرسێن نەبن لەهیچ کاتێکا مەگەر بۆ بەرگری لەخۆیان و ڕاوەستانی چاکەو پوچ کردن و نەهێشتنی خراپە ، بۆ ئەوەیشبێ خۆشی و کامەرانی بەندەکانی خوا و ئاسایش دەستی خراپە کەران لەزەویدا

ببڕێ و نەهێلرێ تالان و ڕوتانەوەی هەژارانی پێ بکرێ. ئاشوب و جەنگ بەرپا نەکەن بۆ ئەوە دانیشتوان بکەن بەژێر دەستەی خۆیان و پیت و فەڕی نیشتمانەکەیان بخۆن وبیدزن .

﴿ وَأَطِيْعُوا اللهَ وَرَسُولَهُ وَلاتَنازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾ وەئێوە فەرمانبەرداری خواو فروستادەی خوابن لەهەموو کارێکاو ئاژاوەو دووبەرەکی مەکەن لەنێوان خۆتانا، دوایی ئێوە بترسن و لاواز ببن بەرانبەر بەدوژمن، هێز و سامتان نەمێنێ و بای سەرکەوتن وزالبوون نەدا بەسەرتانا و کاروبارتان نەڕواو نەلوێ بۆتان .

﴿ وَاصْبِرُوا إنَّ اللهَ مَعَ الصّابِرِيْنَ ﴾ وەئێوە ئارام بگرن و خۆتان ڕاگرن لەجەنگداو هەلمەیەن، لەڕووی دوژمنانی خۆتانا، بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەوکەسانەیە خۆڕاگرن وئارام گرن و سەرکەوتن و زاڵ بوونی خۆیان ئەپارێزن .

بۆ زانین: ئەوشتەی بۆ ماندەردەکوێت لەودوو ئایەتەی پێشودا ئەمەیە کەبەهۆی سەرکەوتنی ڕاستی سێ شتە:

١- ئارام گرتن لەهەموو کارێکدا بەتایبەتی لەجەنگدا ، ئەوەیش بەوە پەیدا ئەبێ کەمرۆڤ خۆی ڕابهێنێ لەسەر فیداکاری بەهەمو شتێکی بەنرخەوەو بەدارایی و بەگییان بۆ زالبوونی ڕاستی و دادپەروەری بەسەر کاری پوچ و ستەمدا ، ئارامگرتن زۆر پێویستە بۆ هەمو مەبەستێ لەمەبەستەکان . کەواتە خوا پەرستی یاقوتابی یامامۆستا یا دروست کەرو هێنانەدی شتێکی نوێ یاهونەرمەند یابازرگان یاهەموکارێ تر بێ ئاواتی خۆیان نایەتەدی بەبێ ئەوەی ئارام گرتن و خۆڕاگرتن لەسەر ماندووبون بەردەاوم نەبێ .

٢- نیازی پاك لەهەمو کارێکا، واتە مەبەست لەوکارە هەر لەبەر خوابێ و پشت بەخوا ببەستێ نەك بەجگەی خوا، بڕوای وابێ بەبێگومان هەرشتێ لای خواوەبێت ئەوەچاکە، ئیتر پلەو پایەو سامان و کوڕو شتی تر بێ، هیچ شتێ لەوشتانە هەلنەبژێرێ بەسە پەرستندا. هەردەست کەوتێ بەفێلو ناوڕەوا بێ پێی ناوترێ سەرکەوتن، بەلکو شەیتان پەرستی و جەردەیی و خراپە بەهێزکردنە .

٣- خۆدورخستنەوە لەئاژاوەو ناکۆکی، ئەوناکۆکیە خوا قەدەغەی کردووە ئەوەیە بۆ بەدەست هێنانی هەوەس و ڕابواردن بێ و بۆ پەلاماردانی جیهان ولـەوەڕی جیهان بێت وبۆ ڕوتانەوەی دانیشتوان بێ، ببێتە هۆی دژایەتی لەنیو موسڵمانانداا، بگرە هۆی جـەنگ کردنیانە لەگەڵ یەکتری، ئەوەیە بەچاوی خۆمان ئـەیبینین هەرێمـەکانی بـەناو موسـڵمان پەلاماری‌یەکتری ئەدەن بەزمان و بەچـەك، ژمارەیـەکی‌زۆر لـەیـەك ئـەکوژن، بەهـەزاران شارو گوند و بەرهەم و ئابوری بنەبڕئەکەن، بەئامۆژگاری پیسـی هەرێمـەکانی ڕۆژئـاواو ڕۆژهەلات بەچەك و تفاقی ئەوان. نـەك بـەخۆڕایی بـەڵکو بەقـەرز وسـود،ئەنجامەکـەی لاوازی و گرانی پەیداکردنە بۆ هەرێمە موسڵمانەکان و برسێتی و ڕوتانەوەی دانیشتوانە، قەرزێکی زۆر ئەخەنە ئەستۆی گەلـەکەیان، بـەقازانج و سـوودی دوژمنانیـان تەواوئـەبێ، بەتایبەتی بۆ قـازانجی زاۆینیـەکان، ئەوانـە نمونـەیان زۆرەو نـاژمێرێن . بـەلام هـەندێکیان ئەنووسین بۆ تەمێ کردن بیرکردنەوە لەخۆیان، وێنەی جـەنگی نێـوان ئـێران وعـێراق، لیبیاو میسر، جەزائیرو مەراکیش، جەنگی یەمەنی باشوری لەنێو یەکدا، جـەنگی میسـرو یەمەنی باکوری، جەنگی نێوان پاکستان و بەنگلادیش، جەنگی ئـەفغان لـەنێو یـەکتریدا، کیمیابارانی کوردەکانو ڕوخاندنی پێنج سەد گونـدی کـوردان و ئـەنفال کردنـی (١٨٠) کەس لەکوردانی بێ تاوان و کوشتنی نیوملیۆن لەوان و دەرکردنیان لەنیشتمانی خۆیان. بەلام وائەبی ئاژاوە پەیدا ئەبێ لەنێوان دانیشتوان و برایانا بۆ کردنی کارێکی سوودبەخش بەگوێرەی بییرو باوەڕی خۆیان و دیاری کردنی ڕێگەیە بـۆ سـەرکەوتنی ئـایینی ئیسـلام، هەریەکەیان بەجۆرە کارێ ئەیانەوێ ئیسلام سەربخەن بـەگوێرەی بـیری خۆیـان، لـەگـەڵ ئەوەیشدا هـەموویان نیازیـان پاکـەو ڕاستی پەرسـتن ئـەو جـۆرە کـارو ناکۆکیـە دژی فەرمانبەداری خواو پیغەمەری خوانین، نابنە هۆی قەدەغەکردنیان و پێك نەهاتنیان لەسەر جەنگی بێ باوەڕان، بگرە زۆرجاران ئەبێتە هۆی دەرکەوتنی ڕاستی کەبەرزبێتـەوە ئـالای ئایینی ئیسلام، ئەو جۆرەیشیان زۆرەو نایەنە ژمارە .

دوایی فەرمان ئەدا بەخۆڕاگرتن و وەستان لەجەنگدا، فەرمان ئەدا بەنیازی پاك وپێك هاتن لەگەڵ یەکتری، قەدەغەیش ئەکا لێمان ئـەم سـێ شتەی خـوارەوە: سەرکێشـی و یاخی بون، خۆنیشاندان و نومایش بەدانیشتوان. ڕێگە گرتن لەئایینی خواو ئەفەرموێ:

﴿ وَلاتَكُونُوا كَالَّذِيْنَ خَرَجُوا مِنْ دِيارِهِمْ بَطَرًا وَ رِئـاءَ النـاسِ ﴾ ووەئێـوەی بـاوەڕدار لەگوناه کردندا مەبن وەك ئەوکەسانەی ئەوتۆ دەرچوون لەجێگەی خۆیان کەمەکەیە بۆ پاراستنی کاروانەکـەیان بـەفیزەوەو بـەیاخی بـوون لەچاکـەیخواو، بەخۆپیشـاندان و نمایشەوە بۆ ئادەمیزاد، زانیشیان کاروانەکە ڕزگاری بووە کەچی نەگەڕانـەوە بـۆ مەکـە ووتیان: ناگەڕێینەوە هەتا نەچینە بەدرو لـەوێ مەی نەخۆینـەوە. ئـەوەبو چـون و توشـی کوشتن و دیل کردن بوون لـەنێو عەرەبەکاناد ئابڕویان چو.

﴿ وَيَصدُونَ عَنْ سَبْيلِ اللهِ و اللهُ بِما يَعْمَلُـونَ مُحِيـطٌ ﴾ وەئـەو بـیٚ باوەڕانـە ڕێگـەیان لـەئادەمیزاد ئەگرت بۆ پەرستنی خواو ڕێگەی ئایینی خوا و چون بۆ لای خانەی خوا، خوا ئەزانیٚ بەشتیٚ ئەوان ئەیکەن و سزایان ئەدا لـەسەر ئەوشتەی ئەیکەن، هیـچ شـتیٚ لـەخوا پەنهان نی‌یە .

﴿ وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمْ الشَيْطانُ أعْمالَهُمْ وَقالَ لاغالِبَ لَكُمْ الْيَومَ مِـنَ النـاسِ ﴾ وەتـۆ بـیری ئەوکاتە بکەرەوە کەشەیتان کارەکانی بیٚ باوەڕانی بۆ ڕازاندبونـەوە بـۆ ئـەوەی جـەنگ بکەن و دوژمنایەتی تۆ بکەن، وەشەیتان خستیە دڵیان ووتـی: هیـچ کەسـیٚ نیـە زاڵببـیٚ بەسەر ئێوەدا ئەمڕۆ لـەئادەمیزاد، چونکە ئێوە ژمارەتان زۆرەو چەکی زۆرتان هەیە .

﴿ وَإِني جارٌ لَكُمْ ﴾ وەبەڕاستی من یاریدەی ئێوەم و فریاڕستانم، خراپـەو ئازارتـان لیٚ لائەدەم .

﴿ فَلَّما تَراءَتْ الفِئتانِ نَكصَ عَلى عَقِبَيْهِ ﴾ دوایی کاتیٚ هـەردوو تاقمەکـە گەیشـتن بەیەك و چاویان بەیەك کەوت شەیتان گەڕایەوەو بـەتوندی وپاشـەو پـاش چوبـە دواوە، چونکە لـەشکری خـوای بینـی لـەفریشـتەکان کەجـەنگ ئەکـەن لـەگـەل موسـڵمانانندا، تەڵەکە وفێڵەکەی پوچ بویەوە، کاتیٚ بیٚ باوەڕان شـەیتانیان بینـی هەڵـهات وتیـان: بـۆ ڕائەکەی خۆ تۆ یاریدەری ئێمە بوویت؟.

﴿ وَقالَ إني بَريءٌ مِنْكُمْ إني أرى مالاتَرَونَ ﴾ وەشەیتان ووتی لـەوەلاٚمیانا: بەڕاسـتی من بێزارم لـەئێوەو لـەجەنگی ئێوە و پەشیمانم لـەووتاری خۆم و توانای یاریدەی ئێوەم نیە. بەڕاستی من شتیٚ ئەبینم ئێوە ئەو شتە نابینن، ئەوشتە بریتیبون لـەفریشتەکان .

﴿ إنيْ أخافُ اللهَ وَاللهُ شَدِيْدُ العِقابِ ﴾ بەڕاستی من لەخوا ئەترسم لەم کاتەدا توشی خراپەیەکم بکا بەدەستی فریشتەکان، یالـەناوم ببـا، یافـەرمان بـدا بـەجبرەئیل بم گـرىو بەئێوەم بناسێنێ و، خوا سزای زۆرسەختە بۆ ئەوکەسـانە لـەخوا ناترسـن و یـاخی ئـەبن لەخوا .

زانایان فەرموویانـە: هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەوە ئایەتـەی سـەرەوە بـەم جـۆرەی خوارەوەیە:

کاتێ قورەیشیەکان پێك هاتن لەسەر ڕۆیشتن بۆ یاریدەی ئەوکاروانە ڕزگاری بکـەن، لەوکاتەدا لەنێو ئەواندا و لەنێوهۆزی کەنانەدا دۆستایەتی توندیان هەبوو، شەیتان بەهەلی زانی خۆی بردە وێنەی سوراقەی کوڕی مالیکی کەنانەییەوە، شەیتان گفتو گۆوڕابواردنی لەگەڵ بت پەرستان کرد، کاتێ فریشتەکانی بینی هەڵهات و ڕای کرد لـەکاتێکا دەسـتی لەنێو دەستی حاریسی کوڕی هیشامدا بو، حاریس ووتـی: بـۆچ بـەجێمان ئـەهێڵی لـەم کاتەدا، شەیتان ووتی: ئەوشتەی من ئەیبینم ئێوە نایبینن، کـاتێ بەشـکاوی گەڕانـەوە بـۆ مەکە ووتیان: سوراقە بو بەهۆی شکاندانی تاقمی ئێمە و هورەت بردین، ئەو روداوە کـە گەیشت بە سوراقە ووتی سوێندم بەخوا: هەستەم نەکردوە بـەچونی قورەیشـیەکان هـەتا هەواڵی شکاوی و لاوازی ئەوانم پێ گەیشتوە، کاتێ کەموسڵمان بوون زانییان شەیتان بوە خۆی بردوەتە وێنەی سوراقەوە.

ئەو ئایەتە بەزەقی ئەفەرموێ: لەوکاتە دا شتێ هەبوە کەقورەیشیەکانی هـان ئـەدا بـۆ جەنگ کردن لەگەڵ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لەبەدردا کەگرتبویە ئەسـتۆی خـۆی سـەرکەوتنی ئـەوان، شـەیتان کـاتێ بـۆی دەرکـەوت پاشـەڕۆژیان خراپـەو بەرەونەمانـە خـۆی لێ بێزارکردن، پیویستە ئێمە بڕوامان بەهەمو شتێ بێ خوا بەسروش بیبنرێ، ئـەقڵیش پـاڵی پێوەنانێ و بەلایەوە قەدەغەنیە شتێ هەبێ و زوربەی کەس نەی بینێ و دوودڵی و گومان و پوچی بخاتە دڵەوە، سەرلەئادەمیزاد بشـێوێنێ. خـوای مـەزن فـەرمانی داوە بەپێغەمـەر ﴿ ﷺ ﴾ پەنابگرێ لەخراپەو دودڵی خستنی شەیتان بۆ نێو دڵـی ئـادەمیزاد و لەخراپـە و دوو دڵی خستنی ئادەمیزادیش بۆ نێو دڵیان .

لەوکاتەدا شەیتان ڕازاندبویەوە بۆ بێ باوەڕان کردەوەکتانیان لەدوژمنایەتی فروستادەی خوا و بەردەوامی لەسەر جەنگ کردنی موسڵمانان ،تاقمێ ترهەبوون دووڕوبوون و دڵ نەخۆش کە تانەو نوانجیان ئەگرتە موسڵمانان، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ إذ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالذِيْنَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرضٌ ﴾ تۆ بیری ئەوکاتە بکەرەوە دووڕوەکانی دانیشتوی مەدینەو کەسانێکی ئەوتۆ نەخۆشی و بێ باوەڕی لەدڵیانایەو ئەڵێن:

﴿ غَرَّ هؤُلاءِ دِينُهُمْ ﴾ ئەوانەی تاقمی مەحەمەد ئاینەکەیان فریوی داون و خەڵەتاون بەجۆرێ کەئەچنە دەرەو بەژمارەی ( ٣١٣) کەس بەو کەمیە ئەیانەوێ زاڵ ببن بەسەر هەزار کەسی ئامادەکراو بۆ جەنگ بەنیازی ئەوەن خۆیان بدەن بەکوشت بۆ پاداشتی پاشەڕۆژ یان ئەو کەسانە زۆر سەرگەردان بوون کاتێ چاویان کەوت بەموسڵمانان بەو ژمارە کەمەوە ئەچن بۆ جەنگی ژمارەیەکی زۆر لەبت پەرستان .

﴿ وَمَنْ يَتوكَلْ عَلى اللهِ فانَّ اللهَ عَزيْزٌ حَكيمٌ ﴾ وەهەرکەسێ بڕوای تەواوی لەسەر خوا بێ و پشت ببەستێ بۆ کارێ لەسەرخوا، دوایی خوا بەڕاستی زۆر گەورەیەو بەدەسەڵاتە، ئەو کەسەی پشت بەخوا ببەستێ سەری ئەخا، هەمو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ ویاریدەی ئەو کەسە ئەدا. بەلاَم بەلای بێ باوەڕانەوە و بەلای دووڕوە دڵ نەخۆشەکان، بڕوا بەخواو پشت بەستن بەخواو پاداشت و بەهەشت بەلایانەوە گفتوگۆی بی مانـاو بێ سوودن، چونکەبەگوێرەی بیری ئەوان هەموو شتێ لەئاین و لەجەنگ و شتی تر هەر بۆ بازرگانی و پول پەیدا کردنە.

لەژێر ڕووناکی مانای ئەو ئایەتە پیرۆزەدا ئەم ڕاستیانەی خوارەوە باس ئەکەین لەژێر دروشمی ئایا کوردو پێشمەرگە خراپەکارو کاول کەرن ؟

ئالەم ڕۆژەدا کە هیزی تاونبارو دوژمنانی کوردو پیشمەرگە پیلان ئەگێڕن بۆ نەمانی ناوی کورد، ئەیانەوێ دانیشتوانی کورد لەنیشتمانی خۆیان و خانەی خۆیان دەربکەن بە منالْ و پیرو ژنەوە بەڕوتی فڕەیان ئەدەنە دەشتی چۆڵ .

ئالـەم کاتەدا کەپێشمەرگەکانی کورد جێگەی دوژمن لـەق و لۆق ئەکەن و خۆشـی و خەویان لێ تێك ئەدەن، ڕوی ئاواتی سەربەستی هەمو کورد دەرئەخەن، ئەیانـەوێ هـەموو کوردێکی دڵسۆز لـەخاکی داگیر کراوی خۆیانا ئازادبن، بەداخەوە پیـاوانی بـەناو ئـایینی ناوخۆیی و دەرەکی فرمێسك بۆ تاوانباران ئەڕێژن .

ئالـەم کاتەدا کەشاری هەڵەبجەی شەهید کیمیاباران ئەکرێ لـەلایەن دوژمنـانی ئـایینی پیرۆزی ئیسلام و مرۆڤایەتی، پیاوانی بەناو ئایین پەرست لـە بولَندو گودا هـاوار ئەکـەن و ئەڵێن: پێش مەرگە هۆی ئەو کیمیابارانەن، چونکە داوای مافی کورد ئەکەن پێـش ئـەو پیاوە ئایینیە فڕۆکە بەسەر شاری هەڵەبجەی شەهیدا ئەسوڕایەوەو ئەیووت کاربەدەستانی عێراق مافی خۆیانە هەموو خراپەیە بکەن لـەگەڵ کوردانداو پێشمەرگە خراپەکارن .

ئێمە پرسـبیار ئەکـەین لـەوکەسـانە پێش مەرگـە بـەکاول کـار دائـەنێن بـۆ بـیر لـە کۆبونەوەی سەردانی سی وولاَت ناکەنەوە لـەجەزائر بڕیاری نەمانی کوردیـان دەرکـرد و شۆڕو شەڕ وا کەکپ کرایەوە؟ بۆ بیر لـەڕوخانی پێنچ هەزار گوند و زیندە بەچاڵ کردنـی ( ١٨٠ ) هەزار کەسی کوردان بەناوی ئەنفتالـەوە ناکەنەوە، بۆ بیر لـەوە ناکەنــەوە کـار بەدەستانی دراوسێ ئەڵێن کورد هەر نیەو نیشتمانی نیە و نابێ بەزمانی خۆیان بدوێن، ئەی بۆ بیر لـەفەرمودەی پێغەمەر ناکەنەوە ( مَنْ ماتَ دُونَ عِقالٍ مِـنْ مالِـهِ مـاتَ شَـهیداً ). بـۆ ئەبێ بەرگری لـەناموس و دارایی و نیشتمان خراپ بێ و فتوای کوشتنمان بدرێ ؟

بەیاریدەی خواو هێزی پێشمەرگەو گەلی دڵسۆز لـەڕاپەڕینی ساڵی ( ١٩٩١ ) کـەمێ هەناسەی خۆشیماندا. بەڵام بەداخـــەوە پێشـــمەرگە و شـەهیدانمان بـێ خـاوەنن، دوژمـن کراون بەکار بەدەست بۆیان. بەڵام پەنا بەخوا پاشەڕۆژمان بــەرەو ئـازادی و سەربەسـتی ئەڕوا، پشت بەخوا ئەبەسـتین، خـوا ئەفـەرموێ: ﴿وَمَـنْ یَتوكَـلْ عَلَـى اللهِ فـانَّ اللهَ عَزیْـزٌ حَلکیمٌ﴾ وەك لـەمەوبەر باسمان کرد.

وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ

وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴿٥٠﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿٥١﴾ كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيّٞ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٥٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمۡ يَكُ مُغَيِّرٗا نِّعۡمَةً أَنۡعَمَهَا عَلَىٰ قَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٥٣﴾ كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ فَأَهۡلَكۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡ وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَۚ وَكُلّٞ كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿٥٤﴾

﴿ وَلَوْ تَرى إِذْ يَتَوفى الذِيْنَ كَفَرُوا المَلائِكَةُ ﴾ وەئەگـەر تـۆ ئـەبینیٚ کـاتیٚ فریشـتەکان گیانی کەسانێکی ئـەوتۆ وەرئـەگرن لـەکاتی مردنیانـا بەڕاسـتی تـۆ فـەرمانێکی گـران و گەورەو سزاییێکی گەورەو ناهەموار ئەبینیٚ توشیان ئەبیٚ لـەوکاتەدا .

﴿ يَضْرِبُونَ وجُوهَهُمْ وَأَدْبارَهُمْ وَذُوقُوا عَذاب الحَرِيقِ ﴾ فریشتەکان ئەدەن لـەڕومـەتیان و تەنیشتیان و پشتیان بەشیشی ئاسنی ئاگرین ، ئەو لیٚدانە هیٚمایە لـەو سـزایە توشی بـیٚ باوەڕان ئەبی لـەکاتی مردنیانا ، دروستیشـە ئەولیٚدانـە هەربـەوجۆرە بـیٚ و لـەڕومـەت و پشتیان بدریٚ ، ئیتر بانەیش بینریٚ بەهەر جۆریٚ بیٚ بیٚ باوەڕان لـەکاتی مردنو پیٚش مـردن سزایان ئەدریٚ بەهەر سشیٚوەیەك بیٚ و، ئەبیٚژریٚ بەوبیٚ باوەڕانە : ئیٚوە بچیٚژن سـزای زۆر سوتیٚنەرو ئازاردەر کەپیٚشەکیە بۆ چونی نیٚو دۆزەخ و سزای گرانتر . ئەو ئایەتە هەچـەندە

بەڕواڵەت ڕووی پێ کراوە بۆلای پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەلام مەبەستەکە بۆ هەموو کەسێکە ئەوشتە ببینێ، چونکە ئەوباسە بۆ ئامۆژگاری کردن و تەمێ وەرگرتنە، مەبەستیش لەبێ باوەڕان لەوئایەتەدا هەموبێ باوەڕانە لەسەر زەویدا، هەندێ زانایان ئەڵێن: مەبەست بت پەرستانی بێ باوەڕانی قورەیشیەکانە.بەتایبەتی ئەوانەیان جەنگیان کرد لەگەڵ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەبەدردا ،چونکە باسەکە هێشتا باسی ڕوداوی بەدرە .

﴿ ذَلِكَ بِمَاقَدَّمَتْ أَيدِيَكُمْ وَأَنَّ اللهَ لَيْسَ بِظَلامٍ لِلعَبيدِ﴾ ئەولێدان و سزایە بەهۆی شتێکە کردوتانە لەبێ باوەڕی و پێشی خۆتانتان خستوە، ووشەی دەست هێمایە لەتواناو، بەڕاستی خوا ستەم ناکا لەبەندەی خۆی لەسزادانیاناو بێ تاوان سزا نادرێ، زۆر ڕونەپرسیار لەخوا ناکرێ و هەموو شتێکی دادپەروەریە. لەپاشا خوای مەزن ڕوونی ئەکاتەوە کەبەسەر هاتی ئەو بێ باوەڕانە وێنەی بەسەرهاتی کەسانێکی ئەوتۆن پێش ئەوان کەوتوونو ئەفەرموێ:

﴿ كَدأبِ آلِ فِرْعَوْنَ ﴾ ئەوخو و ڕەوشتەی بێ باوەڕانی قورەیش لەبێ باوەڕی و دوژمنایەتی پێغەمەر وێنەی خو ڕەوشتی تاقم و پیاوەماقوڵەکانی فیرعەونە لەبێ باوەڕیو دوژمنایەتی موسا .

﴿ وَالذِينَ مِنْ قَبلِهِمْ كَفَرُوا بِآياتِ اللهِ ﴾ وەبەوێنەی خوو ڕەوشتی کەسانێکی ئەوتۆن پێش بێ باوەڕانی قورەیشی بێ باوەڕیان بەئایەتەڕونەکانی خوا نەهێنا کەبەڵگەبوون لەسەر یەکێتی خوا و لەسەر پێغەمەرایەتی و کارەپەك خەرەکانیان، وێنەی گەلی نوح و لوت و عاد و سەمود .

﴿ فَأَخَذَ اللهُ بِذُنوبِهِمْ إنَ اللهَ قويٌ شَديدُ العِقابِ ﴾ دوایی خوا ئەو کەسانەی گرت و سزای دان بەهۆی گوناهەکانیانەوە کەبێ باوەڕی و بەدرۆخستنەوەی پێغەمەرەکانیان، قورەیشیەکانیش سزایان درا بەکوشتن و دیل کردن. سزای گەلانی تریش سزایان باسی ئەکرێ لەجێگەی خۆیانا . بەڕاستی خوا زۆر بەهێزە سزای زۆر سەختە بۆ بێ باوەڕان ، هیچ شتێ ڕێگە لەتواناو سزای خوا ناگرێ .

﴿ ذلِكَ بِأنَ اللّهَ لَمْ يَكُ مَغيراً نعمَةَ أنْعَمَها عَلى قَومٍ ﴾ ئەو گرتن و سزادان و تۆڵە لێ سەندنەوە لەو گەلانەی ڕابورد بەهۆی ئەوەوەیە خوا چاکەی بەخشیبێ و ڕژاندبێتی بەسەر تاقمێکا نای گۆڕێ و لەوانی ناسێنێتەوە، ئەو چاکەیش بریتی بوو لەناردنی پێغەمەر بۆ لایان و بڵاو کردنەوەی ئاسایش و هەرزانی لەنێویانا .

﴿ حَتى يُغَيِرُوا مابِأنْفُسِهِمْ ﴾ هەتا ئەو گەلەنەگۆڕن شتێ بەخۆیانەوەیە لەچاکەو نەڕۆن بۆ خراپە و لەخراپەیەکی خراپ نەڕۆن بۆ لای خراپتر و بێ سوپاسی خوا بکەن، وێنەی قورەیشیەکان باوەڕیان نەهێناو گۆڕییان بەبێ باوەڕی، خزمایەتیان گۆڕی بەدوژمنایەتی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بەخوێن ڕشتن و گاڵتەپێکردن بەئایەتەکانی خوا، هەرزانی ورۆزی فروانیان گۆڕی بەگرانی و لابردنی دارایی .

پرسیار / بەوجۆرەی دەرکەوت لەوئایەتەوە :هەرگەلێ بەردەوامبێ لەسەر فەرمانبەرداری خوا، ئەو ڕۆزی و چاکەو بەخششە پێی داون نای گۆڕێ و لەوانی ناسێنێتەوە. بەڵام هەرکاتێ بێفەرمانی خوابکەن خوا لەوانی وەردەگرێتەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەبینرێ گوناهباران هەتا بێفەرمانی زۆربکەن سامانیان زۆرترئەبێ یالەسەریان هەڵناگیرێ و لەوانی تێك نادا ؟.

وەڵام / بەڕاستی ئەو ئایەتە باسی گوناه کردن و بێباوەڕی نەکردوە ، هەر ئەوەندەی فەرموە: خوا ئەو چاکەیە ناگۆڕێ لەسەر هیچ کەسێ هەتا خۆی نەی گۆڕێ ئەو شتەی بەخۆیانەوەیە، خوا ڕونی نەکردوەتەوە چۆنیەتی ئەو گۆڕانە، بەگوێرەی ئەوەی کەگەلانی پێغەمەرانی پێشوو سزایان دراوە ئەگەر بەووردی بۆی داچین بۆمان دەرئەکەوێ مەبەست لەناوەڕۆکی ئەو ئایەتە ئەمەیە: خوای مەزن هیچ گەلێ لەناو نابا لەجیهاندا هەتا پێغەمەریان بۆ نەنێرێ و داوایان لێبکا بۆ لای ئایینی خوا دەم بەدەم و ڕوبەڕو بۆ باوەڕهێنان، دوایی ئەو گەلە ڕو لەوپێغەمەرە وەرگێڕن لەداوای ئەو، وێنەی بانگ کردنی گەلی قورەیش و گەلی فیرعەون و گەلانی پیش ئەوان، ئەگەر خوا پێغەمەری بۆ نەناردنایە سزاکەیانی دوورئەخست هەتا ڕۆژیپرسیاروپاداشت، خوا لەهەموو کەس زاناترە .

﴿ وَأَنَّ اللّٰهَ سَـمِيْعٌ عَلِيـمٌ ﴾ وەئــەو ســزا و گرتــن و تۆڵەســەندنەیش بــــەهۆی ئەوەوەبوکەبەڕاستی خوا ئەبیسیٚ گفتوگۆی نارێکی ئـەو بـیٚ باوەڕانـە کەپێغەمـەر بـەدرۆ ئەخەنەوە، ئەزانیٚ بیرو باوەڕیان چۆنە، سـزای پاداشـتی هەموکـەس ئەداتـەوە بـەگوێرەی کردەوەی خۆیان و نیازی خۆیان .

﴿ كَدَأْبِ آلِ فِرْعَونَ وَالَّذِيْنَ مَنْ قَبْلِهِمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِ رَبِهِمْ ﴾ ئەو بیٚ باوەڕانــەی ئــەوتۆ کوژراون لـەڕۆژی بەدردا چاکەی خۆیان گۆڕی بەوێنەی ڕەوشــت و کـردەوەی تـاقمی فیرعەون و کەسانێکی ئەوتۆی پێش ئەوان باوەڕیــان بەئایەتــەکانی پــەروەردگاری خۆیــان نەهێناو بەدرۆیان خستەوە .

دووپات کردنەوەی ئەو ڕستەیە ئەمەیە: نــاوەڕۆکی ئایــەتی یەکـەم بەئایـەتی دووهـەم بەهێزتر بکاو مەبەستیش ئەوەیە ئایەتی یەکەم ڕوونی بکاتــەوە ئــەوبیٚ باوەڕانـە شایسـتەی سزای پاشەڕۆژن. مەبەستیش لـەئایەتی دوهەم ئەمەیە شایستەی سزای جیهانن، ئەوەیە خوا ئەفەرمویٚ:

﴿ فَأَهْلَكْنـاهُمْ بِذُنُوبِـهِمْ ﴾ دووایـی ئێمـە لــەناومان بـردن بـەهۆی گوناهەکانیانــەوە. بەتایبەتی بەهۆی بەدرۆخستنەوەی پێغەمەرەکانیانەوە .هــەندێکیان بــەهۆی بومەلــەرزەوە، هــەندێکیان بــەهۆی ڕۆچونـی زەوی لـەژێریانــەوە، هــەندیٚتریان بــەهۆی ڕژاندنـی بــەرد بەسەریانا لـەئاسمانەوە، هــەندێکیان بـەبای ناهـەموار، هــەندیٚ تریـان کردنیــان بەمــەیمون، قورەیشیەکان بەشمشێرو بەتیروکەوان .

﴿ وَأَغْرَقْنا آلِ فرعَونَ ﴾ وەئێمە خنکاندمان گەلی فیرعــەون بـەئاوی دەریـای ســوور، وێنەی ئەو ڕستانەی لـەئایەتی ( ١١ ) ی سورەتی ئالی عیمراندا جاریٚ تر ڕۆیشتوە .

﴿ وَكُلٌّ كانُوا ظالِمِيْنَ ﴾ هــەموتاقمیٚ لــەو گەلانـە ستەمکاربون. یـانی هــەمو یـەکیٚ لـەگەلی فیرعــەون کـە خنکــان و تاقمـەکانی قورەیـش کـەکوژران ستەمیان لــەخۆیان و لـەدانیشتوان کرد کەباوەڕیان نەهێنابە پێغەمــەرەکانیان و ڕێگـەیان لـەدانیشـتوان ئـەگرت لـەخوا پەرستن و لـەخانەی خوا .

لەپاشا خوای مەزن باسی بێ باوەڕان بەخراپە ئەكاو ئەفەرموێ :

إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٥﴾
ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِّ مَرَّةٍ
وَهُمْ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾ فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِي ٱلْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِم
مَّنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن
قَوْمٍ خِيَانَةً فَٱنۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ
﴿٥٨﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُوٓاْ إِنَّهُمْ لَا يُعْجِزُونَ ﴿٥٩﴾
﴿٥٨﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُوٓاْ إِنَّهُمْ لَا يُعْجِزُونَ ﴿٥٩﴾
وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ
تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ
لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فِي سَبِيلِ
ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٦٠﴾ ۞ وَإِن جَنَحُواْ
لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦١﴾
وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ ٱللَّهُ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ

بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ۚ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٣﴾

ئەو ئایەتەی سەرەوە باسی چەند دەستورو فەرمانێ ئەکا لەبارەی ڕون کردنەوەی ئاشتی و جەنگ کەئەمانەن :

١- ﴿ إنَ شَرَ الدَوابِ عِندَ اللهِ الذيْنَ كَفَرُوا ﴾ بەڕاستی خراپترین بونەوەرێ بڕواو خۆی بکێشێ بەزەویدا لەلای خوا کەسانێکی ئەوتۆن باوەڕیان نەهێناوە ، بێباوەڕی جێگەی خۆی گرتوە لەدڵیانا ، وێنەی ئەبو جەهل و نەزو وعەتەبە و هاوڕێکانیان لەقورەیشیەکان ، کەعبی کوڕی ئەشرەف و حوبەیی و هاوڕێکانیان لە جولەکەکان .

﴿ فَهُمْ لايُؤمِنُونَ ﴾ دوایی ئەوکەسانە باوەڕناهێنن بە موحەمەد و چاوەڕوان ناکرێ باوەڕبهێنن .

﴿الَّذِيْنَ عاهَدَتْ مِنهُمْ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆن تۆ پەیمانی ئاشتەوایت لەگەڵ هەندێکیانان بەستبو ، وێنەی سەرۆکەکانی قورەیش و سەرۆکەکانی جولەکەکانی بەنوقورەیزە کەپێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ پەیمانی لێ وەرگرتن ناپاکی نەکەن و بەبێ ئاشوب لەشوێنیخۆیانا دانیشن و هەواڵ دەرنەبن بۆلای یەکتری .

﴿ ثُمَ يَنْقَضُونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِ مَرةً وَهُـمْ لايَتَقُـونَ﴾ لەپاشا ئەو کەسانە پەیمانەکەی خۆیان لەهەمو جارێکا ئەشکێنن . بەگوێرەی ناوەرۆك وبڕگەی پەیمانەکە هەڵنەسان ، ئەوان خۆیان ناپاریزن لەخواو لەشکاندنی پەیمان .

٢- ﴿ فَأما تَثقِفَنْهُم فِي الحَرْبِ ﴾ دوایی ئەگەر تۆ زاڵبوی بەسەریانان لەکاتی جەنگ کردنداو ئەوانت گرت بەدیلیو سەرکەوتی بەسەریانا.

﴿ فَشَرِّدْ بِهِمْ مَنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّـهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴾ دوایـی تـۆ ئـەو بـێ باوەڕانـەت گـرت بەجۆرێ ئازاریان بدەو پەرت و بلاوّیان بکە بەکوشتن و سزادانیان بەهۆی ئەوانەوە پرژو بلاو بن کەسانێ لەدوای ئەوانەوە دێن نەتوانن پەیمان بشـکێنن و دوژمنایـەتیت بکـەن و خراپە بکەن ،بۆ ئەوەی ئەو کەسانە ی پاش ئەوان تەمێ خواربن .

٣- ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِنْ قَوْمٍ خِيَانَةً فَانْبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ ﴾ وەئەگەر تۆ ترسایت لەتاقمێ پەیمانت لێ وەرگرتوون ناپاکی و پەیمانەکەیان شکاند، دوایی تۆیش فڕێ بدە بۆلای ئـەوان پەیمانەکەیان لەسـەر دادپـەروەری و یەکسـانی لەهەردولاتانـەوە و بەرلـەجـەنگ کـردن ئاگاداریان بکەن بەشکاندنی پەیمانەکەیان. تۆ پێش دەستی مەکەلە جەنگ کردنـدا، بۆیـە پێویستە ئاگاداریان بکەی چونکە :

﴿ إِنَّ اللهَ لايُحِبُّ الخائنينَ ﴾ بەڕاستی خوا ناپاکی خۆش ناوێ و لـەهەرلایەکەوەبێ بەبێ ئاگاداری دوژمنەکانیان پەیمانیان یەکسەر پەلاماریان بدرێ، وێنەی بەنو قورەیزەو جگـەی ئەوانەیش .

بەمانای ووشەی ئیسلام پێویستی کردوە پەیمان جێبەجێبکرێ لەگـەڵ ئەوکەسـانەی پەیمانیان لـەگەڵ بەستراوە. بەلام ئەوکەسانە پەیمان ئەکەن بەدەست کەلا بۆ ئەوەی ناپـاکی و ژێربەژێری پێوە بکەن و بەپەنهانی دانیشتوان ئازار بدەن و بیان کوژن و تالانیان بکـەن، لەوکاتەدا فەرماندراوە بەشکاندنی ئەوپەیمانە ، لەم سەردەمەی ئێمەدا کـوردان زۆرشـتی وایان لـەگەڵ دا کراوە .

﴿ وَلاتَحْسَبَنَّ الَّذِيْنَ كَفَرُوا سَبَقُوا أَنَّهُمْ لا يُعْجِزُونَ ﴾ وەگومـان نەبـەن بەکەسـانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە ڕزگاریان بووە لەکوشتن و بەدیل گرتن لەڕۆژی بەدردا بەڕاسـتی ئەوان بەو ڕزگاربونەیان پـەکی خـوا ناخـەن تۆڵـەیان لێئەکاتـەوە،کـەس لەدەسـتی مـن ڕزگاری نابێ، ئیتر یالـەجیهاندا سـزایان ئـەدەم بەکوشـتن یالـەپاشـەڕۆژدا سـزایان ئـەدەم بەسزای گەورەتر، خوا بەو ڕستەیە دڵخۆشی پێغەمەر ئەداتەوە .

لـەپاش ئەوەی ئایەتەکانی پێشوو باسی جێبەجێ کردنی پەیمانی لەگەڵ یـەکتری کـرد، فەرمانیشی دا بۆ دیاری کردنی هەڵوێست لـەگـەڵ یـەکتری لـەکاتی شـکاندنی پـەیماندا، فەرمانئەدا بەموسڵمانان و ئەفەرموێ :

٤- ﴿وَأَعِدُوا لَهُمْ ما اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوةٍ وَمِنْ رباطِ الخَيْلِ ﴾ وەئێوەی موسڵمان ئامادەبکەن بۆ جەنگی بێ‌باوەڕان شتێ توانای ئەو شتەتان هەبێ لەهێز بەچەك و بە تفاق و کەرەسەی چەك لەرِم و شمشێرو لەچارەوێ کەبەستراونەتەوە بۆ جەنگ، خوای مەزن ئەوکاتە باسی چارەوێی کردوە،چونکە گەورەترین هێزبووە بۆ جەنگ کردن لەوسەردەمەدا، پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لەکاتی خوێندنەوەی ئەوئایەتە سێ‌جار ئەیفەرمو ئاگاداربن: هێز بریتیە لەفڕێ دانی تیر. ئەو ووشەیەی دووپات ئەکردەوە سێ‌جار .

بۆ زانین: خوای مەزن لەوئایەتەدا فەرموی: ئێوە ئامادەبکەن شتێ خۆتانی پێ‌بەهێز بکەن لەجەنگدا، ئەوشتەی دیاری نەکردووە، مێژوو دەری خستوە ڕاستی ئەو فەرمودەیە بەرلە ( ١٤٢١) ساڵ لەکاتێکا نەفرۆکە نە بونبای زەرِە و ساروخ نەبوە، زانایانی بلیمەت لەهەموو سەردەمێکا زانستی خۆیانیان بەکارهێناوە بۆ بەهێزکردن و گەشەپێدانی کەرەسەی هێز لەتیرەوە بۆ فیشەك و تفەنگ، لەوانەوە بۆلای ساروخ وبۆنبای بچوك، بۆلای بۆنبای زەرِەو هیدرۆجینی و چەکی کیمیاوی، هەتادێ. ئەوەبو موسڵمانان لەجەنگی خەیبەردا مەنجەنیقیان بەکارهێنا بۆ فڕێدان، ئامادەبکەن شتێ خۆتانی پێ‌بەهێزبکەن بۆ ئەوە:

﴿ تَرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَ اللهِ وَعَدُوَكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لاتَعْلَمُونَهُمْ اللهُ يَعْلَمُهُمْ ﴾ ئێوە بترسێنن بەوشتە لەتواناتان هەیە و ئامادەی ئەکەن دوژمنی خواو دوژمنی خۆتان لەبێ‌باوەڕانی مەکەو ئەوانەیش موسڵمانان بەدوژمنی خۆیانیان ئەزانن و، بەوەی ئامادەی ئەکەن دوژمنانی خۆتانی پێ بترسێنن لەجگەی ئەوان لەدووڕوەکان و لەجولەکە و گاور و فارسەکان و ڕۆمەکان و جگەی ئەوانیش کەئێوە نایان زانن و خوا ئەیانزانێ و ئەیان ناسێ، کەسانێ تریشیان پێ بترسێنن لەپشتی پەردەوەبوون بەستونی پێنجەم و بەرِواڵەت لەگەڵ ئێوەن .

بۆ ئاگاداری: ئەبێ بزانرێ (ئیرهاب) واتە ترساندن تۆقاندن دووجۆرە: یەکەمیان تۆقاندنی بێ باوەڕان کە بە ئاشکرایی دوژمنی ئیسلامن و فێڵ و پیرن ئەگێڕن بە

موسڵمانان ئەم جۆرەیان شتێکی ڕەوایە و پێویستە لە بەرگری کردن لە ئایین و لە نیشتمان، بەو مەرجەی سەر نەکێشێ بۆلای کزبوونی هێزی ئیسلام و نەتوانرێ بەرگری لە خۆیان بکەن، موسڵمانان خاوەنی چاکە نەبن هاوتای چەکی بێ باوەڕان بێ. دووهەم ئەگەربێ باوەڕان جەنگیان بەرپا نەکردو دوژمنایەتی ئاشکرایان نەئەکرد. لەو کاتە تۆقاندنیان قەدەغە نابێ پەلاماری خۆیان و دارایی و کۆشکیان بدرێ ئەم جۆرە کارە ئێسنا پێێ ئەوترتیلو.

بۆ زانین: ئەو دوژمنانەی خوای مەزن ئەیانزانێ، هەمو ئەو کەسانەن ئاواتە خوازن موسڵمانان توشی ترس و لاوازی ببن، خۆیانیان لەموسڵمانان پەنهان داوە هەتا دەستەڵاتیان پەرەئەسێنێ بۆ داگیر کردنی هەزاران ئەو جۆرە کەسانە لەسەردەمی پێغەمەرەوە هەتا ئەم سەردەمەی ئێمە کۆتاییان پێ نەهاتووە، کۆتایشیان پێ نایە هەتا ڕۆژی دوایی، بۆیە ئێویستە لەسەر موسڵمانان و گەلانی هەژار ئەو فەرمودەی خوایە بگرنە دڵ و کاری پێبکەن و خۆیان پرچەکبن .

دووبارە ئێمەی موسڵمان بەتایبەتی، گەلانی تری ئاشتیخواز پێزیستە لەسەریان دوژمنانی خۆیان بناسن خۆیانیان بۆ ئامادەبکەن بەهەمو چەك و تفاقێ هەتا کۆمەڵی ئادەمیزاد بپاریزن لەگێچ داوی ژیان، ستەمکارانی چاوچنۆك بترسێنن هەتا نەتوانن گاڵتەو پاری بەژیانی ئادەمیزاد بکەن، ئەوبیروباوەڕو هێزە سوود بەخشن، بەلاّم پێویستیان بە مرۆڤێکی خاوەن دادپەروەر هەیە، کەسەر شۆڕبکا بۆ فەرمان و یاسای خوا و بانگی هەمو ئادەمیزاد بکا بۆ لای یاسای خوا، بۆ ئەوەی هەموویان وەك یەك بژین بەگوێرەی یاساو دەستوری خوا و هیچ کەسیان لەو دەستورە لانەدەن، ئەگەر کەسێ لابدا بەهێزو توانا بیگێڕنەوە بۆ لای خوا پەرستی، ڕۆژئاواو ڕۆژهەلاّت. بەتایبەتی ئەمەریکاو بەریتانیا و ئیتالیا و فەرەنسا وروسیا، هەرئەوانەبوون دوژمنی کوردان ئێمە بیانناسین لەم سەۆردەمەی ئێمەو بریتین لە ڕژێمە بێ باوەڕە گەورەکان کە عێراقیان چەکدارکردوو کوردەکانیان کیمیاباران کرد و خۆیانیان لێ بێ دەنگ کرد . بەلاّم ئەو کارە خراپانە کاربەدەستەکانیان ئەیکەن، ئەگینا ژێردەستەکانیان زۆربەیان چەوساوەن بۆ

سەپاندنی ئەوانەی پێشو بەڵگەمان زۆرە. بەڵام ئەمانەی خوارەوەتـان بـۆ ئەنوسـین کـورد ئەڵێ مشتی خەروارێکە :

١- ( نیکولاس سبیکمان ) لەنامەی خۆیا (الاستراتیجیة الامریکیة في السیاسة العالمیـة) ئەڵێ: چاوپۆشی کراوە بۆ ئێمەی ئەمەریکا زۆرو سەرکوت کردن بەهـەمو جۆرەکانیـەوە لـەوانە جەنگی کاولـکەر هەتا ویستی خۆمان بەزۆر بسەپێنین بەسەر کەسانێکی ئەوتۆی بێ هێزن و داگیریان بکەین .

٢- ( لیود بلتش ) ی ئەمەریکی ئەڵێ :پێویستی ئەوەیـە کەگـەورەیی بونـی خۆمـان پـەیدا بکـەین بـەهێزو توانـا بەسـەر بونـەوەران بـەڕامیاری و ئـابوری و کۆمەلآیەتیـەوە وەپێویستە ئەوەیش بۆ کاتێ نەبێ و دیاری بکرێ، ئەوانە بەڕاستی پێویسـتێکی بەردەوامـە نابێ کەمتەرخەمی تێدابکرێ .

ئەی موسڵمانان ،ئەی گەلانی ئاشتی خواز .ئەی هـەمو دانیشـتوانی ڕوی زەوی ئـەی کوردی چەوساوە؟ ئەو خـۆ بەگـەوەر زانـین و لـەخۆبایی بونـی دوژمنـان و دەربڕینـی دەست درێژی و ستەمکاریە بۆ سەر بەندەکانی خوا بەتایبەتی هەوڵدانی دوژمنـانی کـورد بۆ بنەبڕکردنیان، بۆ ئەبێ بیریان لێنەکەنەوەو ئەبێ بزانـن هـیچ شـتێ نیـە ئاوایـان لێبکـا جگـەی ئـەوەی ترسـیان لـەهێزێ نیـە دەسـتیان بشـکێنێ. ئـەوهێزە ئـــەوان بترسـێنێ جگەلـەیاسای قورئان دەست ناکەوێ، هەتا ووشەی خوا بەرزو بڵند نەبێ ووشـــەی پـوچ وستەم بەرەوخوار ونزم نابێ.

٥- ﴿ وَما تُنْفِقُوا مِنْ شَيءٍ فِي سَبِيْلِ اللهِ يُـوَفَّ اَلَيْكُـمْ وَأَنْتُـمْ لاتَظْلِمُـونَ ﴾ وەهەرشـتێ ئێـوەی موسـڵمان بیبەخشـن دای بنێـن لـەهەرشـتێ بۆئامـادەکردنی هـێزو چـەك وتفـاق لـەڕێگەی ئایینی خوادا بـۆ پەرسـتن و پێویسـتی جـەنگ پاداشـتەکەی ئەدرێتـەوە بـەئێوە بەبێ کـەم وکـوڕی و، ئێـوە سـتەمتان لێنـاکرێ بەکەمبونـەوەی پاداشـت و ئەیبەخشـن لەڕێگەی خوادا، ئەم مەبەسـتە لـەئایـەتی ( ١٩٦) ی سـورەتی ئەلبەقـەرەدا و لـەئایـەتی (٩٢) ی سورەتی ئالی عیمراندا تیپەڕیوە .

دوای ئەوەی خوا فەرمانی دا بەباوەڕداران بەئامادەکردنی هێزو ئەوشتانەی دوژمنیان پێبترسێنرێ فەرمانیشمان پێ‌ئەدا ئەگەر لەدواییدا دوژمن داوای ئاشتەواییان کرد و وەڵامیان بدەنەوەو ئەفەرموێ :

٦- ﴿ وَإِنْ جَنَحُوا للسِلْمَ فَاجْنَحَ لَها وَتَوَكَلْ عَلى اللهِ ﴾ وەئەگەر بێ باوەڕان ئارەزو ومەیلیان کرد بۆ لای ئاشتی و دۆستایەتی، دوایی تۆیش مەیلت هەبێ بۆ لای ئاشتیو دۆستایەتی و، تۆ پشت ببەستە بەخواو کاری خۆت بسپێرە بەخوا دەربارەی ئەو پەیمانەی ئەی بەستی لەگەڵ بێ‌باوەڕان، بۆ ئەوەی خوا یاریدەی تۆ بدا لەهەمو کات و لەهەمو شوێنێکا .

﴿ إِنَهُ هُوَ السَمْيعُ العَلِيمُ ﴾ بەڕاستی خوا هەر ئەوە ئەبیسێ گفتو گۆی ئەوان، ئەزانێ بەکردار و شاراوەی دڵیان کەدرۆو تەڵەکە بازی لەگەڵ تۆ بکەن، خوا ئاگاداری تۆ ئەکا لەفێڵی ئەوان .

بۆزانین: ئەوئایەتانە ئەمانەی خوارەوەمان فێرئەکا، پێویستە لەسەرمان فەرمانبەرداریان بن:

١- ئاشتی و وازهێنان لەجەنگ ئەمانە ئەگرێتەوە : وەستانی جەنگ لەنێواندا . وەرگرتنی سەرانە لە بێ‌باوەڕان . چونە نێو ئایینی ئیسلام .

٢- پێویستە لەسەر موسڵمانان ئاشتی خواز بن لەگەڵ هەمو کەسێکا و هەمو هەرێمێکا ، ئاشتی خواز و بێ‌ئازاربن لەگەڵ موسڵماناندا و پیلانی ژێر بەژێر وازلێ بهێنن .

٣- پێویستە ئێمە بزانین کەمەبەست لە ئاشتی لەوئایەدا ئاشتیە لەگەڵ دانیشتوانی ڕوی زەوی ئیتر جەنگیان کردبێ لەگەڵ موسڵمانان یا بێ لایەن بن نەك لەنێوان دوولایەنی جەنگ کەر لەگەڵ یەکتری بەتەنها . واتە ئەگەر یەکێکیان پەلاماری شوێنی تری دا ئەوی تریان بێ‌لایەنبێ ، بەو مەرجەی پەیمان لەگەڵ ئەوشوێنەدا نەبەسترابێ بۆ دۆستایەتی ، یاموسڵمان نەبن ، بۆ ئەوەنەبێ ئەوئاشتەواییە هەریەکەیان بە ناڕەوا پەلاماری کیشوەرێکی هەژار و بێ دەستەڵات بدەن و داگیری بکەن و خوێنیان بمژن ، وێنەی

ئەوپەیمان و ژیانە ئاشتییەی نێوان ئەمەریکاو ڕوسیا کە مەبەستیان لەوئاشتیە ئەوەیە ئەوان لەنێو یەکتریدا ئاشتبن. دوایی ئەبینرێ تەڵەکەو فێڵ ئەسازێنن بۆ کیشوەرە بێ لایەنەکان، بەلێدانی سەربەستی و ڕوتانەوەی دانیشتوان لە ئاسیاو ئەفەریقا و ئەمەریکای لاتینی، لەبەر پەرەپیدانی قازانجی هەردوولایان .

٤- ئەو ئایەتە فەرمان دانە بەئاشتی ئەگەر داوای ئاشتی کرا، ئایەتی ( ٣٥) ی سورەتی موحەمەد لەماناکەیدا ئەفەرموێ: ئەی باوەڕداران: ئێوە سستی مەکەن و داوای ئاشتی مەکەن لەبێباوەڕان. لەکاتێکا ئێوە بالادەستبن و، خوا لەگەڵ ئێوەدایە، ڕێگەی یەکگرتنی مانای ئەو دووئایەتە چییە؟ دژایەتی لەنێوان فەرماندانی ئەو دوئایەتەدا نیە، ئایەتی سورەتی موحەمەد بۆ ئەوەیە مەبەستی موسڵمانان بەرزبکاتەوەو گیانیان بەهێزبکا، قەدەغە بکا لێیان ڕوخاندن و هەڵهاتن لەبەر دوژمن، ئایەتی ئێرە ئەفەرموێ ئەگەر ئەوان داوای ئاشتیان کرد وەلامیان بدەنەوە .

٥- ﴿ وَ إِنْ يُرِيدُوا أَنْ يَخْدَعُونَ فَأَنَّ حَسْبَكَ اللهُ ﴾ وەئەگەر ئەو کەسانە داوای ئاشتی ئەکەن ئەیان ویست کەفێڵ لەتۆ بکەن و فریوت بدەن بەهۆی ئاشتیەوە خۆیان دەرباز بکەن، لەپەنهانیدا ناپاکی لەدەرونیاندا بێت تۆ لەوان مەترسە، دوایی بەسە بۆ تۆ خوا لەخراپەی ئەوان ئەتانپارێزێ، بەڕاستی لەوەوبەریش خوا یاریدەی تۆی داوەو سەری خستن .

﴿ هُوَ الَّذِي أَيَّدَ نَبْصِرِهُ وَبِالْمُؤْمِنِيْنَ ﴾ خوا کەسێکی ئەوتۆیە یاریدەی تۆی داوە بەهۆی یارمەتی دانی خۆی و بەهۆی باوەڕدارانی خۆیەوە بەنهینی بەناردنی فریشتە، بەهۆی باوەڕدارانەوە بەئاشکرا بەیاریدەران و کۆچ کەرانەوە .

پرسیار / لەئایەتی ( ٥٨) ئەم سورەتەدا خوا فەرمانی دا بەپێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ کەپەیمانەکانیان بشکێنێ و فڕێبداتەوە بۆ لایان ئەگەر ترسی ناپاکی وفێڵی بو لەوانەوە، لەم ئایەتەدا ئەفەرموێ بە پێغەمەر وەلامیان بداتەوە ئەگەر داوای ئاشتەواییان کرد بابیشیانەوێ ناپاکی بکەن مانای ئەو دووئایەتە چۆن جووت ئەبن ؟

وەلاَم / دژایەتی لەنێو مانای ئەو دوو ئایەتەدا نیە، چونکە خوا لەئایەتی (٥٨) دا فەرمانی داوە بەشکاندنی پەیمان لەگەڵ ئاگادارکردنیان بەشکاندنی ئەو پەیمانە لەکاتێکا بەڕاستی بزانێ بەناپاکی و فێڵیان بەڕونی بەهۆی نیشانەی بێگومانەوە، لەم ئایەتەدا فەرمانی داوە بەپێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بە ئاشتەوایی لەگەڵیانالەکاتێکا بۆی ڕون نەبێتەوە ناپاکی ئەو کەسانە، ئیتر لەژێرەوە ئەوان بیانەوێ ناپاکی بکەن. کەواتە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ پێویستە تەماشای ڕووالەت بکا لەهەموکارێکا، بەوگوێرەیە لەگەڵیان بجوڵێتەوە، شاراوەو نهێنی دەرونیان دەرونیان هەواڵەی خوایە، ڕووالەت پەیوەندی بەئادەمیزادەوە هەیە لەهەمو شتێکا .

لەپاشا خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە بەچ شێوەیە خوا یاریدەی باوەڕدارانی داوەو ئەفەرموێ:

﴿ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ﴾ وەخوا خۆشەویستی و دۆستایەتی کۆکردەوە لەدڵیانا بەهۆی ووشەی ئیسلامەوە .بەتایبەتی لەنێوان دڵی هۆزی ئەوس و خەزرەج کەدوژمنایەتی لەنێویانا بۆ ماوەو ١٢٠ بەردەوامبو بەهۆی باوەڕهێنانیان بەئیسلام وازیان لێ هێنا ، بون بەدۆستی گیانی بەگیانی ، لەگەڵ ئەو هەمو ڕەگەزپەرستی و لوت بەرزی و دڵ ڕەقیەوە عەرەبەکان هەیانبو.

ئەو ئایەتە بۆمان دەرئەخا کەعەرەبەکان بەگشتی توڕەیی و خەشم و لوت بەرزی و ڕەگەزپەرستی و ڕق و دوژمنایەتیان بۆ جێمابو لەباپیرەکانیانەوە، ئەوشتە تێکەڵاوی دڵیان بوبو. جێگەی خۆیانیان گرتبو لەدەرونیانا، ئەوکردەوە خراپانە هێشتا بەردەوامە لەنێویانا لەم سەردەمەی ئێمەدا، چونکە لایانداوە لەدەستوری قورئان :بۆ نمونە سوریا و عێراق و جگەی ئەوانیش. بەتایبەتی تورکیاو ئێران ئەو شێوازە خراپەو ڕەگەز پەرستی بەرلەئیسلام بەردەوامە لەنێویانا بەجۆرێ ئەیانەوێ ڕەگەزانی تر بنەبڕبکەن بەتایبەتی ڕەگەزی کوردان. بەلاَم لەگەڵ ئەو هەمو ڕەوشتەنا پەسەندانە تەماشا بکەن چۆن کاتێك پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ هات عەرەبەکانی گەڕاند بەبرای یەکتری، ئەو کارە کاری پەکخەرە بۆ پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾

چونکە یەکگرتن بۆ دڵیان کارێکی وابو هەرگیز بیری لی نەئەکرایەوە لەگەڵ ئەو ڕەوشتە نالەبارانەدا بۆیە خوا فەرموی:

﴿ لَوْ أَنْفَقْتَ مافي الآرْضِ جَمْيعَاً ماأَلَفتْ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ﴾ ئەگەر تۆ خەرجت بکردایە بۆ چاك کردن و نەرمی دڵیان ئەو شتەی لەزەویدایە هەموی بەدارایی و بەرهەمو پیتە وەتۆ توانات نەبوو یەکێتی و دۆستایەتی و نەرمی بخەیتە دڵیانەوە .

﴿ وَلَكِنْ اللهُ أَلفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ﴾ وەبەلاّم خوا نەرمی و دۆستایەتی خستە نێو دڵیان و دۆستی و یەکێتی نێوانیان گەشەی سەند بەجۆرێ بون بەبرای یەکتری، بگرە زۆرتر لەخۆیان یارمەتی برای ئاییینیان ئەدا .

﴿ اِنَهُ عَزِيْزٌ حكِيْمٌ ﴾ بەڕاستی خوا زۆر گەورەو بەدەسەلاّتە بۆ ئەو کەسانە فێڵ ئەکەن لەتۆ، هەموشتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ، یاریدەی تۆو باوەڕداران ئەدا .

لەدواییدا خوای مەزن فەرمان ئەدا بەباوەڕداران بەجەنگ کردن لەگەڵ بێباوەڕان و هانیان ئەداو ئەفەرموێ :

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ ۚ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾ ٱلْـَٰٔنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٦٦﴾

﴿ يأأيها النبي حَسْبُكَ اللهُ وَمَنْ اتبَعَكَ مِنَ المؤمِنِيْنَ ﴾ زانایان بەدوو جۆر مانای ئەو ئایەتەیان کردوە :

١- ئەی پێغەمەر: بەسە بۆ تۆ خواو کەسێ پەیڕەوی تۆی کردوە لەباوەڕداران بۆ هەموکارو کردەوەیە بۆ تۆو بۆ ئەوان، جگە لەخوا تۆو پەیڕەوانت کەسێ ترتان ناوێ .

٢- ئەی پێغەمەر بەسە بۆ تۆ خواو باوەڕداران بەهۆی پەیامی تۆوە، ئایەتی ( ١٦٢) ی ئەم سورەتە بەڵگەی ئاشکرایە لەسەر مانای دووهەم، بەهەر جۆرێ بێ مەبەست لەناردنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەمەیە: کە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئارام بگرێو بزانێ کەجەنگ کردنی ئەو لەگەڵ بێ باوەڕان ئەو بێ باوەڕیە خوا بەوانی داوە .

﴿ يأأيها النَبيُّ حَرِّض المُؤمِنِينَ عَلى القِتالِ﴾ ئەی پێغەمەر: تۆ هانی باوەڕداران بدە لەسەر جەنگ کردن لەگەڵ بێ باوەڕان، باوەڕداران بخە جوڵە و گەرمیان بکە بۆ ئەو جەنگە لە بۆ بەرزبونەوەی ئایین .

﴿ إنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشرُونَ صابِرُونَ يَغْلبُوا مِئَتَيْنْ﴾ ئەگەر هەبێ لەئێوە بیست کەسی ئارام گرو خۆڕاگر ئەوان زاڵ ئەبن لەباوەڕداران. بەختیاری بەجەنگ دەست ئەکەوێ و بەخۆڕاگرتن و خۆ بەکوشت دان .

﴿ وَإنْ يَكُنْ مِنْكُمْ يَغْلَبُوا مِئَةٌ ألفاً مِنَ الذِيْنَ كَفَرُوا بِأنَهُمْ قَوماً لا يَفْقَهُونَ ﴾ وەئەگەر بێ لەنێو سەد کەس زاڵ ئەبن بەسەر هەزار کەسی لەکەسانێکی ئەو تر باوەڕیان نەهێناوە، ئەوزاڵ بونەی ئێوە بەهۆی ئەوەوەیە ئەوانە تاقمێکن هیچ شتێ نازانن و سوود لەهیچ شتێ وەرناگرن .

خوا یەکەم جاری هاتنی ئیسلام پێویستی کردبوو لەسەر موسڵمانان هەریەکەیان جەنگ بکەن لەگەڵ (١٠) کەس لەبێ باوەڕان بەو بۆنەوە موسڵمانان ژمارەیان کەمبو، بۆیە پێویستبو خۆیان ڕاگرن لەبەردەم هێزی بێ باوەڕاندا، ئەوانیش هێزیان ئەدا بەخۆیان بۆ ئەومەبەستە، کاتێ ژمارەی موسڵمانان زۆربوو، خوای مەزن ئەیزانی هەندێ لەموسڵمانان لاوازو هەندێکیان پیرن ، بۆیە خوا سوکی ڕژاند بەسەریانا بەمیهرەبانی خۆی وفەرموی:

﴿ ألآنَ خَفَّفَ اللهُ عَنْكُمْ وَعَلِمَ أنَّ فِيكُمْ ضَعْفاً ﴾ ئێستا ئەو فەرمانە گرانە لەسەرتانە خوا سوکی کرد لەسەر ئێوە کەبێ،یستە یەکێکتان جەنگ بکەن لەگەڵ دوو کەس لەبێ باوەڕان و خۆڕاگرن وهەڵنەیەن لەبەردەمیانا، خوا ئەزانێ کەبەڕاستی لەئێوەدا هەیە لاوازی لەشتان و گرانە لەسەرتان جەنگ کردنی یەککەستان لەگەڵ ( ١٠ ) کەسدا، خوا ئەزانێ بەلاوازی موسڵمانان لە دوای ئەوانەوە دێن.کەواتە خوا ئەو فەرمانەی سوك کرد لەسەر هەمو موسڵمانان فەرموی:

﴿ فَأنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِئَةٌ صابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِئَتَيْنِ وَأنْ يَكُنْ مِنْكُمْ ألْفَ يَغْلِبُوا ألْفَيْنِ بِأُذْنِ اللهِ وَاللهُ مَعَ الصّابْرِيْنَ ﴾ دوایی ئەگەر هەبێ لەئێوە سەد کەسی خۆڕاگر زاڵ ئەبن بەسەر دووسەد کەس لەبێ باوەڕان. ئەگەر بێ لەئێوە هەزار کەس زاڵ ئەبن بەسەر دووهەزار کەس لەبێباوەڕان بەدەستوری خواو فەرمانی خوا و، خوا لەگەڵ ئەوکەسانەیە ئارام گرن و خۆڕاگرن و یارمەتییان ئەدا، ئیتر چۆن سەرناکەون ؟

لەڕۆژی بەدردا موسڵمانان (٧٠) کەسیان لەبێباوەڕان بەدیلگرتن و هێنانیان، پێغەمەر پرس و ڕاوێژی کرد لەگەڵ هاوڕێکانی لەبارەی ئەو دیلانەوە، ئەبوبەکر ووتی: خزم و خێزانی خۆتن بیانهێڵەوە لەوانەیە پەشیمان ببنەوە، باخۆیان بکڕنەوەو پارەیان لێوەربگرە و موسڵمانیان پێ بەهێز بکە، عومەر وتی: بدە لەگەردنیان ئەوانە پێشەوای بێ باوەرانن خوا تۆ ساماندارمان ئەکاو پێویستت بەکڕینەوەی ئەوانە نیە، هاوڕێکانی تری پێغەمەر ووتیان ئێمە خۆکڕینەوەی ئەوئمان ئەوێ، دوایی دیلەکان خۆیانیان کڕیوە. خوای مەزن بەرەخنەوە کەخۆکڕینەوەیان هەڵبژارد ڕوی کردە موسڵمانان و فەرموی:

مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَـٰبٌ مِّنَ

ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ فَكُلُوا۟ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَـٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٩﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّمَن فِىٓ أَيْدِيكُم مِّنَ ٱلْأَسْرَىٰٓ إِن يَعْلَمِ ٱللَّهُ فِى قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧٠﴾ وَإِن يُرِيدُوا۟ خِيَانَتَكَ فَقَدْ خَانُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾

﴿ ما كانض لِنَبِيّ أن يكُونَ لَهُ أسْرى حَتى يُثخَنَ الآرضَ ﴾ سـزاوارو شايسـتە نيـە بـۆ هيچ پێغەمەرێ کەبۆی هەبێ چەندين ديل خۆکڕينەوەيان هەرکاتێ ئەو پێغەمـەرە بـەزۆری زاڵ نەبێ بەسەر بێ باوەڕاناو زۆريان لێ ئەکوژێ لـەزەويدا، بێ بـاوەڕی لاوازبـێ بـەهۆی ئەو کوشتنە لـەنێو بێباوەڕاندا، شکۆی ئيسلام پەرەبسێنێ. کەواتـە ئـەبێ بکوژيـن هـەمو موسڵمانان هێز پەيدا ئەکەن ديل نەکرێن .

﴿ تُرِيْدُونَ عَرضَ الدُنيا وَ اللهُ يُريدُ الآخِرَة و اللهُ عَزِيْزٌ حَكِيمٌ﴾ ئێوە کاڵاو خواردەمەنی جيهانتان ئەوێ بەوەرگرتنی پارە لـەديلەکان و خواپاداشتی پاشەڕۆژی ئەوێ کەبەهەشتە و برانوەی بۆ نيە، خوا توانای زۆرە، دۆستانی خۆی زاڵ ئەکا بەسەر دوژمنانيدا، هەمو شـتێ لـەجێگەی شياوی خۆيا دائەنێ، بۆيە فەرمان ئەدا بەکوشـتنی بـێ بـاوەڕان و قەدەغـەکا وەرگرتنی خۆکڕينەوەيان هەتا موسڵمانان شکۆ پەيدا ئەکەن و هێزيان پتەو ئەبێ .

بۆزانين: هەرکاتێ موسڵمانان لـەجەنگی بێ باوەڕاندا ديليان گرت بەفـەرماندانی ئـەو ئايەتە بۆ موسڵمانان هەيە دووشت:

١- ئەگەر جەنگ پەيدا بوو لـەنێو موسـڵمنان و بـێ بـاوەڕاندا لـەبـەر ئـەوەی ئـايين جێگەی خۆی بگرێ لـە زەويداو بەرلـەوەيش تەواو ببێ بۆ ئايين هێزو زاڵبـون بەسـەر بـێ

باوەڕاندا ،لەو کاتەدا ئەگەر موسڵمانان زاڵبون بەسەر بێ باوەڕاندا پێویستە لەسەر موسڵمانان بیان کوژن ودیلیان نەکەن، بۆ ئەوەی ترس بکەوێتە دڵیان و جارێ ترنەتوانن جەنگ بەرپا بکەن لەگەڵ موسڵمانان، وەك ئایەتەکە فەرمانی داوە .

٢- لەکاتێکا جەنگ دەستی پێ کرد لەنێوان موسڵمانا ن وبێباوەڕاندا پاش ئەوەی ئاین هێز شکۆی پەرەی سەندبو، دوای تەواوبونی توانای ئاین و موسڵمانان ، بەجۆرێ تەڵەکەی بێباوەڕان کاری نەئەکردە سەر موسڵمانان، لەوکاتەدا موسڵمانان بۆیان هەیە بێ باوەڕان بکوژن، بۆیشیان هەیە دیلیان بکەن، کەدیلیان کردن بۆیان هەیە بەپارەبەرەڵایان بکەن، بۆیشیان هەیە بەخۆڕایی بەریان بدەن، وەك خوا فەرمانی پێداوە لەئایەتی (٤) ی سورەتی موحەمەدا .

﴿ لَولا كِتابٌ مِنَ اللهِ سَبَقَ ﴾ وەئەگەر فەرمانێ لەلایەن خواوە دەرنەچو بایە لەمەوپێش کەخوا یاریدەی ئاین و پێغەمەری خۆی ئەدا بەتاقمێکی کەمی ئەوتۆ جەنگیان کردلەگەڵ پێغەمەر و فەرمانی نەدا بە سزای بێباوەڕان بەو ژمارە زۆرە و بەکوشتن و بەدیل کردن بەدەستی باوەڕداران ، ئەگەر خوا بەوجۆرە فەرمانی نەدایە .

﴿ لَمَسَّكُمْ فيما أخَذْتُمْ عَذابٌ عَظِيْم ﴾ بەڕاستی توشی ئێوەئەبوو سزایێکی زۆر گەورە لەسەر ئەوشتەی ئێوە وەرتان گرت کە بێ باوەڕانی دوژمنانی خواتان بەدیل گرتو بەپارە بەرتاندان، چونکە خوا ئەیویست کە ئەو کوشتن و خۆماندو کردنانەتان و کارەکانتان بۆ نیازی خوابێ نەك بۆ خواردنی جیهان ، جۆری ئەوسزایە خوا ئەیزانێ چیە وباسی نەکردووە .

پرسیار/ کاتێ کە دیل کردن قەدەغەبوو، بەرلەوەی خوا ئایینی خۆی سەربخا بەسەر هەموو ئایینەکانا، پێغەمەر چۆن فەرمانی دا بەهاوڕێکانی لەڕۆژی بەدردا بێ باوەڕان دیل بکەن و خۆیان بکرنەوە بەر لەتەواو بون و چەسپاندنی ئایین ؟

وەڵام / بەڕاستی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەو قەدەغە گرتنانەی گرێتەوە بە تایبەتی و بۆی هەیە ئەو دیلانە بەرەڵابکاو پارەیشیان لێ وەربگرێ، بۆ جگەی پێغەمەر قەدەغەیە، کاری پێغەمەر بێسودنیە، ئەوەبوو زۆر لەودیلانە موسڵمانبوون، ئەوە لەلایەکەوەو لەلایە ترەوە

زۆربەی ئەو دیلانە بەزۆرو بەتۆپزی هێنرابون بۆ جەنگ . کەواتە نەکوشتنی ئەو دیلانە وبەرەلاّکردنی هەندێکیان سودی ئایینی تێدابوە .

ئیبنول ئەسیر لەبەرگی دووی مێژوەکەی خۆیا ئەلّێ: پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لەرۆژی بەدرداو فەرموی: من ئەزانم پیاوانی بەنوهاشم و جگەی ئەوانیش بەزۆر دەرکراون و هێنراون بۆ جەنگ کردن ئێوە توشی یەکێ لەوان بوون مەیان کوژن. لەناو ئەوگیراوانەدا سوهەیلی کوڕی عەمر بە دیلی گیرا، عومەری کوڕی خەتاب ووتی: ئەی نێراوی خودا لێم گەڕێ بابیکوژم جارێ تر لەدژی تۆ خۆی نەنوێنێ، پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرموی: لەمەودوا پلە یە وەرئەگرێ تۆ سوپاسی ئەکەی لەسەر ئە وپلەیە، هەروەها لەبەدردا ئەبول عاسی کوڕی ڕەبیع مێردی زەینەبی کچی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ دیل کرابو زەینەب ملوانکەی خۆی کەلەلای خەدیجەی دایکیەوە پێی درابوو ناردی بۆ ئەوەی ئەو مێردەی خۆی بکرێتەوە. پێغەمەر فەرموی: ئەگەر ئێوەی باوەڕدار ئارەزوو ئەکەن بەرەلاّی بکەن، ئەوانیش مێردەکەیان بەرەلاّ کرد و ملوانکەکەیشیان دایەوە بەزەینەب، دووایی مێردەکەی موسلّمان بوو .

﴿ فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُم حَلالاً طَيِّباً وَاتَّقُوا اللهَ إِنَّ اللهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ دوایی ئێوە بخۆن هەندێ لەوشتەی ئیو بەتالاّن گرتوتانە وەدەستتان کەوتووە لەپارەی خۆکڕینەوە یان بەخواردنێکی ڕەواو پاك بەبێ ترس و، ئێوە لەخوا بترسن و خۆیان بپارێزن لەبێفەرمانی خوا، بەڕاستی خوا لێ خۆشبونی زۆرە بۆ گوناهی ئێوە، میهرەبان و خاوەنی بەزەییە بۆ ڕەواکردنی دەست کەوتی ئێولەبێ باوەڕان، بۆ جگەی ئۆمەتی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ قەدەغەبوە .

﴿ يَاأَيُّها النَّبِيُّ قُلْ لِمَنْ فِي أَيدِكُمْ مِنَ الأَسْرَى ﴾ ئەی پێغەمەر: تۆ بلّێ بەو کەسانە لەژێر دەستی ئێودان لەدیلەکان، ئەوانەیان موسلّمانەتی خۆیانیان دەربڕی، خوا فەرمانی دا بەپێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەوان بلّێ .

﴿ إِنْ يَعْلَمِ اللهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْراً يؤكتم خيراً مِما أَخَذَ مِنْكُمْ ﴾ ئەگەر خوا بزانێ لەدلّی ئێوەدا چاکەیە هەیە لەباوەڕهێنان و نیازی پاك بەپوختەیی، زۆر ڕونە خوا هەمووشتێ

ئەزانیٚ بەر لەپەیدابونی ئەو شتە خوا ئەبەخشیٚ بەئیٚوە چاکتر لەو شتە وەرگـیراوە لـەئیٚوە بۆ ئەوەی خۆتان بکرنەوە لەدیلی .

﴿ وَيَغْفِرِ لَكُمْ وَاللهُ غَفُورٌ رَحيمٌ ﴾ وەخوا خۆش ئەبیٚ لـەئیٚوەو و خـوا لیٚ خۆشـبوونی زۆرە بۆ گوناهباران لەو کەسانەتان نیازتان پاکـە و لـەو کەسـانەتان باوەڕتـان هیٚنـاوە ، میهرەبانە کە یاریدەی ئیٚوەبدا بۆ ئیسلام بونتان و نیازی پاکتان .

﴿ وَإِنْ يُرِيدُوا خِيانَتَكَ فَقَدْ خانُوا اللهَ مِنْ قَبْلُ ﴾ وەئەگەر ئەو دیلانـە موسـڵمان ئـەبن بەڕواڵەت وویستیان ناپاکی لەگەڵ تۆ بکەن ولەدڵیانا بەپەنهانی، دوایـی ئەوانـە ناپاکیـان کردوو لەگەڵ خوا لەمەوپیٚش بەشکاندنی پەیمان و باوەڕنەهیٚنان و جەنگ کردنیان .

﴿فَأَمْكَنَ مِنْهَم وَاللهُ عَلْيمُ حَكيمٌ ﴾ دوایی خـوا تـۆ و موسـڵمانان سـەرئەخا بەسـەر ئەواندا و توانا بەئیٚوە ئەدا، ئەگەر جاریٚ تـر بگەڕیٚنـەوە بـۆ لای ناپـاکی لـەگـەڵ خـوا و لـەگەڵ تۆ، جاریٚ تر خوا توانا ئەداتەوە بەئیٚوە و سەر شۆڕیان ئەکـەن، بەویٚنـەی جـەنگی بەدر و، خوا ئەزانیٚ بەکارو کردەوەی پاشەڕۆژی بەندەکانی خۆی و چ شـتیٚ لـەدڵیانایـە لـەبیٚباوەڕی و ناپاکی ، هەموشتیٚ لـەجیٚگەی شیاوی خۆیا دائەنیٚ، پاداشـتی هـەمو کـەس ئەداتەوە بەگویٚرەی‌کرداری خۆیان لـەپاداشت و تۆڵە، ئیتر ئەی موحەمەد: تۆ نابیٚ بترسـی لـەناپاکی ئەو کەسانە بەرەڵات کردوون، ئەوەی تۆ کردووتە بۆ سوودی ئایین کردوتە .

دووایی خوای مەزن لـەکۆتایی سـورەتەکەدا فـەرمان ئـەدا کەپیٚویسـتە موسـڵمانان و باوەڕداران واز لـەدۆستایەتی بیٚ بوەڕان بهیٚنن و، ئەفەرمویٚ :

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ وَٱلَّذِينَ

ءَامَنُواْ وَلَمْ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَـٰيَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي ٱلْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَـٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٧٤﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعْدُ وَهَاجَرُواْ وَجَـٰهَدُواْ مَعَكُمْ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مِنكُمْ وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَـٰبِ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٧٥﴾

﴿ إنَ الَّذِيْنَ آمَنُوا وَهاجَرُوا ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەو تۆ باوەڕیان هێناوەو کۆچیان کردوە لەنیشتمانی خۆیان لەبەردۆستایەتی و خۆشەویستی خواو پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ .

﴿ وَجاهَدُوا بِأموالِهمْ وَأنْفُسِهِمْ فِي سَبيلِ اللهِ ﴾ وەکۆششیان کردوەو خۆیانیان ماندووکردوە لەجەنگدا بەدارایی خۆیان و بەگیانی خۆیان، بەدارایی خۆیان بۆ ئامادەکردنی چەك و تفاق بۆ جەنگ، بەگیان و لەشی خۆیان چونەتە نێو گەرمەی جەنگ لەڕێگەی بەرزی ئایینی خواداو لەبەر ڕەزامەندی خوا .

پرسیار م وازانراوە کۆچ کەران کەچونە مەدینە جێگەیان کردنەوە ڕێزیان گرتن وەك خۆیان بەبەرگ و خواردەمەنی، کەواتە ئەبێ کۆچ کەران داراییان لەکوێوە هێناوە دای بنێن لەڕێگەی خوادا ؟

وەلاّم/ یەکەمجار سامانداره‌کانی کۆچ کەرانە مەکە دارایی خۆیانیان بەهەژارانی موسڵمانان ئەدا بەر لەکۆچ کردنیان، دووهەم جاریش نیشتمان وجێگەو زەوی و زارو دارایی خۆیانیان بەجیّ هێشت لەبەرخوا ،بت پەرستان سامانەکانیان تالاّن کردن،چ شتیّ بەنرخەو گەورەترە لەوە مرۆڤ جێگەو زەوی و دارایی خۆی دەست لیّ هەڵبگریّ، هەرشتیّ لەتەمەنی خۆیانا کۆیان کردبوەوە بۆ خۆیان و خێزانیان بەجێی بهێڵن لەبەر بەرزی ئایینی خوا .

﴿ وَالْذِيْنَ آوَوْ وَنَصَرُوا ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ پێغەمەرو هاورێکانی پێغەمەریان لە کۆچ کەران لەخانوو لەجێگەی خۆیانا و یاریدەیان دان و رێزیان دان بەسەر خۆیاناو منالیانا، دۆستی ئەوکەسانە بوون دۆستیان بن و دوژمنی ئەو کەسانەبوون دوژمنی ئەو کۆچ کەرانەبوون ، بۆیە خوای مەزن ناوی نان یاری دەران .

﴿ أوْلَئِكَ بَعْضُهُمْ أولِياءُ بَعْضٍ ﴾ ئەو دووتاقمە لە کۆچ کەران و یاریدەران هەندێکیان دۆست و خۆشەویستی هەندێکیانن لەیاریدانی یەکتری و میرات لەیەك گرتن، بەجۆریّ کۆچ کەران و یاریدەران لەپاش مردن میراتیان لەیەك ئەگرت و خزمەکانیان میراتیان لیّ وەرنەئەگرتن باوەکو باوەرداریشبونایە بەمەرجیّ کۆچیان نەکردایە .

﴿ وَالذيْنَ آمَنُوا وَلَمْ يُهاجِرُوا مالَكُمْ مِنْ ولايَتِهِمْ مِنْ شَيءٍ حَتى يُهاجِرُوا ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ باوەریان هێناوە کۆچیان نەکردوە بۆ ئێوەنیە سەرداری کردن و میرات گرتنیان هیچ شتیّ هەتا کۆچ نەکەن لەمەکەو نەیەن بۆ مەدینە و میراتی ئێوەیش بەوان نادریّ .

﴿ وَإن إسْتَنْصَرُوكُمْ في الدِيْنِ مِنْ فَعَلَيْكُمْ النَصْرَ ﴾ وەئەگەر ئەوکەسانە موسڵمان بوون وکۆچیان نەکردوە داوای یارمەتیان لەئێوەکرد لەسەر دوژمنانیان لەکاروباری ئاییندا و بۆ پاراستنی خۆیان و ئایینیان لەجەنگی بت پەرستاندا و داوای کۆمەکیان لەئێوەکرد، دوایی ئێویستە لەسەر ئێوە یارمەتی ئەوان بدەن و کۆمەکیان پیّ بکەن .

بەڕاستی ئەو کەسانە باوەڕیان هێناوەو کۆچیان نەکردوە بەئەندامیّ لەکۆمەڵگای ئیسلام ناژمێرێن، هیچ مافێکیان نیە لەموسڵمانانی وەرگرن لەمیرات و دەست کەوت،

چونکە ئەوان هاورێیەتی بت پەرستانیان هەڵبژاردووە بەسەر موسـڵمانانـدا .بـەڵام ئەگـەر دەست درێـژی کرایـە سـەریان لـەبـەر ئـایین و بڕوایـان، بـت پەرستان هـەوڵیان ئـەدا لەئیسلامەتی وەریانگێڕن وبیانکەنەوە بە بـت پەرست، پێویسـتە لـەسـەر کۆچکـەران و یاریدەران یارمەتی ئەوان بدەن هەرلەبەرئەوە بەتەنها، چونکە پێویستە لەسەر هەمو کەسێ پشتی برای ئایینی خۆی بگرێ باگوناهباریش بێ بەگوێرەی توانا .

﴿ إلا عَلى قَومٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثاقٌ وَّاللهُ بِما تَعْمَلُونَ بَصِيْرٌ ﴾ مەگەر ئەو یاریدانەی ئێوە بۆ ئەوان لـەسەر دژی تاقمێ بێ لـەنێوان ئێوە وئەواندا پەیمانی ئاشـتەوایی هـەبێ، ئەوکاتـە دروست نیە بۆ ئێوە یارمەتی ئەوان بدەن لەدژی ئەوتاقمە، لـەبەرئەوەی دەستیان نەداوەتـە جەنگ و، خوا بەوشتە ئێوە بیکەن لـەئاشتی ولـەجەنگ ئەی بینێ .

لـەپاشا خوای مەزن باسی چۆنیەتی بێ باوەڕانمان بۆ ئەکا لـەنێوان خۆیاناو ئەفەرموێ :

﴿ وَالذيْنَ كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أولِياءَ بَعْضٍ إلا تَفْعَلُوهُ تَكُـنُ فِتْنَـةٌ في الآرضِ وَفَسـادٌ كَبِـيرٌ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە هـەندێکیان دۆسـت وسەرپەرشـتی کـەری هـەندێ تریانن لـە میرات و یارمەتی دانی یەکتری، ئەگەر ئێوە ئەوشتەی من فـەرمانم پێـداون ئێـوە نەیکەن لـەدۆستایەتی و پەیوەست و یارمەتی دان لـەگەڵ یـەکتری بـێ بـاوەڕی و ئاشـوب پەیدا ئەبێ لـەنێو زەویدا و بێ باوەڕی و ستەم بەهێز ئەبێ و پەرەئەسێنن و باوەڕبەئایین کـز ئەبێ و خراپەی گەورە سەر هەڵئەدا لـەکوشـتن و تـالاَن و چەوسـانەوەو بـلاَو بونـەوەی گوناهو خوا نەپەرستن .

خوای مەزن هـۆ ئەکاتـەوە بـۆلای باسـی کـۆچ کـەران و ئـاریدەران و باسـکردن و ناوبردنیان بەچاکەو ئەفەرموێ:

﴿ وَالذيْنَ آمَنُوا وَهاجَرُوا وَجاهَدُوا في سَبيلِ اللهِ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێنـاوە وکۆچیان کردووە لـەمەکەوە بۆ مەدینە و جێگـەی خۆیانیـان بـەجێ هێشـتوەە خۆیانیـان مـاندوکردوە بـۆ جـەنگ و کۆششـیان کـردوە بـەدارایی وبەلـەشـی خۆیـان لـەڕێگــەی بەرزیئایینی خوادا .

﴿ وَالذيْـنَ آوَوا وَنَصَـرُوا أولئِـكَ هُـمُ المُؤْمِنُـونَ حقـاً لَـهُمْ مَغْفِـرةٌ وَرزقٌ كَريـمٌ ﴾ وەکەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕیـان هێنـاوە و جێگـەی پێغەمـەر و هاوڕێکـانی پیغەمـەریان

کردوەتەوە لەمەدینەو یارمەتیان داون لەچنگی بت پەرستان و شتی تردا، ئەوانە ئەوکەسانەن باوەڕیان هێناوە بەباوەڕی ڕاستی وبێگومان، باوەڕیان پەرەپێدا بەبەخشینی سامان و گیانی خۆیان لەڕێگەی خوادا، بۆیان هەیە لێ خۆشبون لەگوناهەکانیان و بۆیشیان هەیە ڕۆزی و خواردەمەنی پاك وبێ ڕەنج و بێ ئازار لەبەهەشت ولەجیهاندا .

خوای مەزن لەئایەتی (٧٢) ی ئەم سورەتە دابەو ڕستانەی پێشو باسی کۆچ کەران ویاریدەرانی کرد بۆ ئەوەی ڕونی بکاتەوە پێویستە لەسەر هەمووموسڵمانێ بەرانبەر بەیەکتری پشتی یەکتری بگرن، لەم ئایەتەی دوواییداباسەکەیان دووپات ئەکاتەوە بۆ ئەوەی چاکەیان باس بکاو ڕونی بکاتەوە ئەوەی بۆی ئامادە کردون لەلای خۆی لەلێ خۆشبون لەخراپەیان ولەپاداشتی گەورە لەپاشەڕۆژدا .

﴿ وَالَّذِيْنَ آمَنُوا مِنْ بَعْدُ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە لەدووای کۆچ کەران و یاریدەرانی پێشوو، لەدوای ئاشتەوایی حودەیبیە .

﴿ وَهاجَرُوا وَجاهَدُوا مَعَكُمْ فأُولئِكَ مِنْكُمْ ﴾ وەکۆچیان کردووە خۆیان ماندوو کردوە و کۆششیان کردوە لەگەڵ ئێوە بەدارایی و بەگیانی خۆیان، دوایی ئەوتاقمە لەئێوەن وباوەڕداران وێنەی ئێوەن. ئەی کۆچ کەران و یاریدەران پێویستە ئێوەی یارمەتیان بدە بەبێ کەم و کوڕی، ئیتر بالەدوای ئێوە باوەڕیان هێنابێ .

﴿ وَأولُوا الْأَرْحامَ بَعْضُهُمْ أولى بِبَعْضٍ فِي كتابِ اللهِ إنَ اللهَ بِكُلِ شَيءٍ عَليمٌ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ خاوەنی خزمایەتی یەکترین لەپشتا هەندێکیان شایستە و چاکترین بۆ هەندێکیان لەمیرات گرتندا کە ڕونکراوەتەوە لەفەرماندان لەنامەی خوادا بۆبەشکردنی میرات، بەو ڕستەیە ناوەڕۆکی ئایەتی ( ٧٢) ی ئەم سورەتە کەکۆچ کردن ئەبێتەهۆی میرات گرتن گۆڕرا بەوەی کە خزمایەتی هۆی میرات گرتنە بەتەنها، بەجۆرێ ڕون کراوەتەوەلەنامەو دەستوریەکاندا و لەسورەتی نیسائدا بەڕاستی خوا بەهەموشتێ ئەزانێ هەمو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ کەلەمەوبەر بەهۆی میرات گرتن لەئیسلامدا کۆچ کردن بو یەکەم جار ،لەدواییدا هۆی میرات گرت نگۆڕرا بەخزمایەتی .

کۆتایی بەتەواوبونی ئەم سورەتە هات بەیارمەتی خوا لە ٢٩ / ٩/ ١٩٩٩
بەرامبەر بە ١٩ / جمادی دووهەم ساڵی ( ١٤٢٠) ی کۆچی

# ﴿ سورەتی تەوبە ﴾

لـە مەدینە هاتۆتە خوارەوە، هەندێ لـە زانایان ئەڵێن: جگەی ئایەتی (١٢٨) و ئایـــەتی (١٢٩) لـە کۆتایی ئەو سورەتەدا لـە مەکە هاتونەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (١٢٩) ئایەتن.

ئەو سورەتە (١٣) ناوی هەیە: ١- (التوبە) لـەبەر ئەوەی لە م سورەتەدا هەیـە باسـی وەرگرتنی پەشیمان بونەوەی باوەڕداران لـەلایەن خواوە ٢- (براءة) بە مانا بێزاری خـــواو پێغەمەر لـە بت پەرســـتان. ٣- (المستشقشـية). بـەمانا بـێزاری دووری لــە دوو ڕووان . ٤- (البُحُـوث) باسـی هـەواڵی دوو ڕوان ئـەکا. ٥- (المُبَعْـثَرَة) بـڵاو ئەکاتـە هـەواڵ و بەســەرهاتی دوو ڕووان. ٦- (المُنَقِـرَةُ) قەدەغـە ئـەکا شـتێ لــە دڵـی بـت پەرســـتانایە. ٧- (المُثَيْرَة) بەرپا ئەکا بێ ئابڕۆی و خراپەی دووڕوان. ٨- (الحافِرَةُ) کون ئەکا دڵی بـێ باوەڕان. ٩- (المُخزِيَةَ) ئابڕۆبەری بێ باوەڕانە. ١٠- (الناضِحَةُ) دەرخەری خراپەی دڵـی دووڕوانە. ١١- (المنکلة) تەمێ کەری دووڕوانە. ١٢- (الدُمَدْمَةُ) لــەم ســورەتەدا هەیـە لـەناوچونی دووڕوان. ١٣- (سُورَةُ العَذابْ) باسی سزای بێ باوەڕان ئەکا.

هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بە تایبەتی و خوێنەوارانی قورئان بە گشتی پێك هاتوون لـە سەر فڕێدانی ڕستەی (بسم الله الرحمن الرحيم) لـە سەرەتای ئەم سورەتەدا لـەیەکەم کـاتی هاتنی خوارەوەیدا، لـەبەر ئـەوەی ئـەم سـورەتە هاتوەتـە خـوارەوە بۆلابردنـی ئاسـایش و لابردنی پاراستنی بت پەرستان و بەرپاکردنی جەنگ، ئەو ڕستەیەش شایستەی دۆســتایەتی و ئاشتیە کە دووجار بەزەیی و میهرەبانی خوای تێدا بێـژراوە لــەو کاتـەی جـەنگدا ئـەو ڕستەیە نەبێژراوە، هەندێ لـــە زانایـان ئـەڵێن: ئـەو سـورەتەو سـورەتی ئەلـئـەنفال یـەك سورەتن، چونکە ناوەڕۆکی هەردوکیان پەیوەندی تەواویان بەیەکەوە هەیە، لـەبەر ئـەوەی ئەلئەنفال باسی بەستنی پەیمان ئەکا، ئەم سورەتە باسی تێکدانی پەیمان ئەکا، بۆیە لکاوە بە سورەتی ئەلئەنفالـەوە .

پێغەمەبە ﴿ ﷺ﴾ لە شەشەم ساڵی کۆچیدا پەیمانی ئاشتی بەست لەگەڵ قورەیشـیەکان لەسەر ئەوەی بۆ ماوەی (١٠) ساڵ جەنگ لەگەڵ یەکتری نەکەن، هـەر هـۆزو کەسـێ ئارەزوی هاوپەیمانی لەگەڵ پێغەمەر ببەستێ ڕێگەی پێ نـەگیرێ، هـەر کەسـێکیش پـێی خۆشبو بچێتە نێو پەیمانی قورەیشەوە قەدەغەی نەکرێ، بەو بۆنەوە هـۆزی خوزاعـە بونـە هاوپەیمانی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ هۆزی بەنو بەکر چونە نێـو پـەیمانی قورەیشیەکان. لـە سـاڵی هەشتەمی کۆچیدا قورەیشیەکان پەیمانەکەیان شکاندو کۆمەکی هۆزی بـەنو بـەکریان بـە پیاوو بە چەك لە کاتێکدا جەنگیان کرد لەگەڵ هۆزی خوزاعە، زۆر کەسیان لە هـۆزی خوزاعەی هاوپەیمانی پێغەمەریان کوشت، هاواریـان بـۆ پێغەمـەر هێنـاو چونـە خزمـەتی پێغەمەر لە ساڵی هەشتەمی کۆچیـداو (١٠) ە هـەمی مـانگی ڕەمـەزان چـوە دەرەوەو مەکەی داگیرگرت عەرەبەکان هەندێکیان موسڵمان بوون، هــەندێکیان مانـەوە لەسـەر پت پەرستی و شکاندنی پەیمان ئەوانە لە لایەکەوە، لە لایەترەوە بت پەرستانی عەرەب لەسەر خوو ڕەوشتی خۆیان بەردەوامبوون، بە ڕوتی ئەسوڕانەوەە بەم لاو بەولای خانەی خوادا و فیکەیان ئەکێشاو چەپڵەیان لێ ئەدا، ئـەو کـردەوە پیسـانە ئـازاری زۆری دڵـی پێغەمەریان ئەداوشایانی ڕێزی خانە خوانە بو، بۆیە ئەبو بەکری کرد بـە پێشـەوای حـەج کەران، لە ساڵی نۆهەمی کۆچیدا لە کاتی چوونی ئەبو بەکر ئەو سورەتە هاتە خوارەوە، ئامۆزاکەی خۆی عەلی کوڕی ئەبو تالیبیشی ناردو فەرمانی پێدا ئــەو سـورەتە بخوێنێتـەوە بەسەر ئادەمیزادا لە ڕۆژی حەجی گەورەداو بەوان ڕابگەیەنێ لەمەو پـاش قەدەغەیـە بـە ڕوتی حەج کردن، بت پەرستان نابێ حەج بکەن. بۆیە خوای مەزن فەرموی:

بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾ فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢﴾ وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ

إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُۥ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾

﴿ براءَةٌ مِنَ اللهِ وَرَسُولِهِ إلى الذيْنَ عاهَدتُّمْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴾ بێزاری و بچڕاندنی پـەیمان و نەماندانی پاراستن لە خواوەو لە فروستادەی خواوە بۆلای کەسـانێکی ئـەوتۆ پـەیمانیان بەستوە لەگەڵیان لە بت پەرستان.

یانێ خوای مەزن بلاوی کردۆتەوە کە خواو پێغەمەر بێزارن لە بت پەرستان، دۆستی بت پەرستان لە نێو دورگەی عەرەبا بترسێنێ بە جەنگ کردن لەگەڵیان هـەتا هـەموویان موسڵمان ئەبن .

﴿ فَسِحُوا في الأرْضِ أرْبَعَةَ أشْهُرٍ ﴾ دوایی ئێوەی موسڵمان بلێن بە بت پەرستان بڕۆن بەنێو زەویدا بەبێ وەی و بەبێ ترس و هاتۆچۆ بکەن بۆ ماوەی چوار مانگ، لە پاش ئـەو ماوەیە ئەگەر موسڵمان بوون ڕزگاریان بووە لە هەردوو جیـهاندا بـەختیاری بـۆ ئەوانـە، ئەگەر هەر بەردەوامبن لەسەر بێ باوەڕی پاداشتەکەیان کوشتنە لە جیـهانداو سـزای زۆر سەختە لە پاشە ڕۆژداو کاتی ڕاکردنیان لە کیس ئەچێ.

﴿ وَأعْلَمُوا أنَكُمْ غير مُعْجِزِى اللهِ وَأنَ اللهَ مُخْزِيُ الكافِرِينَ ﴾ وە ئێـوە بزانـن بەڕاسـتی ئێوە پەکی خوا ناخەن لە سزای خوا دەرچونتان نیە هەرچەندە ماوەیە مۆڵەتتان بـدرێ وە

بە ڕاستی خوا ڕسوا ئەكا بێ باوەڕان لە جیهاندا بە كوشتن و لە پاشە ڕۆژدا بە سـووتانی ئاگری دۆزەخ.

زانایان لە بۆ دیاری كردنی ئەو چوار مانگە بیریان جیاوازە. هەندێكیتان ئەڵێن: بریتین لە مانگی شەوال. زیل پەعیدە. زیل حەجە. موحەڕەم، چونكـە ئـەم سـورەتە لـە مـانگی شەوالدا هاتۆتە خوارەوە، هەندێ تریان ئەڵێن: ئـەو چـوار مانگـە دەسـت پـێ ئـەكا لـە دەهەمی مانگی زیل حجەوە كۆتایی پێ دێ لە كۆتایی دەهەمی مـانگی ڕەبیعـی یەكـەمدا، چونكە گەیاندنی ئەو ئایەتە بە ئـادەمیزاد لـە ڕۆژی دەهـەمی مـانگی زیـل حجـەدا بـوو، لەبەرئەوەیش كاتێ ئەو سورەتە هاتە خوارەوە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ عەلی ئامۆزای خۆی نارد بە سواری هوشترەكەی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ كە ناوی (البعضاء) بوو هەتا ئەو سـورەتە لـە كـاتی حەجدا بخوێنێتەوە بەسەر كەج كەراندا، لەوەو بەر پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ ئـەبو بـەكری نـارد هەتا ببێ بەكار بەدەستی حەج كەران، كاتێ عەلی بینی ووتی كراوی بەكار بەدەستی حەج كەران یا كارێ ترت پێ سپێردراوە؟ عەلی ووتی: كاری ترم پـێ سـپێرراوە، لـەوەو پـاش ئەبو بەكر لە ڕۆژی هەشتەمی زیلحەجەدا ووتـارێكی خوێنـدەوە باسـی چۆنیـەتی حـەج كردنی كرد، لە ڕۆژی دەهەمی مـانگی زیـل حیجـەدا لـەلای جومرەتوالعەقەبـەدا عـەلی هەڵسایە پێ ووتی: ئەی ئادەمیزاد: من ڕەوانەكراوی پێغەمەرم بۆلای ئێوە، ووتیان، بـە چ شتێكەوە؟ (٢٠) ئایەت یا (٤٠) ئایەتی بەسەردا خوێندنەوە، لە دووایـدا ووتـی: فـەرمانم پێدراوە بە چوارشت: دووای ئەمساڵە پێویستە هیچ بـت پەرسـتێ نزیكـی خانـەی خـوا نەكەوێ، بە ڕوتی حەج نەكرێ. ناچێتە نێو بەهەشت جگەی موسڵمانان.

ئەو كەسانەی پەیمانیان لەگەڵ پێغەمەر بەستوە ماوەكەی خۆیان بەسەر بێن بـەبێ تـرس و بەبێ وەیی.

پرسیار/ فەرماندان بە جەنگ لەو ئایەتەدا لەگەڵ بت پەرستان هەتا باوەڕ نەهێنن چۆن دژایەتی نیە لەگەڵ ئایەتی (٢٥٦)ی سورەتی ئەلبەقەرە كە ئەفەرموێ: ( زۆر لـە ئـاییندا نیە) یا لەگەڵ ئایەتی (٩٩)ی سورەتی یونس ئەفەرموێ: (ئایا تۆ زۆرو زەنگ ئەكەی لـە ئادەمیزاد هەتا باوەڕ بهێنن). بەڕاستی ئایینی ئیسلام ئاینی ئاشتیە نەك ئایینی جەنگ؟ .

وەڵام/ بەڵێ: ئایینی ئیسلام زۆر لەکەس ناکا باوەڕ بهێنێ. بەڵام بـانگ ئـەکا بـۆلای ئایین بە نەرمی و بە دانانی بەڵگە. ئەوەندە هەیە کاتێ بەبێ ســوود گەیشت ئیسلام لــە هەندێ کاتی تایبەتدا داوا ئەکا لە بێ باوەڕان باوەڕ بهێنن، ئەبێ بزانرێ کە بت پەرســتان لە نێو دورگەی عەرەبدا لەو کاتەدا بووبوون بە ستونی پێنچەم و خۆرە بـۆ دانیشـتوان و کۆمەڵگای ئیسلامی تازە پێ گەیشتوو، هەر لەبەر ئەوانە فەرمانی خوا لەواندا کوشتنە یا باوەڕهێنانە، ئەو فەرماندانەیش بە تایبەتی هەر بۆ بت پەرستانی نێو دورگەی عەرەبـە، لــە ئایەتی (٢٥٦)ی ئەلبەقەرەدا ئەو باسە تێپەڕبووە.

﴿ وَأذانٌ مِنَ اللهِ وَرَسُولِهِ إلى الناسِ يَوْمَ الْحَجِ الأكْبَرِ ﴾ وە ڕاگەیاندنــە لــە خــواو لــە پێغەمەری خواوە بۆلای ئادەمیزاد لە ڕۆژی حەجی گەورەدا کــە ڕۆژی چــەژنی قوربانــە، بۆیەش گەورەیە چونکە لەو ڕۆژەدا حەج و زۆربەی کارەکانی کۆتایی پــێ هـاتووە، وەك وەستانی عەرەفەو تەواف و سەرتاشین و فڕێدانی بەرد بـۆ جومرەتولعەقەبـە. بـا ئەوەشـی بزانرێ عەمرە کردن پێی ئەوترێ: حەجی بچوك.

زانایان بیریــان جیـاوازە لــەبۆ دیـاری کردنــی ئـەو ڕۆژە: هـەندێکیان ئـەڵێن: ڕۆژی عەرەفەی نۆهەمی مانگی زیل حیجەیە، هەندێ تریان ئــەڵێن: ڕۆژی چـەژنی قوربانــە کــە دەهەمی مانگە.

﴿ أنَ اللهَ بَرِيىءَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُ فَإنْ تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ ﴾ ڕایان گەیاند بەڕاستی خوا بێزارە لـە بت پەرستان و پەیمانی ئەوان، وەنێرراوی خوایش لــەوان بـێزارە، پێویسـتە بزانن جارێ تر پەیمانیان بۆ ناگەڕێتەوەو ڕێزیان لێ ناگیرێ، دوایی ئەگەر پەشـیمان ببنــەوە لـە بت پەوستی و لـە ناپاکی و بە ڕاستی موسڵمان ببن، دوایی ئەو گەڕانەوەبانــە لــە بــت پەرستی چاکترە بۆ ئێوە لە بەردوام بونتان لەسـەر بـێ بـاوەڕی، دوایـی هـەموو مـافێکی موسڵمانتان ئەدرێتێ و گیان و داراییتان پارێزراو ئەبێ و ئەچنــە بەهەشـتەوەو لــە سـزای ئاگری دۆزەخ ڕزگارتان ئەبێ.

﴿ وَإِنْ تَوَلَّيْتُمْ فَاْعْلَمُوا أَنَّكُمْ غَيْرَ مُعْجِزِي اللهِ ﴾ وەئەگەر ئێـوە پشـت بکەنـە پەشـیمان بوونەوە واز لـە بێ باوەڕی نەهێنن، دوایی ئێوە بەڕاستی پەکی خوا ناخەن و ڕێگە لە خـوا ناگرن و ناتوانن لـە دەست خوا ڕاکەن.

﴿ وَبَشِّرِ الذِيْنَ كَفَرُوا بِعَذابٍ أَلِيمٍ ﴾ وەتۆ موژدە بدە بـە کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕیـان نەهێناوە وەخەفەتیان بدەرێ بە سزایەکی ئازاردەر لـە پاشە ڕۆژدا .

پاش ئەوەی خوای مەزن مۆڵەتی بت پەرستانیدا هەتا کۆتایی چوار مانگ لـەگـەڵ ئـەو کەسانە پەیمانی موسـڵمانانیان شکاندوەو ناپاکیان کردوە لەگەڵ موسـڵمانانا، لـە ناوەڕۆکی ئەو فەرماندانە دەرئەکا لـەنێو بت پەرستانا کۆمەڵێ پەیمانیان هەیە لـەگــەڵ موسـڵمانانداو تێکیان نەداوە، ئەوانە مۆڵـەتیان ئەدرێ بە کۆتایی ماوەیە بۆیان دیاری کراوە وێنەی هۆزی کەنانە کە ماوەی پەیمانەکەیان نۆ مانگی مابوو، بۆ پێغەمەر هەیە مۆڵـەتیان بدا هەتا کۆتایی ئەو مانگە، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ إِنَ الذِيْنَ عاهَدْتُمْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ثُمَ لَمْ يَنْقُصُوكُمْ شَيْئاً ﴾ مەگەر بەڕاستی کەسـانێکی ئەوتۆ ئێوە پەیمانتان بەستبێ لـەگەڵیان لە بت پەرستان، لـە پاشا هیچ شتێ لـە مەرجـەکانی ئەو پەیمانەیان کەم نەکرێتەوە، پەیمانەکەیان بردبێتە سەرو تێکیان نەدابێ و کەسیان لـە ئێوە نەکوشتبێ و ئازاری ئێوەیان نەدابێ .

﴿ وَلَمْ يُظاهِرُوا عَلَيْكُمْ أحداً ﴾ وەیاریدەی هیچ کەسێکیان نەدابێ لـە دوژمنانی ئێــوەو لـە دژی ئێوە بە چەك و تەفاق و سەربازو هەواڵ بردن، وێنەی ئەوانە یاریدەی هۆزی بەنو بەکریاندا لـە دژی هۆزی خوزاعەی هاوپەیمانی ئێوە.

﴿ فَأتِمُوا عَلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إلى مُدَتَهُمْ ﴾ دوایی ئێـوە تـەواو بکـەن بـۆلای ئـەو کەسـانە پەیمانەکەیان هەتا کۆتایی ماوەی دیاری کراوی ئەو پەیمانـە، وێنـەی هـۆزی کەنانـە، لـە ماوەی پەیمانەکەیان نۆ مانگی مابو، دوایی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەو پەیمانەی بۆ تەواو کردن.

﴿ إِنَ اللهَ يُحِبُ الْمُتَقِينَ ﴾ بەڕاستی خوا خۆشی ئەوێ ئەو کەسانە خۆیـان ئـەپارێزن لـە گوناهو لـە شکاندنی پەیمان و خراپەکانی تر.

لـە پاشا خوای مەزن فەرمانی خـۆی ڕون ئەکاتـەوە بـۆ بـت پەرسـتان دوای کۆتـایی پەیمانەکەیان، خـوای مـەزن لـە ئایـەتی پێشـوودا مۆڵـەتی ئـەو بـت پەرسـتانەی دا کـە پەیمانەکەیان پاراستبوو هەتا کۆتـایی پەیمانەکـەیان. مۆڵـەتی ئـەو بـت پەرسـتانەی دابـوو پەیمانیان بەستبو لـەگەڵ موسڵمانان. لـە پاشانا پاکیان کـرد لـەگـەڵیان هـەتا کۆتـایی ئـەو ماوەیە لـە مانگە ڕێزدارەکاندا کە بریتیە لـە (٥٠) ڕۆژ. مۆڵەتی ئەو بت پەرستانەی دا بـە پەیمانێکەوە نەبەستزابوون هەتا کۆتایی چوار مانگ بـۆ ڕون کردنـەوەی ئـەو شـتانە خـوا ئەفەرموێ:

فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ اللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِ إِلَّا الَّذِينَ عَاهَدتُّمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۖ فَمَا اسْتَقَامُوا لَكُمْ فَاسْتَقِيمُوا لَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ ﴿٧﴾ كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُوا فِيكُمْ إِلًّا

وَلَا ذِمَّةً يُرْضُونَكُم بِأَفْوَاهِهِمْ وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ وَأَكْثَرُهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٨﴾

﴿ فَإِذَا انْسَلَخَ الأَشْهُرُ الْحُرُمُ ﴾ دوایی کاتێ مانگە ڕێزدارەکان کۆتایی پـێ هـات کـە ڕەوا کرابوو لـەو مانگانەدا بەسەربەستی هاتوچۆ بکـەن کـە لـە (١٠) دەی مـانگی زیـل حیجەوە دەست پێ ئەکا هەتا دەهەمی ڕەبیعی مانگی یەکەم، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئەو مانگانە بریتین لـە مانگی ڕەجەب. زیل قەعیدە. زیل حیجە. موحەڕەم .

﴿ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ ﴾ دوایی ئێوە ئەو بت پەرستانە پەیمانیان داوە بە ئێوە شکاندویانە بیان کوژنلەهەر جێگەیە ئێوە ئەوانتان دەست کەوت لە مەکەدابن یا لـە دەرەوەی مەکە بن؟

﴿ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ﴾ وەئێوە ئەو بـت پەرسـتانە بگـرن بـە دیلی و بەندیان بکەن و مەیەڵن بســوڕێنەوە بـەملاولای خانـەی خـوادا، مەیـەڵن بچنـە دەرەوەو ئێـوە دانیشـن بۆیـان لـە هـەموو جێگەیەکـەوە دێـن و ئەڕۆنـە دەرەوە ئەگـەر موسڵمان نەبوون یا کۆچیان نەکردبێ لە نێو دورگەی عەرەب بەر لە کۆتایی هاتنی ئـەو ماوەیە بۆیان دیاری کراوە .

﴿ فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ﴾ دوایی ئەگەر ئەوان پەشیمان بوونەوە بە دەربڕینی پەشیمانەتی خۆیان، بەر لە کۆتایی ئەو ماوەیە بۆیان دانراوە، درۆشمی ئیسلامیان بەرزکردەوەو نوێژەکانیان بەرپاکردو زەکاتەکانیان دا بە هەژاران، دوایی ئەگەر ئەوانەیان کرد بەرەڵایان بکەن و ئێوە ڕێگایان بۆچۆڵ بکەن و دەستیان بۆ درێژ مەکـەن و باوەڕدارن وەك ئێوە.

﴿ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ بەڕاستی خوا لێ خۆشبوونی زۆرۆە بـۆ ئـەو کەسـانە وازیـان لەبێ باوەڕی هێناوەو موسڵمان بوون و ئەبورێ لـە گوناهەکانیان، بەزەیی زۆرو میهرەبانە بۆ دۆستانی خۆی و بۆ ئەوانە پەرستنی بۆ ئەکەن.

﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجارَكَ فَأجَرْهُ حتى يَسْمَعُ كلامَ اللهِ ﴾ وەئەگەر یەکێ لـــە بت پەرستان پەنای بۆ تۆ هێناو داوای بێ ئازاردانی کرد، دوای پێویستە تۆ پـــەنای بـدەی هەتا ئەو کەسە فەرمودەی خوا کە قورئانــە ئـــەی بیســێ. یانــێ ئەگـــەر یــەکێ لــەو بــت پەرستانە کەمن فەرمانم داوە بە تۆ بیکوژی پەنای هێنا بۆلای یەکێ لە موسڵمانان پێویستە لـەسەریان پەنای بدەن و خۆی و دارایی ئەو بپارێزن هەتا فەرمودەی خوا ئەبیســێ و بــۆی دەرئەکەوێ پاداشتی باوەڕ هێنان و سزای بێ باوەڕی چۆنە، دوایی داوای باوەڕ هێنانی لێ بکەن بە ئامۆژگاری شیرین و ووتەی نەرم ، ئەگەر وەری گـــرت وەك موســـڵمان تەماشـا ئەکرێ، ئەگەر وەری نەگرت نابێ ئێوە بیکوژن.

﴿ ثُمَ أَبْلِغْهُ مَأمَنهُ ذلِكَ بأنَهُمْ قَومٌ لا يَعلَمُونَ ﴾ لـه باشا کە باوەڕی نەهێنا تۆ ئەو کەســە بگەیەنە بە جێگەیە کە لـەو جێگەیەدا ترسی کوشتنی نـەبێ و بحەسـێتەوە، لـەپاشـا ئەگـــەر ویستت جەنگی لـەگەڵ بکە، ئەو پانادانە بەهۆی ئەوەوەیە بە ڕاستی ئەو کەسانە تـاقمێکن نازانن ئیسلام چۆنەو یاسای ئیسلام لـەو بارەوە چۆنە؟ فەرمودەی خوایان نەبیستوە پەنایان بدەن هەتا ئەیزانن و ئەی بیسن.

هەندێ لـە زانایان ئەڵێن: دروستە بۆ مسڵمانێ پەنای بێ بـــاوەڕێکی جــەنگ کـــەریدا، بەو مەرجە خراپەیە لـە پانادانەکەیا پەیدا نەبێ، وێنەی هەواڵ بردن بۆ بـــێ بـــاوەڕان، بــەو هەواڵ بردنە جەنگ لـەگەڵیان ڕانەوەستێنرێ.

کاتێ خوای مەزن فەرمانیدا بە فڕێدانی پەیمان بۆلای بت پەرستان، ڕونی ئەکاتەوە بـــۆ ئەو کەسانە دەرکـــەوتووە لـەوانـــەوە ناپـــاکی، فەرمانیشـــی دا بـــە کۆتـــایی پـــەیمانی ئەوانـــە پەیمانەکەیان شکاندوەو ئەفەرموێ:

﴿ كَيْفَ يَكُونَ لَلْمُشْرِكينَ عَهْدٌ عِنْدَ اللهِ وَرَسُولِهِ ﴾ چۆن ئەبێ و چۆن ئەتوانرێ بۆ بـــت پەرستان لای خواو لای نێردراوی خوا. یانێ پەیمانی خواو پێغەمەر بۆ ئەو کەسانە نابێ لـە کاتێکا ئەوان ناپاکی بکەن و پەیمان بشکێنن، ئەو ڕســتەیە تەواوکـــەری نـــاوەڕۆکی مانـــای (١)ی ئەم سورەتەیە، هەموو کاتێ پەیمانی خواو پێغەمەربۆ بێ باوەڕان نیە.

﴿ إلا الذيْنَ عاهَدْتُمْ عِنْدَ الْمَسْجِدِ الْحَرامِ ﴾ مەگەر بۆ کەسانێکی ئەوتۆ ئێوە پــەیمانتان لـەگەڵ بەستبوون لـەلای ئەو مزگەوتە ڕێزدارە، وێنەی هۆزی بەنو نەزرو بەنو کەنانـە لـە ڕۆژی حودەی بیەدا، ئەو ڕستەیە تەواوکەری مانای ئایەتی (٤)ی ئەم سورەتەیە.

﴿ فَما أسْـتَقامُوا لَكُـمْ فأسْتَقِمُوا إنَّ اللهَ يَحِبُّ الْمُتَقـينْ ﴾ دوایـی هـەتا ئـەو کەسـانە ڕاوەستاون بۆ سودی ئێوە لـەسەر پەیمانەکــەیان ئێــوە چاودێریـان بکــەن ئەگــەر ناپاکیـان نەکرد، دوایی ئێوەیش لـەسەر پەیمانی خۆتان بــەردەوامبن. بەڕاسـتی خـوا خۆشـی ئـەوێ کەسانێ خۆپارێزن لـەبێ فەرمانی خواو پەیمان ئەپارێزن و ناپاکانی خۆش ناوێ.

﴿ كَيْفَ وإنْ يَظْهروا عَلَيكم لا يرقبون فيْكُمْ إلا وَلا ذِمَةٍ ﴾ چۆن ئـەبێ پـەیمان لـەگـەڵ ئێوەو ئەواندا بـمێنێ، ئەگەر ئەو بێ باوەڕانە دەستەڵات پەیدا بکەن بەسـەر ئێـوەد ئـەوان چاوەڕانی ئەوە ناکەن لـەئێوەدا هەبێ هاو سوێندی و خزمایەتی ،چاوەڕانی ئەوەیش ناکە بۆ دوژمنیەتی کردن لـەگڵ ئێوە پەیمان و مافێ بۆ ئێوە دابنێن.

﴿ يَرْضُونَكُمْ بِأفْواهِهِمْ وَتَأبى قُلُوبُهُمْ ﴾ ئەو بێ باوەڕانە ئێوە دڵخۆش ئەکەن و ڕازیتـان ئەکەن بە دەمیان و بە ڕواڵـەت باوەر ئەهێنن و پەیمان ئەدەن بەئێوە ،بەدڵیان باوەڕ نـاهێنن و قەدەغە ئەکەن ئەوەی بەدەم ووتویانە.

﴿ وَأكْثَرَهُمْ فاسِقُونَ ﴾ وە زۆرتر لـەو کەسانە لـە سنوری خوا لایـانداوە و بـەردەوامن لـەسەر بێ باروەڕی خۆیان، کەمێکیان لـەبەر بەدناوی و بێ ئـابڕوی خۆیـان ئـەپارێزن لـە شکاندنی پەیمان .

خوای مەزن لـەو ئایەتەدا باسی خراپەی بێباوەڕانی کردوە بەسێ شت.

١-دڵ پیسی و بێ باوەڕی و بێپیاوەتی و درندەیی، چونکە ئەگــەر دەسـتەڵات پـەیدا بکەن بەسەر موسڵمانندا هەمو شتێکی خراپ لـەگەڵیان ئەکــەن و بـیر لــە مرۆڤایـەتی و پەیمان و خزمایەتی ناکەنەوە .

٢-بەدووڕوویی ،ئەو کەسانە بەزمان شتێ دەرئەبڕن و لـەدڵیانا شتێ تر هەیە ،چ شـتێ بێ و لـەو کارەو لـەو ڕەوشتە خراپتر بێ ؟.

٣-ناویان ئەبرێ بەوەی لەسنور دەرچوون ..هەرکەسێ ئەو شتانەی تێدا بێ و فەرمان ئەدرێ بەسەریا بەگرانترو سەختترین سزاو هیچ مافێکیان نادرێتێ.

پ-بێ باوەڕان هەمەمویان لەسنور دەرچوون، چونکە بێباوەڕی لەسنور دەرونە و زۆر تریش.

ئیتر چۆن خوا ئەفەرموێ :ئەوانە لەسنور دەرچوون؟

و-مانای ڕستەی ﴿ وَأَكْثَرُهُمْ فاسِقُونَ ﴾ بەم جۆرەیە:زۆرتـر لـەبێباوەڕان بـەردەوامن لەســەر بێبــاوەڕی و لەســنور دەرچــوون و چــاوەڕوانی ڕانمویــی وەرگرتنیــان لێ ناکرێ،کەمێکیان ئەگەڕێنـەوە لـەبێ بـاوەڕی خۆیـان .کەواتـە مەبەسـت لەسـنور لادان بەردەوامیە لەسەر بێباوەڕی و وز نەهێنان لەبێ باوەڕی ،ئەو جـۆرە ووشـانە لـەقورئاندا زۆرن.

لەپاشا خوای مەزن رونی ئەکاتەوە ئەو کردارانە بێباوەڕان ئەیکەن و ئەفەرموێ:

ٱشْتَرَوْا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩﴾ لَا يَرْقُبُونَ فِى مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُعْتَدُونَ ﴿١٠﴾ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ۗ وَنُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١١﴾ وَإِن نَّكَثُوٓا۟ أَيْمَـٰنَهُم مِّنۢ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا۟ فِى دِينِكُمْ فَقَـٰتِلُوٓا۟ أَئِمَّةَ ٱلْكُفْرِ ۙ إِنَّهُمْ لَآ أَيْمَـٰنَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ ﴿١٢﴾ أَلَا تُقَـٰتِلُونَ قَوْمًا نَّكَثُوٓا۟ أَيْمَـٰنَهُمْ وَهَمُّوا۟

أَئِمَّةَ ٱلْكُفْرِ إِنَّهُمْ لَآ أَيْمَٰنَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ ﴿١٢﴾ أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوْمًا نَّكَثُوٓاْ أَيْمَٰنَهُمْ وَهَمُّواْ بِإِخْرَاجِ ٱلرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ أَتَخْشَوْنَهُمْ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣﴾ قَٰتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ﴿١٤﴾ وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٥﴾

﴿ أشْتَروْا باياتِ اللهِ ثَمَناً قَليْلاً ﴾ بت پەرستان ئەگۆڕنەوە ئایەتەکانی قورئان بەنرخێکی کەم کە بریتیە لەدواکەوتنی ئارەزوی خراپی خۆیان، ئەوە بوو ئەو پەیمانەی بەستبویان لەگەڵ پێغەمەر شکاندیان بە خواردنیٚ کە ئەبوسوفیان دەرخواردی دان .

﴿ فَصَدُوا عَنْ سَبِيلة أَنَهُمْ ساءَ ماكانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ دوایی ئەو بتپەرستانە ڕێگە ئەگرن لەئادەمیزاد لەڕێگەی ئایینی خواو نایەڵن بچن بۆ لای خانەی خوا پەرستن لەو خانەیەدا یاریدەی یەکتریان ئەدا بەدارایی بۆ جەنگ کردن لەگەڵ پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بەڕاستی ئەو بیٚ باوەڕانە خراپ کارێکە ئەیکەن لەبیٚ باوەڕی و تێکدانی پەیمان و قەدەغە کردنی ئادەمیزاد بۆ چونی نێو ئاینی خوا .

ئەو ئایەتە بەتایبەتی دەربارەی بتپەرستان و خاوەن نامەکان نەهاتوەتە خوارەوە. بەڵکو هەمو ئەو کەسانە ئەگرێتەوە ئاین ئەگۆڕن بەگوێرەی سودو ئارەزوی داگیرکەرانی

نیشتمان و ئەو کەسانە هەژاران و ئاین پەروەران ئەچەوسێنەوە، تەلاّق بەفیڵ و بەپارە چاك ئەکەنەوە .

﴿ لا يَرْقُبُونَ فِي موْمِنٍ إلاّ ولا ذمّة وأُولئِكَ هُمُ الْممتَدُونَ ﴾ ئەو بێ باوەڕانە چـاودێری خزمایەتی و هـاو سوێندی و پـەیمان بـۆ نێـو بـاوەڕداران و چۆنیـان بـۆ بلـوێ ئـازاری باوەرداران ئەدەن .وە ئەو کەسانە ئەوانەن لە سنوری ئاینی خوا لائـەدەن یـاخی و بـوون بەشکاندنی پەیمان .

پرسیار: ئەو ئایەتە وێنەی ئایەتی (٨) ی ئەم سورەتەیە بۆچی دوویات کراوەتەوە؟

وەلاّم: ئایەتی پێشوو خوا ڕوی پێ ئەکا بۆلای هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەم ئایەتـەی ئێرە ڕوی پێ ئەکا بۆلای هەموو باوەڕداران. یانێ دوژمنایەتی بێ باوەڕان تایبەت مەند نیـە بۆ پێغەمەرو هاوڕێکانی. بەڵکو هەموو باوەڕداران ئەگرێتەوە.

﴿ فَأنْ تابُوا وأقامُوا الصَلاةَ وَأتُوا الزَكاةَ فَأخْوانِكُمْ فِي الّدينِ ﴾ دوایی ئەگەر بێ باوەڕان پەشیمان بونەوەو نوێژەکانیـان ڕاوەسـتان و زەکاتـەکانیاندا بـە هـەژارانی دییـاری کـراو لـەلایەن قورئانەوە دوایی ئەو کەسانە بـرای ئێـوەن لـە ئـایینی ئیسـلامداو ئێـوەو ئـەوان یەکسانن لە مافدا، گەورەو بچوکیان وێنەی یەکن بەبێ جیاوازی، زۆرداروبێ هێزیان لای ئایینی ئیسلام یەکسانن.

پرسیار: ئەم ئایەتەو ئایەتی (٥) ی ئەم سورەتە بەم ڕستانە لـەیەك جیـاوازن: یەکـەمیان بە ڕستەی ( فَخَلُوا سَبِيْلَهُمْ ) دووەهەمیان بە ( فَأخْوانُكُمْ فِي الدّيْـنِ ) چـۆن لـەیـەك جـوێ ئەبنەوە.

وەلاّم: ڕستەی یەکەم لە ئایەتی پێنچەمدا یانێ ئێوە وازیان لێ بهێنن و ئازاریان مەدەن و خراپەیان لـەگەڵ مەکەن باوەڕداران وێنە ئێوە، ڕستەی دووهەم لەم ئایەتەدا یانێ ئـەوان و وێنەی ئێوەن و گەورەو بچوك نەماوە نابێ یەکێ هەر بخۆربێ و یەکێ تر خوراوبێ.

﴿ وَنُفَصِلُ الآياتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمونَ ﴾ وەئێمە ڕون ئەکەینـەوەو شـیئەکەینەوە ئایەتـەکانی قورئان بۆ تاقمێ بزانن و لـەمانای ئایەتەکان ووردببینەوە. نەك نەیزانن و لێیان وردنەبنەوە.

﴿ وَإِنْ نَكَثُوا أَيْمانَهُمْ مِنْ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا فِي دِينِكُمْ ﴾ وەئەگەر بت پەرستان سوێندەکانی خۆیان شکاند لە دووای ئەوەی پەیمانیان دابوو بە ئێوەو، تا ئەو تاوانجیان گرتبوە ئایینی ئێوەو ئەیان ویست لە کەداری بکەن فەرمانەکانی ئیسلام.

﴿ فَقاتِلُوا أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لا أَيْمانَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنْتَهُونَ ﴾ دوایی ئێوە جەنگ بکەن لەگەڵ پێشەواکانی بێ باوەڕی و سەرۆکە بت پەرستەکانیان. بەڕاستی ئەو کەسانە هیچ پەیمان و سوێندێ بۆ ئەوان نیە، ئەگەر باوەڕ هێنانیان ڕاست بوایە بە ڕێگەی چەوتا نەئەچون، بۆ ئێوە ئەبێ وازیان لێ بهێنن؟ بۆ ئەوەی ئە کەسانە کۆتایی بهێنن بە تاوانج لە ئایینی ئێوەو واز لە ئێوە بهێنن و دەستەڵاتیان نەمێنێ.

﴿ أَلا تُقاتِلُونَ قَوْماً نَكَثُوا إِيْمانَهُمْ وَهَمُّوا بِإِخراجِ الرَّسُولِ﴾ ئایا ئێوە چۆن جەنگ ناکەن لەگەڵ تاقمێ لەبت پەرستانی قورەیش سوێند و پەیمانی خۆیانیان شکاندوە کەلەحودەیبیە بەستبویان و ، ئەو بت پەرستانە نیازیان کردو ویستیان پێغەمەر دەربکەن ،دوای ڕاوێژیان لە ( دارو نەدوە ) بەجۆرێ پێغەمەریان والێکرد بچێتە دەرەوە لەمەکە.

﴿ وَهُمْ بَدَأُكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾ وەئەوبت پەرستانە یەکەم جار دەستیان کرد بەپەیمان شکاندن، دەستیان کرد بەجەنگ کردن لەڕۆژی بەدردا .

لەپاش ئەوەی خوای مەزن باسی ئەوشتەی کرد کەبێباوەڕان پێی هەڵسان لەتێکدانی پەیمان وهەوڵدانیان بۆ دەرکردنی پێغەمەر و یەکەم جار لەوانەوە جەنگ هەڵگیرسا، خوا موسڵمانان هان ئەدا بۆ کۆشش بۆ بەرزی ئالأی ئایین و جەنگ کردن، چونکە بەجگەی جەنگ کردن ئەوان تەمێ دارنابن، لەدواییدا ترس لەدڵی موسڵمانان دەرئەکا و ئەفەرموێ :

﴿ أَتَخْشَوْنَهُمْ فَاللهُ أَحَقَ أَنْ تَخْشَوْهُ إِنْ كُنْتُم مُؤمِنِينَ ﴾ ئایا ئێوەی موسڵمانان چۆن ئەترسن لەو بێباوەڕانەو جەنگ کردن لەگەڵیان کەچی ئازارتان ئەدەن ، دوایی هەر خوا شایستەو ڕاسترە کەئێوە لەوبترسن و سزاتان بدا بەهۆی وازهێنانتان لەجەنگ کردن لەگەڵیان کەواتە پێویستە لەوان نەترسن و هەر لەخوابترسن و جەنگیان لەگەڵ بکەن.

ئەگەر ئێوە باوەڕتـــان هێنـاوە بەسـزادانی خـوا. یـانی بەڕاسـتی تـرس لـەخوا لـەجگـەی باوەڕدارانەوە نەبووە ناشبێ، هەر باوەڕداران لـەخوا ئەترسن و بێباوەڕان ناترسن ،ئەگـــەر بیشترسن جێگەی سود ناگرێ بۆ ئەوان و دێت وئەڕوا و نامێنێ ئەو ترسە .

لـەپاشا خوای مەزن باوەڕداران ووریائەکاتەوەلـەسەر ڕێز و گەورەیی جەنگ کردن بـۆ بەرزی ئالأی ئیسلام و ئەفەرموێ:

﴿ قاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللهُ بِأيْدِيكُمْ ويُخْزِهِمْ ﴾ ئێوە جەنگ بکـەن لـەگـەڵ بـت پەرسـتان خوا سزای ئەوان ئەدا بەهێزو توانای دەسـتی ئێـوە و بەچـەکی ئێـوە ئـەکوژرێن و، خـوا ئەوبت پەرستانە ڕسوا ئەکا و ئابڕویان ئەبا.

﴿ وَيَنْصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدورَ قَومٍ مُّؤمِنينَ ﴾ وەخوا ئێوە سـەرئەخا بەسـەر ئەواندا و خوا ڕزگار ئەکا دەردی دڵی بـاوەڕداران و نەخۆشـی تـاقمی بـاوەڕداران نایەڵێ و ئەو ڕق و کینەیە هەیان بـوو بـەهۆی ئـەو ئـازارەوە لـەوبت پەرسـتانەوە چەشتبویان تەفروتونا ئەبێ، هەرکارێ لەوبت پەرستانە لـەمەودوا ڕوبدا بۆیان ناچێتە سەر. ئەو هەوڵدانەیش بەوکارانە ی باسـکران لـەوئایەتـەدا کـارێکی پەکخـەرە بـۆ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کەبەر لـەپەیدابوونیان هەواڵی پێداون، ئیـتر ئـەو تاقمـە باوەڕدارانـە هەرکەسێ بن گرنگ نیە، چونکە موسـڵمانان ئەوشـتانەیان هـەموو پـێ بەخشـراوە لـەلایەن خوای مەزنەوە .

﴿ وَيُذهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ ﴾ وەخوا لائەبا بەهۆی یاریدانی خۆیەوە خەفـەت و ناخۆشـی دڵی ئەو تاقمە باوەڕدارانە کەبەهۆی ئازادرانی بێ باوەڕانـەوە چوبـوە دڵیـان، زۆر ڕونـە خوای مەزن یاریدەی باوەڕدارانی داو برینی دڵیانی سارێژ کرد بەلاوازی ستەمکاران .

﴿ وَيَتُوبُ اللهُ عَلى مَنْ يَشاءُ وَاللهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ وەخوا پەشیمان بونەوە وەرئـەگرێ و ئەی ڕێژێ بەسەر هەرکەسێکا ئارەزووی هەبێ باوەڕ ئەهێنن بـەدڵی پاکـەوە بـا خراپـەی زۆریشیان کردبێ وەخوا ئەزانێ بە پەشـیمان بونـەوەی ئـەوان، هـەموو شـتێ لـەجێگـەی شیاوی خۆیا دائەنێ لەهەمو کارو کردەوەی خۆیا.

لـەپاشا خوای مەزن ڕونی ئەاکاتەوە ئەو کەسانەی گرانـە لایـان جـەنگ کـردن لـەڕێگەی خوادا، ئیتر باوەڕداربن یا لەدوو ڕوەکان بن:

أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُوا۟ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَلَمْ يَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلْمُؤْمِنِينَ وَلِيجَةً ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا۟ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ وَفِى ٱلنَّارِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ فَعَسَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ أَن يَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٨﴾

﴿ أمْ حَسِبْتُمْ أنْ تُتْرَكُوا وَلَّما يَعْلَمِ الذِيْنَ جاهَدُوا مِنْكُم ﴾ ئايـا ئێـوە گومانتـان بـردوە کەئێوە وازتان لێ بهێنرێ و فەرمانتان پێ نەدرێ بەجەنگ کـردن و ئێوەتـاقی نەکرێنـەوە کە ئێوە ڕاست ئەکەن یا درۆ ئەکەن و، لـەکاتێکا خوا نەزانێ و نەبینێ کەسـانێکی ئـەوتۆ کۆششیان کردووەو جەنگیان کردوە لـەئێوەو دەری نەخا بۆ دانیشتوان ئـەو شتـەی خـوا زانیویەتی لـەئێوەو. مەبەست ئەوەیە پێویستە ئێـوە جـەنگ بکـەن. ئـەگینا خـوای مـەزن هەموشتێ ئەزانێ بەر لـەپەیدابوونی، مانای ئەوڕستانە لـەباسی مانای ئایەتی ( ٤٢ ) ،ئایـەتی ( ١٦٥ ) ی سورەتی ئالی عیمراندا تێپەڕبون .

﴿ وَلَمْ يَتَّخِذُوا مِنْ دُونِ اللهِ وَلارَسـولە وَلاَ الْمُؤمِنـيِنَ وَلِيجـةً الله خَـبيرٌ بِمـا تَعْمَلُـونَ ﴾ وەلـەکاتێکیشا خوا نەزانێ بەو کەسانە وەرئەگرن لـەجگەی خواو لـەجگەی فروستادەی و لـەجگەی باوەڕداران دۆستی پەنهانی و ژێربەژێری لـەبێباوەڕان کەدژی خـواو پێغەمـەر و

باوەڕدارانن و، خوا ئاگادارە بەشـتیێ ئێـوە ئەیکـەن لـەکاری چـاك ولـەکاری خـراپ و لەدۆستایەتی بیێ باوەڕان و لەنیازی پاکتان بۆ خوا بەتەنها .

گەوەرترین پەرستنی خوا جەنگ کردنە لەگـەڵ دوژمنـانی خـوا بەتەنـها .گـەورەترین گوناه مەیل کردنە بۆ لای دوژمنانیان ،هەرکەسیێ پەنا ببا بـۆلای دوژمنـانی خـوا سـودی خۆی ببەستیێ بە دوژمنانی خواو پێغەمەری خواو بیێباوەڕانەوە ، پێویستە هەمو باوەڕ پاکیێ ئەوکەسە دەست نیشان بکا و خراپـەی دەربخـەن ، هـەتا چـاك و خـراپ لـەیـەك جـویێ بکرێنەوە .

کۆمەڵیێ لەسەرۆکەکانی قورەیش بەدیل گیران لەڕۆژی بەدردا لەنێو ئـەو دیلانـەدابو عەباسـی کـوڕی عـەبدول مەتـەلیب و مـامی پێغەمـــەر ﴿ ﷺ﴾ تـاقمیێ لەموسـڵمانان سەرزەنشتی عەباسیان ئەکردبە بت پەرست، عەلی کوڕی ئەبوتالیب تانەی ئەدا لـەعـەباس بەبۆنەی جەنگ کردنی لەگەڵ پێغەمەردا و پچڕان وەازهێنانی لەخزمایەتی. عەباس وتی: بۆچی خراپەکانمان باس ئەکەن وچاکەکانمان پەنهان ئەدەن ؟ ئێمە گەورەترین لەئێوە، ئێمە مزگەوتی ڕێزداری خوا ئاوەدان ئەکەینەوەو ئاو ئـەدەین بەحاجیـەکان، دیلـەکان بـەڕەلاّ ئەکەین بەرگ بۆ کەعبە ئەکەین، خوای مەزن بۆ ئەو مەبەستە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە و فەرموی:

﴿ ماكانَ لِلمُشْرِكينَ أنْ يَعْمُروا مَساجِدَ اللهِ ﴾ سزاوارو سایشتە نیـە بـۆ بـت پەرسـتان کەئاوەدان بکەنەوە مزگەوتەکانی خوا. یانیێ بچنە نێو مزگەوتەوەو بت پەرستی تێدابکەن، بەچاکتریش نابیێ سەرپەرشتی ئەومزگەوتانەبکەن .

﴿ شاهِدِيْنَ عَلى أنْفُسِهِمْ بِالكُفْرِ ﴾ لەکاتێکا خۆیان شایەتی بدەن لـەسـەر خۆیـان بـیێ باوەڕی خۆیان چونکە پەرستنی بتەکان و پاڕانـەوەو هـاوارکردن لەوبتانـە شـایەتی دانـە لەخۆیان بەوەی کە بیێ باوەڕن، هەرکەسیێ بیێباوەڕبی نابیێ بچێتە نێو مزگەوتەکانەوە .

﴿ أولئِكَ حَبَطَتْ أعْمالَهُمْ وفي النار هَـمْ الخـالِدُونَ ﴾ ئـەو تاقمـە بـت پەرسـتانە پـوچ بوەتەوە پاداشتی کردەوەکانیان، چونکە خوا وەرناگریێ لەگـەڵ پەرسـتیدا هیـچ کـارێکی

چاك وەئەوكەسانە لــە نێـو ئـاگری دۆزەخـدان هـەتا هەتایـەو بـەردەوامن لـەنێویاندا و نایەنەدەرەوە .

﴿ إنَما يَعْمُرُ مَساجِدَ اللهِ مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ ﴾ بەڕاستی کەسیّ ئاودان ئەکاتـەوە مزگەوتەکانی خوا باوەڕی هێنابیّ بەیەکێتی خوا ، باوەڕبەخواتەواو نابیّ بـەبیّ باوەڕهێنـان بەپێغەمەر و باوەڕی هێنان بەرۆژی دوایی .

﴿ وَأَقامَ الصَلاةَ وَآتـي الزَكـاةَ وَلَـمْ يَـخْشَ إلاّ اللهَ ﴾ وەنوێـژی کردبـیّ بەهــەمو مەرجەکانیەوەو ،زەکاتی بەخشیبیّ بەهـەژاران بـەگوێرەی دیـاری کردنـی سـنور ئەگـەر پێویستبیّ لە سەری زەکات ، وەك لـەئایەتی ( ٦٠ ) ی ئەم سورەتە باسی کراوەو لـەکـەس نەترسیّ مەگەر لـەخوا بەتەنها .یانیّ کەســیّ بـۆی هەیـە مزگەوتـەکان ئـاوەدان بکاتـەوە کەخاوەنی ئەوچوار شتانە بیّ باسیان کراوە لـەوئایەتەدا .

﴿ فَعَسى أولئِكَ أنْ يَكُونوا مِنَ المُهتَدينَ ﴾ دوایی بۆ ئەوەی لـەوانەیە ئەوکەسانە لـەوانە بن ڕاغویی وەرگرن بۆلای ڕاستی و کارکردن بەڕاستی .

عەباسـی مـامی پێغەمـەر و تەڵحــەی کــوڕی شــەیبەو عــەلی کــوڕی ئــەبوتالیب خۆیانیانهەڵئەکێشا. عەباس ووتی: من خاوەنی ئاودان و خزمەتکردنی حاجیـەکانم. تەڵحـە ووتـی مـن خاوەنی کەعبەم و کلیلی خانەی خوا لای منــە. عـەلی کـوڕی ئـەبو تـالیب ووتی: من بەرلـەهەمووکەس بەشەش مانگ نوێژم کردوە بـۆلای ئـەو مزگەوتـەو جـەنگم کردوە لـەبەر خوا، خوای مەزن لایەنی عەلی گرت و فەرموی:

أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ
ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ
وَجَٰهَدَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ

ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾

﴿ أجَعَلْتُمْ سِقايَةَ الحاجّ وَعِمارَةَ المَسْجِدَ الحَرامْ ﴾ ئایا ئێوە خاوەنی ئاودان بەحاجیــەکان و ئاوەدان کردنەوەی ئەو مزگەوتە بەڕێزەی خانەی خوداو پاك کردنەوەی لـەبێ باوەڕی.

﴿ كَمَنْ آمَنَ بِاللهِ وَاليَومِ الآخِرِ وَجاهَدَ في سَبيلِ اللهِ ﴾ وەك کەسێکی دائـەنێن بـاوەڕی بەخواو باوەڕی بەڕۆژی دووا هێنــابێ و کۆشــش و جـەنگی کردبـێ لـەڕێگـەی خـوادا، ئەوشتانە ترازوی گەورەنین لای خوا وپلەو پایەیەکن زۆر جاران خاوەکانیــان ڕائەکێشـن بۆلای چاکە. بەپێچەوانەیشەوە پلەو پایەی جیهان خاوەنــەکانیان پـاڵ پێوەئـەنێن بـۆ لای خراپە .

﴿ لايَسْتَوُونَ عِنْدَ اللهِ ﴾ وێنەی یەك نین ئەو دووتاقمە لەباوەڕداران و بێ بــاوەڕان لــە خزمەت خوادا لـەڕێزو پاداشتیان، باوەڕداران لـەکوێی وبێ باوەڕان لـەکوێ ؟

﴿ وَاللهُ لايُـهدي القَـومُ الظـالِمينَ ﴾ وەخـوا ڕێگـەی ڕاسـت نیشـان نـادا بـەو تاقمـە ستەمکارن بە هۆی بت پەرستنی بتەکان ، دوای ئەوەی ڕێگەی ڕاسـتیان پێ‌نیشـاندراوە و پشتیان تێ‌کردوەو ڕێگەی خراپیان هەڵبژاردوە .

﴿ الذِينَ آمَنُوا وَهاجَرُوا وَجاهَدُوا في سَبِيْلِ اللهِ بِأمْوالِهِمْ وَأنْفُسِـهِمْ أعْظَـمُ دَرَجَـةَ عِنْـدَ اللهِ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێنـاوەو کۆچیـان کـردوە بـۆ مەدینـە و کۆشـش وجـەنگیان

کردوە لـەرێگەی ئایینی خوادا بەدارایی و بەگیان و لـەشی خۆیان ئەوکەسـانە گـەورەترن لـەلایەن پلەوە، ئاوەدان کردنەوەو ئـاودان بەدانیشـتوان لـەکوێ و باوەڕهێنـان و کـۆچ کردن و جەنگ کردن لەکوێ؟

لـەخزمەت خوادا لـەوبیاوەڕدارانەیش ئەوشتانەیان نەکردوە، ووشەی گەورەتر بەومانایە نیە ئەوبێ باوەڕانەیش پلـەی گـەورەیان هـەبێ. بـەڵکو مەبەسـت ئەوەیـە ڕێـز هـەر بـۆ باوەڕدارانە، چونکە بێ باوەڕان لای خوا پلەو پایەیان هەر نیە و نرخیان بۆ دانانرێ .

﴿ وَأولئِكَ هُمُ الفائِزُونَ ﴾ وەئەوتاقمە خاوەنی ئەوشتە بەرێزانەن هـەر ئـەوان خـاوەنی سەرکەوتنن و سەربەرزن لەهەردوو جیهاندا وبەئاواتی خۆیان ئەگەن .

﴿ يَبَشِرُهُمْ ربّهُمْ بِرَحمَةٍ مِنْهُ وَرِضوانٍ وَجَناتٍ لَهُمْ فِيْها نَعيـمٌ مقيـمٌ ﴾ مـوژدە ئـەدا بـەو باوەڕدارانە خاوەنی ئەوشتە بەنرخانەن پەروەردگاری خۆیان بەبەزەیی و میهرەبانی لـەلایەن خۆیـەوە و بـە ڕەزامـەندی و خۆشەویسـتی ۆ بەچـەندین بەهەشـت بـۆ ئـەوان هەیـە لـەوبەهەشتانە دایە ڕابواردن و خواردەمەنی چاك و بەردەوام .

﴿ خالِدِينَ فِيْها أَبَدَ إِنَّ اللهَ عِنْدَهُ أَجْرُ عَظِيمٌ ﴾ ئەوتاقمە بەردەوام ئەبن لـەوبەهەشـتانەدا هەتا هەتایە و جێگەی خۆیانە و دەرچونیان نابێ. بەڕاستی خوا لای هەیـە مـزەو پاداشـتی زۆر گەورە بەرانبەر ناکرێ بە هیچ پاداشتێ لـەجیهاندا، ئەوباوەڕدارانـە خـاوەنی بـاوەڕی بەتینن و کۆچ و جەنگیان کردوە پاداشتیان میهرەبانی و خۆشەویسـتی یـەو بەهەشـتەکانە وەك باسکران .

لـەپاشا خوای مەزن قەدەغە ئەکا لـەموسڵمانان دۆستایەتی بێ باوەڕان با، لـەپشتا خزمە نزیکەکانین. ئەفەرموێ لـەوبارەوە:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَابَآءَكُمْ وَإِخْوَٰنَكُمْ أَوْلِيَآءَ إِنِ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْكُفْرَ عَلَى ٱلْإِيمَٰنِ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ إِن

كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾

﴿ يأيُها الذيْنَ لاتَتخِذُوا آباؤكُمْ وَ إخوانَكُمْ أولِياءَ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتـــان هێناوە : ئێـــوە وەرمـــەگرن باوکـــەکانتان و براکانتـــان بەدۆســـت ویـــاریدەرو هاوســـوێند و بەڕێوەبەری کارەکانتان .

﴿ إنْ اسْتَحَبُوا الْكُفْرَ عَلى الايمانَ ﴾ ئەگەر ئەوان خۆشەویستی بێباوەڕی بدەن بەسەر باوەڕهێناندا و بەردەوامبن لەسەری و هانی ئادەمیزاد بدەن بۆ لای بێباوەڕی .

﴿ وَمَنْ يَتولَهُمْ فأولئِكَ هُمْ الظـالِمُونَ ﴾ وەهـــەر کەسێ بێبـاوەڕان بکـا بەدۆســـت و سەرپەرشتی کـــەری خـــۆی دوایـــی ئەوکەســـانە هەرئەوانـــەن ستەمیان لـــەخۆیان کـــردوە کەدۆستایەتیان لـەجگەی جێگەی خۆیا بەکارنەهێناوە: ناوەڕۆکی ئەوئایەتە هەمو گونـــاهێ ئەگرێتەوە.کەواتە ئەگەر بـــاوك و بـــرای موســـڵمانیش ستەمیان کـــرد لەجگـــەی خۆیـــان پێویستە لـەسەرتان پشتی ستەم لێکراو بگرن .

﴿ قُلْ إنْ كانَ آبـــاؤكُمْ وَ ابْنـــاؤكُمْ وَإخْوانَكُـــمْ وَأزواجُكُـــمْ و عَشـــيرَتُكُمْ ﴾ تـــۆ بڵـــێ بەوکەسانە باوەڕدارن ئەگەر ئێوە باوکەکانتان و کوڕەکانتان و براکانتـــان و ژنـــەکانتان و خزم و هۆزەکانی خۆتان .

﴿ وَامْوالٌ اقْتَرَقْتُموها وَ تِجارةٌ تَخشَونَ كَسادَها ﴾ وەئەو دارایيـــە پـــەیداتان کـــردوون و ئەو بازرگانیە ئێوە ترستان هەیە برەوی نەمێنێ و لەناوبچێ کەهەتانە لەمەدینـــە داو کـــاتی بەسەربچێ بەهۆی جەنگ کردنیانەوە لەڕێگەی خوادا .

﴿ وَمَساكِنُ تَرْضَوْنَها أَحَبُ إِلَيكُمْ مِنَ اللهِ وَرَسُولِهِ وَجِهادٍ فِي سَبِيلِهِ ﴾ وەخانوو جێگەی دانیشتنتان کەئێوە لاتان خۆشەویستەو پیێ ڕازین، ئەگەر ئەو (٨) شتانە خۆشەویستتر بن لەلای ئێوە لەخواو لەنێراوی خواو لەخۆماندوکردن و جەنگ کردن لەڕێگەی خوادا.

﴿ فَتَرَبَّصُوا حَتَى يَاتِيَ اللهُ بِأمرِهِ ﴾ دوایــی ئێــوە چاوەڕوان بکــەن هــەتا خــوا ئــەهێنێ فەرماندانی خۆی بــەهێنانی سزادنی ئێوە زوبــێ یــا درەنــگ و مەکــە ئــەگیرێ لەلایــەن باوەڕدارانەوە، ئەو کاتە ڕێزی کۆچ کردنتان نامێنێ لەوکاتەدا ئێوە دەرچوو ن لەپەرستنی خوا بەهۆی دۆستایەتی بێباوەڕان .

﴿ وَاللهُ لايَهْدِيَ الْقَومَ الفاسِقِينَ﴾ وەخوا ڕێگەی ڕاست نیشان نادا بــەتاقمێ لەسنوری خوا دەرچوون لەوکەسانە دۆستایەتی بێباوەڕانیان کردوە.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەوئایەتە ئەمەیە: کاتێ موسڵمانان فەرمانیان پیێدرا کۆچ بکــەن لەمەکە ووتیان: ئەگــەر ئێمــە کــۆچ بکــەین دەستمان ئــەبڕێ لــەباوك و کوڕەکانمان و لەخزمــەکانمان و لـــە ژن و لـــەهۆزەکانمان و لـــەبازرگانی و جێگـــەی دانیشـــتنمان و لەداراییمان هەمویانمان نامێنـێ، ئەوئایەتــە هەرچــەندە لــەبارەی ئــەو ڕوداوەوە بەتایبــەتی هاتوەتە خوارەوە. بەڵام بەڕواڵەت هەموشتێ ئەگرێتەوە. کەواتە هەرکەسێ سودی تایبەتی خۆی ڕێز بدا بەسەر ڕاستیدا و بێ بــاوەری بــۆ خــۆی هــەڵبژێرێ ئەوکەســە بــەدوو ڕوو دائەنرێ .

لەکاتێکا لەمەوبەر باسکرا فەرماندانی خوا بــەباوەڕداران بیریــان ئەخاتــەوە ئەوشــتەی بەوانی بەخشیوە لەسەرکەوتن کات لەدووای کات و ئەفەروێ:

لَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الْأَرْضُ

بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٧﴾

﴿ لَقَدْ نَصَرَكُمْ اللهُ فِي مَوطِنَ كَثِيرةٍ ﴾ بەڕاستی خوا یاریدەی ئێوەی موســڵمانانی داوە لەچەندین جێگەی زۆردا لەکاتی وەستانتانا بۆ جەنگ کردن لەو جێگانەدا، وێنەی ڕۆژی بەدر، جەنگی خەیبەر، جەنگی بەنوقورەیزە، ئاشتەواییی حودەیبیە. جـەنگی بـەنو نـەفزیر. گرتنی مەکە ،جگەی ئەوانیش ژمارەیان گەیشتوەتە هەشتا جێگە، کــاتێ هـەواڵی گرتنـی مەکە گەیشت بەهۆزی هەوازین و سەقیف هەردوولایان پێك هاتن کەپەلاماری‌موسڵمانان بدەن، ئەوهەواڵە گەیشت بەپێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بەدوازدەهەزار کەسەوە ڕوی کــرد بـۆ لای ئەو دووهۆزە، ئەوان چوار هەزار کەس بون. یەکێ لەهاوڕێکانی پێغەمــەر ﴿ ﷺ﴾ ووتـی: ئێمە ژێر ناکەوین ئەمڕۆ لەبەر کەمی بێ باوەڕان و زۆری ئێمەی باوەڕدارەوە و لــەخۆیان بایی بوبون، پێغەمەر ئەو ووتەیەی بــەلاوە پەســەند نـەبوو بەوبۆنـەوە کـە موســڵمانەکان شکان، خوای مەزن ئەو ڕوداوەیان بیر ئەخاتەوەو ئەفەرموێ:

﴿ وَيَوْمَ حُنَينٍ إذ أعْجَبَتْكُمْ كَثرَتُكُمْ ﴾ وەبیری ڕۆژی ( حونەین ) بکەنەوە کە شوێنێکە لەمەکەو تایفدا کاتێ ئێوە ژمارەی زۆری ئێوە خۆتانی بایی کردبو، ســەرتانی لێ تیکدابـو، ئەتان وت: ئێمە ئەمڕۆ ژێرناکەوین لەبەرئەوەی ژمارەمان زۆرە ، واتان ئەزانی ناشــکێن . بەلاّم یەکەمجار ئێوەی موسڵمان شکان و پەرتەوازە و بلاّو بونەوە بە دۆڵ و شیودا .

﴿ فَلَمْ تُغْنِ عَنْكُمْ شَيْئاً ﴾ دوایی ژمارەتان هیچ سودێکی بەئیوە نەبەخشی و نەگەیشتە فریاتان هیچ شتێ و بۆتان دەرکەوت یاریدان و هەڵهاتننا ن هەر لەلایەن خواوەدێت .

﴿ وَضاقَتْ عَلَيْكُمُ الآرْضُ بِما رَحُبَتْ﴾ وەتەنگبو لەسەر ئێوە ڕوی زەوی لەبەر لەترساناو لەبەر سەختی ئەو ڕۆژە بەو پانی و فراوانیەوە زەوی هەبیو .

﴿ ثُمَ وَلَيتُمْ مُدَبِرينَ ﴾ لەپاشا ئێوە پشتتان کردە دوژمنی خۆتان و شکان و بەرەو دووا هەڵهاتن لەکاتی جەنگدا ،پێشەوەتان بەڕاکردویی گەیشتنەوە مەکە ،کەستان لای پێغەمەر نەمایەوە جگەی کەمێ لەخزم و لەهاوڕێکانی کەبریتی بون لەعەلی و عەباس و ئەبو سوفیانی کوڕی حەرسی ئامۆزای پێغەمەر و ئوسامەی کوڕی زەیدو فەزلی کوڕی عەباس و عەبدولای کوڕی مەسعود و ڕەبیعەی کوڕی مەرس و ئەبو بەکر و عومەر و ئەیمەنی کوڕی عوبەید کەلەبەردەم پێغەمەردا کوژرا، عەباسی مامی دەستی گرتبو بەلەغاوی هێسرەکەی پێغەمەرەوە ﴿ ﷺ﴾ ئەبوسوفیانی ئامۆزای پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ هێسرەکەی ڕائەکێشا، ژمارەی ئەو کەسانە مابونەوە لای پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ دووازدە کەسبوون. پیغەمەر فەرموی بەعەباس: هاوار بکەو بلێ بگەڕێنەوە، ئەویش بانگی کردن و ووردە ووردە گەڕانەوەو هەڵمەتیان برد بۆ بێباوەڕان، بێ باوەرانیان شکاند و درێژەی ئەو ڕوداوە لەنامە مێژوییەکاندا تۆمارکراوە .

﴿ ثُمَ أَنْزَلَ اللهُ سَكِينَةُ عَلى رَسُولِهِ وَعَلى الْمؤمِنينَ وَأَنْزَلَ جنُوداً لَمْ تَروْها ﴾ لەپاش ڕاکردنی باوەڕداران خوا بەمیهرەبانی خۆی ئارامگرتنی خۆی ڕژاند بەسەر نێراوی خۆیا و بەسەر باوەڕدارانداو ترس لەدڵیانا نەماو گەڕانەوە بۆ لای پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ و، خوا ناردبویە خوارەوە بۆ یاریدەی باوەڕداران چەندین سەربازێ لەفریشتەکان ئێوە نەتان ئەبینین بەچاو، بەڵام نیشانەی هاتنەخوارەوەیان ڕون بویەوە بەسەرکەوتنی باوەڕداران .

بۆزانین: هەرچەندە پێشەوا ڕازی فەرمویەتی: ئەو سەربازانە فریشتەبون. بەلام ئێمە بڕوامان وایە خوا لەشکری بێ ژمارەی هەیە لەفریشتەکان و جگەی فریشتەکان و، لەو لەشکرانەیە ئازایی و هێزی دەرەوەی تریش .ئایەتەکە جۆرێ ئەوسەربازانەی ڕون نەکردوەتەوە، بۆیە واشایستەیە ئێمەیش وازی لێبهێنین، خوا ئەفەرموێ :

﴿وَما يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلاهُوَ ﴾ نازانیٚ بەلـەشکرەکانی پەروەردگاری تۆ مەگـەر هـەر خۆی بیزانیٚ .

﴿ وَعَذّبَ الذِيْنَ كَفَرُوا وَذلِكَ جَزاءُ الْكافِرِينَ ﴾ وەخوا سزای کـەسانیٚکی ئـەوتۆی دا باوەڕیان نەهیٚنابوو بەکوشتن و دیل کردنی خۆیانو خیٚزانەکانیان و ئەوسزایەی خوا کـردی لـەگەڵ بیٚباوەڕان تۆڵـەی بیٚباوەڕانە لـەجیهاندا، لـەپاشەڕۆژ دا بەتۆڵـەی گرانتر .

﴿ ثُمَ يَتُوبُ اللهُ مِنْ بَعْدِ ذلِكَ عَلى مَنْ يَشاءُ وَاللهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ لـەپاشا خوا وەرئەگریٚ پەشیمانبونەوەو ئەیرِیٚژیٚ بەسەر کەسیٚکا ئارەزووی هەبیٚ بەگەورەیی خۆی، دوای کۆتایی جەنگ و شکانی بیٚباوەڕان و خوا خۆش ئەبیٚ لـەوگوناهەی کردویانــە و دوای پەشـیمان بونەوەیان، میهرەبان وخاوەنی بەزەییە بۆ بەندەکانی خۆی .

بەڕاستی خوای مەزن زۆر بەخشـندەیەو گـران نیـە لای لیٚبوردنـی گونـاهی گـەورەو دەرگای لیٚخۆشبونی کراوەتەوە بۆ هەموکەسیٚ.کەواتە ئەوکەسەی لـە موسـڵمانان ڕایـان کردوەو پەشیمان بونەتەوەو ئەوبیٚباوەڕانەیش جەنگیان لـەگەڵ پیٚغەمەر کردوەو لـەدواییدا باوەڕیان هیٚناو کردەوەی چاکیان کـرد، ئەوانـە خـوا خۆشـی ئـەویٚن و ڕزگاریـان ئـەکا لـەئاگر.

نمونە لـەلیٚبوردن وبەزەیی پیٚغەمەر ﴿ ﷺ﴾ کاتیٚ جەنگ کۆتایی پیٚهات و دەست کــرا بە بەشکردنی دەست کەوت و تالاّنی بیٚباوەڕان، نویٚنـەریٚ لـەلایـەن هـۆزی هەوازینـەوە هاتنە خزمەت پیٚغەمەر ﴿ﷺ﴾ ووتیان: ئیٚمە موسڵمان بووین ئەی فروسـتادەی خـوا و تـۆ چاکـترین کەسـی و چاکەکـەری ئـادەمیزادی، خیٚزانـەکانمان گـیراون و دیـل کـراون و داراییمان زەوت کراوە. پیٚغەمــەر ﴿ ﷺ﴾ ئیسـلامەتیەکەیانی وەرگـرت و فـەرمانی دا ژن وخیٚزان ودارایيان بدەنەوە. کاتیٚ خوای مەزن قەدەغـەی کـرد دۆسـتایەتی بـیٚ بـاوەڕان، هەڵی گرت سەرپەرشتی کردنیان بۆ مزگەوتـەکانی خـوا، قەدەغەیشـی کـرد بچنـە نیـو مزگەوتەکانەوەو فەرموی:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَـٰذَا ۚ وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦٓ إِن شَآءَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٨﴾

﴿ ياأيها الذِينَ آمَنُوا إنما الْمُشْرِكُونَ ننَجِسٌ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان بەڕاستی بت پەرستان و ئەوکەسـانەی هاوبـەش بـۆ خـوا دائـەنێن پیـس و دەروون پیسـبن، ئـەبێ خۆتانیان لـێی بپارێزن بەجۆرێ خۆتان لـەپیسی تر ئـەپارێزن، قـێزەو ن وبێـبڕواو لـەشیان پیسەو لـەش پیس و بێدەست نوێژن و بەرگیان پیسە.

﴿ فَلا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الحَرامَ بَعْدَ عامِـهِمْ هـذا ﴾ دوایـی نـابێ نزیکـی ئـەو مزگەوتـە ڕێزادرە بکەون و قەدەغەیە بچنە نێوی لـەپاش ئەم سالّـە سوەرتی ( بەرائەتی ) تێداهاتوەتـە خوارو سالّی نۆهەمی کۆچیە .

زانایان لـەبارەی ئەونزیکبونەوەیە بیریـان جیـاوازە: لای پێشـەوا شـافیعی نزیکـی ئـەو مزگەوتە ڕێزدارە نەکەونەوە بەتایبەتی ،نەك مزگەوتەکانی تر، لای پێشەوا مالیك پێویستە قەدەغەبکرێن لـەهەمو مزگەوتێ. پێشــەوا حەنـەفی ئەفـەرموێ: قەدەغـە نـاکرێن لـەهیچ مزگەوتێ. نەمزگەوتی حەرام و نەمزگەوتەکانی تر و بۆ بێ بـاوەڕانی هاوپـەیمان دروستە بت پەرستان لـەهەمو لایەکەوە لـەنێو دورگەی عەرەب ئەهاتن بۆ مەکە بۆ حەج کـردن و بازرگانی، دانیشتوان سودیان لێ وەرئـەگرتن بـەهۆی کڕیـن وفرۆشـتن و بـەکرێ دانـی خانوەکانیان، کاتێ خوا قەدەغەی کـرد بێـباوەڕان نـەچن بـۆ مەکـە ترسیان پـەیداکرد لەهەژاری، خوای مەزن فەرموێ:

﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوفَ يُغْنِكُـمْ اللهُ مِـنْ فَضْلِـهِ إنْ شـاءَ ﴾ وەئەگـەر ئێـوە ترسـاون لەهەژاری و کەم دەرامەتی بەهۆی قەدەغەکردنی بێ بـاوەڕان بـۆلا ی‌مزگـەوتی حـەرام، دوایـی خـوا بـەم نزیکـە ئێـوە سـاماندار ئـەکا بەگـەورەیی خـۆی و دەسـت کـەوت و لەلایەترەوە ڕۆزیتان بۆ ئەنێرێ ئەگەر ئارەزۆ بفـەرموێ، فەرمانیشـتان پێ‌ئـەدا بەتەمـەڵی دانەنیشن و کۆشش بکەن بۆ پەیداکردنی دارایی وسامان و هۆی‌ژیانتان .

﴿ إنَّ اللهَ عَليمٌ حَكيمٌ ﴾ بەڕاسـتی خوائـەزانێ بەسـودی بـەندەکانی خـۆی لەهـەمو ڕوێکەوە، هەموشتێ لـەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ لەقەدەغـەکردن وڕەواکردنـی کـارو فەرمانی خۆیا .

لەپاشا خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە کەهـەندێ لـەبێ‌باوەڕان دروسـتە دانیشـن لـەنێو دورگەی عەرەبدا بەوەرگرتنی سەرانە لـەوان و ئەفەرموێ :

قَٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴿٢٩﴾ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى
ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ۖ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ
ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ۖ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ
يُضَٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ ۚ قَٰتَلَهُمُ

ٱللَّهُۚ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٣٠﴾ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓاْ إِلَٰهًا وَٰحِدًاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣١﴾ يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾

﴿ قاتِلُوا الذينَ لايُؤمِنُونَ بِاللهِ وَلابِاليَومِ الآخِرِ ﴾ ئێوەی باوەڕداران جەنگ بکەن لەگەڵ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕناهێنن بەخواو بەڕۆژی دوایی و زیندوبونـەوەو پرسیار بەشێوەیە پێویست بێ. وەك جولەکەکان ئەڵێن : لەبەهەشتا خواردن وخواردنەوە نـین، گاورەکـان ئەڵێن: کلیسا چەکی لێخۆشبون ئەفرۆشێ و خوابوە بەعیسا .

﴿ وَلايَحرِمُونَ ماحَرّمَ اللهُ وَرَسُولُهُ وَ لايَدِنُبونَ دِينَ الْحَقِ ﴾ وەقەدەغە ناکەن شتی خواو نێراوی خوا قەدەغەیان کردوە ، وەك مەی خواردنـەوەو خواردنـی گۆشتی بـەراززوبڕوا نایەرن بەئاییینی ڕاست کەئاییینی ئیسلامەو باوەڕیان بەوەنیە کە هەمو ئایینـەکانی گـۆڕاوەو کار بەوشتانە ناکەن لەتەوراتایە کەدووای پیغەمەر بکەون .

﴿ مِنَ الذينَ أتُوا الكِتابَ حَتى يُعطُوا الجِزيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صـاغِرُونَ ﴾ ئـەوبێ باوەڕانـە کەسانێکی ئەوتۆن بەخشراوە بەوان نامەکان کەتـەورات و ئینجیلـە بـۆ موساو عیسـا ،

جەنگیان لـەگەڵ بکەن هەتا خاوەن نامەکان ئـــەیدەن بەموسـڵمانان ئەوشـتەی لـەسـەریان پێویست کراوە لـەسەرانە بەدەسـتی خۆیـان ونـابێ سـەرپێچی بکـەن لـەدانیا بـەگوێرەی دیاریکراو لـەلایەن یاساوەو، بەجۆرێ ئەبێ‌بیدەن سەرشۆڕ و مل کـــەچبن و ئێوەدانیشـن و ئەوان بەپێوەبن .

زانایان لـەبارەی سەرانەوە کەوەرئەگیرێ لـــەبێ‌باوەڕان بیریـان جیـاوازە: لای پێشـەوا شافیعی لـە جوو گاورو ئاگر پەرست سەرانە وەرئەگیرێ، ئەندازەی سەرانەکەیان پێویستە لـەیەك دینار کەمتر نەبێ. لای پێشەوا حەنەفی و ئەحمەد لـە جگەی بت پەرستانی عــەرەب پێویستە ســـەرانە وەربگـیرێ. ئـەندازەی سـەرانەکەیان بریتیـە لـە دووازدە دەرهـەم بـۆ هەژاران، بیست درهەم بۆ مام ناوەندیەکان چل و هەشت درهەم بـۆ سـامانداران، هـەر هەژارێ دەرامەتی نەبێ سەرانەی لێ وەرناگیرێ، تورکـەکان و هندیـەکان وەك خـاوەن نامەکان تەماشا ئەکرێن، هەموو کەس جگە لـە بت پەرستانی عەرەب سەرانە ئەبێ بـدەن، لای پێشەوا مالیك سەرانە لـە هەموو بێ باوەڕان وەرناگیرێ لـە جگەی ئـەو کەسـانە لـە ئاینی ئیسلام وەرگەڕاون، ئەندازەی بۆ هەموو ساڵێ لـەیەك دینار کەمتر نابێ ئیتر هەژار بن یا نا.

پرسیار/ ئەو ئایەتە ئەفەرموێ: خاوەن نامەکان بڕوا بە خـواو بـە ڕۆژی دوای ناکـەن، زانراوە لـەوانەوە باوەڕیان بە خوا هێناوەو بە ڕۆژی دوایش؟.

وەڵام/ بەڵێ . باوەڕیان بە ئاینی ڕاست نی‌یە بەو شـــێوەیە شایسـتە بـێ و وڵامـی ئـەو پرسیارە بەم ئایەتە ڕونکراوەتەوە کە خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَقالَتْ اليَهُودُ عَزيزٌ الله وَقالَتْ النَصاري المســيح أبـن الله ﴾ وە جوەکـان ووتویانـە: عوزەیر کوڕی خوایە، گاورەکان ووتویانە مەسیح کوڕی خوایە. پوختەی پرسیارو وەڵامی پێشو بەم جۆرەیە: بە ڕاستی جوەکان و گاورەکان دایان ناوە بـۆ خـوا هاوبـەش. کەواتـە ئەوان بڕوایان بە خوایە هەبووە هەر نەبوە مەگەر لای ئەوان و بـاوەڕی پوچیـان؟ چونکـە ئەوان لایان وایە خوا خاوەنی کوڕە، بڕوایان بە خوای ڕاسـتی هـەبێ کـوڕی بـۆ دانـانێن کەواتە باوەڕەکانیان وەك بێ باوەڕی وایە.

پرسیار/ بەڕاستی ئیسلام زۆر لەکەس ناکا بۆ باوەڕهێنـان کـەچی خـوای مـەزن لـەو ئایەتەدا فەرمانی داوە بە جەنگ کردن لەگەڵ ئەو کەسانەدا باوەڕ نـاهێنن بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایی هەتا سەرانە نەدەن؟.

وەڵام/ فەرمان دان بە جەنگ لەگەڵ ئەو خاوەن نامانە بۆ ئەوانە یانە بــە تایبـەتی کـە لەنێو دورگەی عەرەبدان وئەوانەی یان هاوسوێندی بت پەرستەکانبوون بۆ جەنگ کردن لەگەڵ پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ وەك جوەکانی مەدینـە، ئـەوە لەلایەکـەوە لـە لایـەترەوە هـەواڵ گەیشت بە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ کە ڕۆمەکان لــە شـامدا لەشـكریان کۆکـردەوە بـۆ ئـەوەی پەلاماری موسڵمانان بدەن و پەرتەوازەیان بکەن. بەڵگەو نیشانەی ڕون دەرکەوتبوو کـە خاوەن نامەکان هەواڵ بەرو یاریدەری ڕۆمەکانن لەبەر ئـەو شـتانە خـوا فـەرمانی دا بـە جەنگ کردن و چـەك کردنیـان و سەرشـۆڕکردنیان بـۆ موسـڵمانان لەگـەڵ بەخشـینی سەرانە هەتا ببێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە خاوەن نامەکان ئاشتی خوازبن و پەیمانـەکانیان ناشکێنن، کاتێ سەرانەیان بە خشینی پێویستە دەست درێژی نەکرێتە سەریان و یاریدەیـان بدرێ و سەربەست بن لەبارەی ئاین و مامەڵەی خۆیانەوە، ئەبێ بزانرێ کاتـێ موسـڵمان بوون سەرانەیان لەسەر هەڵئەگیرێ.

﴿ ذلِكَ قَوْلِهِمْ بِأفْواجِهِمْ یضاهئون قول الذیـن كفـروا مِـنْ قَبْـلْ ﴾ ئەوانـەی ڕابـوردن گفتوگـۆی خـاوەن نامەکانـە دەرئـەچێ لـە زمـان و دەمیانـەوە بـەبێ ئـەوەی بەڵگـــەو نیشانەیەکیان هـەبێ بچێتـە ئەقڵـەوە، گفتوگۆکـان وەك گفتوگـۆی کەسـانێکی ئەوتۆیـە باوەڕیان نەهێناوە لە پێش ئەوە کە ئەیان ووت: فریشتەکان کچـی خـوان، هـەروەك بـت پەرستەکانی ڕۆمان ویۆنان و بوزیوکان و جگەی ئەوانیش .

﴿ قاتِلْهُمْ اللهُ أنی یُؤفَكُونَ ﴾ خوا لەناویان بباو دوریان بخاتەوە لەبەزەیی و میـهرەبانیی خۆی چۆن لایانداوە لەڕێگەی ڕاست لەگەڵ دەرکەوتنی بەڵگەی دروست بەرەو ڕێگەی خراپ ڕویان کردوە .

﴿ اتّخَذُوا أصبارُهُمْ وَرُهْبانَهُم أرْباباً مِنْ دُونِ اللهِ ﴾ وەریان گرتوە و دایان ناوە جوەکان و زاناکان و ئەو کەسانەو وازیان لـەجیهان هێناوەو خوا پەرستی ئەکەن بەچەندین خوا بۆ خۆیان لـەجگەی خوای تاك و تەنها و ئەیان پەرستن، هەربەوێنەی جوەکـان گاورەکـانیش ئەو کەسانەی خۆیانیان تەرخان کردووە بـۆ خـوا پەرسـتی کردنیـان بەچـەندین خـوا بـۆ خۆیان، ئەوشتانەی خوا قەدەغەی کردون ڕەوایان ئەکەن بۆ پەیڕەوانی خۆیان لـەجوەکانو گاورەکان، ئەوانەی خوا ڕەوان قەدەغەی ئەکەن بۆیان بەبێبەڵگە بەلای خـواوّ و هـاتبێ بۆیان .

﴿ وَالَمسيحَ ابْنَ مَرْيَمَ ﴾ وەگاورەکانیش مەسیحی کوڕی مریەمیان وەرگرتوە بە خوا بۆ خۆیان ئەی پەرستن، ئەیان ووت: مەسیح کوڕی خوایە، ئەوگفتوگۆخراپانــە بەڵگەیـەترن لـەسەر ئەوەی ئەو خاوەن نامانە باوەڕیان بەخوا نیە. بەڵکو هەرباوەڕیان بەو شـتانە هەیـە زاناکانیان ئەیڵێن .

﴿ وَما أمروا الآ لِيَعْبِدُوا إليها واحد لا إله الاّ هو سبحانه عّمـا يشـركون ﴾ وەفـەرمان نـەدراوە بـەو بێباوەڕانـە مەگـەر لـەبۆ ئـەوەی ئـەوان خوایـــەکی تەنـــها بپەرســـتن و لـەنامەپێشوەکاندا بـەوە فەرماندراوەکـە خـوا وەرگـرن بەپەرسـتراو نـەك زانـاو تـەرخان کراوەکان وەرگرن، هیچ پەرستراوێ نیە مەگەر ئەو خوا تەنهایە پاك ودورە خوا لـەشـتێ ئەوان ئەیکەن بەهاوبەش بۆی .

﴿ يُرِيدُونَ أنْ يَطْفَئُوا نُورَ اللهِ بِأفْواهِهِمْ وَيَأبى اللهُ إلا أنْ يَتِمّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الكـافِرُونَ ﴾ سەرۆکەکانی جو و گاور ئەیانەوێ کە بکوژێننە ئاینی پاکی ئیسلامە بەفوی دەمی خۆیـان و بەدرۆو بوختان هەڵبەستن و، خوا ڕازینابێ مەگـەر کـەخوا تـەواوبکا ڕونـاکی ئـایینی خۆی و ئالأی ئیسلام بەرزبێتەوەو باوەکو بێباوەڕان پێیان ناخۆش بێ و لایان گرانبێ ئـەو ڕوناکی ئایینەی باوەڕداران .

﴿ هُوَ الذيَ أرْسَلَ رَسُولَهُ بِالُهدى وَدِينِ الحَقِ لِيُظهِرَ عَلى الدِيْنِ كُلَهُ وَلَـو كَـرِهَ الُمشْـرِكُونَ ﴾ خـوا کەسـێکی ئەوتۆیـە ڕەوانـەی کـردوە نـێراوی خـۆی بەگـەورەیی خـۆی بەرێگـــە نیشاندەرێك کە قورئانەو بەئایینێکی ڕاستەوە، بۆ ئەوەی ئـە وئایینـە بەرزبکاتـەوە بەسـەر

هەمو ئایینەکانی تردا و موسڵمانان گەورەیی بەدەست بهێنن و، ئەگەرچی پێیـان نـاخۆش بیّ ولایان گرانبیّ بت پەرستان ئەو سەرکەوتنەی ئایینی خوا بەسەر هەمو ئایینەکانی تـردا. بێگومـان خـوا ئـایینی ئیسـلامی سەرخسـت لـەشـارەکانی عـەرەبدا وبەسـەر جوەکـان ورۆمەکانی شام و بەسەر ئاگرپەرستەکانی فارسدا .

کورتەباسێك لـەبارەی مێژووی ڕابوردوی گاورەکانەوە کەچۆن پارچـە پارچـە بـوون بەوجۆرەی خوارەوە :

گاورەکان دوای عیسا هەتا هەشتا ساڵ لـەسەر ئایینی ڕاسـت بـون و نوێـژو ڕۆژویـان ئەکرد هەتا جەنگیّ پەیدابوو لـەنێوان ئەوان و جوەکـاندا، جوەکـان مرۆڤێکـی زۆر ئـازاو دلێریان هەبو ناوی ( پۆلس) بو، لـەوجەنگەدا ژمارەیـەکی زۆری لـەگاورەکان کوشـت، لـەپاشا ووتی: ئەگەر عیسا لـەسەر ڕاستی بێت ئێمە بیّباوەڕین وئەچینـە دۆزەخ و ئـەوان ئەچنە بەهەشت.کەواتە من فێڵیّ ئەسازێنم هەتا ئەوانیش وێنەی ئێمە بچنە دۆزەخ، لـەپاشا سواری ئەو ئەسپە بوو جەنگی پیّکردبوو، هوزەنگی لێداو بەرەو گاورەکان کەوتە ڕێگەو پەشیمان بونەوەی دەربڕی وخۆڵی کرد بەسەر خۆیدا .

گاورەکان ووتیان تۆ چ کەسێکی، پولس ووتی: من پولسی دوژمنی ئێوەم لـەئاسمانـەوە بانگم لیّکراو پەشیمان بونەوەم لیّ وەرنـاگریّ هـەتا نـەبم بـەگاور، ئـەوانیش بردیـان بـۆ کلیساو یاریدەی زۆریان داو هۆدەیەکیان بۆ تەرخان کرد و لـەوهۆدەیـە نایەتـەدەریّ بـۆ ماوەی یەکساڵ لـەوماوەیەدا فێری ئینجیل بوو، دوایی هاتە دەریّووتی: لـەئاسمانەوە بانگم لیّکراوە خوا پەشیمان بونەوەی لیّ وەرگرتوم و منـی خـۆش ئـەویّ، گاورەکـان بڕوایـان پیّکرد، لـەپاشا سیّکەسی لـەگاورەکان هەڵبژارد: یەکەمیان نـاوی ( نسـطور ) بـو فـێری کرد کە عیساو مریەم و خوا هەر سێیان خوان، دووهەمیان ناوی ( یەعقوب ) بـوو فـێری کرد کە عیسا ئادەمیزادەو کوڕی خوایە، سێهەمیان ناوی ( ملکان ) بو فـێری کـرد کـە هەرعیسا خوایە و هەربووەو هەرئەیشبیّ. کـاتیّ زانـی فێرکردنەکـەی کـاری تیّکـردون لـەپەنهانیدا لـەگەڵیان کۆبووەوە و، پێی وتن: یەك بەیـەك هـەر تـۆ پەختـەی وشـاگردی

ڕاستی منی، بەهەریەکەیانی ووت: من خۆم سەرئەبڕم و خۆم ئەکەم بەقوربانی، لەدواییدا خۆی سـەربڕی، هەریەکـەیان لـەوسیّ‌کەسـانە ڕویـانکردبۆ شـوێنیّ یـەکێکیان بـۆ ڕۆم، دووهەمیان بۆ بەیتولموقەدەس، سێهەمیان بۆ لایە تر، لەوکاتەدا گاورەکان بـون بەسـیّ‌تاقم دژی یەکتری، هەرچەندە بەڵگەیە نیە بۆ ڕاستی ئەو ڕوداوە. بەلاَم لـەم سەردەمەی ئێمەدا ئەبینریّ گاورەکان بەوجۆرەن، لەفێڵزانی جولەکەکانەە دوورنیـە، لەپاشا خـوای مـەزن ڕونی ئەکاتەوە کەزاناکانی جوەکـان و گاورەکـان لەهـەولّی ئـەوەدان دارایـی و پـارەی نارەوا و پوچ بخۆن، ئەوەتە خوا ئەفەرمویّ:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلۡأَحۡبَارِ وَٱلرُّهۡبَانِ لَيَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۗ وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٣٤﴾ يَوۡمَ يُحۡمَىٰ عَلَيۡهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكۡوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمۡ وَجُنُوبُهُمۡ وَظُهُورُهُمۡۖ هَٰذَا مَا كَنَزۡتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡنِزُونَ ﴿٣٥﴾

﴿ ياأيُها الَذيْنَ آمَنُوا إنَ كَثيراً مِنَ الآحْبار وَالرهبان لِيَأكِلُونَ أمْـوالَ النـاسِ بِالبـاطِلِ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتـان هێنـاوە بەڕاسـتی زۆرکـەس لـەزانایان و ئەوکەسـانەی

﴿ وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ ﴾ وەهەتا تۆ ئەتزانیٚ بەوکەسانە درۆیان لەگەڵ تۆ کردوە، ئەگەر ئارامت بگرتایە ڕاست گـۆو درۆزنـت بـۆ ڕون ئەبویـەوە، لەخۆتـەوە دەسـتورت دەرنەئـەکرد بۆیـان نەچنەدەرەوە. ئەوبیٚباوەڕانە ئەیان ووت: موحەمەدمان خەڵەتان بەدرۆ کردن. بەلاٚم ئابڕویان چو لەنیو دانیشتوانداو ڕون بویەوە درۆکانیان .

پرسـیار/ پیٚغەمـەری خـوا لەدووجیٚگـەدا سەرزەنشـتی کـراوە :یەکـەمیان :لـــەکاتی وەرگرتنی خۆ کرینەوەی دیلەکان لەبەدردا. دووهەمیان: دەستوردانی بەنەچونە دەرەوەی دوورووان لەوئایەتەدا، سەرزەنشت ئەوەئەگەیەنیٚ پیٚغەمەر گوناهی کردبیٚ ؟

وەلاٚم/ لیٚ بوردن ئەوە ناگەیەنیٚ پیٚغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ گوناهی کردبیٚ، چونکـە زۆرجـاران ئـەو جۆرە ووشەیە بۆ زۆری پاداشتو میهرەبانیە، هەمو پیٚغەمەران داوای لیٚبودردنیان کردوە لـەخواو مانای وانیە کەئەوان گوناهبارن، پیٚغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەگویٚرەی بیری خۆی ئەو دووکارانەی کردوە و بەچاکی زانیوە بۆ ئایین، بۆیە فەرمانی پیٚداون .

لە دواییدا خوای مەزن شیٚوەی کاری باوەڕداران و بت پەرستان ڕون ئەکاتەوە هەریەکـەیان بەگویرەی شایستەی خۆیان وئەفەرمویٚ :

لَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِى رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾ ۞ وَلَوْ أَرَادُوا۟ ٱلْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا۟ لَهُۥ عُدَّةً وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ ٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٤٦﴾ لَوْ خَرَجُوا۟ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُوا۟ خِلَٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ

ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ لَقَدِ ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ حَتَّىٰ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَظَهَرَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٤٨﴾

﴿ لا يَسْتَأْذِنُكَ الذِيْنَ يُؤمِنُونَ باللهِ وَاليَومِ الآخِرِ﴾ داوای دەستور ناکەن لەتۆ کەنـەچن بۆ جەنگ کردن بەبیانو هێنانەوە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕئەهێنن بەخواو بەڕۆژی دوایی .

﴿ أنْ يُجاهِدُوا بِأمْوالِهِمْ وَانْفُسِهِمْ ﴾ کـە ئـەوان جـەنگ بکـەن لەبـەر بـەرزی ئـایین بەدارایی و بەگیان وبەلەشی خۆیانـەوە، ئاشکرایە هیـچ هۆیـێ نیـە بـۆ ئـەو داواکردنـە لەکاتێکا جەنگ پێویست کرابێ لەسەریان. ئایا باوەڕداری ڕاستی داوائەکا نوێژ و ڕۆژ و بگرێ و بیکاو شایەتیمان بـهێنێ ؟ چونکـە کـەبزانێ پێویسـتە چۆنـی داوائـەکا، جـەنگ پێویستە نابێ داوای بکا ئایا جەنگ بکەم . زانایان بۆ ڕون کردنەوەی فەرمانی ئەو ئایەتـە ئەڵێن: جەنگ کاتێ پێویستە لەسەر کەسێ دارایی هەبێ خۆی پێ بەهێز بکـا بـۆ کڕینـی چەك و خۆیشی ساغبێو شایستەی جەنگبێ، ئەگەر نەخۆشبو یاپەك کەوتەو کـەم ئـەندام بویالاواز و بێهێزبو پێویستە لەسەری بەدارایی خۆی پیاوێ بگرێ بۆ جەنگ کردن .

﴿ وَاللهُ عَليمٌ بِالمُتَّقِينَ ﴾ وەخـوا ئـەزانی بەوکەسـانە خۆیـان ئـەپارێزن لەدانیشـتن و لەنەچون بۆ جەنگ، بەوکەسانە ئەزانێ پەلەئەکەن بۆ لای فەرمانی خواو بۆ پەرستنی خوا لەجەنگ و جگەی جەنگ و بەنیازی دڵی ئادەمیزاد .

﴿ إنَما يَسْتَأْذِنُكَ الذِيْنَ لايُؤمِنُونَ بِاللهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ داوای دەستوری چون بۆ جەنگ ئەکەن باوەڕبەخوا و بـەڕۆژی دووایـی نایـەرن، ئـەو کەسـانە دووڕون .

﴿ وَارْتابَتْ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ في رَيبِهِمْ يَتَرَدَدُونَ ﴾ وەدڵیان گومانی هەیە لـــەباوەرهێنانیاندا، دوایی ئەوان لەنێو گومانی خۆیاناسەرگەردانن، بەموسڵمانەتی خۆیان ئەنوێنن و لەڕاستیدا دوو دڵن لەبڕیاردانی باوەڕوبێباوەڕی و نازانن ڕاستە یادرۆیە باوەڕهێنانیان .

خۆیانیان تەرخان کردوە لەخاوەن نامەکان بۆ پەرستن ئەخۆن دارایی ئــادەمیزاد بەبــەرتیل وەرگرتن لەفەرمانەکانی خوادا و ئەیان گۆڕن بەگوێرەی سودی تایبەتی خۆیان .

﴿ وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللهِ ﴾ وەئــادەمیزاد قەدەغــە ئەکــەن لەرێگــەی ئــایینی خــوا و نایەڵن موسلمان بن و کارئەکەنە سەر ئەقڵی مرۆڤــە ســاویلکەکان، کــاتی وایــش ئــەبێ تاوانج ئەگرنە ئایینی خواو پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بۆ نمونە: زانــای فەرەنســی ( ڤولــتر ) ناوهاتــە خرۆش لــەدژی کلیساو پەلاماری قەشەکانی داو ووتی: هەموو کاتێ وەك سەگ ئــەوەڕن بۆ کۆکردنەوەی دارایی وتانەیشی گرتە تەورات و ووتی: شــتی خــراپ و قــێزەونی دژی یەکتری تێدایە، بەو بۆنەوە پیاوانی کلیسا دەریان کرد لەئاایینی خۆیان، هەندێکیان داوایان کرد ماوەی ژیانی بەند بکرێ لەگرتوخانەدا، ئەو زانا فەرەنسیە لەترسا ئەقڵی تیك چــوو، هیچ چارەیەکی بۆ ڕزگارکردنی خۆی نەدۆزیەوە لــەلای ( پاپا بنوا ) ی چواردەهەم جگــە لەوەی نامەیە دابنێ لەدژی پێغەمەری ئیسلامدا، نامەکــەی دانــا و جنێــوی دا بەپێغەمــەر ﴿ ﷺ﴾ کلێسا لــەو خۆش بوو پیرۆزبایی‌یان لەخۆیی و نامەکەی کرد .

﴿ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَــبَ وَ الفِضَــةَ وَلا يُنْفِقُونَــها فِي سَــبِيلِ فَبَشِّــرْهُمْ بِعَــذابٍ أَلِيــمٍ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ کۆئەکەنەوە زێڕو زیوو دایان ئەنێن لەســەر یــەك، هەریەکــە لــەوانــە دانانێن لــەرێگەی ئایینی خوادا و ئەو ئەندازەیە پێویســت کــراوە بــدرێ لــەزەکاتا نــایدەن بەهەژاران دوایی تۆ موژدە بدە بەو کەسانە زەکاتــەکانیان نابەخشــن بــەو کەســە دیــاری کراوانە بەسزایەکی خاوەن ئازار، مەبەست لەوکەسانە هەڕەشەیان لێ ئەکرێ لەوئایەتــەدا هەمو کەسێ ئەگرێتەوە، ئیتر خاوەن نامەکان بن یا موسڵمانان بەبێ جیاوازی. مەبەســت لەو داراییە دانراوانەیش تەنها زێڕو زیو نیە. بەڵکو هەموو داراییە ئەگرێتەوە زەگاتی تیــدا پێویست کرابێ، ئیتر با دانراویش نەبێ یا زێڕو زیو نەبێ. مەبەست لەرێگەی ئــایینی خــوا جەنگ کردنە بۆ بەرزی یاسای ئایینی ئیسلام وبەرگری لەنیشــتمان و دروســت کردنــی مزگەوت و خەستەخانەو قوتابخانە و چاك کردنی ڕێگە و بان و دروست کردنــی پــرد و ڕاکێشانی ئاو ئەوانە هەمو ئەگرێتەوە بەبێ جیاوازی بەوێنەی هەژاران و شتی تریش .

بۆ زانین: پێویستە لەسەر موسڵمانانی خاوەن سامان و دارایی خۆیان لەجگەی زەکاتیش ببەخشن بۆ بەرگری لەدوژمنی ئایین و نیشتمان. کاربەدەستان بۆیان هەیە زۆر بکەن لەدانیشتوان بۆ ئەو مەبەستە سوودی تایبەتی خۆیان نەبێ، بگرە پێویستە مرۆڤ لەشی خۆی ماندو بکا بۆ ئەو مەبەستانە بەگوێرەی تواناى خۆیان .

﴿ يَوْمَ يُحْمى عَلَيْها في نار جَهَنَمَ فَتُكْوى بِها جِباهَهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ ﴾ ئەو سزا ئازاردەرە توشیان ئەبێ لە ڕۆژێکا گەرم ئەکرێ لەسەر ئەو داراییە دانراوانە ئاگری دۆزەخ هەتا زۆر گەرم ئەبن و سورئەبنەوە، دوایی داخ ئەکرێ بەو داراییانە ووتو ئەدرێ یەوان تەوێل و لاتەنیشت و پشتی ئەوان. ئەبێژرێ بەوان.

﴿ هذا ما كَنَزْتُمْ لِأَنْفُسِكُمْ فَذُوقُوا ماكُنْتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾ ئەمەیە شتێ ئێوە داتان ئەنان لەسەر یەك و كۆتان ئەكردەوە بۆ خۆتان و نەتان ئەبەخشین لەڕێگەی خوادا، ئێستا بۆ بە سزادانتان دوایی ئێوە بچێژن شتێ ئێوە كۆتان ئەكردەوەو داتان ئەنان لەسەر یەك .

کاتێ خوای مەزن باسی جەنگی باوەڕدارانی کرد لەگەڵ ئەوشتەی بوبو بەهۆی بێ باوەڕی خاوەن نامەکان لەخواردنی بەرتیل و باسی چاوچنۆکی ئەوانی کرد، دوای ئەوانە باسی چەند شتێ ئەفەرموێ کەپەیوەندیان بەجەنگەوە هەیە، ئەفەرموێ :

إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثۡنَا عَشَرَ شَهۡرٗا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوۡمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٞۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُۚ فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡۚ وَقَٰتِلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ كَآفَّةٗ كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ كَآفَّةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٣٦﴾

إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا لِّيُوَاطِـُٔوا۟ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّوا۟ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ زُيِّنَ لَهُمْ سُوٓءُ أَعْمَٰلِهِمْ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾

﴿ إِنَّ عِدَّةَ الشُهُور عِنْدَ اللهِ اُثنَتا عَشَرَ شَهْراَ في كِتــابِ اللهِ يَــوُمَ خَلَـقَ السَـماواتِ وَالآرضَ ﴾
بەڕاستی ژمارەی مانگەکان لەخزمەت خوادا دوازدە مانگن لەنێو نامەی خواداو لەفەرمانی ئەودا لەڕۆژێکەوە خوا ئاسمانەکان وزەوی دروست کردوە و لەیەکەم کاتی بونیانەوە. ژمارەی ئەو مانگانە دەست کردو دانروای ئادەمیزاد نین، بەرهەمێکی پێویستین بۆ بونەوەران و بۆ دەستور و ژیانیان .

بۆ زانین: ئەگەر ئێمە تەماشای چۆنیەتی سروشتی ئەم گەردونە بکیەن بەهۆی خۆرو مانگەوە هەمو کاتەکان ئەناسین کەخۆر دێت و ئەڕواو هەڵدێت و ئاوائەبێ ڕۆژ بەڕۆژ . بەو بۆنەوە بەیانی و نیوەڕۆو عەسرو ئێوارە وشەویان پێئەناسین و ئەوانە پەیوەندیان بەمانگەوە نیە. بەڵام مانگ دێت و ئەڕوا بەشێوەیەکی تایبەتی لەیەکەم ڕۆژی هەمو مانگێکەوە هەتا کۆتایی ئە ومانگە، بەو بۆنەوە دوای تێپەڕبوونی دوازدە مانگ ساڵی پێئەناسین. کەواتە ئەومانگانەی مانگ پەیدایان ئەکا هەر ئەوانە مانگی سروشتین بۆ گەردون نەك جگەی ئەوان، هەرلەبەرئەوەیشە خوای مەزن کاتی دیاری کردوە بەهۆی مانگەوە بۆ حەج کردن و ڕۆژو گرتن، بۆ ژمارە دیاری کراو بۆ شیردان بەمناڵ. وەستانی ژنان بۆ ماوەی دیاری کراوی دوای تەڵاقدانی ژنان ( عدة) بەڵام نوێژ کردن کاتەکانیان بەهۆی خۆرەوە ئەناسرێن، خۆر بۆ ناسینی کات کە بیست وچوار کاتژمێرە بۆ شەو وڕۆژ، ناسینی دووازدە مانگەی ساڵ بەهۆی مانگەوەیە. مەبەست لەدیاری کردنی مانگ

بۆ حەج کردن و ڕۆژو گرتن ئەوەیە ئەوپەرستانە بۆ خوا بسوڕێنەو ەلەهــەمو وەرزەکـاندا و لـەهەمو بەشەکانیاو هەتا ئاسانی و گرانیان تۆشی ئادەمیزاد بن لـەگەرماو لـەســەرمادا و ڕۆژی کورت ودرێژ .

﴿ مِنْها أَرْبَعَةٌ حرُمٌ ذلِكَ الدينُ القَيِمُ ﴾ هــەندێ لـەودوازدە مانگانـە ڕێـزدارن و نـابێ جەنگیان تێدا بکرێ، ئەو چوار مانگە بریتین لە زیل عەقیدە و زیـل حیجـە و موحـەڕەم و ڕەجەب. ئەو باسکردنی مانگانە بە دووازدە مانگ بەگوێرەی هاتوچۆو سوڕانەوەی مانگ و ئەو قەدەغەکردنەی جەنگ لەوانداو ڕێزدارن ئایینی ڕاستی ئیبراهیم و ئیسماعیلە و بـۆ ئیسلام ماونەتەوە. قەدەغەیە دەست کاری کردنیان و گۆڕانیـان لـەژمارەیاندا بـەگوێرەی ئارەزووی ئادەمیزاد .

﴿ فَلا تَظْلِمُوا فِيهِنَّ أَنْفُسَكُمْ ﴾ دوایی ئێوە ستەم مەکــەن لـەخۆتان بەلەکـەدارکردنی ئەومانگە ڕێزدارانە و کاری قەدەغەکراویان تێدا مەکەن و جەنگ وتـالاّنی کـردن لـەنێو ئەوچوار مانگەدا مەکەن .

بۆ زانین: زۆربەی زانایان لـەســەر ئـەوەن قەدەغـەکردنی جـەنگ لـەوچوار مانگـەدا گۆڕاوە و دروستە جەنگیان تێدابکرێ لـەبەر ســودی ئـایین، هەرچـەندە گونـاە کـردن و وازهێنان لـەفەرمانی خوا لـەو چوار مانگەدا خراپترە .

﴿ وَقاتِلُوا المَشْرِكِينَ كافَةً كَما يُقاتِلُونَكُمْ كافـةً ﴾ وەئێـوە جـەنگ بکـەن لـەگـەڵ بـت پەرستان لـەسەر بەرزی ئایینی خوا بەهەموتانەوە بەبێ جیاواز لەو چوارمانگەدا و جگــەی ئەو چوار مانگەیش، هەروەك ئەوەی بت پەرستان جەنگ ئەکــەن لـەگـەڵ ئێـوە هـەمویان بەبێ گوێدان بەڕێزگرتن لـەومانگانەدا بۆڕێزی هیچ مانگێ .

﴿ وَأَعْلَمُوا أَنَّ اللهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ ﴾ وەئێوە بزانن بەڕاستی خوا لـەگەڵ ئەوکەسانەیە خۆیـان ئەپارێزن لـەبت پەرستی وبێ باوەڕی و تێکدانی پەیمان و جەنگ کردن لـەوچوارمانگانەدا و جەنگ نەکردنیان لــەو مانگانـەدا دووائەخست بـۆ مـانگێ تـر. بـۆ نمونـە لـەمانگی موحەڕەمدا دەستیان ئەکرد بەجەنگ کردن و ئاوڕیان نەئەدایەوە بۆ ڕێزگرتن لـەومانگـە .

ئەیان ووت: ئەورێزە ئـەدەین بـەمانگی سـەفەر و لـەومانگـەدا جـەنگ ناکـەین لـەبریتی موحەڕەم. خوای مەزن بۆ قەدەغەکردنی ئەوکارە خراپە فەرموێ :

﴿ إنَما النَّسيءُ زيادةٌ في الْكُفْرِ يُضلُّ بِهِ الذِيْنَ كَفَرُوا ﴾ بەڕاسـتی دوواخسـتنی مـانگیٚ لـەوچوار مانگە لـەبارەی ڕێزدارییە وە بۆ مانگیٚ تر زۆربونە لـەبیٚباوەریدا، چونکە ئـەوەی خوا قەدەغەی کردوە ئەی گێڕن بەڕەوا بۆ خۆیان و ئـەوەی ڕەوایـە لای خـوا قەدەغـەی ئەکەن، بت پەرستان بەو کارە خراپە کەسـانێکی ئـەوتۆن باوەڕیـان نـەهێناوە لـەڕێگـەی ڕاست لایان ئەدەن .

﴿ يُحَلُّونَهُ عاماً وَيَحرِمُونَهُ عاماً لِيُواطِئُوا عِدَةَ ماحَرَّمَ اللهُ ﴾ بت پەرستان ئەو دواخستنی مانگە ڕیزدارە بە ڕەوا دائەنێن جەنگ کردن لـەودا، لـەجێگەی ئەودا مانگیٚ تر دائەنێن بۆ قەدەغەکردنی دوواخستن و، دواخستن قەدەغە ئەکەن لــە سـالٚیٚ تـردا. یـانیٚ لـەسـالٚێکا مانگیٚ لـەومانگە ڕێزدارانە ڕەوا ئەکەن جەنگ لـەودا کــەچی لـەسـالٚیٚ تـردا بەقەدەغـەی دائەنێن لـەومانگەدا جەنگ کردن لـەبەرئەوەی ڕێکی بخە ن ژمارەی شتیٚ خــوا قەدەغـەی کردووەو ژمارەکەیان ببیٚ بە چوار مانگ .

﴿ فَيُحَلُّوا ماحَرَمَ اللهُ زُيِّنَ لَهُمْ سُؤُ أعْمالِــهِمْ ﴾ دوایـی ئــەو بـت پەرسـتانە ڕەوا ئەکـە نبەهۆی ئــەو ڕێکخسـتنەوە ڕەوا بکـەن شـتیٚ خـوا قەدەغـەی کـردوە بـەبیٚ چـاودێری مانگەکان، ڕازینراوەتەوە بۆیان لـەلایەن خــواۆ خراپـەیکردارەکانیان و لـەڕێگـەی لادان بەجۆریٚ گومان ئەبەن ئەوکارەیان چاکە. ئیبنو عەباس ئەفەرمویٚ: بت پەرسـتان ڕەوایـان نەئەکرد مانگیٚ لـەمانگە ڕیزدارەکان مەگەر قەدەغەیان ئەکرد لـەجێگەی ئــەودا مـانگیٚتر کەڕەوابو جەنگی تێدا بکریٚ، قەدەغەیان نەئەکرد مانگیٚ ڕەوابـو جـەنگ لـەودا مەگـەر دایان ئەنا لـەجێگەی ئەودا مانگیٚ لـەمانگە ڕێزدارەکان .

﴿ وَاللهُ لايُهْدي القَوْمَ الْكافِرِيْنَ ﴾ وەخــوا ڕاغومـایی تـاقمی بیٚبـاوەڕان ناکـا بـۆ لای کاریچاك هەتا ئەوان بەردەوام بن لـەسەر بیٚ فەرمانی خوا .

کاتیٚ خوای مەزن ڕونی کردەوە کاتەکاتی قەدەغەی جەنگ کردن لـەوچوار مانگانـەو جگەی ئەوانیش دەست پیٚ ئەکا و هانی موسلٚمانان ئەدا لـەسەر جەنگ کـردن ،ئـەوەیش

لەکاتێکا بوو ەپێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ لــەتایف گەڕایــەوە و فــەرمانیدا بەجــەنگ کــردن لــەگــەڵ ڕۆمەکان، لەکاتێکا بۆ دانیشتوان لەتەنگیدا بوون گەرمایش پەرەی ســەندبو، دانیشــتن و پشودان لەسێبەردا زۆر خۆشبو لایــان، پێغەمــەر ﴿ ﷺ﴾ کــاتێ بیویســتایە جــەنگێ بکــا ئەیشاردەوەو نەی ئەفەرموو: هەتا ئەوکاتە ئەیویست بچێ بــۆ جــەنگی تــەبوك لــەپێشــەوە دەری بڕی و بەهاوڕێکانی خۆی ڕاگەیاند، فەرمانی دا بەجەنگ لەوکاتە گەرمــەدا، ڕوی کرد بۆ لای کارو ڕۆیشتنی زۆرو یەکجار دورودرێژ و بڕینی چەند بیابانێ، بۆلای جەنگی ژمارەیەکی زۆر لەڕۆمەکان لەمانگی ڕەجەبی ســاڵی دەهــەمی کۆچــی، موســڵمانان کــە ئەوفەرمانەی پێغەمەریان بۆ دەرکەوت کەخۆیان ئامادەبکــەن زۆریــان لاگــران و ســەخت بوو چونیان بۆ ئەو جەنگە. دوایی خوای مەزن فەرموێ:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيۡـٔٗاۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدۡ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذۡ أَخۡرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ فَأَنزَلَ

ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾

﴿ ياأيها الذِينَ آمَنُوا مالَكُمْ إذا قِيلَ لَكُمْ انْفِرُوا في سَبيلِ اللهِ أثـاقَلْتُمْ الى الآرضِ ﴾ ئـەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: چ شتێکە ڕێگە بگرێ لەئێوە کاتێ بێژراوە بەئێوە ئێـوە بچنە دەرەوە بۆ جەنگ لەگەڵ پێغەمەری خۆتانا لەڕێگەی بەرزی ئایینی خوادا ئێوە سستی ئەکەن و خۆتان دوا ئەخەن و ئاوڕ بۆ لای جیهان ئەدەنەوەو چونە دەرەوەتـان لاگرانـە و ئەتانەوێ لای زەوی نیشتمانی خۆتانا بمێنیتەوە. لەوکاتــەدا پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ فـەرمانی دا بەچونە دەرەوە بۆ تەبوك هەندێ لە باوەڕداران ئەوانەیان سستیان ئەکرد بۆ چونـە دەرەوە چون بۆ خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بیانویان بۆ ئەهێنایەوەو وتیان: کاتەکەمان زۆر گەرمــە، دانیشتوان لەتەنگانەدان لەبەرکــەمی خواردەمــەنی، میـوەی مەدینـە پێگەیشتوەو کـاتی کۆکردنەوەیەتی وبۆ ئەومەبەســتە خـوا سەرزەنشـتی کـردن و فـەرموی بـەو کەسـانە ئەوبڕوبیانوەیان ئەهێناوە .

﴿ أرَضِيتُمْ بِالحَياةِ الدُّنيا مِنَ الآخِرَةِ ﴾ ئایا ڕازین و پێتان خۆشە لەجیاتی پاداشتی ڕۆژی دوایی ئێوە ژیان و ڕابواردنی جیهان هەڵبژێرن، بۆیەکاروکردەوەی بەوجۆرە دەرئەبڕن؟

﴿ فَما متاعُ الحَياةِ الدُّنيا في الآخرَةِ إلاّ قليلٌ ﴾ ڕابواردن و خۆشی ژیانی جیـهان نرخـی بۆ دانانرێ بەرانبەر بەدوارۆژ مەگەر کـەمێکی بـێ نـرخ و بـڕاوە. کـارێ بـەوجۆرە بـێ سایشتەی باوەڕی ئێوەنیە .

﴿ إلا تَنْفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذاباً أليماً﴾ ئەگەر ئێوە نەچنە دەرەوە وەڵامی پێغەمەر نەدەنەوە بۆ جەنگی ڕۆم خوا سـزای ئێـوە ئـەدا بەسـزایەکی خـاوەن ئـازار و دەردنـاك لـەتۆڵـەی تەمەڵیتانا .

﴿ وَيَسْتَبْدِلْ قَوماً غَيْرَكُمْ﴾ وەخوا بنەبڕئەکا و ئــەتان گــۆڕێ بــەتاقمێ جگــەی ئێــوەو فەرمانبەرداری خواو پێغەمەر ئەبن، ئەوتاقمە ڕۆژی دووایی هەڵئەبژێرن و جیهانیان ناوێ، خوا یاریدەیان ئەدوا یاریدەی پیغەمەر و ئەوتاقمەئەدا.

﴿وَلا تَضِرُوهُ شَيئاً وَاللّهُ عَلى كُلِ شيءٍ قَدِيرُ﴾ وەئێوە ناتوانن هیچ زیانێ بەخوا بگەیـەنن بەهۆی دانیشتنتانەوە، خوا پێغەمەری خۆی سەرئەخاو، خوا دەسەلاّتی بەسەر هەمو شتێکا هەیە، بەبێ‌گومان تواناى یاریدانی پێغەمەری خۆی هەیە بەوتاقمــەوە،کورتەیــە لــەمێژووی چونی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بۆ تەبوك: لـەشکری ئیسلام بەسەرۆکایەتی پێغەمەر ڕۆیشتن لـەوکاتە گەرمای زۆرەدا و چەندین دەشت و چۆلاّییان بڕی، لـەپاش حەوت ڕۆژ گەیشتنە سـنوری نیشتمانی ڕۆمەکان، لەوسنورەدا سەرۆك و گەورەکانی ئەو شوێنانە هاتنە خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ داوای ئاشتەواییان کرد لـەپێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ لـەسەر ئەوەی ســەرانەبدەن بەپێغەمــەر ﴿ ﷺ﴾، پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ وەلاّمــی دانــەوە. لـەشـکری ئیسـلام بـەرەودوا گەڕانـەوە هـەتا گەیشتنە شاری تەبوك کەنیوەی ڕێگەیە لـەمەدینەوە هـەتا دیمەشـق، ئـەو ڕوداوە لـەسـاڵی نۆهەمی کۆچیدا بو لـەمانگی ڕەجەبدا بوە. لـەوگەشتەدا توشی فەرمانبەری تەبوك بون کـە هاتبو بۆ ڕاوکردن بەدیلی گرتیان و شاری تەبوك خـۆی دا بەدەسـتەوە، پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ لـەجێگەیەکەوە بۆ جێگە تر ئەی گوازتەوە، چەند بنکەیەکی سەربازی ڕۆمەکانیان گرت، تایفەکانی عەرەبی ئەو جێگایانە ڕزگاریان بو لـەدەستی ڕۆمەکان، موسڵمانان بەبــەختیاری گەڕانەوە بۆ مەدینە بەدەست کەوتێکی زۆرەوە. پێغەمــەر ﴿ ﷺ﴾ بڕیـاری دا ئەوکەسـانە نەهاتوون بۆ جەنگی تەبوك وازیان لێ بـهێنێ و قەدەغـەی کـرد هیـچ کەسـێ گفتوگـۆ و مامەڵـەیان لـەگەڵ نەکەن.

دوایی خوای مەزن بەپێغەمەری ڕاگەیاند ئەگەر ئێوە واز لـەپێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بهێنن هیچ زیانێ بەپێغەمەر ناگاو خوا یارمەتی ئەدا وێنەی ئەوکاتەی لـەمەکە بــو کــە بــت پەرسـتان ویستیان یکوژن، خوا سەرپەرشتی کردو فەرموی:

﴿ إلا تنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللهُ إذْ أخرَجَهُ الذِيْنَ كَفَرُوا﴾ ئەگــەر ئێـوە یارمــەتی پێغەمــەر نەدەن، دوایی بەڕاستی خوا یارمەتی پێغەمەری داوە لەمەوپێش و بەم نزیکەیش لەمەوپاش یارمــەتی ئــەداو یارمــەتی داوە لەمەوبــەر کــاتێ کەســانیکی ئــەوتۆ باوەڕیــان نــــەهێنابوو پێغەمەریان دەرکرد لەمەکە، ئەوەبو خوا لەوکاتەدا فەرمانی دا بەپێغەمەر بەدەرچون کاتێ ئەیویست بخەوێ، ئەوەبو پێغەمەر کۆچی کرد بۆ مەدینە .

﴿ ثـاني اثْنَــينِ إذهُمــا في الغــارِ﴾ پێغەمــەر یــەکێ بــو لەودووکەســەی کــاتێ لەئەشکەوتەدابوو ن، ئەو دووکەسە بریتی بوون لەپێغەمەر و ئەبوبەکر لــەو ئەشــکەوتەدا خۆیانیان پەنهان دابو. ئەو ئەشکەوتە لەسەرەوەی کێوی سەرەوەی نزیکی مەکە بــەدوری یەك سەعات سێ رۆژ لەوێ مانەوە .

﴿ إذْ يَقُـولُ لِصاحِبِـهِ لاتَحـزَنْ إنَ اللهَ مَعَنـا ﴾ لەوکاتــەدا پێغەمــەر ﴿ ﷺ﴾ فــــەرموی بەهاوڕێکەی خۆی ئەبو بەکر: تۆ خەفەت مەخۆ بەڕاستی خوا لەگەڵ ئێمەیەو ویاریدەمــان ئەداو لەئازاری دوژمن ئەمانپارێزێ وئێمە زاڵئەکا بەسەریانا .

ئەگێڕنەوە کاتێ بت پەرستان چونە سەر ئەشکەوتەکەوە ئەبو بەکر ترسا کــە پێغەمــەر بگیرێ. پێغەمەر فەرموی: بەئەبوبەکر گومانی تۆ چۆنە بەدووکەس خــوا ســێهەمیان بــێ، دوایی خوا چــاوی بــت پەرســتانی لەئاســتی ئــەوان کوێــر کــردو ئەگــەڕان بــەم لاولای ئەشــکەوتەکەداو ئــەوانیان نەئــەبینی، بێـژراوە خــوا دووکۆتــــری نــارد لــــەخوارەوەی ئەشکەوتەکەو هێلکەیان کرد و جۆلاّیی کەرەیشدەرگاری‌ئەشکەوتەکەیان تەنی بەبۆنــەوە خوا پاراستنی .

بۆ زانین: زانایان ئەڵێن: هەرکەسێ بڵێ: ئەبوبــەکر هــاوڕێی پێغەمــەر نیــە بێبــاوەڕە . بەلاّم بۆ جگەی ئەو گوناهبار ئەبن، چونکە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەفــەرموێ بەئــەبو بــەکر: تــۆ هــاوڕێی منــی لــەلای حــەوزی کەوســەر وهــاوڕێی منــی لــەم ئەشــکەوتەدا. تورمــوزی فەرمویەتی. کاتێ گەیشتنە ئەشکەوتەکە و ئەبوبەکر ووتی بەپێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ وەڵهی نــابێ بەرلــەمن بچیتە ناوی ، ئــەوەبو چونــە ژورەوە و گســکی داو کراســەکەی خــۆی دڕی و

کونەکانی پیٚ گرتن، وە کونێکیان مایەوە پاژنەی پیٚی خۆی پێداکرد، دوایی چونە ژورەوە پێغەمەر سەری نایە سەرکۆشی ئەبوبەکر و خەوت، دوایی ئـەبو بـەکر مـاریٚ پێـوەی‌دا و نەجولاٚیەوە نەوەك پێغەمەر خەبەری بێتەوە و لـەتاو ئـازاری خـۆی فرمێسـکی ڕژا بەسـەر ڕومەتی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرموی: ئەوەچیە ؟ ووتی باوك و دایکم بەفیدات بیٚ مـار پێـوەی دام. پێغەمەر تفی خۆی لـێداو ئازاری شکا، دوایی هەڵی دایەوەو ئەڵێن: بو بەهۆی مردنی ئەبو بەکر .

﴿ فَأنْزَلَ اللهُ سَكِينَتَهُ عَلَيهِ وَأيَدَهُ بِجُنُودٍ لَمْ تَرَوْهـا ﴾ دوایـی خـوا ئـارامی و میـهرەبانی خۆی نارده خوارەوە بۆســەر پێغەمـەرو دڵـی بـەهێزکرد، وەخـوا یارمـەتی پێغەمـەری دا بەچەندین سەربازیٚ ئێوەنەتان ئـەبینین، ڕوی بـت پەرسـتانی وەرچـەرخان هـەتا نـەیانبینن وێنەی یارمەتی دانی بەفریشتە لـەجەنگی بەدرو ئەحزاب و حونەین.

﴿ وَجَعَلَ كَلِمَةَ الذِيْنَ كَفَرُوا السُفلى ﴾ وەخوا ووشـەی کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕیـان نەهێنابوو کە بریتی بو لـەبت پەرستی و بیٚ بـاوەڕی گـیرای بـەنزم و سەرشـۆڕی کـردن لـەهەمو کاتێکا بەتایبەتی لـەڕوداوی ئەشکەوتی سەوردا.

﴿ وَكَلِمَةُ اللهِ هِيَ الْعُليا وَاللهُ عَزِيْزٌ حَكِيمٌ ﴾ وە ووشەی خـوا کـە بریتیـە لـە یـەکێتی خودای مەزن هەر بالاٚو بەرزە لـەهەموکاتێکاو، خوا زۆر گەورەو بەدەسـەلاٚتە، هەموشـتیٚ لـەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنیٚ .

دوایی خوای مەزن فەرمان ئەدا بەجەنگ کردن لـەڕێگەی خوادا، ڕونیشـی ئەکاتـەوە کە پێویستی کردوەو بە بەندەکانی خۆی ئەفەرمویٚ:

ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَـٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّٱتَّبَعُوكَ وَلَـٰكِنۢ بَعُدَتْ

عَلَيْهِمُ ٱلشُّقَّةُ وَسَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ يُهْلِكُونَ أَنفُسَهُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٤٢﴾ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا وَتَعْلَمَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾

﴿ انْفِرُوا خِفافاً وَثِقالاً ﴾ ئێوە بچنە دەرەوە لـەگەڵ پێغەمەری خۆتانا بۆ جەنگی تـــەبوك بەسوك و قورستانەوە، بەلاوو بەپیرتانەوە. بەسوارو بەپیادەتانەوە. بـــەلاوازو قەڵـەوتانـــەوە. بەمناڵدارو بێ‌مناڵتانەوە. بەهەژارو ساماندارتانەوە. بەخاوەن هێزو لاوازتانەوە، بەچەكدارو بێ‌چەكتانەوە .

﴿ وَجاهِدُوا بِـأَمْوالِكُمْ وَأَنْفُسِكُـمْ في سَـبيلِ اللهِ ذلِكُـمْ خَـيْرٌ لَكُـمْ إنْ كُنْتُـمْ تَعْلَمُـونَ ﴾ وەتێبكۆشن و جەنگ بكەن بەداراییەكانتانەوەو بەلـەشی خۆتانەوە لـەڕێگەی ئایینی خـــوادا ئەو دەرچونەی ئێوە بۆ جەنگ كردن چاكترە بـــۆ ئێـــوەی موســـڵمان لـەدانیشـــتن و كـــەنار گرتنتان بۆ بەرزی ئیسلام ئەگەر ئێوە بزانن بەپاداشتی زۆری ئەو دەرچونـــەتان و بەســـزای زۆری دانیشتنیان .

بۆ زانین: هەركاتێ دوژمـــن هـــەوڵی داو ویستیان دەست درێـژی بكەنـە ســـەرتان و سەرئایینی ئیسلام ،یابیانەوێ نامەی خواو فەرمودەی پێغەمەر بگۆڕن، یاقەدەغەی پەرستنو بەجێ هێنانی درۆشمی ئایین بكەن. یا ویستیان یەكێ لـە شارەكانی موسڵمانان داگیر بكەن، لـەوكاتانـــەدا پێویســـتە لـەســـەر هـــەموو موســـڵمانان بـــەرگری لـەوشـــتانە بكـــەن و لـەوداگیركەرانە، بەخۆیان و بەدارایی و بەژن و پیاویانەوە، ئەگەر بەهەندێكیان ئەوكارانـــە بەرگری نەئەكران موسڵمانان گوناهبار ئەبن بەگشتی، ئەگەر بەهەمو موسڵمانان نەبوایـــە ئەومەبەســـتە نەئەچوەســـەر پێویســـتە هـــەمویان بـــەوكارە هەڵســـن. ئـــەگینا هـــەمویان

گوناهبارئەبن، هەرلـەبەر ئەومەبەستەیشە خوا ڕوئەکاتە موسڵمانانی مەدینە ئـەوان سستی نەکەن لـەدەرچون بۆ جەنگ و ئەفەرموێ:

﴿ لَوْكانَ عَرَضاً قَرِيباً وَسَفَراً قاصِداً لاتَّبَعُوكَ ﴾ ئەگەر تـۆ داوا بکـەی لـەوان دەست کەوتێکی نزیك وئاسـان لـەسـودی جیـهان و، داوای کـاروانێکی مـام نـاوەندی نـەدورو نەنزیك بکەی ئەوان دووای تۆ ئەکەوتن.

﴿ وَلٰكِنْ بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ الشُّقَةُ ﴾ وەبەلاّم ڕێگەیە ناخۆشبیٚ چون بەناویاگرانە لـەسەریان بچنە دەرەوە، گەردەلول وبای لماوی و زۆری دوژمن ئەی ترساندن دوای تۆ بکەون.

﴿ وَسَيَحْلِفُونَ بِاللهِ لَوِ اسْتَطَعْنا لَخَرَجْنـا مَعَكُـمْ يُهْلِكُونَ أَنْفُسَـهُمْ ﴾ وەئـەو دووڕوانـە نەچونە دەرەوەو دوواکەوتون سوێند ئەخۆن بەخوا ئەگەر توانامان ببوایـە بەڕاسـتی ئێمـە دەرئـەچوین لـەگـەڵ ئێـوە، ئەوکەسـانە خۆیانیـان کـەئارداو سـوێندیان خـوارد خۆیـــان لـەناوئەبەن، سایشتەی سزای گران و تۆڵەی سەختێ لـەهەردوو جیهاندا .

﴿ وَاللهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكاذِبُونَ ﴾ وەخوا ئەزانێ بەڕاستی ئەو کەسانە کەناریان گرتـوە درۆ ئەکەن لـەسوێند خـواردن و بیانوهێنانـەوەیاندا. نـاوەڕۆکی ئـەو ئایەتـە بەڵگەیـە لـەسـەر پێغەمەرایەتی موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ کەخوا هەواڵی داوە بەپێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ بەشـارەوای دڵـی ئەو کەسانە بەرلـەوەی بچنە دەرەوە بۆ جەنگی تەبوك لـەکاتی گەڕانـەوەیان بـۆ مەدینـە. ئەوەبو چونە خزمەت پێغەمەر ودەستیان کرد بەبیانوهێنانەوەو سوێند خواردن .

پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ فەرمانی دا بەهەندێ لـەدانیشتوانی مەدینە نەچنـە دەرەوە بـۆ جـەنگی تەبوك بەبێ ئەوەی خوا فەرمان بدا بەوشتە، دوایی خوای مەزن ڕوئەکاتە پێغەمەر بـەجۆرە سەرزەنشتێ بەهۆی ئەوفەرمانەوە دابوی بەو دواکەوتنە و فەرموی:

﴿ عَفا اللهُ عَنْكَ لِمَ أَذِنْتَ لَهُمْ حَتى يَتَبَيَّنَ لَكَ الذِينَ صَدَقُوا ﴾ خوا لـەتۆ ببورێ لـەبـەر چ شتێ تۆ دەستورت دا بەو دوو ڕووانـە نەچنـە دەرەوە بـۆ جـەنگی تـەبوك لـەوکاتـەدا بیانویان هێناوە بۆ تۆ ، ئەبوایـە دەسـتورت پـێ نەدانایـە هـەتا کـاتێ بـۆ تـۆ دەرکەوتایـە کەسانێکی ئەوتۆ ڕاستیان کردوە لـەگەڵ تۆ لـەبیانو هێنانەوەیاندا .

﴿ وَلَوْ أَرادُوا الخُرُوجَ لَآعدّوا لَهُ عُدَةً﴾ وەئەگە ئــەو دووڕوانــە بیـان ویستایە بچنـە دەرەوە لـە گەڵ پێغەمەر بۆ جەنگی تەبوك بەڕاستی ئامادەئـەبوون بـۆ ئەوچونـە دەرەوەیـە بەچەك و بەتفاق و وولاّخی سواری وتوانای ئەوانیشیان هەیە بەزۆرتریشەوە.

﴿ وَلَكِنْ كَرِهَ اللهُ انبِعـاثَهُمْ فَثَبَّطَـهُمْ ﴾ وەخـوا پـیٚ‌ی ناخۆشـە چونـە دەرەوەی ئـەوان بۆجەنگ لـەگەڵ ئێوە، دوایی خوا قەدەغەی کرد چونــە دەرەوەیـان و سســت و تەمـەڵی کردن و وئارەزوویان لـە چونـەدەرەوە نـەما، ئەگـەر بچونایەتـە دەرەوە گـێرە شـێوێنی و دوودڵی بلاّو ئەکەنەوە .

﴿ وَقيلَ اقْعُدوا مَعَ القاعِدِينَ ﴾ وەبێژراو ەبەو دووڕوانە لـەلایەن هەندێ لـەخۆیانــەوە: ئێوە لـەگەڵ دانیشتوان و پەك کەوتەکان لـەژنان و لـەمندالاّن و بیمارەکانبن، خوای مــەزن ڕونـی نەکردوەتــەوە چ کەسـێ بـەوانی ووت: مەچنـە دەرەوە پێغەمـەر بوبـێ یاهــەندێ لـەخۆیان یازمانی خۆیانبێ گرنگ نیە، ئێمە بڕوای پاکمان بەفەرمودەی خوا هەیە .

پرسیار/ خوای مەزن لـەئایەتی ( ٤٣ ) ی ئــەم ســورەتەدا فــەرموی بەپیغەمــەر ﴿ ﷺ﴾ بۆچی دەستورت بەواندا بۆ چونە دەرەوە، لـەم ئایەتەدا ئەفەرموێ: پەسەند نیــە لای خـوا بچنە دەرەوەو دوایی سست وتەمەڵی کردن، ئەو دووئایەتە بەچ جۆرێ دژی یەکتر نین ؟

وەلاّم/ لـەباسی مانای ئایەتی پێشــودا ووتمـان: ئەوڕسـتەیە بـۆ خراپـەگرتن لـەپێغەمــەر ﴿ ﷺ﴾ نیە. بەڵکو بۆ ئەوەیە درۆو بیانوی دووڕوان ڕون ببێتەوە .

﴿ لَوْ خَرَجُوا فيكُمْ مازادوكم إلا خبالاً ﴾ ئەگەر ئەو دورووانە بچونایەتە دەرەوە لـەنێو ئێوەداو تێکەلاّوی ئێوەببونایــە پــەیدایان نەئــەکرد بەوچونـە دەرەوەیـە وبـۆ ئێوەیـان زۆر نەئـەکرد مەگــەر خراپــەو گێرەشـێونی و ئـاژاوەو لاوازی بـۆ ئێـوەو بـلاّو کردنــــەوەی دووبەرەکی. وێنەی ئەو ڕووداوانە لـەهەموو کات و جێگەیەکدا زۆرن، لــەم ســەردەمەدا ناویان ئەبرێ بەستونی پێنجەم (الطابور الخامس ).

﴿ وَلَآوضَعُوا خلالَكُمْ يَبْغونَكُمْ الفِتْنَةَ ﴾ وەبەڕاستی دایان ئەنا لـەنێو ئێوەدا دووبــەرەکی و هاوردن و بردنی گفتوگۆی نارەواو لاوازی ئێوە، ئەیانەوێ و نییازی ئازارو دووبەرەکی و شتی خراپتر بسازێنین بۆ ئێوە.

﴿ وَفِيكُمْ سَمّاعُونَ لَهُمْ وَاللهُ عَليمٌ بِالظالِمِينَ ﴾ وەلـەنێو ئێودا هەیـە بـۆ سـوودی ئـەوە دووڕووانە هەواڵبەرو گوێگر لـەگفتوگۆی ئێوەو ئەی بەن بۆ لای ئەوان و وایـش ئـەبێ لەئێوەدا هەبێ چەند کەسێکی سادەو نـەزان هـەموو درۆیـە وەرگـرن وبەهـەمو دەنگـێ هەڵپـەڕن و، خـــوا ئـــەزانێ بەســـتەمکاران لەودووڕووانـــە و ســـتەم لـەخۆیانئەکـەن لەهەردووجیهاندا .

﴿ لَقَدْ أبْتَغُوا الفِتْنَةَ مِنْ قَبْـلُ وَقَلَّبُـوا لَـكَ الأُمُـورَ ﴾ بەڕاسـتی ئەودووڕووانـە پـەیدایان کردوە بۆ ئێوەو داوای ئەوەیان کـــردوە بـۆ ئێـوە هـەمو خراپەیـە لـەمـەوپێش لـەجـەنگی ئوحودداو لـە گەڕانەوەی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی لـەجەنگی خەندەقدا و، ئەو دووڕووانە سازاندویانە بۆ تۆ چەندین فێڵ و تەڵـەکە بـازی و بەپێچەوانـەی کـاری تـۆوە هەڵسـاون، ڕاوێژیان کردوە لـەنێو خۆیانا بۆ ئەوەی تۆ لـەناوببەن و چورتمت پیٚبدەن .

﴿ حَتَى إذا جاءَ الحَقُ وَظَهَرَ أمرُ اللهِ ﴾ هـەتا کـاتێ هـات یـاریدانی کۆمـەکی خوایـی دەرکەوت فەرمـانی خوا بەســەر کـاری دووڕووانـدا، هەرشـتێ خـوا بیـەوێ ڕاسـت و دروسته و جگەی ئەو پوچە، خوا ویستی پێغەمەری خـۆی سـەربخاو سەریشـی خسـت و هەمو هۆیەکی بۆ ئامادەکردن بۆ گرتنی مەکەو بۆ سەرکەوتن لـەحونەین و تـــەبوك و پـاك کردنەوەی نیوە دورگەی عەرەب لـەبت پەرستان وەجوە خوێن خۆرەکان، لـەوسەردەمەوە هەتا ئێستا و هەتا هەتایەو پاشە ڕۆژیش ناوی موحەمەدی کوڕی عەبدوڵا دەنگ ئەداتـەوە لـەخۆرهـەڵات و خۆرئـاوا، ڕۆژ بـەڕۆژ ئـایینی ئیسـلام خـۆی ئـەنوێنێ بـەهۆی لاوانـــی ئیسلامەوە.

﴿ وَهُمْ كارِهُونَ ﴾ وەئەو دووڕوو و بێباوەڕانە، ئـەو یاریدانـەی خـواو دەرکـەوتنی ئایین و سەرکەوتنی ئایین و بیروباوەڕی ئێوەیان زۆر لاقورس و گرانەو پێیان ناخۆشە.

زانایان زوربەیان ئەڵێن: کاتێ پێغەمـــەر ﴿ ﷺ﴾ فـەرمانی دا بـەدەرچوونی گشـتی بـۆ جەنگی تەبوك ( جـەدی ) کـوڕی قـەیس کەیـەکێ بـو لـەپێشـەواکانی دووڕووان ووتـی بەپێغەمەر ﴿ ﷺ﴾: ئەی فروستادەی خوا: تۆ دەستور بدە بەمن دانیشم و نەیەمە دەرەوە بۆ

جەنگی تەبوك، چونکە من مرۆڤێکم ژنانم زۆر خۆش ئەوێ، ئەترسم چاوم بکەوێ بەژنانی ڕۆم و گیرۆدەیان ببم و خۆمم پێ نەگیرێ و توشی گوناەببم، بەڵام من یاریدەی تــۆ ئــەدەم بەدارایی، ئەو دووڕووە بەگومانیخۆی لەگوناە ئەترسێ بەهۆی ژنانەوە. بەڵام لەخەشم و سزای خوا ناترسێ کەدرۆ لەگەڵ پێغەمەر ئەکا، بۆ ئەو مەبەستە خوای مەزن ئەم ئایەتــەی ناردە خوارەوە: فەرموی:

وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ائْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّي ۚ أَلَا فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ﴿٤٩﴾ إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ ۖ وَإِن تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُوا قَدْ أَخَذْنَا أَمْرَنَا مِن قَبْلُ وَيَتَوَلَّوا وَّهُمْ فَرِحُونَ ﴿٥٠﴾ قُل لَّن يُصِيبَنَا إِلَّا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَانَا ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَا إِلَّا إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ ۖ وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ اللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِ أَوْ بِأَيْدِينَا ۖ فَتَرَبَّصُوا إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ﴿٥٢﴾

﴿ وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ ائْذَنْ لِي وَلاَتَفْتِنِي ﴾ وەهەندێکە لەو دووڕووانە کەسێ ئــەڵێ : تــۆ دەستور بدەبەمن نەچمە دەرەوە بۆ جەنگی تەبوك و ، تۆ من توشی خراپە و گونــاە مەکــە بەبۆنەی چونە دەرەوەم .

﴿ ألا في الفِتْنَةِ سَقَطُوا ﴾ ئاگاادار بـــەو بزانـــە ئـــەوان کەوتونەتـــە نێوخراپـــەوە بـــەهۆی دەرنەچونیانەوەو دەرکـــەوتنی دووڕووی خۆیانـــەوە. بـــەگومانی خۆیـــان لـــەدەستی گونـــاه هەڵدێن . بەڵام کەوتونەتە نێو گوناهی خراپترەوە .

﴿وَإِنَّ جَهَنَمَ لَمُحيطةٌ بِالكافِرينَ ﴾ وەبەڕاستی چونکـــە دووڕوون دۆزەخ دەورەی داوە بەم لاو لای بێ باوەڕاندا دەرچونیان نیە و لـــەدۆزەخ ڕزگاریـــان نـــابێ. بەڕاستی پێغەمـــەر ﴿ ﷺ﴾ بانگی ئەوانی کرد بۆ لای بەهەشت و ڕزگاری ئەگەر پەشیمان بونایەتـــەوە. بـــەڵام پەیڕەوی پێغەمریان نەکردو سزای خوا دەوری دان .

﴿ إنْ تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ ﴾ ئەگەر توشی تۆ ببێ چاکەیـــە لـــەســـەرکەوتن و دەست کەوت ئەوچاکەیە خەفەتباریان ئەکا، چونکە دڵیان پیسە بەرانبەر بەتۆ، زۆر ڕاستە هـــەمو مرۆڤێکی نامەردو پەست هەرکاتێ پیاوچاکان توشی چاکە بن لـــەوانەیە لـــەداخا زیرەبکەن.

﴿ وَإنْ تُصِبْكَ مُصيبَةٌ يَقُولُوا قَدْ أخَذْنا أمْرَنـــا مِـــنْ قَبْـــلُ ﴾ وەئەگـــەر ســـەختی و شـــکان وێنەی جەنگی ئوحود و برینداری و ئـــازار یـــا لاوازی توشـــی تـــۆ ببـــێ، بەیـــەکتر ئـــەڵێن: بەڕاستی ئێمە کاری خۆمانمان وەرگرت لـــەمەوپێش، خۆمانمـــان ڕزگـــارکرد لـــەوناخۆشـــیانە توشی موسڵمانان بو، باســـی ڕزگـــاربوونی خۆیانیـــان ئـــەکرد بـــەهۆی دەرنەچونیانـــەوە بـــۆ جەنگ .

﴿ وَيَتَوَلُّوا وَهَمْ فَرِحُونَ ﴾ وەئەو دووڕووانە پشت ئەکەنە تۆ و کۆمـــەکی موســـڵمانان بەشادمانی و خۆشی یەوە لـــەبەر ئەو ئازارەی توشی تۆ بوە و ئەوان ڕزگاریان بوە .

﴿ قُلْ لَّنْ يُصيبْنا إلاماكَتَبَ اللّٰهُ لنا ﴾ تۆ بڵێ: توشی ئێمـــە نـــابێ هیـــچ شـــتێ لـــەچاکـــەو لـــەخراپە مەگەر شتێ خوا بۆ ئێمەی نوسی بێ، ئێمە ئاگاداری خۆمان بوین، بەڵام بێ ئاگاو نەزانان خەریکی چ شتێکن بەبۆنەی دانیشتنیان لـــەگەڵ پەك کەوتەکاندا، ئێمـــە جـــەنگمان کردوە لـــەڕێگەی ئـــایینی خـــوادا، هـــەموو کەرەســـەی جـــەنگمان ئامـــادەکردبو. بەڕاستی موسڵمانان کەوتبونە زۆرانبازی لـــەگەڵ بێ باوەڕاندا. بـــەگوێرەی دەستـــوری خـــوا جـــارێ باوەڕداران سەرکەوتن،جارێ تر بێ باوەڕان سەرئەکەون. جەنگ بەردەوامـــە لـــەنێوانیانا.

بەلأم هەمو کارێ تەماشـــای ئـەنجام و پاشـەڕۆژی ئـەکرێ، بـەبێ گومان سـەرکەوتن بـۆ مەسڵمانان بو، یاریدەی خوا هەمو کاتێ هەروا ئەبێ پاشەڕۆژی سەرکەوتن بۆ موسڵمانان و باوەڕدارانی نیازپاکان ئەبێ.

﴿ هُوَ مَوْلانا وَعَلى اللهُ فَلْيَتَوَكَلْ المُؤمِنُونَ ﴾ خوا گەورەو کار هەڵسـورێنەری ئێمەیـە، هەر خوا خاوەنی ئێمەیەو ئێمـەیش بـەندەی ئـەوین، هـەر لـەسـەر یـاریدەی خـوا پشـت ئەبەسـت بـاوەڕداران، پـەنا هـەربۆ لای خـوا ئەبـەن، بـاوەڕداران کەرەسـەی جـەنگ ئامادەئەکەن و بەتەنها پشتی پێ نابەستن و خوایان لـەبیر ناچێ و بەتەمای یـاریدەی خـوان، هەرشتێ ببێ لـەسەرکەوتن و لـەژێرکەوتن بەمیهرەبانی خوا دادپـەروەری خـوای ئـەزانن، تاکە ئومێدیان سەرکەوتنی خۆیان و ئایینی ئیسلامە .

﴿ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنا إلاَ إحْدَى الحُسْنَيين ﴾ تۆ بڵێ بەو دووڕووانە چـاوەڕوانی هیـچ شتێ مەکەن بۆ ئێمە مەگەر یەکێ لـە دوو شـتەی ئـەوتۆ ئەنجامـەکانیان شـیرین و چاکـە: یاسەرکەوتنە بۆ ئێمە لـەجیهاندا یامردنە لەڕێگەی ئایینی خواداو بەهەشتی بەریندا، ئەگـەر ئێمە سەرکەوتین ئێوەیش توشی کزۆلی و بێ ئابڕویی ئـەبن، ئەگـەر کوژرایـن بـەختیاری پاشەڕۆژ و بەهەشت و پلەی گەورە بۆ ئێمەیە، کەواتە هەردوولایان گەورەیی و ڕێزن بـۆ ئێمە .

﴿ وَنَحْنُ نَتَرَبّصُ بِكُمْ اَنْ يَصيبكُمُ اللهُ بِعَذابِ مِنْ عِنْدِهِ أوْ بِأيْدِينا ﴾ وەئێمـە چـاوەڕوانی ئەوەئەکەین بۆ ئێوە کەخوا سزا توشی ئێوەبکـا لـەلایـەن خۆیـەوەو بنـەبڕتان بکـا وێنـەی گەلانی ڕابوردو یاسزاتان توش بکـا بـەهۆی هـێزو دەسـتی ئێمـەوە بەکوشـتنتان بـەهۆی بێ باوەڕیتانەوە.

﴿ فَتَرَبَصُوا إنا مَعَكُمْ متَرَبِصُونَ ﴾ دوایی ئێوە چـاوەڕوانی ئەوشـتانە بکـەن ئەتانـەوێ توشی ئێمەببین بەڕاستی ئێمەیش لـەگەڵ ئێوە چاوەڕوانی ئەوشتانە ئەکەین ئەمانەوێ پێمـان بگا.

لەپاشا خـوای مـەزن ڕونـی ئەکاتـەوە ئـەو دووڕووانـە سـودێ وەرنـاگرن بـەهۆی ئەوشتانەوە ئەی بەخشن لـەکاتێکا ئەوان بەردەوامبن لـەسەر بێ باوەڕی و ئەفەرموێ :

قُلْ أَنفِقُواْ طَوْعًا أَوْ كَرْهًا لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمْ إِنَّكُمْ كُنتُمْ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَا مَنَعَهُمْ أَن تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَٰتُهُمْ إِلَّآ أَنَّهُمْ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأْتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمْ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٥٤﴾ فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾ وَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ وَلَٰكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ ﴿٥٦﴾ لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَـًٔا أَوْ مَغَٰرَٰتٍ أَوْ مُدَّخَلًا لَّوَلَّوْاْ إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ ﴿٥٧﴾

﴿ قُلْ أنفِقُوا طَوْعاً أو كُرْهاً لَنْ يَتَقَبلْ مِنْكُمْ ﴾ تۆ بلێ بەو دووڕوانــە: ئێوە ببەخشن دارایی خۆتان لەڕێگەی چاکەکاندا بەخوایشتی خۆتانبێ یالاتان گرانبێ لــەئێوەوەرناگیرێ و سودی بۆتان نابێ، چونکە بۆ جگەی خوا کردوتانە.

هۆی هاتنە خاورەوەی ئەو ئایەتە ئەمەیە: هەندێ لەدووڕووان داوایان کرد لەپێغەمــەر ﴿ ﷺ﴾ نەیان بەن بۆ جەنگی تەبوك ،ووتیان بەدارایی یاریدەتان ئەدەین، بۆیە خوای مــەزن فەرمانی دا بەپێغەمەری خۆی ﴿ ﷺ﴾ بەوکەسانەبلێ: ئێمە پێویستمان بــەدارایی ئێوە نیە بەهەر شێوەیە بێ .

پرسیار/ زۆر ڕاستە هەرستیٚ بەناخۆشەویستی بدریٚ وەرناگیریٚ لای خـوا ، بۆچی بەخوایشت و بیٚ خۆشبونی وەرناگیریٚ ؟.

وەلاّم/ ئە وکەسانە ئەو بەخشینەیان لەبەرخوا نیە. بەلّکو بۆ شۆرەت و ناوبردنەو بۆ بەدەست هیٚنانی پلەو پایەیە، وەك خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوەو ئەفەرمویٚ :

﴿ إنَّكُمْ كُنتُمْ قَوماً فاسِقِيْنَ ﴾ بەڕاستی ئیٚوە تاقمیٚکن لـەڕەفتار تانـا لەسنورلاتان داوە لەبازنەی موسلّماناندا. کەواتە ئەوبەخششەتان لیٚ وەرناگیریٚ لای خوا .

﴿ وَما مَنَعَهُمْ اَنْ تُقْبَلَ نَفَقاتُهُمْ إلا اَنَهُمْ كَفَرُوا بِاللهِ وَرَسُولِهِ ﴾ وەقەدەغەی نەکردوە کە وەربگیریٚ لەو کەسانە بەخشینەکانی ئەوان مەگەر بەڕاستی ئەوکەسانە باوەڕیان نـەهیٚناوە بەخواو بەنیٚراوی خوا، هەر لەبەرئەو بیٚباوەڕییە لەوان وەرناگیریٚ لەلایەن خوداوۆ .

﴿ وَلايَأتُونَ الصَلاةَ إلا وَهُمْ كُسالى وَلا يُنْفِقُونَ إلا وَهُمْ كارِهُونَ ﴾ وەئەوکەسانە ناچن بۆ نویٚژی بەکۆمەلّ لەگەلّ پیٚغەمەر مەگەر ئەوکەسانە بـە تەمـەلّی و بەلەشـی قورسـەوەو لەبەر چاوی دانیشتوان ئەچن بەلای نویٚژەوە وەدارایـی خۆیـان نابەخشـن مەگـەر ئـەوان لایان ناخۆش و گرانە ئەوبەخشینەو بەتەمای پاداشت نین و لەسزای پاشەڕۆژ ناترسن .

﴿ فَلاْ تُعْجِبْكَ اَمْوالُهُمْ وَلا اَوْلادُهُمْ إنَما يُرِيدُ اللهُ لِيُعَذِبَهُمْ بِها فِي الحَياةِ الدُّنيا ﴾ دوایـی سەرنجی تـۆ ڕانەکیٚشـیٚ ولای تـۆ چـاك نـەبی دارایـی و منالّـەکانیان و سـەرت لەوانـە سوڕنەمیٚنیٚ. بەڕاستی خوا ئەیەویٚ کەبەهۆی ئەوانەوە سـزایان بـدا لـەژیان و زیندەگـانی جیهاندا وخۆیانیان لیٚ بگۆڕیٚ و لەناکاودا ئەیاندا بەزەویدا، ئەوسزادانەی خوای مەزن بەم دووجۆرەیە:

١- ئەوبیٚ باوەڕانـە بـەهۆی دارایـی و منالّیانـەوە سـەریان لیٚتیٚـك چـوەو گـیرۆدەی کردوون خۆشەویستیان و لەخۆیان بایی بوون بەهۆی ئەوشتانەوە .لەکاتیٚکا یەهـەرجۆریٚ بیٚ کەدارایی خۆیان ببەخشن بەزۆربیٚ یابەخوایشتی خۆیـانبیٚ ، یامنالّـەکانیان نـیٚرران بـۆ جەنگ و کوژران و دیل کران ، بەوبۆنەوە توشی خەفەتی زۆر ئەبن لەجیـهاندا ،چونکـە لەبەر خوا ئەوشتانەیان نەکردووە وەلەپاشەڕۆژیشدا سودیان لی وەرناگرن .کەواتــە خـوا سزای داون بەتایبەتی لەجیهاندا .

٢- خـوای مـەزن سـزای بێباوەڕانیش ئـەدا هــەر لـەجیــهاندا بــەهۆی ئــەوەوە کەمناڵەکانیان موسڵمانئەبن بەدڵی پــاك و بێگـەردە وەبەپێچەوانـەی باوکەکانیانـەوە چ شتێ بێ لـەو سزایە گەورەتر بێ کوڕلـەئایینی باوکی خۆی لابدا .

﴿ وَتَزْهَقَ أَنْفُسُهُمْ وَهُمْ كافِرِينَ ﴾ وەلـەبەرئەوەی گیانیان دەرئەچێ وئەمرن و ئەوان بێ باوەڕن. کەواتە لـەپاشەڕۆژدا خوا سزایان ئەدا بەهۆی بــێ باوەڕیانــەوە، هــەروەك سـزایان ئەدا لـەجیهاندا بەهۆی دارایی ومناڵەکانیانەوە سوودیان بۆیان نیە .

﴿ وَيَحْلِفُونَ بِاللهِ إِنَّهُمْ لَمِنْكُمْ وَما هُمْ مِنْكُمْ وَلَكِنَـهُمْ قَـوْمٌ يَفْرَقُـونَ ﴾ وەئەودووڕووانـە سوێند ئەخۆن بەخوا بەڕاستی کەئەوان لـەئێوەن و موسـڵمان بـون و، ئـەوان لـەئێوە نـین وباوەڕیان بەخوا نەهێناوە لـەدڵی خۆیانا، بەدرۆ باوەڕیان هێنـاوەو، بـەڵام ئـەوبێ بـاوەڕ و دووڕووانە تاقمێکن ئەترسن لـەئێوە کەبیان کوژن کەلـەسەر دووڕووی بمێنێتەوەو لـەترسـی کوشتن و دیل کردن و تالآن کردنیان بەسەرزارەکی موسڵمان بوون .

﴿ لَوْ يَجِدُونَ مَلجأً أَوْ مَغاراتٍ أَوْ مُدَّخَـلاً وَلَّـوا إِلَيـهِ وَهُـمْ يُجْمَحُـونَ ﴾ ئەگـەر ئـەو دووڕووانە دەستیان بکەوێ پەناگایە پەنای پێبەن، وێنەی قەڵایە یاسەری کێوی یادورگەیە لـەناوەڕاستی دەریایەکا، یائەشکەوتەکان یاکونێ بچنە نێویانەوەو خۆیان بشارنەوە لــەواندا بەڕاستی ئەو کەسانە ڕائەکەن و ڕوو وەرئەگێڕن بۆلای ئەو شتانە لـەترسی ئێوە بەڕاکردن بەگورجی بۆ لای ئەوانە بەوێنەی ئەسپی سەرکێش و هیچ شتێ نایان گێڕێتەوە .

لـەکاتێکا پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ دارایی بەش ئەکرد بەسەر هاوڕێکانیدا بەگوێرەی پیویسـتی و سوودی ئایین، لـەوکاتەدا ( زیل خویبەسەر) کەپیاوێ بو لـەهۆزی تەمیم هات ووتی: ئــەی فروستادەی خوا لـەوبەشکردنەدا دادپەروەربە. پێغەمەر فەرموی: هاوار بۆ تـۆ چ کەسـێ بێ دادپەروەربێ ئەگەر من دادپەروەرنەبم، عومەری کوڕی خەتاب ووتــی: وازم لێ بهێنـە بابیکوژم، ئەو ڕوداوە گەیشتە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ فەرموی: من پەنائەگرم لـەخوا کـەئادەمیزاد بڵێن: من هاوڕێکانی خۆم ئەکوژم. بەڕاستی ئەوکەسـانەو هاوڕێکـانی قورئـان ئـەخوێنن. بەڵام لـەقوڕگیان ناچێتە خوارەوە ودەرئەچن لـەدەستوری قورئان بەوێنەی تیری لـەکــەوان دەرچێ ،بۆ ئەومەبەستە خوا ئەفەرموێ:

وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنْ أُعْطُواْ مِنْهَا رَضُواْ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْاْ مِنْهَآ إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُواْ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾

﴿ ومِنهُمْ مَنْ يَلمِزكَ في الصّدقاتِ فَأنْ أعطُوا رَضُوا وَإنْ لَمْ يُعْطُوا مشنْها إذا هُمْ يَسْخَطُونَ ﴾ وەهەندێك لـەو دوورِووانە کەسێ تاوانج و رِەخنە ئەگرنە تۆ لـەبارەی بەشکردنی زەکـاتو دەست کەوتەکان، گومانی وایە بەبێ دادگەری و بەلایەن گـری بەشـی ئەکـەی، دوایـی ئەگەر ببەخشرێ بەوان لـەو زەکات و دەستکەوتانە شادمان ئەبن ولایان پەسەندە، ئەگـەر نەبەخشرێ بەوان لـەوزەکات ودەست کەوتانە کوتوپڕ خراپە لـەتۆ ئەگرن و زویـر ئـەبن لـەتۆ .

﴿ وَلَوْ أنهُمْ رَضُوا ماآتاهُمْ اللهُ وَرَسُـولُهُ ﴾ وەئەگـەر بەڕاسـتی ئـەو تاقمـە پەسـەندیان بکردایە ئەو شتەی خوا و نێراوی خوا بەخشیوێنی بەوان و بەلایانەوە چاکبوایە .

﴿ وَقالُوا حَسْبُنا اللهُ سَيُؤتِينا اللهُ مِنْ فَضْلِهِ وَرَسُولُهُ ﴾ وەئەوان بیان ووتایە: بەسەبۆ ئێمە لـەوشتەی خوا بماندانێ لـەمـەوداو خوائەبەخشـێ بەئێمـە لـەگـەورەیی خـۆی زەکـات یـا دەستکەوتێ ترو نێراوی خوایش ئەیبەخشێ بەئێمە زۆرتر لـەشتێ ئەیبەخشێ پیمان، ئەگـەر ئەوانە بلێین چاکترە بۆیان .

﴿ إنا إلى اللهِ راغِبُونَ ﴾ بەڕاستی ئێمە ئارەزوو مەنو ئومێدەوارین بۆلای خوا میـهرەبانی خۆی برێژێ بەسەرمانا و پێویستیمان جێبـەجێ بکـا. یـانێ ئەگـەر بـەوجۆرەیان بووتایـە چاکتر بۆئەوان لـەوەی داوای زەکاتو دەستکەوتیان بکردایە لـەپێغەمەر بەرِەخنە گرتنەوە .

ئـەو ئایەتـە هـانی ئـادەمیزاد ئـەدا بـۆ ئـەوەی خۆیـان بپـارێزن بەوشـتەی بەدەسـتی خۆیانەوەیە، داوای هیچ شـتیٚ نەکـەن لـەئادەمیزاد و پشـت ببەسـتن بـەخواو ڕازی بـن بەوشتانە بەئارەقی ناوچاوانی خۆیان پەیدای ئەکەن .

پاش ئەوەی خوای مەزن باسی ئەو دووڕووانــەی کـرد کـەتاوانجیان ئەگرتـە پێغەمـەر ﴿ ﷺ ﴾ لـەبەشکردنی زەکاتا بەوشتەی ئارەزوی هـەبیٚ بیـدا بەهەرکەسـیٚ و بەوکەسـانەی نادا خۆشـی نـەوێن، بەخزمـەکانی خـۆی ئەبەخشـیٚ و زۆریـش بـۆ خـۆی هەڵئـەگریٚ، ئەوکەسانەیش داوایان ئەکرد لـەبەشی خۆیان زۆرتریان بدریٚتیٚ، لـەدوای ئەوانە خوا ڕونـی ئەکاتەوە ئەوتاقمەی زەکاتیان ئەدریٚتیٚ هەتا ئەو دووڕووان تێبگەن کەبەشـکردنی زەکـات بە گوێرەی فەرمودەی خوایە. نەك بەگوێرەی ویستی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾، باسیشی ئەفەرمویٚ ئەو تاقمانەی زەکاتیان ئەدریٚتیٚ هەشت تاقمن، وەك ئەفەرمویٚ :

إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦٠﴾

لـەم ئایەتەی سەرەوەدا خوای مەزن باسی بەشەکانی خوای کـردوە کـەپێی ئـەوترێت: زەکات یا سەدەقە. پێشەکی ئەبیٚ بزانین سەدەقە بریتی‌یـە لـەوشـتانە ئـادەمیزاد لـەدارایی خۆیان دەری ئەکەن و لـەبەر فەرمودەی خوا ئەیبەخشن بۆ ئەوەی نزیك ببنەوە لـەبـەزەیی خـوا، سـەدەقە دووجـۆرە: (١) پێـی ئـەووترێت سـەدەقەی سـونەت، واتـە بەخشـینی چاکەیەپێویست نەکراوە لـەسەر ئادەمیزاد. (٢) پێـی ئـەووترێت زەکـات، خـوای مـەزن پێویستی کردوە لـەسەر ئادەمیزاد بـەگوێرەی ئەندازەیـەکی دیـاری کراولـەلایـەن یاسـای

ئایینـەوە کـە موسـڵمانان لـەدارایی خۆیـان دەری بکـەن و بیـدەن بـەو تاقمانـەی خـوا لەوئایەتەدا باسی کردون کەئەفەرموێ :

١- ﴿ إنَمأ الصَدَقْاتُ لِلْفُقَراءِ ﴾ بەڕاستی وبەبێ گومان زەکاتــەکان بـۆ ئەوکەسـانەیە هەژارن نەدارایی ونەکارێکی وایان نەبێ پێی بژین خۆیان وئەوکەسانەی پێویستە بـەخێویان بکاو پێی بژین. یانێ ئەوکەسانەن پێویستیان بە (١٠) دینار هەیە ڕۆژانە پێی بژین، بــەڵام ئەوان هیچیان نەبێ یا کەمتر لەپێنچ دیناریان ببــێ، ئیــتر داوای زەکـات بکـەن یانەیکـەن یاشلـەپەتەیش نەبن .

٢- ﴿ وَالَمساكِينِ ﴾ وەبۆ بیمارەکانە: ئەو کەسانەن دارایی و کــاری شـایانیان هەیـە. بەڵام بەشیان ناکا، یانێ، پێویستیان بە (١٠) دینــار هەیـە بـۆ ژیـانی ڕۆژانـەی خۆیـان و خێزانەکانیان. بەڵام ناگاتە ئەندازەیە بەشیان بکا .

بۆ زانین: ئەوکەسانەی خزمێ یامێرد پێویستە بەخێویان بکەن و بەخێویشیان ئەکەن، یـا بۆیە بیمارو هەژاران خەریکی پەرسـتنی سـونەتن، ئەوکەسـانە زەکاتیـان نـادرێتێ. بـەڵام قوتابی ئـایینی لـەبەرئـەوەی خـەریکی کـارێکن کەسـودی موسـڵمانانی تێدایـە بەگشـتی زەکاتیان ئەدرێتێ. خزمەتکارو خانو و بەرگ و نامەی پێویستی نابنە هــۆی زەکـات پـێ نەدانیان. داراییە دورتر بێ لـەدوو قۆناخ و قەرزێ وادەی دانەوەی نەهاتبێ یا هەربەتەمای دانەوەی نەبێ ئەوانەیش نابنە هۆی زەکات پێنەدان و زەکاتی پێ ئەدرێ ئەوکەسە .

٣- ﴿ وَالعامِلِينَ عَلَيْها ﴾ وەبۆ ئەوکەسانەیە کارکەرن لـەسەر ســەدەقەکان، دانـراون لـەلایـەن کاربەدەسـتانی موسـڵمانانەوە بـۆ ئـەوەی بگـەڕێن بەســـەر دانیشـتواندا بــۆ کۆکردنەوەی زەکاتەکانیان، ئەوکەسانەیش زەکــات ئـەدەن و ناوی‌ئەوکەسـانە ئەنوسـن زەکات ئەدەن وزەکات وەرئەگرن .

٤- ﴿ وَالُمؤَلَفَةِ قُلُوبِهِمْ ﴾ وەبۆ ئەو کەسانە یە دڵیان کۆبکرێتەوەو دڵیان خۆش بکرێ لـەسـەر ئیسـلامەتی. یـانێ موسـڵمان بـوون و هێشـتا نیازپـاك نـین و لاوازە باوەڕیـان و نەچەسپاوە لـەدڵیانا، یاسـەرۆکی هۆزێکـن ئەوکەسـانە زەکاتیـان ئـەدرێتێ هـەتا جگـەی

ئەوانیش چاویان لێ بکەن بۆ موسڵمان بـون، بـۆ ئـەوەیش ئەوکەسـانەی زەکـات نـادەن بەئیسلام رامیان بکەن بۆ دانی زەکات بە ئیسلام .

٥- ﴿ وَفِي الرِقابِ ﴾ وەسەدەقە ئەدرێ لەئازادکردن وسەربەستی ئەوکەسانە کۆیلەن و بەندەن و ئەیانەوێ خۆیان بکرِنەوە لەگەورەکانی خۆیان، ئەوبەشەیان سوپاس بـۆ خـوا لەم سەردەمەی ئێمەدا نەماون وئەگەر مابیشن زۆرکەمن و لەکوردستاندا نین .

٦- ﴿ وَالغارِمِينَ ﴾ وەبۆ ئەوکەسانەیە قەرزارن و ناتوانن قەرزەکانیان بدەنەوە، هـۆی قەرزاریان شتێکی رەوا بوبێ یانارەوا بوبێ و بەراستی پەشیمان بونەتەوە، یاقـەرزار بوبـون بەهۆی ئاشت کردنەوەی دووتاقمی دوژمنی یەکتری، یابوبێ بەتەنخوای کەسێ ( کفیل ) ، ئەوبەشانە زەکاتیان پی‌ئەدرێ بەگوێرەی پیویستی خۆیان .

٧- ﴿ وَفِي سَبيلِ اللهِ ﴾ وەسەدەقە ئەبەخشرێ لەرێگــەی ئـایینی خـوادا بـۆ کەسـانێ جەنگ بکەن بەخۆرِایی لەبەر بەرزی ئـایین، باسامانداریشـبن. هـەندێ لـەزانایان ئـەڵێن: ئەدرێ بەهەمو شتێ خوای مـەزن لای پەسـەند بـێ: وەك دروسـت کردنـی مزگـەوت و قوتابخانەی ئایینی و جگەی ئایینی کەسودی موسڵمانانی تێدابـێ و بـۆ دروسـت کردنـی پردو خەستەخانەو کرینی چەك و چاك کردنی رێگەوبان و جگەی ئەوانیش .

٨- ﴿ وَابْنَ السَبيلِ ﴾ وەبۆ ئەوکەسـانەیە جـێ مـاون لـەکاروان و دەسـتیان ناگاتـە نیشتمانی خۆیان، ئەوکەسـانە زەکاتیـان ئـەدرێتێ بەئەندازەیـە بیـان گەیـەنێ بەنیشـتمانی خۆیان، کاروانەکەیش بۆ گوناه نەبوبێ، ئیتر بۆ هەرشتێ بوبێ .

﴿ فَرِيْضَةً مِنَ اللهِ وَاللهُ عَلِيْمٌ حَكِيمٌ ﴾ وەئەو سەدەقانە خوا پێویستی کـردون و دیـاری کراون لەلایەن خواوە، بۆ ئەوەی بدرێ بەو هەشت تاقمانـە و، خـوا ئـەزانی بەپێویسـتی بونەوەران، هەموشتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائـەنێ لـەوەرگرتنی زەکـات و بەخشـینی زەکات بەوتاقمانە .

لەباسـی مانـای ئایـەتی ( ١١٠ ) ی سـورەتی ئەلبەقـەرەدا باسـی سـودی زەکـات و ئەوشـتانەی زەکاتیـان تێـدا پێویسـت کـراوەو ئەوکەسـانەی زەکاتیـان پـێ ئـەدرێ و

ئەوکەسانەی قەدەغەیە زەکاتیان بدرێتێ، بەهەموو مەرجەکانیانەوە بـەدرێژو شـی کراوەیی ڕون کراوەتەوە .

کۆمەڵێ لەدوورڕوەکان گفتوگۆی ناشایستەیان دەربارەی پێغەمەر کـردو ئـەیان ووت: موحەمەد گوێچکەی هەیە هەموو شتێ ئەبیستێ ڕاستبێ یـادرۆ، هـەندێکیان ئـەیان ووت: گفتوگۆی وامەکەن ئەترسین بگەنە موحەمـەدو توشـی ئازارمانبکـات. جەلاسـی کـوڕی سوەید ووتی: هـەر شـتێ ئارەزومـان هـەبێ ئـەیڵێین و دوایـی ئـەچین بـۆلای موحەمـەد وسوێندی بۆ ئەخۆین کەگفتوگۆی خراپمان نەووتوە، بۆ ڕوون کردنەوەی ئەوکارە خـوای مەزن ئەفەرموێ:

پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ کردەوەی لەگـەڵ ئـادەمیزادا بـەگوێرەی ڕوواڵـەت بـووە، لەنـهێنی وپەنهانی ئەوان نەکۆڵاوەتەوە، نهێنی ئەوانی هەاوڵـەی خـوا کـردوە، ئـەوکارە شـیرینەی پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ بـوە بـە دەسـتوری موسـڵمانان، ئـەوکردەوە چاکـەی پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ دووڕووان کردیـان بەهـەل بـــۆ خۆیـان بۆیـە تـاوانجی زۆریـان ئەگرتـە پێغەمـــەرو ﴿ ﷺ﴾،لەدواییدا بیانویان بۆ ئەهێنایەوە، پێغەمەر لەوانی وەرئەگرت، بۆ دەرخسـتنی ئـەو کردەوانە خوا ئەفەرموێ :

وَمِنْهُمُ الَّذِينَ يُؤْذُونَ النَّبِيَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَقُّ

أَن يُرْضُوهُ إِن كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّهُۥ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدًا فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْخِزْىُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٣﴾

﴿ وَمِنْهُمْ الذيْنَ يُؤْذُونَ النَّبيَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أذنٌ ﴾ وەهـــەندیٚ لـەو دووڕوانـەی ئـەوتۆ ئازاری پێغەمەر ئەدەن و ئەڵێن: پێغەمەر مرۆڤێکـــە گفتوگـۆ ئەبیسـیٚ و هـەرچی ببێـژریٚ بڕوای پیٚئەکا، بەبیٚ ئەوەی ووردببێتەوە لـەهیچ شتیٚ هەتا چاك و خراپ جویٚ بکاتەوە بۆ وەرگرتنی باوەڕ وبیٚباوەڕی .

﴿ قُلْ هُوَ اُذنُ خَيْرٌ لَكُمْ ﴾ تۆ بڵیٚ: موحەمەد پیاوێکە چاکە ئەبیسـیٚ، خراپـە نابیسـیٚ، وەرئەگریٚ لـەئێوە شتیٚ زیانی ئادەمیزادی تێدا نەبیٚ، ئـەوەی زیـانی ئـەوانی تێدابـیٚ وەری ناگریٚ موحەمەد.

﴿ يُؤمِنُ بِاللهِ وَيُؤمِنُ لِلْمُؤْمِنِيْنَ ﴾ بڕوای بــەخوا هەیـە هەرشـتیٚ بفـەرمویٚ و و بـڕوای بەچاکەهەیە بۆ سودی بـاوەڕدارانو گفتوگـۆی ئـەوان وەرئـەگریٚ بـەهۆی نیـازی پـاکی خۆیانەوە، بەلاٚم لـەدوو ڕووان ئەوشتەی سودی نەبیٚ وەری ناگریٚ، دوایـی پێغەمـەر شـتیٚ ئەبیسیٚ زیانی کەسی تێدانەبیٚ .

﴿ وَرَحْمَةَ لِلْذِيْنَ آمَنُوا مِنكُمْ ﴾ وەپێغەمەر بەختیاری و دیاری‌یە بۆ کەسانی‌یکی ئـەوتۆ باوەڕیان هێناوە لـەئێوە، چونکە هەر ئەوان ڕێگەی ڕاستیان وەرگرتـوە بـەهۆی پێغەمـەر و پاڕانەوەی پێغەمەر بوە .

﴿ وَالذِيْنَ يُؤْذُونَ رَسُولَ اللهِ لَهُمْ عَذابٌ ألِيْمٌ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ ئازاری فروسـتادەی خوائەدەن بۆئەوان هەیە سزایەکی خاوەن ئازار لـەڕۆژی دواییدا ولـەجیهاندا.

﴿ يَحْلِفُونَ بِاللهِ لَكُـمْ لِيَرْضُوئَكُمْ وَاللهُ وَرَسُـولُهُ أحَقُّ أنْ يُرْضُـوهُ إنْ كـانُوا مُؤمِنِـينَ ﴾ وەئەوکەسانە سوێند ئەخۆن بەخواو بۆ ئێوەی موسڵمان ئەوشتەی گەیشتوە بـەئێوە پوچـە لـەبەرئەوەی ئێوە ڕازی بکەن و دڵتان بدەنەوە هەتا ئێوە ئازاریان نەدەن، و خوا و نـێراوی

خوا شایستە وچاکترن کەیەکەبەیەکەی ئــەوان ڕازی بکــەن بەپەرستنی خــواو پەشیمان بونەوەیان بەنیازی پاك و گوێ ڕایەڵی پێغەمەربن، ئەگەر ئەوان باوەڕبهێنن بەڕاستی .

﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّهُ مَنْ يُحادِدِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَأَنَّ لَهُ نارَجَهَنَّمَ خالِداً فيها ذٰلِكَ الخزي العَظِيمُ ﴾ ئایا بێ باوەڕان و دووڕووان نەیانزانیوە کەبەڕاستی هەرکەسێ دژایەتی و بێ فــەرمانی خــوا و نێراوی خوا بکات بەڕاستی دوایی بۆ ئــەو کەســە هەیــە ئــاگری دۆزەخ بەردەوامەلــەناو دۆزەخدا، ئەو بەردەوامیەی‌لەئاگردا ڕسوایی و بێ ئابڕوی گەورەیە .

کاتێ پێغەمەر ئەچو بۆ جەنگی تەبوك، تاقمێ لەبێ بــاوەڕان لەخزمــەتیا بــوو ن لــەنێو خۆیانا بەگاڵتەوە ئەیان ووت: سەیری ئەو پیاوەبکەن ئەیــەوێ کۆشــك و قــەڵاکانی شــام بگرێ. دوایی پێغەمەر فەرموی: ئەو تاقمەم بۆ ڕاوەستێنن، هاتنە خزمەت پێغەمــەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرموی: ئایا ئێــوە ئەوشتانەتان ووتــوە؟ وتیــان ئــەی فروســتادەی خــوا: ســوێند بــەخوا لەبارەی تۆو هاوڕیکانتەوە هیچ شتێکی خراپمــان نــەووتوە، لــەنێوان خۆمــاندا باســی ئــەم لەشکرەمان کــردوە هــەتا ڕێگــەمان کــورت بکەینــەوە بــە گفتوگــۆ کردنــەوە. بــۆ ڕوونکردنەوەی ئەومەبەستە خوا فەرموی :

يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ قُلِ اسْتَهْزِئُوا إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾

﴿يَحْذَرُ الْمنافِقُونَ أنْ تُنزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورةٌ تُنَبِّئُهُمْ بِما فِي قُلُوبِهِمْ ﴾ دوورِووەکان ئەترسن کەبهێنرێتە خوارەوە لـەلایەن بیٚ باوەڕیانەوە سورەتیٚ لـەقورئان ئەوسورەتە هەواڵ بـدا بـەو دووڕوانەو دەربخا شتیٚ لـەدڵیانایە لـەکینەو دوژمنایەتی بۆ موسـڵمانان. هـەندیٚ لـەزانایان ئەڵێن: ڕاناوەکانی (عَلَيهِمْ، تُنَبئهُمْ، قُلُوبِـهِمْ ) هـەمویان ئەگەڕێنـەوە بـۆلای بـاوەڕداران .هەندیٚ تریان لایان وایـە ڕانـاوی ( عَلَيْـهِمْ، تُنَبئـهِمْ ) ئەگەڕێتـەوە بـۆلای بـاوەڕداران . ڕانـاوی ( فِي قُلُوبِـهِمْ ) ئەگەڕێتـەوە بـۆلای دوڕووان. لـەبەرئـەوەی باسـی بـاوەڕداران لـەوئایەتەدا نەکراوە واشایستەیە ڕاناوەکانهەمویان بگەڕێنەوە بـۆ لای دووڕووان،خوایـش لـەهەموکەسیٚ زاناترە .

﴿ قُلْ اسْتَهْزِؤُا إنَ اللهُ مخرجٌ مـا تَحْـذَرُونَ ﴾ تـۆ بڵـێ: ئێـوەی دووڕوو گاڵتـە بکـەن بەباوەڕداران بەڕاستی خوا دەرئەخا شتیٚ ئێوە ئەترسن ئاشکرابیٚ لـــەدەروەنتانا. بـەجۆریٚ ئەترسان یەکیٚ لـەوان ووتبوی: من خۆم پێشکەش ئەکەم سەدتا زیانەم لیٚ بدەن. بەلاٚم شتیٚ نەیەتە خوارەوە ئابڕومان ببا.

هەندیٚ لـەبیٚباوەڕان گفتوگـۆی ناشایسـتەیان ئـەووت لـەبارەی پێغەمـەرەوە ﴿ ﷺ﴾، تاوانجیان ئەگرتە قورئانو باوەڕداران.خوا فەرموی:

﴿ وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إنَمْا كُنا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ﴾ وەئەگەر تۆ پرسیارت بکردایـــە لـــەو دووڕووانە چ شتێکیانت ووتوە لەبارەی ئێمەوە ؟ سوێند ئەخۆن و ئەڵێن: بەڕاسـتی ئێمـە لـەبارەی لـەشکرو سوارەکانەو ەگفتوگۆمان کردووەو چوینەتە ناوباسێکەوە بۆئەوەی ئێمە ڕابوێرین و ماوەکەمان کورت بکەینەوەو جگە لـەوە هیچ شتیٚ ترمان نەوتوە .

﴿ قُـلْ أبِـاللهِ وَآياتِـهِ وَرَسُـولِهِ كُنْتُـمْ تَسْـتَهزِؤُونَ ﴾ تۆبڵـێ: ئایـا ئێـــوە گاڵتەئەکـــەن بەفەرمانەکانی و بەئایەتەکانی نامەی خواو بەنێراوی خوا، بەڕاسـتی بیـانو هێنانـەوەکانتان خراپترە لـەوگوناهانەی کردوتانەو بیانوی بۆ ئەهێننەوە. ئایا خواو ئایەتەکانی نامــەی خـوا ونێراوی دەستکەلای ئێـوەن هـەتا بـەوانرابوێرن ؟ موحەمـەد تـۆ گرنگـی بەخراپـەگرتنی بیٚباوەڕان مەدە. ئەوئایەتە بەڵگــەی ڕونـە لـەسـەر ئـەوەی هەرکەسـیٚ گاڵتـە بـەئایین و فەرمودەی خواو پێغەمەربکا لـەڕیزی بیٚباوەڕاندا ئەژمێریٚ. ئەوەتە خوا ئەفەرمویٚ:

﴿ لاتَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمانِكُمْ ﴾ ئێو ەبیانو مەهێننەوە، چونكە بیانوەكانتان درۆی ڕووتە. بەڕاستی ئێوە بێباوەڕی خۆتانتان دەربـڕی لـەپاش ئـەوەی باوەڕهینانتـان ئاشكرا كرد.

پرسیار/ ئەوڕستەیە وائەگەیەنێ ئەوكەسانە خاوەن باوەڕبوون بەرلـەوگاڵتە كردنـەیان، یان بەو گاڵتەكردن ەبێباوەڕبون ؟

وەلاّم/ ئەوكەسـانە لـەناوەڕۆكا بەرلـەگاڵتەكردنەكەیشـیان هــەربێباوەڕبون بــەلاّم لـەبەرئەوەی باوەڕیـان دەربـڕی وەك موسـڵمان تەماشـائەكران لـەبارەی كـارو فـەرمانی جیهانەوە، لـەپاش ئەوەی بێباوەڕیان دەربڕی بەهۆی گاڵتەكردنیان بــەخواو بەئایەتـەكانی خـواو فروسـتادەی خـوا تەماشـاكران وەك بـێ بـاوەڕان لـەبارەی كاروبــاری جیــهان ولـەپاشەڕۆژیشەوە.

﴿ إِنْ نَعْفُ عَنْ طائِفَةٍ مِنْكُمْ ﴾ ئەگەر ئێمە ببوریـن لـەتاقمێ لـەئێوە بـەهۆی پەشـیمان بوتەوەتان بەپاكی یا لـەبەرئەوەی بیانوتان لێ وەرئـەگیرێ كـە بلێـین: ئێمـە لاوازبوویـن و سەرۆكەكان زرۆیان لێ كردووین ئەگینا لـەدڵدا باوەڕداربووین .

﴿ نُعذِبُ طائِفَةً مِنْكُمْ بِأَنَّهُمْ كانُوا مُجْرِمِينَ ﴾ ئێمە سزای تاقمێتر لـەئێوەئەدەین بـەهۆی ئـەوەوە كەبەڕاسـتی ئـەوان تاوانبـاربوون و بـەردەوامن لـەسـەر بێبـاوەڕی وســەرۆكی دووڕووانبوون .

لـەپاشا خوای مەزن باسی كارو كردەوەی بێباوەڕان ئەكا لــەنێو خۆیانـا و لـەشێوەی هەڵسان و دانیشتنیان لـەگەڵ یــەكتریو یارمــەتی دانیـان بـۆ یـەكتری لـەكاری پـوچ و نارەوادا و ئەفەرموێ:

ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍۢ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ۚ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ

إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ هِىَ حَسْبُهُمْ ۚ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٦٨﴾ كَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنكُمْ قُوَّةً وَأَكْثَرَ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا فَٱسْتَمْتَعُوا۟ بِخَلَٰقِهِمْ فَٱسْتَمْتَعْتُم بِخَلَٰقِكُمْ كَمَا ٱسْتَمْتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُم بِخَلَٰقِهِمْ وَخُضْتُمْ كَٱلَّذِى خَاضُوٓا۟ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمْ يَأْتِهِمْ نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَقَوْمِ إِبْرَٰهِيمَ وَأَصْحَٰبِ مَدْيَنَ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتِ ۚ أَتَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٧٠﴾

**﴿ الْمُنـافِقُونَ وَالْمُنافِقـاتُ بَعْضُـهُمْ مِـنْ بَعْـضٍ ﴾** پیاوانی دووڕوو وژنـــانی دووڕوو هــەندێکیان لەهــەندێ تریـــانن لـــەدووڕوی و لـــەدووریان لـــەباوەڕهێناندا بەوێنــەی تاکەکەسێکن ، شێوەو کردەوەیان یەکسانن لەدواییدا خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە جۆرێ یەکسانیان وکارە خراپەکانیان و ئەفەرموێ:

﴿ يَأمُرُونَ بِالْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ﴾ ئـەو دووڕووانـە بـەپیاو وبەژنیانەوە فەرمان ئەدەن بـەكاری خـراپ و زۆرشـت و بێبـاوەڕیو بەدرۆخستنەوەی پێغەمەر و ﴿ ﷺ﴾ قەدەغەئەكەن لـەكاری چاكەو لـەخواپەرستی و فەرمانبەرداری پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ و دەستی خۆیان ئەقوچێنن و ئەیان گرن و ڕژدن و نایكەنەوە بۆ بەخشینی دارایـی خۆیان لـەڕێگەی ئایینی خوادا و لـەدەست گیرۆدەیی هەژاران دەستیان بەرزناكەنـەوە بـۆ پارانەوە لـەخوا .

﴿ نَسُوا اللهَ فَنَسِيَهُمْ ﴾ ئەو دووڕووانە خوایان لـەبیر خۆیـان بردوەتـەوە و نایپەرستن، دوایـی خـوا واز لـەوان ئـەهێنێ و بەچاوی‌بـەزەیی و میهرەبانیـەوە تەماشـایان ناكـا و ئەفەرموێ:

﴿ إنَّ الْمُنافِقِيْنَ هُمُ الفاسِقُونَ ﴾ بەڕاستی دووڕووەكان هەرئەوانن دەرچـوون لـەسنور وبازنەی باوەڕهێنان وڕێگەی شەیتان و بێباوەڕیان گرتوە .

﴿ وَعَدَ اللهُ الْمُنافِقِيْنَ وَالْمُنافِقاتُ وَالكُفّارَ نارَ جَـهَنَّم خـالِدِينَ فِيهـا هِـيَ حَسْبُهُمْ ﴾ خـوا بەڵێنی داوە بە پیـاوانی دووڕوو و ژنـانی دووڕوو بـەبێباوەڕان بـەئاگری دۆزەخ ئەگـەر بەردەوامبن لـەسەر كاری خراپی خۆیان و بەردەوام ئەبن لە نێـو ئـاگری دۆزەخـدا ،ئـەو ئاگرەی دۆزەخ بەسە بۆ سزادانی ئەوان .

﴿ وَلَعَنَهُمُ اللهُ وَلَهُمْ عَذابٌ مُقِيمٌ ﴾ وەخوا ئەو دووڕووانەی دورخستوەتەوە لـەبـەزەیی ومیهرەبانی خۆی و لـەخۆشی بەهەشت و، بۆ دووڕووان هەیە سزای بێپایـان و بـەردەوام وگران .

لـەپاشا خوای مەزن ڕوئەكاتـە بێبـاوەڕان بەگشـتی و ئەفـەرموێ : ئێـوە وێنـەی ئـەم بێباوەڕانە خوار وەن .

﴿ كَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ كانُوا أشَدَّ مِنكُمْ قُوةً وَأكثَرَ أمْـوالاً وَّ أوْلاداً﴾ خـوا بـەڵێنی داوە بەو دووڕووانە بەوێنەی بەڵێنێ دابوی بەكەسانێكی ئەوتۆ لـەپێش ئێـوەوە بـون لـەگـەلانی ڕابوردوادا ئەوان توندترو سـەختتر بـوون لـەئێوە لـەبارەی هـێزو لـەشیانەوە ، داراییـان زۆرتربوە لـەئێوەو منالیشبان زۆرتربووە .

﴿ فَاسْتَمْتَعُوا بِخَلاقِهِمْ ﴾ دوایی ئەوکەسانەی پێشو ڕایان ئەوبواردو بەهرەمـەند بـوون بە بەشی خۆیان لـەجیهاندا بەهۆی هێزو دارایی خۆیانەوەو وازیان لـەپاشەڕۆژ هێنابوو .

﴿ فَاسْتَمْتَعُوا بِخَلاقِكُـمْ كَمَـا اسْتَمْتَـعَ الذِيْـنَ مِـنْ قَبْلِكُـمْ ﴾ دوایـی ئێـوەش ڕابوێـرن وبەهرەمەندبن بەبەشی خۆتان لـەم جیهانەدا بەخۆشیو بەوێنەی کەسـانێکی ئـەوتۆ ڕایـان ئەبوارد بەخۆشی لـەپێش ئێوەوەبون .

﴿ وَخُضْتُمْ كَالَّذِي خَاضُوا أُولَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمالُهُمْ ﴾ وەئێوەخۆتانتـان فڕەداوەتـە نێـو کاری پوچەوە بەوێنەی کەسـانێکی ئـەوتۆ چوبونـە نێوکـاری پوچـەوە لـەپێش ئێـوەوە ، ئەوتاقمانە پاداشتی کارەکانیان پوچ بوەتەوە لەهەردووجیـهاندا ، لـەجیـهاندا نرخیـان بـۆ دانانرێ لای مرۆڤێ خاوەن بیرو هۆش ، لـەپاشـەڕۆژدا لـەکیسـیان چـوە پاداشـتی ئـارقی ماندوبوونیان کە ئەو هەموە سامانەیان پێکەوە نابو .

﴿ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْخاسِرُونَ ﴾ وەئەوتاقمانە هــەر ئەوکەسـانەن زیانۆمـەندن لـەهـەردوو جیهاندا،چونکە خۆیانیان ماندوکردبو بەئازارداني باوەڕدارانەوە لـەجیهانداو بەپـەیداکردنی سامانەوە، لـەپاشەڕۆژدا ئەو ئازاردانە و ئەودارایيە ئازارەکـەی گەڕایـەوە بـۆ سـەرخۆیان هەروەك لـەجیهاندا توشی ئازار بوبون .

مەبەست لـەوئایەتانەی پێشوو بۆ ئەوەیە کە دووڕووەکانی سـەردەمی پێغەمـەر و ئـەو بێباوەڕنەیش لـەمەوپاش دێن واز لـەبێباوەڕیو دووڕویـی نایـەرن، بەگـەلانی پێشـەوەی خۆیان تەمێ خوار نابن، خوای مەزن وەبیریان ئەخاتەوەو ئەفەرموێ:

﴿ أَلَمْ يَأْتِهِمْ نَبَأُ الذِيْـنَ مِـنْ قَبْلِـهِمْ ﴾ ئایـا نـەهاتوە بـۆ لای ئـەو دووڕووانـە هـەواڵی بەسەرهاتی کەسانێکی ئەوتۆ لـەپێش ئەوانەوەبوون کەبەخۆشی سـامانی جیـهان لـەخۆیان بایی بوبون ئەنجامەکانیان نەمان و لـەناوچونبون.

﴿ قَوْمِ نُوحٍ وَعادٍ وَثَمُودَ وَقَوْمِ إِبْراهِيمَ وَأَصْحابِ مَدْيَنَ وَالْمُؤْتَفِكاتِ ﴾ کەبریتی بون لـە گەلی نوح بەلافاو خنکان و گەلی عادبەبای سەختی ناهەموار لـەناوچون و گـەلی سـەمود بەبومەلـەرزە و دەنگی گەور و تیژ لـە ناوچون و گەلی ئیبراهیم بەسـزای زۆر گـیرۆدەبونو

نەمرودی بەمێشولـە لـەناوبرد و دانیشتوانی مەدیەنی گەلی شـوعەیبی بنـەبڕکرد بـەئاگری بومەلـەرزەو دانیشتوانی گوندەکان وشارەکانی‌لوتی بنەبڕکرد بـەبارینی بـەرد بەسـەریانا و شوێنەکانیان ژێراو ژووربون ( والمؤتنكات ) بەمانا ژێراو ژوربوونـە ، ئەوگەلـە ژێـراوژور بوو شوێنەکانیان .

﴿ أَتَتْـهُمْ رُسُـلُهُمْ بِالبَيِّنـاتِ ﴾ چوبـوون بـۆلای ئەوگەلانـە پێغەمـەروکانی خۆیانیــان بەچەندین بەڵگەو نیشانەی ڕون وئاشکرا و بەکاری پـەك خـەرەوە کـەچی باوەڕیـان پـێ نەهێنان و لـەئەنجامدا خوا بنەبڕی کردن .

﴿ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾ دوایی خـودا لـەوان ستەم ناکا بەبێ‌تاوان سزای ئەوان بدا ،بەڵام خۆیان ستەمیان لـەخۆیان کرد بەهۆی بێ‌بـاوەڕی و بەدرۆخستنەوەی پێغەمەرەکانیان کرداری پیسی خۆیانەوە سزایان درا.

کاتێ خوای مەزن باســی دووڕوەکـانی کـرد بـەو هـەموە کـرداره خراپانـەوە باسـی باوڕدارانیش ئەکا بەدژی کرداری ئەوانەوە بەهەموکردەوە چاکەکانیانەوەو ئەفەرموێ:

وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٧١﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٧٢﴾

﴿ وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِناتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِياءُ بَعْضٍ ﴾ وەپیاوانی باوەڕدارو ژنـانی بـاوەڕدار هـەندێكیان دۆسـت و بەڕێوەبـەری كـاری یـەكترین، ئەوڕسـتەیە فێرمـان دەكـات هەركەسیٚ خۆی بەباوەڕدار بزانیٚ ویاریدەی برای خۆی نەدا بەدووڕوو ئەژمێریٚ .

﴿ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنْكَرِ ﴾ وەئەو باوەڕدارانە فـەرمان ئـەدەن بەچاكـەو بـەباوەڕو بەفەرمانبـەرداری خـواو بەقەدەغـە كردنـی خراپـە و بیٚبـاوەڕی و دژایـەتی باوەڕداران .

﴿ وَيَقِيمُونَ الصَلاةَ وَيُؤتُونَ الزَكاةَ وَيُطيْعُونَ اللهَ وَرَسُـولَهُ ﴾ وەنوێژەكانیـان ئەكـەن و بـەرپایان ئەكـەن و زەكاتـەكانیان ئەبەخشـن بەوتاقمانـەی خـوا دیـاری كـردوون، وەفەرمانبەرداری خواو نێراوی خوائەكەن لـەهەموو فەرمانەكانیانا.

﴿ أولئِـكَ سَيَرْحَمُهُمْ اللهُ إِنْ اللهَ عَزِيـزٌ حَكِيـمٌ ﴾ ئـەو باوەڕدارانـە بـەهۆی كردنـی ئەوشتانەوە خوا میهرەبانیان لـەگەڵ ئەكا بەبیٚگومان. بـەدژی بیٚبـاوەڕانو دوڕووەكانـەوە خوا میهرەبانیان لـەگەڵ ناكا. بەڕاستی خوا خـاوەنی توانـای زۆرە، هەموشـتیٚ لـەجیگـەی شیاوی خۆیا دائەنیٚ .

﴿ وَعَدَ اللهُ الْمُؤمِنِينَ وَالْمُؤمِناتِ جَناتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِها الآنْـهارُ خـالِدِيْنَ فِيـها ﴾ خـوا بەڵێنی داوە بەپیاوانی باوەڕدارو ژنانی باوەڕدار بەچەندین بەهەشت وبێستان ئەچیٚ بـەژێر درەختەكانیانا و بەملاو لای كۆشـكەكانیان چـەندین ڕوبـاری ئـاوی شـیرین و پوختـە، بەردەوامن لـەوبەهەشتانەداو كاتیکی دەرچونیان بۆ نیە .

﴿ وَمَساكِنَ طَيْبَةً فِي جَناتِ عَدْنٍ ﴾ وەبـەڵێنی پیٚـداون بەچـەندین جێگـەی دانیشـتنی خۆش و پاك لـەوبەهەشتە بەرین و بەردەوامانەدا لـەپاشەڕۆژدا بۆ حەسانەوەیان .

﴿ وَرِضْوانٌ مِنَ اللهِ أَكْبَرُ ذلِـكَ هُـوَ الفَـوْزُ العَظِيـمُ ﴾ وەخۆشەویسـتی و ڕەزامـەندی لـەلایەن خواوە بۆ باوەڕداران گەورەترە لـەبەهەشت و لـەخۆشی بەهەشت و لـەهەموشـتی تر، خۆشەویستیەكە باسی ناكریٚ لـەگەورەییدا، ئەوبەهەشت وجێگەپاكانەو خۆشەویسـتی خوایە بۆ ئەوان سەركەوتنوپیرۆزیەكی گەورەیە، بەتایبەتی ڕەزامەندی خوا بەرانبەر بـەهیچ شتیٚنیە .

لەپاشا خـوای مـەزن فـەرمان ئـەدا بەكۆشـش و جـەنگ كـردن لـەگـەڵ بێباوەڕان ودووڕوانداو ئەفەرموێ:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَـٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٣﴾ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَـٰمِهِمْ وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟ ۚ وَمَا نَقَمُوٓا۟ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦ ۚ فَإِن يَتُوبُوا۟ يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ ۖ وَإِن يَتَوَلَّوْا۟ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ وَمَا لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٧٤﴾

﴿ياأيُها النَّبيَ جاهِدْ الكُفارَ والمُنافِقِيْنَ وَأغلَظْ عَلَيْهِمْ وَمَأواهَمْ جَهَنَمَ وَبِئسَ المَصيْرَ﴾ ئـەی پێغەمەر: تۆ جەنگ بكـە لـەگـەڵ بێباوەڕان ودووڕوان و خـۆت مـاندو بكـە لـەگـەڵيان بەهەموچەكێكەوە بـۆ پاراسـتنی سنور ویاسـای خـواو، تـۆ لـەگـەڵیان زبروتیـژ بـە، تـۆ لەمەوپاش نەرمی بەكارمەهێنە لـەگەڵیاندا كاتێ تاوانج ئەگرنـە تـۆو قورئـان و، جێگـەی ئەوان دۆزەخەو خراپ جێگەیەكە بۆ گەڕانەوەیان .

زۆربەی زانایان ئەڵێن: پێغەمەری خوا لـەتەبوك گەڕایەوە بۆ ماوەی دوومـانگ ئایـەتی قورئان لـەدژی ئەو دووڕووانە نەهاتە خوارەوە نەچوبون بۆ جـەنگی تـەبوك، یـەكێ لـەو دووڕوانە كەناوی جەلاسی كوڕی سوەید بو ووتی: ئەگەر ئەوشـتەی موحەمـەد ئـەیلێت ڕاستبێ گوێ درێژێ كەئێمە سواری ئەبین چاكترە لـەئێمە، دوایی عامیری كـوڕی قـەیس

ووتی بەجەلاس: موحەمەد ڕاست ئەکاو تۆ خراپتری لەگوێ دریژی. ئەو ڕوداوە گەیشت بەپێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾. پێغەمەر بانگی جەلاسی کردو سوێندی خوارد بەخوا مـن نـەم ووتـوە، عامر دەستی بەرزکردەوەو ووتی: ئەی خوایە: بنێرە خوار بۆ سەر پێغەمەری خـۆت شـتێ ڕاست وێژ و درۆزن جویێ بکاتەوە، خوای مەزن فەرموی:

﴿ يَحْلِفُونَ بِاللهِ ماقالُوا وَلَقَدْ قالُوا كَلِمَةَ الكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إسْلامِهِمْ ﴾ ئەو دووڕووانـە سـوێند ئـەخۆن بـەخواو بـەدرۆ ئەوشـتەیان نـەووتوە، لەپاشـا خوایـش سـوێند ئـەخوا کەئەوشتەیان ووتوە: ئەفەرموێ: بەڕاستی ئەو دووڕووانە ووشەی بـێ باوەڕیـان ووتـووە لـەتاوانج و دوودڵـی پێغەمـەرو، بێبـاوەڕبوون دوای دەربڕینـی ئیسـلامەتی خۆیـان، بێباوەڕیان لـەدڵیاناپەنهان دابو ئێیستا ئاشکرایان کرد، بۆ ئەوەی چاکتر مانای ئەوڕسـتەیە بزانرێ تەماشای مانای ئایەتی ( ٦٦ ) ی ئەم سـورەتە بکـرێ کەپرسیارو وەڵامـێ لـەوێ ڕونکراوەتەوە .

﴿ وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنالُوا ﴾ ئەو دووڕوانە نیازی شـتێکیان کـردو بەوشـتە وبەمەبەسـتی خۆیان نەگەیشـتن . وەك ئـەوەی ویسـتیان پێغەمـەر بکـوژن یالـەمەدینـە دەری بکـەن و دووبەرەکی بلاوبکەنەوەلـەنێو هاوڕێکانی پێغەمەردا ﴿ ﷺ ﴾ خوای مەزن ئەوهەواڵـەی دا بەپێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ .

﴿ وَمَا نَقَمُـوا إلا أنْ أغنـاهُمُ اللهُ وَرَسُـولُهُ مِـنْ فَضْلِـهِ ﴾ وەئـەو دووڕوانـە هیـچ ڕقـو کینەیەکیان نەبوو لـەپێغەمەر وموسڵمانانو تاوانج و تانەیان تێنەئەگرتن مەگـەر ئەوەنـەبێ خواو نێراوی خوا ساماندارایان کردن لـەڕۆزی خـوا بەبەخشینی دەستکەوت وتـالانی بێباوەڕان. زوربەی زۆری ئەو دووڕوانە لەتەنگی گوزەراندابوون و هەژاربون بەرلـەوەی موسڵمانەتی دەربڕن، کاتێ بەدەم موسڵمانبون ئەوقەرزانەی لایانبو دایانەوەو پێغەمەر بۆی بژاردن. لـەپاداشتی ئەوچاکەیە ئەبوایە سوپاسـی خوایـان بکردایـە کـەچی ئـەوەبو نیـازی کوشتنی پێغەمەریان کرد.

﴿ فَأنْ يَتُوبُوايكُ خَيْراً لَهُمْ ﴾دوایـــی ئەگـەر ئـەوان پەشـیمان ببنـەوە لـەبێباوەڕی و دووڕوی ئەو پەشیمان بونەوەیە چاکترە بۆ ئەوانو هەموکەســێ بچێتـە نێوئـایینی ئیسـلام، ڕێگـەی چونـی زۆر ئاسـانە. بێبـاوەڕان و دووڕووان داوای هیـچ شـتێکیان لێنـاکرێ لـەپەشیمان بونەوەیاندا .

﴿ وَإنْ يَتَوَلّوا يُعَذِبْــهُمْ اللهُ عَذابَـاً أليْمـاً فِي الْدُنيـا وَالآخِـرَةِ ﴾ وەئەگـەر پشـت بکەنـە پەشیمان بونەوەو بەردەوامیش بن لـەسەر دووڕوویی، خوا سزای ئەوان ئـەدا بەسـزایەکی خاوەن ئازار لـەجیـــهاندا بەکوشـتن و دیـل کـردن و تـرس و ئـابڕوچون و لـەپاشـەڕۆژدا بەسوتانی ئاگری دۆزەخ .

﴿ وَما لَهُمْ فِي الآرْضِ مِنْ وَلِي وَلا نَصِيْرٍ﴾ وەنابێ لـەنێو زەویدا بۆ ئەوان هیــچ دۆسـتێ دەستیان بگرێ و و نابێ بۆ ئەوان هیچ یاریدەدەرێ بیانپارێزێ لـەسزای جیهان و پاشەڕۆژ. چ کەسـێ ئـەتوانێ ببـێ بەدۆسـت ویـاوێدەدەری کەسـانێ ئابڕویـان چوبـێلای هـــەمو دانیشتوان.

زۆربەی زانایان ئەگێڕنەوە سەعلەبەی کوڕی حـاتیب ووتـی بەپێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ ئـەی فروستادەی خوا: تۆ داوابکە لـەخوا داراییم پێبەخشێ، پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ فـەرموی: ئـەی سەعلـەبە: دارایی کەم سوپاسی خوای لـەسەر بکرێ چاکترە بۆ تـۆ لـەزۆری سامانێ تـۆ بەرگەی نەگری، وازی لـەپێغەمەر نەهێناو وتی: بەوکەسەی تۆی بەڕاستی نـاردوە ئەگـەر خوا داراییم بداتێ ئەیبەخشم بەهەموکەسێ مافی خۆی. لـەپاشا پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ پاڕایـەوە لـەخوا دارایی ببەخشێ، هەندێ مەڕی ڕاگرت، بەویستی خوا زۆربـون و پـەرەیان سـەند بەوێنەی گەشەکرم، هەتا وای لێهات لـەمەدینە جێگەی نەبویـەوەو لـەمەدینـە دەرچـو بـۆ شـیوێکی مەدینـە، وازی لـەنویژ هێنـاو نوێـژی بەکۆمـەڵ نەئـەکرد. پێغەمـەر پرسـیاری لـەچۆنیەتی سەعلـەبە کرد، بێژرا کەدارایی ئـەو زۆربـوەو لـەمەدینـەدا جێگـەی نابێتـەوە. پیغەمەر ﴿ ﷺ﴾ فەرموی: هاوار بۆ سەعلـەبە. لـەپاشا پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ دووکەسی نـارد بـۆ وەرگرتنی زەکات، چونو داوای زەکاتیان لێکرد، ئەویش ووتی: ئـەوە وێنـەی سـەرانەیە،

بگەڕێنەوە هەتا بیری لێ ئەکەمەوە، دووبـارە کەچونـەوەبۆلای پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ دووجـار فەرموی: هاوار بۆ سەعلەبە. لەپاشا خوای مەزن ئەم ئایەتەی نارده خـوارەوە، سـەعلەبە هاتە خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ زەکاتەکەی لێ وەربگرێ. پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ فـەرمووی: خـوا قەدەغەی لـەمن کردوە کەزەکاتِ لـەتۆ وەربگرم، سەعلەبە دەسـتی کـرد بـەخۆڵ کـردن بەسەرخۆیا، پاش کۆچی دوایی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ چووە لای ئەبوبەکر و عومەر وعوسمـان یەك لـەدوای یەك هیچیان لێ وەرنەگرت، بۆ ڕون کردنەوەی ئەو ڕوداوە خوا فەرموی:

وَمِنْهُم مَّنْ عَٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٧٦﴾ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿٧٧﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٧٨﴾

﴿ وَمِنْهُمْ مَـنْ عـاهَدَ اللهَ لَئِـنْ آتانـا مِـنْ فَضْلِـهِ لَنَصدَقـنَ وَلنَكُونَـنَ مِـنَ الْصـالِحْيْنَ ﴾

وەهەندێك لـەو دووڕوانە کەسێ پەیمانی دابوو بەخوا ئەگەر خوا دارایی ببەخشێ بەئێمـە لـەگەورەیی خۆی و سامانی خۆی بەڕاستی ئێمە زەکات ئەبەخشین بەهەژاران و ئێمە ئەبین بەیەکێ لـەپیاو چاکان و بەفەرماندارانی خوا .

﴿ فَلَمَّا آتَاهُمْ من فَضْلِهِ بَخِلُوا بِهِ ﴾ دوایی کاتێك خـــوا دای بـەوان دارایـی و سـامان بەزۆری لەگەورەیی خۆیەوە، ئەو دووڕووانە ڕژدیان کـــرد لـەودارایيـە خــوا بەگـەورەبی خۆی بەوانی دابو، بێ فەرمانی خوایان کرد لـەبارەی زەکاتدانەوەو پەیمانی خوایان شکاند.

﴿ وَتَوَلَّوا وَهمْ مَعْرِضُونَ ﴾ وەپشتیان کردە پەرستنی خـواو بەهەموودڵیانـەوە وازیـان لـەپەرستنی خوا هینابوو ورویان لـەوپەیمانەو فەرمانی خوا وەرگێڕا.

﴿ فأعْقَبَهُمْ نِفاقاً في قُلُوبِهِمْ ﴾ دوایی چروکی ڕژدی و دووڕوی چەسپاند لـەدڵیانا، خوا پەشیمان بونەوەیان لێ وەرناگرێ هەتا لـەڕۆژی دوواییدا بەخزمەت خودا ئەگـەن تۆڵـەیان لێ ئەکرێتەوە، بەهۆی دووشتەوە :

١- ﴿ بِمَا أخْلَفُوا اللهَ ماوَعَدُوهُ ﴾ بەهۆی شتێکەوە دژایـەتی فـەرمانی خوایـان کـرد بەشتێ ئەوان بەڵێنیان دابو بیکەن ونـەیان کـرد لــەدەرچوونی زەکـاتی دارایـی خۆیـان و کردنی بێ‌فەرمانی خوا .

٢- ﴿ وَبِما كانُوا يَكْذِبُونَ ﴾ وەبەهۆی شتێکەوە ئەوان درۆ ئەکـــەن لـەبـەڵێن دانیـان بەخوا، ئەو دووشتانە دەرکەوتوترین کردەوەی ئەو دووڕووانەبوو خراپترین کردەوەن .

﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوا أنَّ اللهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْواهُــمْ ﴾ ئایـا ئـەو دوو ڕووانـە نـەیان زانیبـوو خـوا بەنهێنی ئەوان و بەئاشکرا کردنـی ئـەوکارەو ئـەزانێ بەچفـەی ئـەوان کەئـەیان ویسـت پێغەمەر بکوژن ونایانەوێ زەکات بدەن و بەسەرانەی دائەنێن .

﴿ وَأنَ اللهَ عَلاّمُ الغُيُوب ﴾ وەنەیان زانیبو خوا بەڕاستی ئەزانێ بـەو شـتانەی پەنـهان و نادیارن و ئادەمیزاد نایانزانێ. زۆر جێگەی سەرسوڕمانە چۆن ئەتوانن بێ باوەڕی و چفەی نارەوا بەکاربهێنن، هەرشتێ بێت و بڕوا بەدڵیاناو لەئاسمان و زەویدان خوا ئەیزانێ .

زانایان ئەڵێن: پێغەمەری خوا هانی موسـڵمانانی دا بـۆ بەخشـینی دارایـی خۆیـان لــە ڕێگەی خوادا. عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف چوارهەزاردرەمی هێنا بۆ خزمەت پێغەمەر و ووتی: ئەو ئەندازەیە نیوەی سامانی خۆمە، پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ فەرموی: خوا پیت وفەڕ بخاتـە نێو ئەوەی هێناوتەو نێو ئەوەی دات ناوە بۆ خێزانەکانت ، ئەوەبو خــوا پیتـی خسـتە نێـو دارایی عەبدوڕەحمان بەجۆرێ کەکۆچی دوایی کرد ( تەمازوری )ژنەکـەی ڕێـك کـەوت

لەگەڵ خیزانەکانی تریا بەهەشت هەزاردرهەم کەهەشـت یـەکی سـامانی عـەبدورەحمانی کوڕی عەوف بو ( عاسمی کوڕی عەدی ) سەدو بست خورمـای هێنـا. هاوڕێکـانی تـری پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ هەریەکەیان بەگوێرەی توانای خۆیان داراییان هێنا لەدووای هەمویان ئەبو عوقـەیلی ئەنسـاری یـەك مـەن خورمـای هێنـا، پێغەمـەر فـەرموی: بـیڕژن بـەناو هـەمو زکاتەکاندا. لەپاشا هەندێ لەدووڕووان تاوانجیانگرتە هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ووتیـان: عەبدورەحمان و عاسم بۆ بەرچاوی و خۆهەڵکێشان ئەو ئەندازەیان هێناوە، ئـەبو عوقـەیل بۆیە ئەو مەنەخورمایەیان هێناوە هەتا بەزەییان پێیا بێتەوە لەکاتی بەشکردنی زەکاتا بیریـان بکەوێتەوە. خوای مەزن ئەو ڕوداوەی ڕون کردەوەو فەرموی:

ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ مَرَّةٗ فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٨٠﴾

﴿الذِيْنَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِعِيْنَ مِنَ الْمُؤمِنِيْنَ فِي الْصَدقاتِ ﴾ کەسـانێکی ئـەوتۆ ڕەخنـەو خراپـە ئەگرنـە ئـەو کەسـانە داراییـی خۆیانیـان ئەبەخشـی لـەباوەڕداران لـــەدەرکردنی زەکاتەکانا، وەك عەبدولرەحمانی کورشی عەوف و هاوڕێکانی .

﴿ وَالذِيْنَ لايَجِدُونَ إلا جُهْدَهُمْ ﴾ وەخراپــەو ڕەخنـە ئەگرنـە کەسـانێکی ئـەوتۆ لـە باوەڕداران دەستیان ناکەوێ لەدارایی ببیەخشن لەڕێگەی خودا مەگەر شتێ لــە توانایـان

هەبێ ،وەك عوقەیل کە شەو هەتا بەیانی ئاوی لـەبیر دەرئەهێنا بەدوو مەن خورما مــەنێکی هێنا بۆ خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەو دوورڕووانە ئەیان ووت : خواو پێغەمەر پێویستیان بەو دوومەنە خورمایە نیە .

﴿ فَيَسْخَرُونَ مِنهُمْ سَخِرَ اللهُ وَلَهُمْ عَذابٌ أَلِيمٌ ﴾ دوایــی ئـەو دووڕوانـە گاڵتەئەکـەن بەهەندێ لـەباوەڕداران لـەوشتەی ئەیان بەخشی خوا پاداشتی ئەو گاڵتەکردنە ئەسێنێ لـەو دووڕووانــەو تۆڵــەیان لێ ئەســێنێ و، بـۆ ئـەو دووڕوانـە هەیـە سـزایەکی زۆر ئـازاردەر لـەپاشەڕۆژدا.

کاتێ خوای مەزن ئەو ئایەتانەی پێشوی نارده خــوارەوە لــەبارەی ئـەو دووڕووانـەوە داوایان لـەپێغەمەر﴿ ﷺ﴾ کە داوا لـەخوای مەزن بکا لــەوان خۆشـی ببـێ، خـوای مـەزن وەڵامی دانەوەو فەرموی:

﴿ اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أو لاتَسْتَغْفِرْ لَهُمْ ﴾ تـۆداوای لێ بـوردن و لێ خۆشـبون بکـە بـۆ ئـەو دوڕووانە یاداوای لێخۆشبون نەکەی بۆیان، یانێ داوای لێخۆشــبونیان بـۆ بکـەی یانـەی کەی خوا لـەوان خۆش نابێ.

﴿ إنْ تَسْتَغْفِرلَهُمْ سَبْعِيْنَ مَرَةً فَلنْ يَغْفِرْ اللهُ لَهُمْ ﴾ ئەگەر تۆ داوای لێ خۆشبون بکــەی بۆ ئەو دووڕووانە حەفتاجار، دوایی خوا خۆش نابێ لـەوان و لـەکوناهیان، ئابڕویان ئەبا لـە ڕۆژی دواییدا لـەبەرچاوی بونەوەراندا، ژمارەی حەفتا هێمایــە بەلــەزۆرکردنی پارانــەوە، مەبەست ئەوژمارەیە نیە بەتایبەتی .

﴿ ذٰلِكَ بِأنَـهُمْ كَفَرُوابِاللهِ وَرَسُـولِهِ ﴾ ئـەو وەرنەگرتنــەی لێ خۆشـبونەی تـۆ بـۆ ئـە وبێباوەڕانە بەهۆی ئەوەوەیە کەبەڕاســتی ئەوکەسـانە باوەڕیـان بـەخواو بـەنێراوی خـوا نەهێناوە، ئەوان دووڕوو بەرچاوبازبون .

﴿ وَاللهُ لايُهدي القَوْم الفاسِقِيْنَ ﴾ وەخوا ڕێگەی ڕاستی نیشان نادا بەتاقمێ لـەسـنور و فەرمانی خوا دەرچوبن و لـەئایین وەرگەڕابن و بەردەوام بن لـەسەر بێبـاوەڕی، زۆر ڕونـە باوەڕنایەرن، بۆیە خوای مەزن ڕێگەیان لێوون ئەکا.

پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ فەرمانی داوە بەوتاقمە داوایــان لـەپێغەمـەر کردبـو نەچنـە دەرەوە بـۆ جـەنگی تـەبوك و دەســتوری دانــی نەچنــە دەرەوە لـەبەرئــەوەی ئــەیزانی ســودێ

لەچونەدەرەوەیاندا نیە، ئەوتاقمــە زۆریــان پێ‌خۆشبو نەچونــە دەرەوە، دژی پێغەمــەریش وەستان لەکاتی فەرماندانی بۆ چونە دەرەوەی موســڵمانان. لەبەرئــەوەبو بــاوەڕ لــەدڵیانا جێگەی خۆی نەگرتبوو، یاریدەی پێغەمەریان نــەدا نەبــە چونــە دەرەوەی خۆیــان و نەبــە دارایی، بۆیە خوای مەزن فەرموی:

فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓا۟ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُوا۟ قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا۟ كَثِيرًا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا۟ مَعِىَ أَبَدًا وَلَن تُقَٰتِلُوا۟ مَعِىَ عَدُوًّا ۖ إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْخَٰلِفِينَ ﴿٨٣﴾

﴿ فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلافَ رَسُولِ اللهِ ﴾ شادمان وخۆشحاڵبوون ئەوکەسانەی دوواکــەوتبون بــۆ چونــە دەرەوە لــەجــەنگی تــەبوكدا و وازیــان لیٚ هیـــنرابوو لەلایــەن پێغەمەرەوە بەدانتیشتنی خۆیان بەدژایەتی‌کردنی نێرراوی خوا لەدەرنەچونیانا .

﴿ وَكَرِهُوا أنْ يُجاهِدُوا بِأَمْوالِهِمْ وَأنْفُسِهِمْ في سَبِيلِ اللهِ ﴾ ولایان ناخۆشـــبو کەجــەنگ وکۆشش بکــەن بــەدارایی وبەلــەشــی خۆیــان وگیــانی خۆیــان لــەڕێگــەی ئــایینی خــوادا، حەسانەوەو ئاسایشیان ئەویست وپەرستنی خوایان واز لیٚ‌هێنابو.

﴿وَقَالُوا لاتَنْفِرُوا فِي الْحَرِّ﴾ وەئەو دووڕوانــە ئـەیان ووت بەیـەکتری و بەموسـڵمانان ئێوە مەچنە دەرەوە بەگشتی بۆ جەنگی تەبوك لـەمکاتە گەرمــەدا، خـوای مـەزن وەڵامـی دانەوە:

﴿ قُلْ نارَ جَهَنَمَ أشدّ حرّاً ﴾ تۆ بڵێ بەوان ئاگری دۆزەخ ســەختترو زۆرتـرە لـەلایـەن گەمیەوە لـەگەرمای ئەم ڕۆژە .

﴿ لَوْ كانُوا يَفْقَهُونَ ﴾ ئەگەر ئەودووڕوانە بزانن پاشەڕۆژیان لـەپاشەڕۆژدا ئاگری زۆر گەرمیەوە دۆزەخە، ئیتر بۆ ئەبێ ئاسایش و پشوی ئە مـرۆژۆ بـەچاکتر بزانـن لـەپەرستنی خوا، ئەوان هەرچـەندە خۆشـحاڵن بـەو دانیشـتنە. بـەلاّم لـەپاشـەڕۆژدا توشـی کزۆڵـی بێئابڕویی دەبن .

﴿ فَلَيَضْحَكُوا قَلِيْلاً وَلِيَبْكُـوا كَثـيراً ﴾ کەواتـە ئـەو دووڕوانـە بـاپێ بکـەنن بەکـەمی لـەجیهانداو بگرین بەزۆری لـەپاشەڕۆژدا. یانی خۆشی جیهان کەمــە بەرانبــەر بەناخۆشـی ڕۆژی دووایی کەهەرگیز بڕانەوەی بۆ نیە .

﴿جَزاءً بِما كانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ لـەبەر پاداشت دانەوە تۆڵــە کردنـەوە لـەئـەوان بـەهۆی شتێکەوە ئەیکەن لـە دووڕوی و ڕەوشتی خراپ و قێزەون. یـانێ ئەوگریانـە زۆرەی پـاش ڕۆژ پاداشتی ئەو پێکەنینە کەمەو کردەوە خراپەکانیانە.

﴿ فَإنْ رَجَعَكَ اللهُ إلى طائِفَةٍ مِنهُمْ فَاسْـتَأذَنُوكَ لِلْخُـروجِ ﴾ دوایـی ئەگــەر خـوا تـۆی گەڕانەوە بۆ مەدینە لـەجەنگی تەبوك بـۆ لای تـاقمێ لـەودووڕوانــە کەبـەردوامن لـەسـەر دووڕوی و نەهاتوون بۆ جەنگی تەبوك، دوایی ئەوان داوائەکە نلــەتۆ بـۆ دەرچونیـان بـۆ جەنگ و جگەی جەنگ، لـەمەوپاش تۆ ڕێزو گەورەیی جەنگیان پێمەبەخشە .

﴿ فَقُلْ لّنْ تَخْرُجُوا مَعِي أبَداً ﴾ دوایی تۆ بڵێ بەوان: ئێوە مەیەنــە دەرەوە لـەگـەڵ مـن هەر گیز بۆ مەبەستێ و ئەوکارە پیرۆزە بەبەشتان نابێ .

﴿ وَلَنْ تقاتِلُوا مَعَي عَدُواً إنَكُمْ رَضَيْتُمْ بِالقَعَودّ أوَلَ مَرَّةٍ فَاقْعُدُوا مَعَ الخَـالِفِيْنَ ﴾ وەئێـوە لـەمەودوا جەنگ لـەگەڵ من مەکەن بەرانبەر بەهیچ دوژمنێ چونکە بەڕاســتـی ئێـوە ڕازی

بون و خۆشحاڵبون بەدانیشتن یەکەم جار بۆ چونی جەنگی تەبوك. کەواتە دانیشتن لەگەڵ نەهاتوان بۆ جەنگ بەوێنەی منالو ژن وپـیر و پـەك کەوتـە، لەبەرئـەوەی ئێـوە شـایانی ئەوکارە پیرۆزەنین .

پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ هەرکاتێ یەکێ لەهاوڕێکانی بمردنایـە نوێـژی لەسـەرئەکرد و لەگـەڵ تەرمەکەی ئەچو بۆ سەرگۆرستان، ئەوەستا لـەسـەر گۆڕەکـەی و داوای لێ بوردنـی بـۆ ئەکرد لەخواو ئەیشی فەرمووی‌بەوکەسانە لەوێ بون ئیوەیش بۆی بپاڕێنەوە کە خوا ڕای وەستێنێ لەسەر باوەڕ، لەبەرئەوەی ئێستا پرسیاری لێ ئەکەن لەنێو گۆڕەکەیدا.

کاتێ عەبدولای کوڕی ئوبەی سەرۆکی دووڕووان کەوتە گیانەلاو عەبدولای کـوڕی کەهاوناوی‌باوکی بو داوای لەپێغەمەر کرد کەکراسی خـۆی بداتـێ هـەتا بیکـا بـەکفنی باوکی و داوایشی لێ کرد نوێژی لەسەر بکا، پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ کراسـەکەی خـۆی دایـە لەبەر دڵخۆش کردنی، چونکە ئەو کوڕە زۆر پیاوی خوا بو، پێغەمەر فـەرموی: کراسـی من ناگانتە فریای عەبدولای باوکت. بەلام هیوادارم بـەهۆی ئـەم کـارەوە هـەزار کـەس لەخزمەکانی باوکت باوەڕبهێنن، خوای گەورە هیواکـەی هێنایـەدی لـەهۆزی خـەزرەج هەزارکەس موسلمان بون، هەر لەبەرئەوەی عەبدولای کوڕی عەبدولای کـوڕی ئوبـەی لەکاتی نزیکبونەوەی مردنی باوکی لەبەر پیرۆزی داوای کراسی پێغەمـەری کـرد، کـاتێ کەمرد پێغەمەر نوێژی لەسەر کرد، زۆر پێ‌نەچو ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە:

وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَآ

أُنزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُوا۟ مَعَ رَسُولِهِ ٱسْتَـْٔذَنَكَ أُو۟لُوا۟ ٱلطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُوا۟ ذَرْنَا نَكُن مَّعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾ رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٨٧﴾ لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ جَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٨٩﴾

﴿ وَلاتُصَلِ عَلى أحَدٍ مِنْهُمْ ماتَ ابَداً ﴾ وەتۆ نوێژمەكە لەسەر هیـچ كەسـێ لـەدوو ڕووانە كە مردن هـەرگیز، پێغەمـەری كـاتێ مرۆڤـی بخرایەتـە گـۆڕەوە بـۆی ئەپاڕایـەوە لەخزمەت خوادا .

﴿ وَلاتَقُمْ عَلى قَبْرِهِ ﴾ وەتۆ ڕامەوەستە لەسەر گۆڕی ئەوكەسەو سەپەرشتی دانانی لە گۆڕدامەكەو زیارەتیشی مەكە.

﴿ إنَهُمْ كَفَرُوا بِاللهِ وَرَسُولِهِ وَماتُوا وَهُمْ فاسِقُونَ ﴾ بەڕاسـتی ئـەو دووڕوانـە باوەڕبـان بەخواو بەنێراوی خوا نەهێناوەو بەردەوامبوون لەسەر بێ باوەری، كەواتـە نوێـژ لەسـەر كردنیان و ناشتنی ئەوان شایانی تۆ نیـەو شـایانی سـەرلێدانی تۆیـش نیـە لـەگۆڕەكانیانا، ئەودووڕووانە مردوون وئەوان لەسنوری ئایین دەرچون و لەئایین وەرگەڕاون .

ئەوئایەتە پێمان فێر ئەكا وەستان لەسـەر گـۆڕی مـردووان دروسـتەو چاكەبەمـەرجێ باوەڕداربن، چۆنێتی سەرلێدانی گۆڕەكان بەم جۆرەیە: سەرلێدانی گۆڕستانی موسـڵمانان

چاکە بۆ پیاوان و پێویست نیە، بۆ ژنان چاك نیە بەو مەرجە ئەو سەرلێدانە سەر نەکێشێ بۆلای بێ سنوری. هەندێ لە زانایان لایان وایە بۆ ژنان قەدەغەیە. ئەو کەسانە ئەچنە سەردانی گۆڕستان سڵاو بکەن لە مردووەکان، بە گوێرەی خواست و توانای خۆیان قورئان بخوێن لەسەریان و داوای لێ بوردنیان بۆ بکەن لەخوا.

بۆ زانین: لای پێشەوا شافیعی و زۆرترین لە زانایانی سەر بە شافیعی خوێندنی قورئان سود بە مردو ناگەیەنێ. بەڵام لای پێشەوایان حەنەفی و مالیك و ئەحمەدو کۆمەڵێ لە شافیعیەکان خوێندنی قورئان سود ئەگەیەنێ بە مردووان و سوودی لێ وەرئەگرن. بۆ ڕون بوونەوەی ئەو مەبەستە تەماشای نامەی (مغني المحتاج) بکە بەرگی سێهەم و لاپەڕەی (٦٩-٧٠) پاداشتی دارایی بەخشین و پاڕانەوە بۆ مردوان خاوەنی سودن لای موسڵمانان لە خزم و لە بێگانە. ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر پێویستی توێژکردن لەسەر مردووان، ئەبێ بیشزانین ئەو کەسەی مرد پێویستە لەسەر خزمان و باوەڕداران ئەمانەی خوارەوە:

١- شۆردنی مردو بە ئاوێکی پاك، کەمترین شۆردنی مردو لابردنی ئەو پیسییانەیە بە لەشی مردوەکەوەن، لە دواییدا یەکجار لەشی مردوەکە بشۆرێ بە ئاوی ڕوت و پاك، درێژەی ئەو باسە لەنامە دەستوریەکاندا ڕون کراوەتەوە.

٢- بەرگ کردنە بەری مردوو (کفن) بە قوماشی شیاوی پۆشینبێ بۆ مردوەکە بە زیندوی بەلای کەمەوە هەموو لەشی مردووەکە داپۆشێ، ئەو بەرگە واچاکە سێ باڵا پۆش و کراسێك و مێزەرێ بۆ پیاوان، ژنان یەك باڵا پۆش و چارشێوەیەو کراس و دەرپێیە، وایش چاکە ئەو بەرگە سپی بێ بۆ پیاوان و بۆ ژنان، درێژەی باسەکە لە نامەکانا باسکراوە.

٣- نوێژکردن لەسەر مردو پێویستە لەسەر باوەڕدارانی ئەو جێگەیە مردوەکەی تێدا مردووە، ئەگەر یەك کەس نوێژی لەسەربکا لەسەر هەموویان لائەبرێ. پایەو پێویستیەکانی نوێژ مردو ئەمانەی خوارەوەن:

أ- (النیە) یانێ نیازی نوێژکردن لەسەر مردووەکە لەسەرەتای نوێژەکەوە بەم جۆرە: نییازم هەیە نوێژی ئەم مردووە ئەکەم و پێویستە لەسەرم و بۆ خوای ئەکەم.

ب- لە دوای نیياز چوار جار بلّێ: (الله أكبر) دوای یەکەمیان سورەتی فاتیحە بخوێنێ، لە دوای دووهەمیان کەمترین سەڵەواتیێدا لەسەر پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بلّێ: (اللـهم صل على محمد) لە دوای سێهەمیان بپاڕێتەوە لەخوا بۆ مردوەکەو بلّـێ: (اللـهُمَ أغْفِـرْ لِـهذا المَيِّـتِ وَأرْحَمْهُ) لە دوای چوارەمیان بلّێ: (اللهُمَ لا تَحْرِمْنا أجْرَهُ وَلا تَفْتِنا بَعْدَهُ) .

جـ- سلاّودانەوەو یەك جـار بلّـێ: (السَـلامُ عَلَيْكُـمْ)، واچاكـە ڕووەرگـێڕێ بـۆلای ڕاست.

د- پێویستە وستان بە پێوە لەیەکەم جاری نیازەوە هەتا کاتی سلاّودانەوە بەبێ ڕکـوع و بەبێ سوژدە بردن .

٤- دانانی مردوو لە گۆڕدا، کەمترین گۆڕ بریتیە لەوە قەدەغەی بۆن بۆنی مردوەکـە بکاو قەدەغەی دەرهێنانی لەشی مردووەکە بکا لە دەرهاوردنی دڕندەکان. درێژی باسی ئەوانەی پێشوو لە نامەکاندا ڕوون کراونەتەوە.

دووڕوی سەرۆکی دووڕووان عەبدولاّی کـوڕی ئوبـەی، خـۆ هەڵکێشـانی دووڕوان بەدارای و منالّ و هۆزەکەیانەوە، دانیشتن و دوواکەوتنیان لە یـاریدانی پێغەمـەر ﴿ ﷺ ﴾ بەردەوامیان لەسەر خراپەو ڕەخنەگرتن لە ئیسلام و پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ گەیشـتنی دووڕوان بە گومڕایی و بێ باوەڕی، داواکردنی عـەبدولاّی کـوڕی عـەبدولاّی کـوڕی ئوبـەی بـۆ کراسی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾، ئەوانە هەموویان شایستەی ئەوەن خوای مەزن فەرمودەی خـۆی بەم ڕستەی خوارەوە دووپات بکاتەوەو بفەرموێ:

﴿ وَلا تُعْجِبْكَ اَمْوالُهُمْ وَأوْلادُهُمْ ﴾ وەتۆ سەرگەردان نەکا دارایـی و منـالّی دووڕوان بازویشبن بەهێزو توانایشانەوە، نوێژیان لەسەمەکەو لەسەر گۆڕیان ڕامەوەستە .

﴿ إنَما يُرِيـدُ اللهُ أنْ يُعَذِبَـهُمْ بِـها في الدُنيـا ﴾ بەڕاسـتی خوائەیـەوێ کـە سـزای ئـەو دووڕوانە بدا بە هۆی دارایی و منالّەکانیانەوەو خۆ خـەریك کـردن بەوانـەوەو خەفـەت بخۆن لە پاراستنیاناو توشی ڕەنج ببەن لە پەیدا کردنی گوزەران و داراییانا لە جیهاندا.

﴿ وَتَزْهَقَ أنفُسَهُمْ وَهُمْ كافِرُونَ ﴾ وەگیانیان دەربچێ و بمـرن وە ئـەوان بـێ بـاوەڕن، خوای مەزن لە ئایەتی (٥٥)ی ئەم سورەتەدا وێنەی ئەو ئایەتەی فەرموە، لێرەدا دووپـاتی

کردۆتەوە لەبەر ئەوەی تیژ ترو توندتر بیان ترسێنێ لەسەر گەردانیانا بە هۆی پەیدا کردنی دارایی و لە خۆیان بایی بن بە هۆی منالەوەو خۆماندوکردن بەوانەوە، هەتا بیری ئادەمیزادی بخاتەوە ئەو شتانەی لەسەر زەوین بێ دەوامن و ئەبنە هۆی سزادانی خاوەنەکانیان لە جیهاندا .

لە پاشا خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە هەواڵی کردەوەی ئەو دووڕوانە بە تێرو تەسەلی و ئەفەرموێ:

﴿ وَإِذ أُنْزِلَتْ سُورةٌ أنْ آمِنُوا بِاللهِ وَجاهِدُوا مَعَ رَسُولِهِ ﴾ وەهەرکاتێ بنێررایەتە خوارەوە سورەتێ لە قورئان بە تەواوی یابەشێ لە سورەتێ، فەرمانی بدایە کە ئێوە باوەڕ بەخوا بهێنن و، ئێوە جەنگ بکەن لەگەڵ نێردراوی خوادا لە دژی بێ باوەڕان .

﴿ أَسْتَأْذَنَكَ أولوا الطَّوْلِ مِنْهُمْ ﴾ داوای دەستور ئەکەن لەتۆ بۆ دانیشتن لە جەنگ نەکردن خاوەداراییەکان و بە تواناکان لەو دووڕوانە، سودی تایبەتی خۆیانیان ئەوێ.

﴿ وَقالُوا ذَرْنانكُنْ مَعَ الْقاعِدِيْنَ ﴾ وەئەیان ووت بەبێ شەرمانە: تۆ واز لە ئێمە بهێنە لەگەڵ دانیشتوانابین لە ژن و منال و پەك کەوتەکان، ئەوان مەبەستیان لەو دانیشتنە ئەوەبوو خراپە بڵاوبکەنەوەو خۆیان بە گەورە دابنێن و نەیان ئەزانی ئایینی ئیسلام و باوەڕ بەخوا هێنان و داوای یەکسانی ئەکا لەنێو ئادەمیزادا، جەنگ کردن لەگەڵ پێغەمەر بکرێ لەگەڵ بێ باوەڕان بۆ دژی ستەم و خراپەیە، بەر لەوەی ئەو دووڕوانە بە ڕووالەت موسڵمانن هیچیان بۆ نەماوەتەوە جگە لەوەی داوای دانیشتن بکەن لە پێغەمەرو نەچنە دەرەوە بۆ جەنگ .

﴿ رَضُوا بِأَنْ يَكُونُوا مَعَ الخَوالِفَ وَطَبَعَ عَلى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لايَفْقَهُونَ ﴾ خۆشحاڵن بەوەی کەلەگەڵ ژنەکاندا بن و، مۆردراوە بەسەر دڵیانا، هەواو هەوەسی خۆیان کوێرو کەڕی کردوون لەئاستی ڕاستی، ئەو مۆرکردنەوای لێ کردوون لەگەڵ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ نەبن، دوایی ئەو ڕووداوانە نازانن و تێناگەن بۆجەنگ کردن لەگەڵ پێغەمەر بن ئەبێتە هۆی بەختیاریان .

﴿ لكِنَ الرَّسُولُ وَالذِيْنَ آمَنُوا مَعَهُ جاهَدُوا بِأمْوالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ ﴾ بەلاّم فروستادەی خواو کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە لەگەڵ تۆ جەنگ ئەکــەن بــەدارایی و بەلــەش و گیــانی خۆیان لەرێگەی ئایینی خوادا، ئیتر دووڕووان نرخیان بۆ دانانرێ .

﴿ وَاُولئِكَ لَهُمُ الخَيْراتُ وَاُولئِكَ هُمُ المُفْلِحُونَ ﴾ وەئــەو باوەڕدارانــە بــۆ ئــەوان هەیــە چــەندین چاکــە لەجیــهاندا بــەوەرگرتنی دەستکەوت و بەســەرکەوتنی خۆیــان و، ئــەو باوەڕدارانــە هەرئــەوانن بــەختیارن و بەهــەمو ئــاواتی خۆیــان ئەگــەن ورزگاریــان ئــەبێ لەپاشەڕۆژدا .

﴿ أعَدَ اللهُ لَهُمْ جَناتٍ تَجْری مِنْ تَحْتِها الآنهارُ خالِدِيْنَ فيْها ذلِكَ الفَوْزُ العَظِيْــمُ ﴾ خــوا ئامادەی کردوە بۆ ئەو باوەڕدارانە چەندین باخ و بــۆلاخ و چیمــەن لەپاشــەڕۆژدا ئــەچێ بەژێر دارو درەختەکانیاناو ئەم لاولای کۆشەکەکانیان چــەندین ڕوبــاری ئــاوی شــیرین و خۆش وبێ خەوش بەردەوامن لەنێو ئەو بەهەشتانەدا هەتاهەتایە ئەوانەی بــاس کــران بــۆ باوەڕداران ڕزگاربون و سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە .

پاش ئەوەی خوای مەزن باســی دووڕوەکــانی کــرد لــەبارەی دانیشــتنیان لــەمەدینــەو نەچونیان بۆ جەنگ کردن لەئایەتەکانی پێشودا باسی ئەوکەســانەیش ئــەکا کەلەجــەنگ دواکەوتوون لەعەرەبــە دەشــتەکیەکان ئــەیان کــا بەدووبەشــەوە لــەم ئایەتــەی دواییــدا کەئەفەرموێ :

وَجَآءَ ٱلْمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٩٠﴾ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ

مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ ۞ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَآءُ رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٩٣﴾

بەشی یەکەمیان دێنە خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ داوای دەستوری لێ ئەکەن بۆ دانیشتن و بیانوی ڕاستی بۆ پێغەمەرئەهێننەوە، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿وَجَاءَ الْمُعَذِّرُونَ مِنَ الأَعْرابِ لِيُؤذَنَ لَهُمْ ﴾ وەچون بۆ لای پێغەمەر لەو کاتەدا فەرمانی دا بەدەرچوونی گشتی بۆ جەنگی تەبوك ئەوکەسانەی بیانویان ئەهێنایەوە لەعەرەبە دەشتەکیەکان وەك هۆزی ئەسەدو هۆزی غەتفان یاهۆزی تر هەتا دەستور بدرێ بەوان نەچنە دەرەوە بۆ جەنگ لەبەرئەوەی هەژارن و توانای چەك و تفاقیان نیە و خێزانیان زۆرە،دوایی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بیانوەکانی لێ وەرگرتن و فەرموی: دانیشن .

بەشی دووهەمیان چونەخزمەت پیغەمەر ﴿ ﷺ ﴾، بیانویان بۆ هێنایەوە بۆ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ وَقَعَدَ الَّذِيْنَ كَذَّبُوا اللهَ وَرَسُولَهُ ﴾ وەدانیشتن کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنابوبە خواو بەنێراوی خوا بەبێ ئەوەی بیانویە بهێنینەوە بۆ چونە دەرەوە، خۆیانیان وادەرئەخست خاوەنی باوەڕن .بەلام لەژێرەوە بێباوەڕبون ، نرخیان بۆ بیانوهێنانەوە دانەئەناو خوا هەڕەشەی لێکردن وفەرموی :

﴿ سَيُصيبُ الذِيْنَ كَفَرُوا مِنهُمْ عَــذابٌ ألِيـمٌ ﴾ کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕیـان نـەهێناوە لـەعەرەبە دەشتەیەکان توشی ئەوان ئەبێ سـزایەکی خـاوەن ئـازار بەکوشـتن لـەجیـهانداو بەسوتاندنیان بەئاگری دۆزەخ لەپاشەڕۆژدا .

هەندێ لەزانایان لەمانای ئەو ئایەتەدا لەدیاری کردنی ئەو دووبەشانە ئەڵێن: هەردوو بەشەکان درۆیان ئەکرد لەگەڵ خوا و پێغەمەر دا بەم جۆرەی خوارەوە:

یەکەمیان بەدرۆ بیانویان ئەهێنایەوە، مەبەستیان پشودان وڕاکردن بوو لەگرانی جەنگ بەڵام بەئاشکراو بەنهێنی بڕوایان بەخواو بەپێغەمەر هەبو. بەڵکو سست وتەمەڵبوون .

بەشی دووهەمیان بیانویان نەهێنایــەوە بـۆ پێغەمــەر و بەئاشکراموسـڵمانبون لەنـهێنیدا باوەڕیان بەخواو پێغەمەرایەتی موحەمەد نەبو، ئەوتاقمە بێ باوەڕانە شایانی ســزای خــاوەن ئازارن .

لەپاشا خوای گەورە باسی ئەوکەسانەئەکا لاوازن و توانای جەنگ کردنیـان نیـە ئـەو کەسانەن بیانوویان لی وەرئەگیرێ بۆ نەچونە دەرەوە، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ لَيْسَ عَلى الْضُعَفاءِ ﴾ نیە لەسەر ئەوکەسانە لاواز و توانای جەنگیان نیە لەبەر پیری و ناتەواوی لەشیان لەبنچینەی بونیانەوە کەهاتونەتە جیهانەوە.

﴿ وَلا عَلى المَرْضَى ﴾ وەنیە لەسەر نەخۆشەکان و بیمارەکان. جیاوازی نێوان لاوازو نەخۆشەکان بەوەیە: نەخۆشی یەکەم جار لەگەڵ ئادەمیزاد نەبووە بەپیچچەوانـەی لاوازی ناتەواویی لەشیان کەیەکەم جاری بونیان کەم ئەندام و لاوازبوون .

﴿ وَلاعَلى الذِيْــنَ لايَجِـدُونَ مـايُنْفِقُونَ ﴾ وەنیـە لـەســەر کەسـانێکی ئـەوتۆ دەسـتیان ناکەوێ شتێ خەرجی بکــەن بـۆ خۆیـان و بـۆ تفـاق و کەرەسـەی جـەنگ و کەسـیش نایانداتێ.

﴿حَرَجَ إذا نَصَحُوا اللهُ وَرَسُولِهِ ﴾ هیــچ گونـاهێ لەسـەر ئەوسـێتاقمە نیـە هـەرکاتێ نیازیان پاك و خاوینبێ دەربارەی باوەڕهێنانیان بەخواو بە نێرراوی خــواو پەرستنی خـواو شتی تر. وەك پاسەوانی نێو شار ئاگاداری و چاودێری خێزان و دارایــی جـەنگ کـەرانی

موسڵمان بکەن ،ئەو سێ تاقمە بەومەزجانەوە گوناهیان ناگــا نەچنــە دەرەوە بــۆ جــەنگ کردن .

﴿ ماعَلى المُحْسِنينَ مِنْ سَبْيلٍ وَاللهُ غَفُــورٌ رَحيــمٌ ﴾ نیــە لـەســەر چاکەکــەرانی نیازپـاك رێگەیە لـە سەرزەنشت و گوناه، ئەبێ لـەبیرمان نــەچێ هەرکەســێ بەپێویستی سەرشانی خۆی بەپاکی هەڵسا ئــەو کەسە چاکەکــەرە، هەرکەســێ ناپـاکبێ لـەهــەر کارێکـا بــێ خراپەکەر و، خــوا لێبوردنــی زۆرە بــۆ کەســێ دوواکــەوتبێ لـەجـەنگ بـەهۆی بیـانوی ڕاستەوە بێ، خاوەن بەزەیی و میهرەبانیە بۆ هەمو بەندەکانی خۆی کەپەشیمان ببنەوە .

﴿ وَلا عَلى الذِيْنَ إذا ماأتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لا أجِدُ ما أحْمَلِكُمْ عَلَيْهِ ﴾ وەهیچ گونـاهێ نیە لـەسەر کەسانێکی ئەوتۆ دووابکەون لـەجەنگ هەرکاتێ هاتبن بۆلای تۆ بۆ ئەوەی تــۆ ببەخشی بەوان شتێ هەڵیان بگرێ خۆیو تفاقەکەی وەك هوشترێ یاشــتێ تــر، تۆئـەڵێی: من هیچ شتێکم دەست ناکەوێ بیبەخشم بەئێوەو هەڵتان بگرێ و بچن بۆ جەنگ کردن، ئێوە سواری ئەو شتە بکەم .

﴿ تَوَلَوْ وَ أعْيُنَهُمْ تَفِيضَ مِنَ الدَمعِ حَزَنَاً أنْ لايَجِدُوا مايُنفَقُونَ ﴾ ئەوکەســانە دەرئــەچن لای تۆو چاوەکانیان ئەڕژێنێ فرمێسك و خوڕخوڕ دێتــە خــوارەوە لـەبەرئــەوەی خەفــەت ئەخۆن کەدەستیان ناکەوێ شتێ خەرجی بکــەن بــۆ تفـاقی جــەنگ و لـەگــەڵ تــۆ بچنــە دەرەوە .

زانایان ئەڵێن: هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە لـەبەرئــەوەبوو تــاقمێ لـەموســڵمانان چونــە خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ووتیان: ئەی فروستادەی خوا: ئێمە وولاخمان نیە خۆمان وتفاقمان هەڵگرێ و لـەخزمەت تۆدا بێین بۆ جەنگی تەبوك، داوات لێ ئەکەین وولاخــی ســواریمان بدەرێ، پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ فــەرموی: نیمانــە وولاختــان بدەینــێ، ئیــتر ژمـارەی ئەوکەســانە چەندەبێ و ناویان چی بوە گرنگ نیە .

پرسیار / ئەو تاقمە ڕستەی ﴿ ولا على الذين لا يجدون ما ينفقون ﴾ ئەیان گرێتــەوە ، ئەبێ سوودی دووپات کردنەوەی چ شتێ بێ بۆ جارێ تر ؟

زانایان ئەڵێن: ئەوانەی ڕابووردوون لەوڕستەیەدا ئەوکەسانەن خواردەمەنی ووڵاخیان نەبوە. بەڵام ئەوکەسانەی لەخەفەتا ئەگریان جگە لەووڵاخ ئەوانی تریان هەبوە .

بەکورتی هەرکەسی چ لەجەنگ دوابکەوێ بەهۆی بیانووی ڕاستەوە دەستوری پێ ئەدرێ نەچێتە دەرەوە، ئیتر هەرکەسێ بێ گوناهی لەسەر نیە .

﴿ إنما السَبِيْلُ عَلَى الَذِيْنَ يَسْتَأذِنُوكَ وَهَمْ أغْنِيـاءُ وَرَضَـوا بِـأنْ يَكُونُـوا مَـعَ الخَوالِـفَ﴾ بەڕاستی ڕێگەی سەرزەنشت وگوناه لەسەر کەسانێکی ئەوتۆیە داوای دەستوری نەچونەدەرەوە لەتۆئەکەن بۆ جەنگ و، ئەوان سامانداراون وخاوەن ووڵاخ و کەرەسەی جەنگن و هەژار و نەخۆش نین، خۆشحاڵ و ڕازین بەوەی کەئەوان لەگەڵ ژنەکان بن، نەچنە دەرەوە بۆ جەنگ خاوەنی هیچ بیانوێ نین لەوانەی باسکران .

﴿ وَطَبَعَ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهَمْ لايَعْلَمُونَ ﴾ وەخوا مۆری داوە بەسەر دڵیانان و ڕاستی وەرناگرن، بەخوایشی خۆیان خراپەیان هەڵبژاردوە، دوایی ئەوکەسانە نازانن بەوچاکانە لەجیهان و لەپاشەڕۆژدا هەیە چەندە زۆرن، لەجیهاندا بەوەرگرتنی دەست کەوت، لەپاشەڕۆژدا بە هەشت وچاکەی زۆریان ئەدرێتێ .

ئەبێ بزنین: ئەوکەسانەو شاگردەکانیان لەم سەردەمەی ئێمەدا و لەهەمو کاتێکا هەرگیز سوودی گشتی و چاکەی جگەی خۆیانیان ناوێ، یارمەتی نیازپاکانو خوا پەرستان نادەن لەبەرئەوەی سودی تایبەتی خۆیان کەم ئەبێتەوە. بگرە زۆر جاران بێ نەوایان و بێ تاوانان چەرمەسەری ئەدەنو ئەیان کوژن بۆ ئەندازەیەکی کەم لە پول و پارەی کاربەدەستان. ئامادەن ئایین ونیشتیمانو ناموسی خۆیان بفرۆشن بۆ شەیتان وخوێن مژان بەرامبەر بە پارەیەکی کەم و خراپ. بەیاریدەی خوا هەژاران وچەوساوەکان و ئایین پەرستان لەخەبات کردندا ناوەستن هەتا ستەمکاران ئابڕویان ئەچێ و لەناو ئەبرێن، ئاڵای بەرزی یاساو دەستوری قورئان ئەخرێتەکار .

بەیاریدەی خوای مەزن کۆتایی بەنوسینی جزمی ( ٨ -٩ -١٠ ) هات ڕۆژی هەینی ( ١٣ ) ی مانگی ڕەجەب ( ١٤٢٠ ) کۆچی بەرانبەر بە ( ٢٢ /١٠/ ١٩٩٩ ) زایینی

# پێرست

خوێنەری هێژا لەم جزمەدا ئەرکی چاوپیاخشانی ئەم هەڵانە بگرە ئەستۆی خۆت

| هەڵە | ڕاست | لا | دێڕ |
|---|---|---|---|
| ولو أنزلنا | ولو أنا نزلنا | ٤ | ١ |
| لتؤمنوا | ليؤمنوا | ٤ | ١٢ |
| باوەڕهێنان | باوەڕهێنانی | ٤ | ١٣ |
| فلعوه | فعلوه | ٧ | ٦ |
| المحترمين | الممترين | ٩ | ٧ |
| شبيله | سبيله | ١١ | ٦ |
| براوی | سەر براوێ | ١٢ | ١٩ |
| ما اظطررتم | ما اضطررتم | ١٣ | ٥ |
| كثيرين | كثيرا | ١٣ | ١١ |
| بەشتێ سزايان | سزايان | ١٣ | ١٨ |
| نجارج | نجارج | ١٦ | ١٠ |
| ئەو | لەو | ١٧ | ٤ |
| پرسيارکە | پرسيارکەر | ١٨ | ٤ |
| کەرە | گەڕاندوە | ١٩ | ١٣ |
| يهديه | أن يهديه | ٢١ | ١٢ |
| جرجا | حرجا | ٢٢ | ١ |
| ئەخرێته | ئەخاته | ٢٢ | ٢١ |
| تەنگە | تەنگیه | ٢٢ | ٢٣ |
| شتێ چ | شتێ | ٢٥ | ٥ |
| هيچ تر | هيچ شتی تر | ٢٦ | ١٠ |
| با سبێ بێ | باسبێ | ٢٧ | ١٤ |
| تواوی | تەواوی | ٢٨ | ١٠ |
| وجعلوا الله | وجعلوا لله | ٣١ | ٤ |
| درأ | ذرأ | ٣١ | ٤ |
| ڕێژەکان | وێژەکان | ٣٢ | ١ |
| لە خۆیانەوە | لە خۆیانەوەیە | ٣٢ | ٨ |
| دزيانی | زيانی | ٣٢ | ١٩ |
| بوختان | بە بوختان | ٣٤ | ٢ |
| کياتن | کيان | ٣٥ | ١٦ |
| کردوو | کردوە | ٣٧ | ١٦ |
| فيها | فی ما | ٤٠ | ١١ |
| اطفر | اضطر | ٤٦ | ٤ |
| لەو ناوەڕۆکی | لە ناوەڕۆکی | ٤٨ | ١٣ |
| يەکسانيە | يەکسانيەوە | ٥٧ | ١٦ |
| تا فتين | طائفتين | ٦٢ | ١ |
| واتقوا | أو تتولوا | ٦٢ | ١٠ |
| القرايين | القرائيين | ٦٥ | ٣ |
| بوو | بوون | ٦٥ | ٥ |
| اني صلاتي | أن صلاتي | ٦٧ | ١ |
| ئەوە | ئەو | ٧٠ | ٣ |

| هەڵە | ڕاست | لا | دێڕ |
|---|---|---|---|
| فلنسأ أن | فالنسألن | ٧٤ | ١ |
| فروستاوەکان | فروستادەکان | ٧٤ | ٢ |
| هەنا | هەتا | ٧٤ | ١١ |
| شەی يتان | شەيتان | ٨٤ | ١٤ |
| عنها | عنهما | ٨٦ | ١٣ |
| کان بێ | کان | ٨٧ | ١٧ |
| ئامادەم | ئادەم | ٨٨ | ١٥ |
| ڕێگەی | ڕێگە | ٩٠ | ١٠ |
| عنها | عنهما | ٩٥ | ١ |
| خالصته | خالصة | ١٠٣ | ٣ |
| يفلحون | يعلمون | ١٠٣ | ٧ |
| صلوا | ضلوا | ١٠٧ | ٤ |
| أولادهم | أو لاهم | ١٠٨ | ١٧ |
| بداتی چ | بداتێ | ١١٣ | ٣ |
| نايسنيان | ناسينيان | ١١٦ | ٢ |
| بسيماتهم | بسيماهم | ١١٦ | ٢٢ |
| نادوا | نادو | ١١٦ | ٦ |
| ئەوتۆنيە | ئەوتۆيە | ١٣٠ | ٧ |
| ئەکر | ئەکرد | ١٣٧ | ٢١ |
| نناهەند | سفاهة | ١٣٨ | ٣ |
| ترساندانی | ترساندنی | ١٤٣ | ١٢ |
| الحكم الله | يحكم الله | ١٥٣ | ٩ |
| کەتنا | کەتان | ١٥٥ | ٥ |
| بفنوا | يغنوا | ١٥٧ | ٣ |
| والغراء | والضراء | ١٥٨ | ١١ |
| أعفوا | عفوا | ١٥٩ | ١ |
| ساعی | ساغی و | ١٥٩ | ١٣ |
| خەرکاتێ چ | هەرکاتێ | ١٥٩ | ٢٣ |
| تأعون | تائمون | ١٦١ | ١١ |
| أصناهم | أصبناهم | ١٦٢ | ٨ |
| بون | نەبوون | ١٦٣ | ١٦ |
| ڕاینەگەیاند | ڕائەگەیاند | ١٦٦ | ١٦ |
| بثعبان | ثعبان | ١٦٧ | ١٢ |
| ببغاء | بيضاء | ١٦٧ | ١٧ |
| الساحر | لساحر | ١٦٨ | ٣ |
| الظالمين | الغالبين | ١٧١ | ١٠ |
| سحر | بسحر | ١٧٣ | ٣ |
| فغلبوا | ففلبوا | ١٧٣ | ٢١ |
| چفه چفه | چف | ١٧٥ | ٩ |
| هێنا | هێنان | ١٧٥ | ١٤ |

| هەڵە | ڕاست | لا | دێڕ |
|---|---|---|---|
| ئەدەی | ئەوەی | ١٧٥ | ٢٢ |
| تغنا | توفنا | ١٧٦ | ١٨ |
| لو | لە | ١٧٧ | ٩ |
| وەمافەد | لەو مافەدا | ١٧٧ | ٢٠ |
| دالكبونە | دايك بونى | ١٧٨ | ٣ |
| من بعدكا | من بعدما | ١٧٨ | ١٩ |
| زۆرە | زۆرەوە | ١٨٠ | ١٧ |
| گەنە پێش | گەنەیش | ١٨٢ | ١ |
| بدابە | بدايە | ١٨٣ | ١٦ |
| وأورقنا | وأورثنا | ١٨٤ | ٦ |
| ومنا ربها | ومغاربها | ١٨٤ | ٦ |
| بەخنە نەمر | بەختە نەسر | ١٨٥ | ١ |
| ئايەتەكەيان | ئايينەكەيان | ١٨٦ | ١٩ |
| أجيناكم | أنـجيناكم | ١٨٧ | ٧ |
| وأعمناها | وأغمناها | ١٨٨ | ١٤ |
| ضعيفا | صعقا | ١٩٠ | ١٤ |
| لەو سانە | لەو كەسانە | ١٩١ | ٥ |
| الغاسنين | الفاسقين | ١٩١ | ١٩ |
| هەروايشن | هەروايشبوو | ١٩١ | ٢١ |
| چۆن پەنى | چۆنيەتى | ١٩٥ | ٣ |
| ناوخوا | ناوى خوا | ١٩٦ | ١٤ |
| لفوز | لغفور | ١٩٩ | ٧ |
| پيتەكردنى | پينەكردنى | ٢٠١ | ٦ |
| گوناهە | ئەو گوناهە | ٢٠١ | ٦ |
| ئابيا | ئايا | ٢٠١ | ١٠ |
| بە مەلەرزە | بومەلەرزە | ٢٠٢ | ١٤ |
| أحبب | أصيب | ٢٠٣ | ١٥ |
| يجدنە | يجدونە | ٢٠٤ | ٢١ |
| هاتوەتە لەگەلتا | هاتووە لەگەليا | ٢٠٥ | ١٧ |
| جولەكاتى | جولەكايەتى | ٢٠٩ | ٤ |
| أذ أستستاە | أذ أستسقاە | ٢١٠ | ٧ |
| خۆتان | خۆتانە | ٢١١ | ٦ |
| بەروان | بەوان | ٢١١ | ١٠ |
| بەين | بكەين | ٢١١ | ١٥ |
| گيروە | گيرودە | ٢١١ | ٢٣ |
| دانيشتواى | دانيشتوانى | ٢١٣ | ١٢ |
| مستهم | سبتهم | ٢١٤ | ١ |
| لا يسبقون | لا يسبتون | ٢١٤ | ٣ |
| ناكەين | ئەكەين | ٢١٤ | ١٧ |
| رونەوا | ڕونەدا | ٢١٥ | ٧ |
| كراوە | كردوە | ٢١٧ | ٧ |

| هەڵە | ڕاست | لا | دێڕ |
|---|---|---|---|
| داوە | داناوە | ٢٢٠ | ١٦ |
| لەمە | لەمەوبەر | ٢٢٢ | ٨ |
| على أله | على الله | ٢٢٢ | ١٨ |
| دەرونيا | دەرونيانى | ٢٢٣ | ١٦ |
| توربتى | قورتوبى | ٢٢٦ | ١١ |
| خويار | خوا يارمەتى | ٢٢٦ | ١٣ |
| داوى | دواى | ٢٢٧ | ١٦ |
| كلك | كذلك | ٢٢٨ | ٥ |
| لادەروان | لادەران | ٢٣٠ | ١٢ |
| چفەى | چغەى | ٢٣١ | ١٩ |
| ولا خيرا | ولا ضراً | ٢٤٤ | ٨ |
| ئەوێچن | ئەوێن | ٢٤٦ | ٤ |
| نفساها | تغشاها | ٢٤٨ | ٦ |
| ئەگە | ئەگەرتۆ | ٢٤٨ | ١٤ |
| سيئا | شيئا | ٢٥٠ | ٧ |
| خۆيسيان | خۆيشيان | ٢٥٠ | ١٥ |
| هاوريان | هاواريان | ٢٥٣ | ١٤ |
| بالمعروف | بالعرف | ٢٥٥ | ١٥ |
| بالمعروف | بالعرف | ٢٥٦ | ٨ |
| خێلى | فێلى | ٢٥٧ | ٢٣ |
| ديش | تريش | ٢٥٨ | ٩ |
| ناياويان | نيازيان | ٢٥٩ | ٩ |
| بالند | بالغدء | ٢٦٢ | ١٧ |
| بارو | يادو | ٢٦٣ | ٤ |
| وجعضلە | وما جعلە | ٢٧٤ | ١١ |
| فنكم | فتنكم | ٢٨٢ | ١٢ |
| ويمكروا الله | ويمكر الله | ٢٩٤ | ٩ |
| ليصعدوا | ليصدوا | ٢٩٩ | ١٠ |
| مەسلمانان | موسلمانان | ٣٠٠ | ٢ |
| للرسول | وللرسول | ٣٠٣ | ١٢ |
| باوەڕيان | باوەڕتان | ٣٠٥ | ٥ |
| دەركەوتايوە | دەركەوتايە | ٣٠٦ | ١٦ |
| لتنازضعم | لتنازعتم | ٣٠٨ | ١٣ |
| فاتبعوا | فاثبتوا | ٣١١ | ٣ |
| زۆرى | بە زۆرى | ٣١١ | ١٦ |
| ولا تنازضعوا | ولا تنازعوا | ٣١٢ | ٤ |
| كەس | هەزار كەس | ٣٣٢ | ١٦ |
| فرۆكە | بە فرۆكە | ٣١٧ | ٨ |
| شۆڕو | شورشە | ٣١٧ | ١٢ |
| هەچەندە | هەرچەندە | ٣١٨ | ١٧ |
| شكانادنى | شكاتى | ٣٢٣ | ١٨ |

| هەڵە | ڕاست | لا | دێر |
|---|---|---|---|
| فشرر | فشردٌ | ٣٢٤ | ١ |
| پیرن ئەگێرن بە | پیلان ئەگێرن بۆ | ٣٢٥ | ٢٣ |
| لەبەرگری | بەرگری | ٣٢٦ | ١ |
| ئەوتر تیلو | ئەوترێ تیلۆر | ٣٢٦ | ٦ |
| ئیمەو | ئێمەدا | ٣٢٦ | ٢٢ |
| خستن | خستی | ٣٢٩ | ١٦ |
| لە باوەڕداران | بەسەر بێ باوەڕانا | ٣٣٢ | ١٣ |
| یغلبوا مئة | مئة یغلوا | ٣٣٢ | ١٥ |
| لەنێو | لەنێو ئێوەدا | ٣٣٢ | ١٦ |
| ئەوتر | ئەوتۆ | ٣٣٢ | ١٦ |
| کە پیێستە | کە پێویستە | ٣٣٣ | ٢ |
| ئەوئمان | ئەوانمان | ٣٣٣ | ١٧ |
| هێز | هێزو | ٣٣٥ | ٥ |
| گرتنانەی | گرتنانە ئەی | ٣٣٥ | ٢٢ |
| یۆکتم | بۆتیکم | ٣٣٦ | ٢٣ |
| بوەڕان | باوەڕان | ٣٣٧ | ١٧ |
| پرسیارم | پرسیار | ٣٣٨ | ١٦ |
| فی الدین من | فی الدین | ٣٣٩ | ١٩ |
| بەبێ کەم | بدەن بەبێ کەم | ٣٤١ | ١٥ |
| الیحوث | البحوث | ٣٤٢ | ٨ |
| کرد | نەکرد | ٣٤٨ | ٤ |
| دەرونە | دەرچونە | ٣٥٢ | ٣ |
| وز | واز | ٣٥٢ | ٩ |
| سبیلة | سبیلە | ٣٥٣ | ١٢ |
| الممتدون | المعتدون | ٣٥٤ | ٣ |
| باوەڕداران | باوەڕداران ناکەن | ٣٥٤ | ٤ |
| الله | والله | ٣٥٧ | ١٦ |
| پەرستیدا | بت پەرستیدا | ٣٥٨ | ٢٣ |
| لە پاشا | لە پێشا | ٣٦١ | ١٨ |
| لا تتذخذوا | لا تتخذوا | ٣٦٢ | ٦ |
| نەقزبر | قورەیزە | ٣٦٤ | ٨ |
| لەمەکە | لەنێوان مەکە | ٣٦٤ | ١٧ |
| وەرناگیرێ | وەرئەگیرێ | ٣٧٠ | ١٢ |
| خوا | لای خوا | ٣٧٢ | ٦ |
| پەختەی | پوختەو | ٣٧٣ | ٢٣ |
| فی سبیل | فی سبیل الله | ٣٧٥ | ١٣ |
| ساسیتەی | شایستەی | ٣٨١ | ١٨ |
| ئەبەست | ئەبەستن | ٣٩٣ | ٦ |
| هەرستێ | هەرشتێ | ٣٩٥ | ١ |
| کفرثوا | کفروا | ٣٩٥ | ٧ |
| مثنها | منها | ٣٩٧ | ٦ |
| لە دووریان | لە درۆیان | ٤٠٦ | ١٤ |
| گەشە | گەشەی | ٤١٣ | ١٩ |
| فەرماندانی | فەرمانبەردارانی | ٤١٤ | ١٧ |
| بست | وسق | ٤١٦ | ٢ |
| پێغەمەری | پێغەمدر | ٤٢١ | ٩ |
| سەپەرشتی | سەرپەرشتی | ٤٢١ | ١١ |
| بەختیارن | بەختیاریانە | ٤٢٤ | ٢٣ |
| لەگەل تۆ | لەگەل ئەو | ٤٢٥ | ١ |